# بنەماڵەی زانایان

نووسینی:

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

سرشناسه    مدرس، ملا عبدالکریم، ۱۹۰۵ — ۲۰۰۵ م.
عنوان و نام پدیدآور : Mudarris, Abdal-karim.
بنەماڵەی زانیاران/نووسیار: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس.
مشخصات نشر : تهران: آنا، ۱۳۸۹
مشخصات ظاهری    ۴۸۹ ص.
شابک    ۹۷۸-۹۶۴-۶۸۷۶-۵۹-۰
وضعیت فهرست نویسی: فیپا
یادداشت : کردی.
موضوع    کردان، سرگذشتنامه.
موضوع    دانشمندان کرد، سرگذشتنامه
ردەبندی کنگره    ۱۳۸۸ ۴ م ۴ک/DS۵۹
ردەبندی دیویی    ۹۵۶/۰۰۴۹۱۵۹۷
شماره کتابشناسی ملی: ۱۷۰۹۷۱۴

# بنەماڵەی زانیاران

نووسەر : مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس
پیتچن و رازاندەوە: سەیران پەرویزی
هەڵەگر: نەجمەدین براخاس
رووبەرگ: ئەفشین بەهاریزەڕ
بڵاوکردنەوە: کتێبی کانی
ژمارەی چاپ: یەکەم
تیراژ: ۳۰۰۰ دانە

ناوەندی بڵاوکردنەوە: سنە ـ شەقامی شوهەدا ـ پاساژی عیزەتی ـ کتێبی کانی
تەلەفوون: ۲۲۲۵۲۵۹-۰۸۷۱

بسم الله الرحمن الرحيم

اَلحَمدُ لله ربِ العالَمين، والصلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيّدنا مُحمَّد
وَ آلِه وَ صَحبِه وَ اَتباعِهِ اَجمَعين بِأحسانٍ اِلى يَوم الدّين.

# ناوەرۆک

## ناوەرۆک

## ناوەرۆک

## پێشەکی

پاش ستایشی پەروەردگار و درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نـازدار و بـۆ هـەموو خزم و نەتەوە و یارانی، لە سەرەوە تا خوار... عەرزتان ئەکەم:

ئەمەوێ دوا دەفتەری رشـتەکتێبی «یـادی مـەردان» بنووسـم، ئـەم بەشەیشـم بـۆ باس کردنی هەندێ لە بنەماڵـە زانیـاری‌یـە ئـایینی‌یـەکانی نیشـتمانم —کوردسـتان- تەرخان کردووە. ئەوانەی کـە وەک ئەسـتێرەی ئاسمـان درەوشـاونەتەوە و بـە رووی خاوەن ئابڕووەوە بەرەورووی گەلەکەمان بە جوانی گەشاونەتەوە. بە هیوای ئـەوە کـە لاوانی نیشتمان بە رووناکی تەماشای مێژووی ئەوان بکـەن و رێگـای خزمـەت‌کـردن وەربگرن و لەسەر یاسای پێشینان بگەن بە پیرۆزی ماوەی ژیان.

| | |
|---|---|
| ئـــەوەی بزانـــێ حاڵـــی پێشـــینیان | لە شادی و ساغی، لـە نەخۆشـینیان |
| ئـەزانێ پایـەی هیممـەتی مـەردیی | بۆ خزمـەتکاری گـەلی یـا فـەردیی |
| کە بە زاماری چەن بە هیممەت بوون | بۆ زانیاریی چەن بە هەڵمەت بـوون |
| جا مەمنوون ئەبن بە دڵ و بـە گیـان | بـۆ کـاری ئـەوان لـە مـاوەی ژیـان |
| ئەکەونـە سـەر رێ بـە رێـی ئـەوانا | بـە وێنـەی مـەردی زانـای تـەوانا |
| پەیـڕەویی بـاوکی بـەڕێزی زانیـار | پێویستە لـە بـۆ نەتـەوەی هۆشـیار |
| نەخسووس لە رێگەی پـیرۆزی ژینـا | لـە کـاری دنیـا و لـە کـاری دینـا |
| ئـادەمی ئـەبێ زانـا و زیـرەک بـێ | بۆ خانووی ژیان وێنەی تیرەک بـێ |
| بـڕوانێ بـۆ راسـت، بـڕوانی بـۆ لار | بـــەراورد بکـــا وەزعـــی رۆزگـــار |
| لێـک بداتـەوە فـەرقی ئـەم و ئـەو | لــەم لێکدانــەوە وەربگــرێ پرتــەو |

من وا ئەزانم فەرزە لە سەرمان ... دەرزی ڕەوشتی گەلی پێشوومان
ئەوان بە زەحمەت گەیین بە پایە ... بە ڕەنج و ئازار گەیین بە مایە
تۆ بۆچی وەها کەوتووی لە جێدا ... ئەڵێی نەخۆشی لە سەرەڕێدا
بۆ بێن بە سەرتا ئەسنافی ئینسان ... تۆ بۆ چاڵی ڕەش، ئەوان بۆ کەیوان
سیپڕی ئەم دەردە هەز نەزانینە ... هەر بێئاگایی لە ژین و دینە
هەستە، لە جێدا بە کزیی مەمرە ... لە زانستی پاک دەرزێ وەربگرە
بەڵکوو بەو دەرزە لەگەڵ دڵسۆزیی ... بگەی بە پایە و مایەی پیرۆزیی
قەت دامەمێنن لە ڕووی جیهانا ... لە بەرەوڕوودا یا لە پەنهانا
تێکۆشن بە دڵ بۆ ناز و نیعمەت ... ئێستەیش ئەبارێ بارانی ڕەحمەت
هەرکەس تێکۆشێ بە ڕاستی بێ گەڕ ... وەرئەگرێ بەشی بەختیاریی و فەڕ
«نامی» ئومێدی وایە بە خودا ... ڕەحمەت ببارێ دائیم لەسەردا

***

جا بزانن! ئەم دەفتەرە دانراوە بۆ یادی بنەماڵەکانی زانیاری و ئایین، مەبەستم ئەوەیە کە ناویان کوێر نەبێتەوە و نەتەوەکانیش بە شوێنی ئەوانا برۆن و ئەگەر یەکێ سەرزەنشتی من بکا و بڵێ: ئیمڕۆ دنیا گۆڕاوە و خەڵکی خەریکی بیری دنیای خۆیانن! وەڵامەکەی ئەوەیە: دنیا هەرچۆن بێ هۆشیارەکان بە شوێن ڕشتەی ڕەوشت و خووی بەرزا ئەگەڕێن و بەردەوامیی ڕەوشتی بەرزیان مەبەستە.

جا لەبەر ئەوەی کە گەلێ لەو بنەماڵانەی ئێرەدا باسیان ئەکەم — لەسەر نووسراوی خۆیان- ئەڕۆنەوە سەر حەزرەتی حەسەن یا حەزرەتی حسەین- خودایان لێ ڕازی بێ- بەر لە باسی بنەماڵەکان نموونەیێ لە ژیان و بەسەرهاتی ئەو دوو زاتە و نەوە ناودارەکانی ئیمامی حسەین ئەنووسم، ئەوسا دەست بە نووسینی مەبەست ئەکەم.

سەرچاوەکانی ئەم باسەیش ئەمانەن:

١- الرسالة المنجية فی مناقب السادات البرزنجية، دانراوی شێخ مارفی ڕیشەڵانی.

٢- نورالأنوار، دانراوی سەیید «عبدالصمد»ی تووداری.

٣- عنوان المجد، دانراوی ئیبراهیم فەسیح حەیدەری.

٤- ئەو نووسراوە کورتانە و ئەو شەجەرەی ڕشتەی نەسەبانە کە لە هەندێ لە پیاوانی باوەڕ پێکراوی خانەدانەکانەوە بە دەستم گەیشتوون و مۆری پیاوە گەورەکان و زانا ناودارەکانیشیان پێوەیە.

زیاد لەمانەیش هەندێ زانیاری کە خۆم لە تەمەنی خۆمدا لە زانایان و پیاوانی چەرخی خۆم بیستوون.

وە لەبەر ئەوە زانیاری‌یەکانم پارچە پارچە و لە کات‌گەلی درێژەدارا بۆ هاتوون ئەگەر شتێکی پێچەوانەی تەرتیبی واقیعیتان پێش چاو کەوت، چاوپۆشیمان لێ بکەن.

من لەم نووسینەدا مەبەستم هەر ئەوەیە ناو و نیشانەی پیاوانی ئەو خانەدانە بەرزانە ون نەبێ و هەندێ لە ژیان و بەسەرهاتیان بۆ هاونیشتمانەکانم روون بێتەوە.

جا بە یارمەتی خودای میهرەبان ئەڵێم:

**یادی ئیمام «حسن الـمجتبی»**

ئەم زاتە شیرین‌سیفاتە لە ساڵی سێهەمی کۆچیدا لە دایکی بەڕێزی فاتیمەی زەهرا«خ» لە شاری مەدینەی پیرۆزدا لە دایک بووە.

کاتێ موژدەی پەیدابوونی گەییشت بە حەزرەتی فەخری عالەم – دروودی خودای لەسەر بێ- تەشریفی برد بۆ لای کچی خۆی فاتیمە و فەرمووی: ئەو کوڕی فاتیمەم بۆ بهێنن. کە هێنایانە خزمەتی وەری‌گرت و بانگی‌دا بە گوێچکەی ڕاستیدا و قامەتی خوێند بە گوێچکەی چەپیدا و ناوی نا (حەسەن).

وە فەرمانی‌دا سەریان تاشی و بە کێشانەی مووی سەری زیویان‌دا بە هەژاران و بە ناوی حەوتم – عقیقە–وە کاوڕێکیان بۆ سەربڕی.

لە باسی ڕێز و گەورەیی ئەم زاتە پیرۆزەدا گەلێ حەدیسی شەریف ریوایەت کراوە.

بوخاری و موسلیم لە بەراء دەگێڕنەوە [کە] ئەڵێ: چاوم بە حەزرەت کەوت حەسەن بەسەر شانیەوە بوو ئەیفەرموو: خودایە! بەڕاستی من ئەم کوڕەم خۆش ئەوێ، دەی تۆیش خۆشت بوێ.

بوخاری لە ئەبووبەکری سەدیقەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەرم بینی لەسەر مینبەر بوو، حەسەن لە تەنیشتیەوە بوو، جارێک تەماشای حەسەنی ئەکرد و جارێک تەماشای خەڵکەکەی ئەکرد و فەرمووی: ئەم کوڕەم گەورەیە و هیوام وەهایە کە خودا بە هۆی ئەوەوە هێمنی و ئاشتی بخاتە ناو دوو کۆمەڵی گەورە لە موسوڵمانان.

ئەم زاتە لە تەمەنی ٤٧ ساڵیدا لە شاری مەدینەی مونەووەرەدا لە ساڵی پەنجای کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی «بەقیع»دا نێژراوە. خودای لێ رازی بێ.

نەوەی نێرینەی ئەم زاتە بریتین لەم هەشت کەسە: زەید، الحسن المثنی، حسەین، محەمەد، جەعفەر، یەعقووب، تەلحە، ئەبووبەکر.

## یادی حەزرەتی حسەین

ئیمام حسەین کوڕی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبیتالیب لە فاتیمەی زەهرایە«خ» لە ساڵی چواری کۆچیدا لە شاری مەدینەدا لە دایک بووە.

«ام الفضل» کچی «حارث»ی کوڕی «عبدالمطلب» ئەڵێ: لە پێش ئەوەدا کە ئیمامی حسەین لە دایک ببێ لە خەودا چاوم پێکەوت پارچەیێ لە لەشی پیرۆزی حەزرەت جیا بووەوە و هات کەوتە باوەشم، منیش لە ترس و سەرسامی ئەم خەوە خەبەرم بووەوە.

جا رۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر و خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: لەم رۆژانەدا فاتیمەی کچم کوڕێکی ئەبێ ئەینێتە باوەشی تۆ. جا پاش چەن رۆژێ فاتیمەی زەهرا«خ» کوڕێکی بوو من هەڵمگرت و لە باوەشی خۆمدا دامنا.

ئەهلی سیرەت ئەڵێن: حەزرەتی حسەین گەلێ جوان و شیرین‌شێوە بووە و هەرکەسێ چاوی پێی ئەکەوت دڵی شاد ئەبوو.

وە گەلێ حەدیس دەربارەی گێڕدراوەتەوە. لەوانە: حەزرەت فەرموویەتی: حەسەن و حسەین گەورەی جوانەکانی بەهەشتن.

هەروەها لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە دەگێڕنەوە وتی: چاوم کەوت بە حەزرەت، حەسەن و حسەینی لەسەر دوو رانی دانابوو، واتە هەر یەکێکیان لە سەر رانێکی بوو

فەرمووی: خودا! ئەم دووانە کوڕی منن و کوڕی کچی منن؛ من ئەوانم خـۆش ئـەوێ تۆیش خۆشت بوێن؛ وە ئەو کەسانەیش ئەوانیان خۆش ئەوێ خۆشت بوێن.

ئەم دوانە دوو ئیمامن لە دوازدە ئیمامی ئالی بەیت و پایەی زانستیان دیارە.

وە حەزرەتی حسـەین«خ» لە ساڵی ٦٠ی کۆچیدا لە تەمەنی ٥٧ ساڵـیدا لـە خـاکی کەربەلادا بە پایەی شەهادەت گەییشت و لـەو شـوێنەدا بـە خـاک سـپێرراوە، خـودا بەهەشت بکات بە جێگەی.

**ئیمام عەلی زەینەلعابدین**

زانایانی مێژوو یـەکـڕا و یـەک قسـەن لەسـەر ئـەوە کـە ئـەم ئیمامـە تاقـەکوڕی حەزرەتی حسەین بووە و لە پاش شەهادەتی ئەو لە شاری مەدینەدا لە دایـک بـووە و پلەی زانست و تەقوای دیار و ناسراوە.

دەگێڕنەوە: کاتێ کە نوێژی ئەکرد ڕەنگی زەرد ئـەبوو و لـە حاڵـی ئێـرەتی خـۆی دەرئەچوو. کە عەرزیان ئەکرد: ئەم حاڵە چییە؟ لە وەڵامدا ئەیفەرموو: نازانن مـن لـە حوزووری کێدا راوەستاوم؟!

| | |
|---|---|
| امامی کز ازل فضـلش جلـی بـود | علی ابن الحسـین ابـن علـی بـود |
| جـــمالش آفتـــاب عالـــم‌افـــروز | دلـش از نـور ثاقـب صـیقلی بـود |
| مقامش بـود برتـر ز آنچـه گفـتم | غـم دل از کلامــش منجلـی بـود |
| به فضل علم و زهد و دین و تقوی | شبیهی مصطفی، شبهی علـی بـود |

ئەم زاتە لە مێژووی نـەوەد و پێنجـی کۆچیـدا لـە مەدینـەی پـیرۆزدا لـە جیهـان دەرچووە و لە گۆڕستانی بەقیع بە خاک سپێرراوە لە نزیکی ئیمام حەسـەنی مامیـەوە «خ».

نەوەی نێرینەی ئیمام زەینەلعابدین، ئەوانەیان لە پاش خـۆی ماونەتـەوە، حـەوتن: محەمەدباقر، عەبدوڵلا، زەیـد، عومـەر، حەسـەن، حسـەین، عـەلی. لـە نـاو ئەمانـەدا محەمەدباقر جێگەداری ئەو بووە.

### ئیمام محەمەدی باقر

ئەم زاتە لە ساڵی ٥٧ی کۆچیدا لە شاری مەدینەی پیرۆزدا لە دایکی بەڕێزی - فاتیمەی کچی ئیمام حەسەن «خ»ـ لە دایک بووە.

مهی سپهر جلالت محمدی باقر
کە بود نور امامت ز طلعتش ظاهر
به جود و علم بسان حسن عدیم المثل
به فضل و علم چو حیدر به عهد خود نادر

ئەم زاتە شیرین‌سیفاتە خۆش‌ڕەفتارە، زانا و پارێزگار و لەخوداترس و دۆعاگیرا بووە.

ئەگێڕنەوە پیاوێکی «ابو بصیر»ناو کوێر بووە، هاتووەتە خزمەتی ئیمام محەمەدی باقر تا دۆعای بۆ بکا بەڵکوو خودا بینایی چاوەکانی پێ بداتەوە، جا ئیمام محەمەد دەستی پیرۆزی دێنێ بەسەر چاوەکانیا و هەردوو چاوی وەکوو جارانیان لێ دێتەوە و چاک ئەبنەوە.

ئەم ئیمامە لە ئامۆژگاریدا زۆر خاوەن بەلاغەت و قسەڕەوان بووە و گەلێ وتاری بەرزی لێ ئەگێڕنەوە. لەوانە: هیچ عیبادەتێ بەنرخ‌تر نییە لە پارازتنی سک لە تیکەی حەرام و پارازتنی عەورەت لە کردەوەی بەد. وە هیچ عەیبێ لەوە ناشیرین‌تر نییە کە ئادەمیزاد عەیبی خەڵکی ببینێ و عەیبی خۆی نەبینێ و خەڵکی لەکەدار بکات بە عەیبێ کە لە خۆیدا بێ؛ وە بە خەڵکی بڵێ کە کاری چاک بکەن و خۆی نەیکات و بە وتاری نابار ئازاری دڵی خەڵک بدات.

وە فەرموویەتی: پێویستە بۆ موسوڵمان هیچ کاتێ لە یادی مردن فەرامۆش نەبێ و هیچ کاتێ یادی خودای لەبیر نەچێتەوە.

وە فەرموویەتی: هەر دڵێ فیز و دەماری تێدا بێ بە قەی ئەو فیزە ئیمانی کەم ئەبێ.

وە فەرموویەتی: خۆشەویستی برای خۆت لە خۆشەویستی خۆتەوە بۆ ئەو تەماشا بکە.

وە فەرموویەتی: برادەرێکی خراپە، ئەو کەسەی کە لە کاتی دەوڵەمەندیدا لەگەڵتا بێ و لە کاتی گەداییدا لێت دوور بکەوێتەوە.

ئەم ئیمامە لە ساڵی ١١٤ی کۆچیدا لە تەمەنی ٥٨ ساڵیدا لە شاری مەدینەدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی بەقیعدا بە خاک سپێرراوە. خودا بەهەشتی بەرینی خۆی بکات بە جێگەی.

ئەم زاتە چوار کوڕی لێ بەجێماوە: ئیمام جەعفەری سادق، ئیسماعیل، عەبدوڵلا، ئیبراهیم، لە ناو ئەم کوڕانەدا ئیمام جەعفەری سادق جێگەنوشینی باوکی بووە.

**ئیمام جەعفەری سادق**

ئەم زاتە لە ساڵی ٨٠ی کۆچیدا لە شاری مەدینەی پیرۆزدا لەدایک بووە و پڕتەوی قودوومی پیرۆزی ئەو جیهانی رووناک کردەوە. ئەم زاتە لە زانست و ئەدەبدا تاقانەی زەمان بووە و دڵی بە نووری مەعریفەت رووناک بووە و نیشانەی بەرزی و خوو و رەوشتی جوانی لێ باریوە. باسی کەرامەت و رەوشت و خووی ئەو جیهانی داگیر کردووە و شوێنەواری چاکە و بەرزیی بە جیهاندا بڵاو بووەتەوە.

محیط جمله کمالات امام جعفر صادق
که بهر کسب فضائل نموده سلب علایق
لوای مرحمت او پناه اهل سعادت
ظلال مکرمت او ملاذ جمله خلایق

ئەم ئیمامە یەکێ لە موجتەهیدینی چەرخی خۆی بووە و زانا و گەورەکان ئەچوونە خزمەتی بۆ وەرگرتنی زانیاری و دەسکەوتنی مەعریفەت و کردنەوەی گرێ و گۆڵە و دۆزینەوەی چاری رووداوی نابار. ئەم زاتە لە بابەتەکانی: فیقهـ و حەدیس و تەفسیردا دەستێکی باڵای هەبووە.

ئەگێڕنەوە کە «سوفیان ثەوری» چووە خزمەتی و عەرزی کرد: ئەی رووناکی چاوی رەهبەری خۆشەویست«د» فەرمووی ئامۆژگاری‌یەکم بکە بەڵکوو بە هۆی ئەوەوە بە پایەیێ بگەم. ئەویش فەرمووی: ئەی سوفیان! هەرکەسێ لە دەرگای تەوازوع و بەندەیی خوداوە بڕواتە دەرەوە خودا لە هەردوو دنیادا ناوی بەرزی بڵاو ئەکاتەوە. وە

بزانە درۆزن پیاوەتی لێ نایێ و حەسوود ئاسایشی نابێ و ئینسانی بەدخوو گەورەیی بۆ ناکرێ و فەرمانداران برایەتی‌یان نییە.

جا وتم: قوربان زیاتر ئامۆژگاریم بکە. فەرمووی: خۆت لە کاری نابار بگێڕەرەوە ئەبی بە عابید. وە رازی بە بەوەی کە خودا پێی داوی، دەوڵەمەند ئەبی. وە حەقی هاوڕێتی خەڵکی بەجێبێنە ئەبی بە زینەتی ئیسلام. وە ئەگەر بێ‌سەڵتەنەت هەیبەتت ئەوێ و بە بێ‌عەشرەت و هۆز عیززەتت ئەوێ لە نافەرمانی خودا و سەرشۆڕی گوناه دوور بکەوەرەوە، هاوڕێتی بەدڕەوشتان مەکە تا بە گوناه گیرۆدە نەبی. لەگەڵ هاوڕێی خراپدا مەبە گیانت سەلامەت ئەبێ و زمانت بپارێزە با گیرۆدەی پەشیمانی نەبی.

ئیمام جەعفەری سادق «خ» زاتێکی خاوەن رۆحانییەت و دۆعاگیر بووە و زۆر ئاگاداری کیتاب و سوننەت بووە و شارەزای مەعنای قورئان و حەدیس بووە و زانا بووە بەو حوکمە شەرعییانە کە جێگەی ئیجماع یا خیلاف بوون.

وە فەرموویەتی: هەرکەسێ رزق و رۆزیی کەم و کوورە ئەوە با زۆر لە خودا بپاڕێتەوە و بە دڵ و زمان «استغفرالله» بکا.

وە فەرموویەتی: هەرکەسێ هەر حاڵێ یا ماڵێکی خۆی لەلا جوان بێ و بە عەجایب بێتە بەرچاوی با بڵێ: «ماشاءالله لاقوة الاّ بالله» ئەو شتە ئەپارێزرێ.

وا باوە کە ئەم ویردە بۆ لابردنی ئازاری چاوی پیس زۆر بەسوودە و لە کاتی ترس لە چاوی پیسدا ئەخوێنرێتەوە.

بە کورتی ئیمام جەعفەر پلە و پایەی گەورەی زۆرن.

ئیمام جەعفەر تەمەنی شەست و هەشت ساڵ بووە، لە ساڵی ١٤٨ی کۆچیدا لە شاری مەدینە کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی بەقیعدا بە خاک سپێرراوە. ئەم زاتە حەوت کوڕی لێ بەجێماوە: مووسای کازم، ئیسماعیل، عەبدوڵلا، ئیسحاق، محەمەد، عەبباس، عەلی. عەلی لە زەمانی باوکیدا لە جیهان دەرچووە و محەمەد «داعیە» بووە. ئیمام مووسا جێگەنوشینی باوکی و مەرجەعی خەڵک بۆ لابردنی تەنگ و چەڵەمە و حەللی موشکیلاتی ئایینی‌یان بووە.

**ئیمام مووسای کازم**

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٠ی کۆچیدا لە شاری مەدینەی پیرۆزدا لەدایک بووە، ئادەمیزادێکی خاوەنڕەوشت و خووی بەرز بووە و لە زانست و لە خوداترسیدا لە پیاوە بەرزەکانی دنیا ژمێرراوە و موسوڵمانان بە هۆی هاوڕێتی ئەوەوە دڵیان رووناک بووەتەوە و روویان کردووەتە بەندەیی خودا.

وە نازناوی «کازم» لەسەر ئەو بناغە بووە کە زۆر چاوپۆشی لە کار و وتاری ئادەمیزادی نابار کردووە و داخی دەروونی خۆی خواردووەتەوە و بە شوێن تۆڵەدا نەگەڕاوە.

امام اهل دین موسی بن جعفر — جهان از نکهت خلقش معطر
ز روی خلق او هادی الامم بود — به فرط علم او عالی علم بود
ز خویش فایح آثار سعادت — ز رویش لایح انوار سیادت
علوّ همتش برتر ز افلاک — ز علمش گشته حیران علم ادراک
امامت را وجودش بود لایق — درین معنی خبر می‌داد صادق

شەقیقی بەڵخی ئەڵێ: لە سەفەری حیجازدا لە بیاباندا گەیشتم بە ئینسانێکی دیمەن و شێوە جوان، لەسەر تەپۆلکەیێ دانیشتبوو هەندێ قوماشی بە دەستەوە بوو، منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەم کوڕە گەنجە خۆی لە شێوە و بەرگی ئەهلی تاعەتا پیشان ئەدا، ئەیەوێ ئەم قوماشە وا بە دەستیەوە بیدا بەسەر خەڵکدا. ئەچم بۆ لای کەمێ سەرزەنشتی ئەکەم! کاتێ لێی نزیک بوومەوە فەرمووی: «یا شقیق! اجتنبوا کثیراً من الظّن، اِنّ بعض الظّنِ اثمٌ» ئەمەی فەرموو و هەستا و رۆیشت و لە پێش چاوم ون بوو. منیش لە دڵی خۆمدا وتم: سەرم سوڕئەمێنێ! ئەم زاتە چۆن ناوی منی زانی و چۆن لە خەیاڵی دڵم ئاگادار بوو، مەگەر ئەمە یەکێ بوو لە ئەولیای خودا و لە پیاوە باشەکان بوو.

جا شەقیق ئەڵێ: لە شوێنێکی‌تریشدا هەمان جەوانم بینی خەریکی نوێژکردن بوو، فرمێسک بە هەردوو چاویدا ئەهاتە خوارەوە. منیش وتم: با بڕۆمە پێشەوە بەڵکوو دەرزێ لەم جوانە وەربگرم، نزیکی بوومەوە، کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: ئەی

شەقیق خودای تەعالا فەرموویەتی: «وَ إِنّی لغفار لِمَن تاب» پاش ئەم فەرمووده رۆیشت و لە پێش چاوما ون بوو.

دوای ئەمە باوەڕم هاتە سەر ئەوە کە ئەو زاتە یەکێکە لە پیاوچاکانی خودا و بە شوێنیا گەڕام هەتا لە شوێنێکی‌تردا چاوم پێی‌کەوتەوە. کاتەکە کاتی نوێژ بوو، موسوڵمانان بۆ ئاوی دەسنوێژ ماتڵ بوون، جا ئەو جوانە هاتە لای بیرێ کە لەو ناوەدا بوو، لەسەر بیرەکە راوەستا و فەرمووی: خودایە! هیچ شتێ نیە ئاوی لەم بیرە پێ هەڵگۆزم ئەم شەربە بێ پەتە نەبێ، کە تەماشام کرد ئاوی بیرەکە هاتەسەرەوە و ئەویش دانەوییەوە و ئاوی خواردەوە و دەسنوێژی گرت. جا ئاوی بیرەکە وەکوو جاران چووەوە خوارەوە و ئەویش چووەوە بۆ شوێنی خۆی. من کە ئەمەم دی شوێنی کەوتم، لە رێگەدا دیم هەندێ لمی کردە ناو ئەو شەربەوە کە بە دەستیەوە بوو و هەڵی‌گرت. کاتێ گەیشتە شوێنەکەی فەرمووی بە من: وەرە با پێکەوە ئەم خواردەمەنییە کە خودا داویەتی بیخۆین. جا شەربەکەی هەڵڕژاندە سەر سفرەکە، تەماشام کرد خۆراکێکی بەتام و خۆشە و هەندێکم لێ خوارد. سێ رۆژ دوای ئەوە ئارەزووی خواردنم نەکرد. دوای ئەمانە پرسیم: ئەم زاتە کێیە؟ وتیان: ئەمە مووسای کوڕی جەعفەری سادقە– خودای لێ رازی بێ!

ئەم زاتە خوو و رەوشت شیرینە لە ساڵی ١٨٢ی کۆچیدا لە شاری بەغدا لە جیهان دەرچووە و لە شوێنی دیاری و ناوداری ئێستەی خۆیدا بە خاک سپێرراوە.

زانایانی مێژوو دەڵێن: ئیمام مووسا نۆزدە کوڕی لێ بەجێ ماوە.ئەمەش ناوی کوڕەکانیەتی: ئیسماعیل «محدث»، زید، ئیبراهیم، عەقیل، هاروون، حەسەن، حوسەین، عەبدوڵلا، حەمزە، عەلیڕەزا، عوبەیدوڵلا، جەعفەر، یەحیا، ئیسحاق، ئەحمەد، محەمەد، عەبباس، قاسم و سولەیمان.

عەلیڕەزا لە ناو ئەم کوڕانە جێگەنوشینی باوکی بووە. وا باوە کە ئیسماعیلی «محدث» چووە بۆ هەورامانی ئێران و لە دێی «ئەسپەرێز» نیشتەجێ بووە، تا لەوێ لە دنیا دەرچووە و قەبرەکەی لەوێ ناسراوە.

هەروەها عوبەیدوڵڵا چووە بۆ هەورامانی ئێران و لە دێیەک لە قەراخی سیروان‌دا لە نزیکی ئەسپەرێز دانیشتووە، ئەو جێگە ئێستە بە هەجیج ناسراوە. ئەمەیش لە

«حجیج» وەرگیراوە کە سیفەتی عوبەیدوڵڵا بووە، واتە حەجی زۆر کردووە و عوبەیدوڵڵا کۆسە بووە، بۆیە ئێستە ئەڵێن کۆسەی هەجیج.

وە حەمزە چووە بۆ قەرەداغ و لە شوێنێکدا کە ئێستە بە تەکیە[1] ناوبانگی دەرکردووە دانیشتووە، وە هەر لەو شوێنەدا کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە گەلێ نەوەی زانا و پیاوی گەورەی لێ کەوتووەتەوە. لەوانە: شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی ماموستای زانایانی شارەزوور و شێخ جامی تەکیەیی و یوسفی ئەسەم (اصمّ) و شێخ عەلی مەلا و شێخ بابەعەلی سلێمانی و شێخ نووری کوڕی شێخ بابەعەلی و... گەلێ زانایانی بەرزی دیکە کە لەم کتێبە کورتەدا باسیان ناکرێ.

وە ئەحمەد ڕۆیشتووە لە گوندی (ئەحمەد بڕندە) لە قەزای دەربەندیخان نیشتەجێ بووە و هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە و قەبرەکەی لەوێدا دیارە و زیارەتگایە.

وە محەمەد و ئیمام قاسم ڕۆیشتوون بۆ کەرکووک و لەوێ دانیشتوون و هەر لەوێ کۆچی دواییان کردووە. ئیمام قاسم لە تەنیشتی مزگەوتی مەشهوور بە ئیمام قاسمەوە نێژراوە و محەمەدیش لە گۆڕستانی گشتیی موسوڵمانان لەسەر تەپۆڵکەیێ لە شیمالی کەرکووکەوە بە خاک سپێرراوە.

ئیبراهیمیش هەندێ ئەڵێن: ئەو زاتەیە کە لە گەرمیاندایە لە قەزای کفری و بە ئیبراهیم سەمین ناوبانگی دەرکردووە. وە هەندێتر ئەڵێن: ئەم ئیبراهیم سەمینە ئەو ئیبراهیمی کوڕی ئیمام مووسا نییە.

وە ئیسماعیل: وەک وتمان وا لە هەورامامندا. بەڵام هەندێ کەس ئەڵێن هەر لەو جێگەدا بە خاک سپێرراوە کە باوکی تێدایە لە شاری بەغدادا، بەڵام قسەی پێشوو -کە لە هەورامانە- ڕاستە.

---

١- لە هەندێک شوێنەوارەوە دەردەکەوێ کە کاتی خۆی دێی تەکیە لە شوێنی ئێستەی خۆیدا نەبووە کە پێی دەڵێن «خانوان» و وا دیارە پێشتر لە نزیکی دێی «بەلەکجاڕ»ی ئێستەدا بووە و بە گوێرەی نووسینی ماموستا شێخ نووری لە کۆندا «چوارتاق»ی پێ گوتراوە. زۆر لەو شوێنەوارانە کە ماونەتەوە وان لە نزیکی ئەو گۆڕستانەوە کە ئیمام هەمزە «حمزە»ی تێدا نێژراوە و ئەو کەلاوە و شوێنەوارانە ئێستە بە (تەکیە کۆن) ناسراوە. هەر لە نزیکی دێکە و گۆڕستانەکەوە بە سەربەرزی‌یەکەوە، شوێنێک هەیە پێی ئەڵێن: (خەڵوەکە) کە دیارە جێگەی شەونخوونی و بەندەیی‌کردن بە تەنیا بۆ خودا بووە. بەڵام ئەوەیش نازانرێ ئەم خەڵوە هی ئیمام هەمزە بووە یا هی پیاوچاکانی دوای ئەو بووە؟ یا هی هەردوولایان. م.ع.ق.

بە هەرحاڵ ئیسماعیل «محدث» باپیرەگەورەی ساداتی بەرزەنجەیە، وەک لەمەولا باسیان دێ.

**ئیمام عەلیڕەزا**

ئەم زاتە لە ساڵی ١٥٢ی کۆچیدا لە مەدینە لەدایک بووە.

امامی علی نام عالی نسب
پناه عجم مقتدای عرب
ازو بود راضی جهان آفرین
ازآن رو رضا گشت او را لقب

هەموو زانا و شارەزایانی سەردەمی ئیمام عەلیڕەزا شایەتیی‌یان لەسەر زانست و لەخوداترسی و کردارجوانی ئەو داوە.

در آن زمان که جهان شد به مقدمش انور
ندیده دیده[ی] کس چون رضای موسی جعفر
سپهر عزّ و جلالت، محیط علم و کمال
امام مشرق و مغرب، ملاذ آل پیمبر
وفور علم علو مکان اوست به حدی
که شرح آن نتواند نمود مرد سخنور

ئەم زاتە لە خزمەت باوکی‌دا لە مەدینەوە هات بۆ بەغدا و لەوێ مایەوە تا باوکی لە جیهان دەرچوو. دوای کۆچی دوایی باوکی ئەم لە جێگەیدا دانیشت.

وە کاتێ «هارون الرشید» خەلیفەی عەبباسی مەئموونی کوڕی خۆی کرد بە والی خۆراسان... عەلیڕەزای لەگەڵ مەئمووندا نارد بۆ شاری نیسابوور کە مەرکەزی خۆراسانە و لەم سەردەمەدا بە خۆراسان ناسراوە.

دەگێڕنەوە کاتێ ئیمام عەلیڕەزا گەیشتە شاری (مەرو) زانا و ناسراو و گەورە پیاوانی شار هاتن بە پێشوازی مەئموونەوە بە ناوی ئەوەوە کە کوڕی خەلیفە و والی

وڵاتەکەیە، هەروا بە پێشوازی عەلیڕەزاوە بەو ناوەوە کـە یەکێکـە لـە ئیمامـانی ئـالی بەیت و کوڕی ئیمام مووسایە.

کاتێ لێیان نزیک بوونەوە عەرزیان کرد: تکایە حەدیسێکی وامان بۆ ریوایـەت بکـە کە لە باوک و باپیرتەوە ریوایەت کرابێ، تـا بـۆ پـیرۆزی لای خۆمـان رای‌بگـرین. جـا ئیمام عەلیڕەزا فەرمووی:

حدثنی ابی موسی الکاظم، عن ابیه جعفر الصادق، عن ابیه محمد الباقر، عن ابیه علـی زین‌العابدین، علن ابیه شهید کربلاء، عن ابیه علی المرتضی، قال: حـدثنی حبیبـی و قـرة عینی رسول‌الله «ص» قال: حدثنی جبریل علیه السّلام قال: حـدثنی رب العـزة سـبحانه و تعالی قال: کلمة لا اله الاّ الله حصنی، فمن قالها دخل حصنی، و من دخـل حصـنی امِـن من عذابی.

گەلـێ لەو زانایانە ئەم حەدیسەیان بە سەنەدەوە لەبەر کـرد. وە ئیمـام ئەحمـەدی کوڕی حەنبەل ئەم حەدیسەی گێڕاوەتەوە و بەراورد کراوە هەرکەسێ خـاوەن ئیجـازە بێ بۆ ریوایـەتی ئـەم حەدیسـە و ئـەم حەدیسـە بـە سـەنەدەوە بخوێنێتـەوە بەسـەر کەسێکدا کە تووشی نەخۆشی «صرع» هاتبێ بە ئیزنی خودا شیفای بۆ دێ.

وە مـن خـۆم لـەبیرم دێ کـە مامۆسـتای بـەڕێزم عەللامـەی رۆژ شـێخ عومـەری قەرەداغی ئەم حەدیسەی بەو سەنەدەوە خوێند بەسەر فێدارێکدا و شیفای بـۆ هـات و دوای ئەو جارە نەم‌بیستووە ئەو نەخۆشینە گەڕابێتەوە سەری.

ئیمام عەلیڕەزا لە رۆژی چوارەمی مانگی رەمەزانی پیرۆزا لە ساڵـی ٢٣٠ کۆچیـدا لە شاری خۆراسان کۆچی دوایی کردووە.

ئیمام عەلی رەزا چوار کوڕی لـێ بەجێ‌ماوە: محەمەدتەقی کە بـە محەمـەدجـەواد ناوبانگی دەرکردووە. حەسەن، حوسەین، ئیبراهیم. محەمەدجەواد جێگەداری بـاوکی بووە.

**محەمەد جەواد**

ئەم زاتە لە ساڵی ١٩٥دا لە مەدینەی پیرۆزدا لەدایک بووە. وە هەر لە منداڵی‌یـەوە نیشانەی رێز و نەجابەت بە ناوچاوانیا دەرکەوتووە و گەلـێ شوێنەواری چاکە و تاعەت و لەخوداترسی لـێ دەرکەوتووە.

امـــام تقـــی و نقـــی جـــواد    فطانـــت نهـــاد و کرامـــت‌نـــژاد
ز صـلب شـــریفی علـــی الرضـــا    ز اولاد دیـــن پـــروری مرتضـــی
گـل سـرخ بسـتان‌سـرای رسـول    نهـــال ثمـــربخش بـــاغ بتـــول

***

به فضل کرم آن چنان شهره گشت    که صیتش ز اوج فلـک درگذشـت

***

ز حـــد بـــود بـــیرون کرامـــات او    ز حصـر اسـت افـزون مقامـات او

ئەگێڕنەوە کە محەمەدجەواد لە تەمەنی دە ساڵـیدا لـە کـۆڵانێکی شـاری بەغـدادا لەگەڵ هەندێ منداڵدا راوەستا بوو، لەو کاتەدا مەئموونی عەبباسی بەو شوێنەدا رابورد و منداڵەکان هەموو بڵاوەیان کرد و تەنیا محەمەدجـەواد لـە شـوێنی خۆیـدا مایـەوە. مەئموون لێی پرسی: بۆچی هەر لە شوێنی خۆتا مایتـەوە؟ ئـەویش فـەرمووی: ئـەی خەلیفە بۆچی رابکەم؟ من تاوان لە خۆمدا شک نابەم هەتا لـە شـەرمدا یـا لـە ترسـدا رابکەم و رێگەکەیش گوشادە، بۆ هات‌وچۆی هەموو جۆرە کەسێ ئەشێ و خەلیفـەیش بە بێ‌تاوان ئازاری کەس نادا، ئیتر بۆچی لە شوێنی خۆم دەرچم؟

مەئموون زۆر لە قسەی ئەو منداڵە سەرسام بوو و قسەکەی پـێ خـۆش بـوو، لێـی پرسی: ناوت چییە و کـوڕی کێیـت؟ ئـەویش وتی: نـاوم محەمـەدجـەوادە و کـوڕی عەلی‌ڕەزام. جا مەئموون وتی: ئەم جۆرە وەڵامە جوانە لە ئەهلی ئەو خانەدانـەوە دوور نییە.

ئیمام محەمەدجەواد لە تەمەنی ۲۰ ساڵـیدا لـە ساڵـی ۲۲۰ی کۆچیـدا لـە شـاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە نزیکی گومەزی ئیمام مووسادا بە خاک سپێرراوە.

ئەم زاتە دوو کوڕی لـێ بەجێ‌ما: عەلی‌نەقی کە بە هـادی ناسـراوە و جـێ‌نوشـینی باوکی بووە، مووسا.

**ئیمام عەلی نەقی کە مەشهوورە بە عەلی هادی**

ئەم زاتە لە مێژووی ۲۱٤ی کۆچیدا لە شاری مەدینە لەدایک بووە.

امـــام علـــی نـــام، هـــادی لقـــب
که ظاهر ازو گشـت فضـل و ادب

ازو نـــور ایـــمان فروزنـــده شـــد
بـه او سـنت مصـطفی زنـده شـد
سـپهر شـرف را رخشــی آفتـاب
دلـــش واقـــف ســـر امالکتـــاب

ئیمام عەلی‌نەقی وەکوو لە مەدینەی پیرۆزدا لەدایک بوو هەر لەوێدا بـە کامـەرانی رای‌ئەبوارد و خەریکی بەندەیی کردن بۆ خودا بووە. هـەتا لـە رۆژانی «المتوکّـل علـی اللە»ی عەباسیدا هات بۆ بەغدا و موتەوەکیل بە رێزەوە ناردی بۆ شاری سامەڕا و لەوێ دانیشت و بە بەندەیی کردنی خوداوە خەریک بوو، هەتا لە مێژووی ۲٥٤ی کۆچیدا لـە جیهان دەرچووە، لەو شوێنەدا –کە ئێستە ناسراوە- بە خاک سپێرراوە.

ئیمام عەلی‌نەقی چوار کوڕی لـێ بـەجێ‌مـاوە: حەسـەنی عەسـکەری، حسـەین، محەمەد، جەعفەر. لە ناو ئەم چوارەدا حەسەنی عەسکەری بوو بە جێ‌نوشینی باوکی.

### ئیمام حەسەنی عەسکەری

ئەم زاتە لە ساڵی ۲۳۱ی کۆچیدا لە شاری مەدینەی پیرۆزدا لـەدایک بـووە و هـەر لەو شوێنەدا بووە بە جێگەی خزمەتی موسوڵمانان.

امامی حسن خلـق، عـالی مکـان
حسینی نیشـان، کرامـت فشـان
گـــل گلشـــن خـــاتم انبیـــا
چـــــراغ شبســـــتان آل عبـــــا
دری بود از بحر احسـان و جـود
منـــور مهـــی بـــر ســـپهر وجـــود

ئەم زاتە شیرین‌ڕەفتارە پاش ماوەیێ لـە مەدینـەوە هاتـەوە بـۆ عێـراق و رۆیشـتە سامەڕا و لە جێگەی باوکیدا دانیشـتووە، هـەتا لـە سالـی ۲٦٠ی کۆچیـدا لـە شـاری سامەڕە کۆچی دوایی کردووە و لـەو شـوێنەدا کـە ئێسـتە دیـار و ناسـراوە بـە خـاک سپێرراوە. وە تاقە کوڕێکی لـێ بەجێ‌ما ناوی مەهدی بوو لـە تەمـەنی دە ساڵـیدا لـە سامەڕە لە جیهان دەرچووە.

بە باوەڕی شیعەی ئیمامی‌یە ئەم کوڕە ئیمامی دوازدەهەمە، لە پاش کۆچی دوایی باوکی ڕۆژێ مەئمووری خەلیفەی عەبباسی هاتووە بە شوێنیا بیبا بۆ بەغدا و ئەویش لەو کاتەدا چووەتە سەردابی ماڵی خۆیان و خۆی لە مەئموورەکان ون کردووە و ئیتر نایێتە دەرەوە هەتا ئاخر زەمان.

بەڵام لەسەر بیر و باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت مەهدی کوڕی ئیمام حەسەنی عەسکەری کۆچی دوایی کردووە و لە سامەڕەدا بە خاک سپێرراوە.

بەڵام محەمەد مەهدی «منتظر» سەییدێکە لە نەوەی فاتیمەی زەهرا و دایکی حوسەینی و باوکی حەسەنی‌یە و لە ئاخر زەمانا لەدایک ئەبێ. پاش ئەوە کە گەیشت بە تەمەنی پیاوەتی و گەورەیی هەر لە شاری مەکەدا موسوڵمانان بەیعەتی پێ ئەکەن و لەبەر ئەوە کە موسوڵمانان لەو چەرخەدا لە دەستی فیتنەی دنیا زۆر عاجزن موسوڵمانێکی زۆر شوێنی ئەکەون و سوپایەکی گەورە پێکەوە ئەنێ و غەزا ئەکا و بەسەر دوژمنەکانیانا زاڵ ئەبێ و دنیا دائەمەزرێنێ و هەر لە چەرخی ئەودا «دجال»—کە لە حەدیسی شەریفدا باسی هەیە- لە لایەنی ئەسفەهانەوە دەرئەچێ و دێ بە دنیادا و لە سەرەتاوە خۆی بە پیاوچاکێ پیشان ئەدا و پاش ئەوە خۆی گرت و هێزی سەند، داوای پێغەمبەرایەتی ئەکا و گەلێ خەڵکی لێ دوور ئەکەونەوە و گەلێ بێ‌دین ئەکەونە شوێنی و وڵات دائەگرێ تا ئەگاتە خاکی شام و دێتە شاری دیمەشق.

لەو سەردەمەدا حەزرەتی عیسا لە ئاسمان دێتە خوارەوە و لەگەڵ محەمەدی مەهدی‌دا یەک ئەکەون و قسە ئەکەن بە یەک و عیسا لەسەر شەریعەت و ئایینی ئیسلام ئەڕوا.

وە لە شاری دیمەشقدا ئەگەن بە دەجال و حەزرەتی عیسا لە شام دەجال ئەکوژێ. بەم جۆرە فیتنەی دەجالیش ئەبڕێتەوە.

وە لە پاش ماوەیەک حەزرەتی محەمەدی مەهدی کۆچی دوایی ئەکات، هەروەها حەزرەتی عیسایسش بۆ یەکجاری جیهان بەجێ دێڵێ.

وە وەک زانایانی حەدیس فەرموویانە ئەم کارەساتانە ڕوو ئەدەن و لە دوای ئەمانەیش ئەم جیهانە هەر ئەمێنێ و موسوڵمانان حەج ئەکەن و دێنەوە، هەر کەسێ بەپێی خۆی دینی خۆی ڕائەگرێ و لەسەر زمانی گوم نابێ.

وە بۆ ئەم بابەتانە کتێبی تایبەتی زۆر نووسراون، ئەوەی مەبەستی لێکۆڵـینەوە بێ ئەتوانێ تەماشای ئەو کتێبانە بکات.

جا پاش باسی ئەم ئیمامە موبارەکانە بگەڕێینەوە بۆ سەر باسی مەبەستی خۆمان کە باسی بنەماڵەکانی زانیاری ئایینە و لەبەر ئەوە کە حەزرەتی ئیمام حەسەن براگەورە بووە لە پێشدا باسی نەتەوەی ئەو ئەکەین.

وە لەبەر ئەوە کە رشتەی بنەماڵەی «نهریە» لە نەتەوەی حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانین و ئەو زاتەیش لە نەتەوەی ئیمامی حەسەنە. هەروا رشتەی ساداتی «کاکۆ زەکەریایی» لە ئەولادی شێخ ئەبولحەسەنی شازلین و ئەویش لە نەتەوەی ئیمام حەسەنە، ئێمە باسی ئەم دوو رشتە ئەکەین.

بەڵام لەبەر ئەوە کە مێژووی هاتنی حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی پێش هاتنی شێخ ئەبولحەسەنی شازلی بووە باسی حەزرەتی عەبدولقادر و نەتەوەکەی پێش ئەخەین.

وە لەبەر ئەوە کە حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی یەکێکە لە مەردە گەورەکانی جیهانی ئیسلام لە پێشدا باسی ژیانی خۆی دەکەم و ئەم نامەیە بە ناوی ئەوەوە پیرۆز دەکەم.

## حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی

ئەم زاتە لە رشتەی باوکەوە ئەگات بە حەزرەتی ئیمام حەسەنی کوڕی حەزرەتی عەلی. بەم شێوە: عەبدولقادر کوڕی شێخ مووسا، کوڕی شێخ عەبدوڵلا، کوڕی شێخ یەحیا، کوڕی شێخ محەمەد، کوڕی شێخ داوود، کوڕی شێخ مووسا، کوڕی شێخ عەبدوڵلا، کوڕی شێخ مووسای ناسراو بە «موسی الجون» چونکە گەنمڕەنگ بووە، کوڕی شێخ «عبدالله المحض»، کوڕی ئیمام حەسەنی موثەننا، کوڕی ئیمام حەسەنی موجتەبا، کوڕی حەزرەتی عەلی، کوڕی ئەبووتالیب و لە فاتیمەی زەهرا.

جا بزانن کە شێخ مووسای باوکی حەزرەتی عەبدولقادر بە «جنگی دوست» ناوبانگی دەرکردووە، چونکە زۆر مەیلی لە غەزا کردن لە دژی کافرانی نزیکی دەریای خەزەر بووە. وە شێخ یەحیای باپیری بە شێخ یەحیا زاهید ناسراوە، لەبەر ئەوە کە وازی لە دنیا هێناوە و زۆر خەریکی بەندەیی کردن بووە. وە شێخ مووسای باپیرەگەورەی بە «جون» ناوبانگی دەرکردووە، چونکە جون لە زمانی عەرەبا بە مانای رەش‌ئەسمەر هاتووە و ئەو زاتە وەک وتمان ئەسمەر بووە. وە عەبدوڵلای باوکی شێخ مووسا بە «عبدالله المحض» ناسراوە، چونکە خالس بووە و تان و پۆی سەیید بووە. وە وەکوو لە رشتەی باوکیا لە نەتەوەی ئیمام حەسەن بووە لە رشتەی دایکیشیا هەر سەیید بووە، چونکە دایکی فاتیمەی کچی ئیمام حسەینی کوڕی حەزرەتی عەلی بووە. وە باوکی بە «الحسن المثنی» ناسراوە، چونکە باوکیشی ناوی حەسەن بووە.

وە حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی وەکوو لە رشتەی باوکیدا ئەگات بە ئیمام حەسەن لە رشتەی دایکیشیا ئەگات بە ئیمام حسەین. بەم شێوە: دایکی ناوی فاتیمە و لەقەبی «امة الجبّار» و کونیەی «ام الخیر»ە و کچی شێخ عەبدوڵلای سەومەعی زاهید، کوڕی شێخ محەمەد ئەبوجەمالەدین، کوڕی شێخ مەحموود، کوڕی شێخ

عەبدوڵڵا ئەبولعەتا، کوڕی شێخ عیسا کەمالـەدین، کـوڕی ئیمـام محەمـەدی جـەواد، کوڕی ئیمام عەلیڕەزا، کوڕی ئیمام مووسای کازمە.

هەروا رشتەی نەسەبی حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی ئەگات بە خەلیفەی یەکەم ئەبووبەکری سدیق «خ» لەبەر ئەوە کە دایکی شێخ مووسای جـەنگیدۆسـت نـاوی «امّ سلمە» کچی محەممەدی کوڕی تەلحەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕەحمان کوڕی ئەبووبەکری سدیقە.

هەروا رشتەی نەسەبی حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی ئەگات بە خەلیفـەی دوەم حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب و خەلیفـەی سـێهەمیش کـە حـەزرەتی عوسمـانی کوڕی عەففانە. وەکوو لە کتێبە ئەنسابە گەورەکاندا بە درێژی باس کراوە.

### لەدایک بوونی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر

روون و ئاشکرایە لای ئەوانەی مێژوو ئەزانن و ئاگاداری رووداوەکـانی جیهـانن کـە ئادەمیزاد بە هۆی گەلـێ ئەسـبابەوە وڵاتی خـۆی بـەجێ دێڵـێ و دووری و ئـاوارەیی ئەچەژێ خواه لەبەر پەیدا کردنی ژیوار و یا لەبەر هێرشی دوژمنی نابار یا لەبەر گەڕان و مانەوە لە وڵاتاندا، یا لەبەر هەوڵ و کۆشش بۆ فێربوونی زانیاری و یا لەبەر ئـەوە کـە فەرمانبەری حوکوومەتێکە و بە فەرمانی ئەو حوکوومەتـە ئـەچێ بـۆ وڵاتێکـی دوور و لەوێ دەمێنێتەوە.

لەسەر هەندێ لەم ئەسبابانە گەلـێ لە سەیدەکان لە خاکی حیجـاز دەرچـوون بـۆ وڵاتانی دوور و لە ئاوارەییـدا ژیـان و لـە ریـزی ئەوانـە دەرچـوونی بـاوک و بـاپیرانی حەزرەتی عەبدولقادر لە مەدینەوە بۆ عێراق و لە عێراقەوە بۆ وڵاتی ئێران و لە ئێرانا لە ناوچەی رەشت و گێلاندا بە ئارەزووی خۆیان دامەزراون و باوکی حەزرەتی عەبدولقادر کە شێخ مووسای جەنگیدۆست بووە لـە شـارۆچکەی (نیـق)دا کـە سـەر بـە گێلانـە نیشتەجێ بووە، جا حەزرەتی عەبدولقادر لە ٢٠ی مانگی (ربیـع الثـانی) ساڵـی ٤٧٠ی کۆچیدا لەدایک بووە و بە هاتنی خۆی وڵاتی رووناک کردووەتەوە.

ئەم زاتە هەر لە منداڵییەوە گەلـێ شوێنەواری جوانی لـێ پەیدا بووە. دەگێڕنـەوە دایکـی وتوویـەتی: عەبـدولقادر لـە مـانگی رەمەزانـدا مـەمکی نـەگرتووە و شـیری نەخواردووە، هەتا بە هۆی ئەوەوە خەڵکی زانیویانە کە مانگی رەمەزان هاتووە.

ئەم زاتە لە پاش ئەوە کە لە وڵاتی خۆیاندا بە یاسای خۆیان قورئانی پیرۆز و کتێبە وردەکانی خوێندووە و هەندێ فامی کردووەتە و تەوانای سەفەر و هاتوچۆی پەیدا کردووە، لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا لە وڵاتی گێلانەوە بە هیوای خوێندنەوە روو ئەکاتە وڵاتی عێراق و بەرەو شاری بەغدا ئەڕوا کە لەو رۆژەدا جێگا و کانگای زانیاری و پیرۆزی بووە.

ئەگێڕنەوە: کە دێ بۆ سەفەر دایکی ئامۆژگاری ئەکا بە چاودێری دین و خۆپاراستن و دوور بوون لە مرۆڤی بەدڕەوشت و پاریز لە درۆ کردن. کە دێ بەڕێدا لە نزیکی شاری «هەمەدان»دا جەردە ریگەیان پێ ئەگرن و ئەو کاروانە ئەوی تێدایە رووتی ئەکەنەوە! یەکێ لە جەردەکان دێ بۆ لای شێخ عەبدولقادر و پرسیاری لێ ئەکا: تۆ چیت و چیت پێیە؟ ئەڵێ سەفەریم و بۆ خوێندن ئەڕۆم و ئەندازەی بیست ئاڵتوونم پێیە. ئەویش ئەڵێ: نیشانم بدە بزانم راستە. کە نیشانی ئەدا ئەڵێ: کێ ئەزانێ تۆ ئەم پارەت پێیە و بۆچی قسەت کرد؟ فەرمووی: دایکم ئامۆژگاری کردووم کە درۆ نەکەم! ئەگێڕنەوە ئەو کۆمەڵە چەتە گەلێ لەم کار و وتارە شەرمەسار بوون و تەوبەیان لەو کار و کردارە پەستەیان کرد و ماڵی کاروانییەکانیان دایەوە.

ئەگێڕنەوە: شێخ عەبدولقادر کاتێ بەرەو بەغدا بە کوردستانا تێپەڕیوە بە خەتی هەورامان و شارەزووردا هاتووە و لە دێی (نەرگسەجاڕ) لای داوە و لە ماڵی شێخ مستەفا ناوی نەرگسەجاڕی میوان بووە و چەن رۆژێ لەو دێدا ماوەتەوە. وەکوو خەبەری (متواتر) باسی ئەوە هەیە کە لە سێبەری دارپەڵکێک کە لەو رۆژەدا لە باخی شێخێک لەو شێخانەدا بووە دانیشتووە و خەریکی قورئانخوێندن و بەندەییکردن بۆ خودا بووە. وە لەسەر بەردێکی پانی گەورە کە لەسەر حەوز و ئاوی مزگەوت و لە حەوشی مزگەوتدا بووە دانیشتووە و گەلێ جار نوێژی کردووە.

وە من خۆم ئەو بەردە گەورەم دیوە و نوێژم لەسەر کردووە و لە سێبەری ئەو دارپەڵکەدا دانیشتووم. وە لە خاوەنی ئەو باخە کە ناوی شێخ قادر بوو بیستم فەرمووی: حەزرەتی غەوسی گەیلانی لەم باخەدا لە سێبەری ئەم پەڵکەدا دانیشتووە.

وا باوە داری پەڵک زۆر ئەمێنێتەوە. جا یا هەر ئەو دارپەڵکە پێشووە بووە یا لەسەر ریشە و لقەوردەی ئەو گەورە بووە و ماوەتەوە.

وە وا باوە کە «شیخ محمد تاج العارفین ابوالوفای نەرجسی» دۆستی حەزرەتی شێخ و برادەری بووە و بەهۆی ئەو دۆستایەتی و برادەرییەوە ئەم باسانە بڵاو بوونەتەوە.

**گەیشتنی حەزرەتی غەوس بە بەغدا**

کاتێ کە حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی گەیشتە شاری بەغدا و چاوی کرایەوە لە مزگەوت و خوێندنگاکانیدا دەستی بە خوێندن کرد و بەر لە هەموو شتێ بە قورئانی پیرۆزەوە بە خوێندن و لەبەر کردنیەوە و خەریک بوو، دوای ئەوە بە یاسای ئەو ڕۆژە دەستی بە خوێندنی زانیارییە جۆراوجۆرەکان کرد.

زانیارییەکانی نەحو و سەرف و ئەدەبی لە خزمەت ئەبوزەکەریا یەحیای کوڕی عەلی تەبریزیدا خوێند و زانیاریی حەدیسی پیرۆزی لە گەلێ لە مامۆستایانی حەدیس وەک: (محەمەد ئەبولغەنائیم) کوڕی حسەین کوڕی ئەحمەد کوڕی حسەینی باقلانی و (ئەبولغەنائیم) محەمەدی کوڕی محەمەد کوڕی عەلی قورەیشی و ئەبولبەرەکات تەلحەی عاقوولی و... وەرگرت. وە زانیاریی فیقهی لە خزمەتی (ئەبولوەفا) عەلی کوڕی عەقیلی حەنەفی و (ئەبولخەتاب) مەحفووزی کوڕی ئەحمەدی گۆرانی حەنبەلیدا خوێند.

وە باقی زانیارییەکانی فورووع و ئوسوول و مەعقوولات و مەنقوولات و مەزهەب و عیلمی خیلافی لە خزمەت ئەبووسەعیدی کوڕی موبارەکی کوڕی عەلی حەنبەلیدا وەرگرت و زانیاریی تەسەووفی لە خزمەت «قدوة المحققین ابوالخیر» حەمادی کوڕی موسلیمی دەباسدا خوێند. وە تەریقەتی لە شێخ ئەبووسەعیدی کوڕی موبارەک وەرگرت و جبەی لەو وەرگرت. ئەویش جبەی ئیرشاد و تەسەوفی لە شێخ ئەبولحەسەن عەلی کوڕی محەمەدی قورەیشی هەکاری وەرگرتبوو، ئەویش لە شێخ ئەبوفەرەجی تەرسووسی وەرگرتبوو، ئەویش لە ئەبولفەزل عەبدولواحیدی تەمیمی وەرگرتبوو، ئەویش لە شێخ ئەبووبەکری شبلی، ئەویش لە «سید الطائفتین» شێخ جونەیدی بەغدایی، ئەویش لە خاڵۆی خۆی شێخ سەریی سەقەتی، ئەویش لە شێخ مەعرووفی کەرخی، ئەویش لە داوودی تائی، ئەویش لە حەبیبی عەجەمی، ئەویش لە

شێخ حەسەنی بەسەری، ئەویش لە حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبووتالیب، ئەویش لە حەزرەتی فەخری عالەم «دروودی خودای لەسەر بێ».

جا حەزرەتی شێخ ئەبووسەعیدی مەخزوومی نەخۆش کەوت و وەسیەتی کرد کە ئەو خوێندنگایە کە وا لە دەرەوەی شووورای بەغداوە و لای مەحەللەی «باب الازج» دایە– کە لە بارەگای ئێستەی شێخ عەبدولقادرە– بدرێ بە شێخ عەبدولقاری گەیلانی. دوای ئەوە ئەبووسەعید کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەوبەری رەسافەوە بەخاک سپێررا.

وە خوێندنگاکەی درا بە شێخ عەبدولقادر، ئەویش دانیشت و دەستی کرد بە وتنەوەی دەرسی فیقهـ و حەدیس و زانیاریەکانی دین و رێنومایی موسوڵمانان.

### یاسای دەرزوتنەوە و رێنومایی

شێخ عەبدولقادر رێنومایی کردنی موسوڵمانانی لەسەر فەرمانی کیتاب و سوننەت و ئیجماعی زانایانی ئوممەت دامەزراند و بەم شێوەیە لەسەری رۆیشت:

یەکەم: ئەیفەرموو: پێویستە لەسەر بەندەی خودا کە باوەڕی ببێ کە خودا تاق و تەنیایە و پەنایە بۆ هەموو کەس لە هەموو کارێکدا. لە کەس نەبووە و کەسی لێ نابێ و کەس وێنەی نییە و ئەوە پەروەردگاری عالەم بە هەموو ئاسمان و ئەستێرە و زەوی و دەریا و... بە هەموو شتێکەوە و لە هیچ کار و کردارێکدا هاوڕێ و هاوبەشی نییە.

دووهەم: پێویستە لەسەر هەموو کەسێ باوەڕی وابێ کە قورئان وتاری خودایە و ئەو ناردوویەتی بۆ حەزرەتی محەممەد بە جوبرەئیلدا و باوەڕی ببێ بە باقی ئەو کتێبانە کە خودا ناردوونی بۆ پێغەمبەرەکان، باوەڕی وابێ کە هەموو پێغەمبەرەکان خودا هەڵیبژاردوون و ناردوونی بۆ رێنومایی خەڵک و ئەو پێغەمبەرانە دوورن و پاکن لە تاوان و راستن و ئەمینن و لە گەیاندنی پەیامی خودادا درێغی یان نەکردووە. وە باوەڕی وابێ کە رۆژی قیامەت دێتە پێشەوە، بەم شێوە ئەم دنیا نامێنێ و دنیایەکی تر دێتە پێشەوە و هەرچی مردوون لە کافر و موسوڵمان خودا زیندوویان ئەکاتەوە و پرسیاری کردار و رەفتاریان لێ ئەکا. ئەوسا کافرەکان لە دۆزەخدا سزا ئەدرێن و ئەوەی موسوڵمانی بێتاوانە ئەڕواتە بەهەشت و ئەوەی باوەڕی هەیە و تاوانبارە بە ئەندازەی تاوانەکەی سزا ئەدرێت، وە خودا ئەیبەخشێ و لە ئەنجامدا ئەڕواتە

بەهەشت. وە باوەڕی وابێ ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ هەر یەکە و لە جێگەی خۆیدا ئەمێننەوە هەتا هەتایە.

وە باوەڕی وابێ کە خودا دروستکەری هەموو شتێکە لەم دنیادا گەورە یا بچووک، بە بێ ئیرادە و خواستی خودا هیچ نەبووە و نابێ.

پێویستە ئادەمیزادی موسوڵمان کاتێ گوناهێکی کرد لەو گوناهە پەشیمان ببێتەوە و حەقی هەرکەسی بەسەرەوە بێ بیداتەوە یا گەردنی خۆی پێ ئازاد بکا.

وە هەرگیز درۆ نەکا و هەر بەڵێنێکی بە هەر کەسێدا بە گوێرەی دەستەڵات و تەوانا جێبەجێی بکات.

وە کەس لەوانە کە بە ڕواڵەت موسوڵمانن و ڕوویان لە قیبلەیە بە کافر دانەنێ، کاتێ نەبێ کە باوەڕێکی پێچەوانەی یاسای ئیسلامی لێ دەربکەوێ، یا تا کاتێ کردارێ یا وتارێکی وای لێ دەردەکەوێ.

باوەڕی وەهابێ هەرکەسێ باوەڕێ یا کردەوەیەکی پێچەوانەی ئیسلامییەتی هەبێ، وەکوو ئەوە: واجبێ تەرک بکا یا کردەوەیەکی حەرام بکا؛ ئەوە یاخی و تاوانبارە. وە پێویستە لەسەر ئادەمیزاد کە نە بە ئاشکرا و نە بە دڵ بیر لە کردەوەی پێچەوانەی یاسای ئیسلام نەکاتەوە. وە ئەگەر شتێکی وای کرد ئەوە بە ڕاستی تاوانبارە و پێویستە تۆبەی لێ بکا.

ئەبێ باوەڕی وابێ کە ئیمان بریتی‌یە لە نوتق بە دوو کەلیمەی شایەتی بە زمان و باوەڕیشی پێی ببێ بە دڵ بە مەعنای «أشهَدُ انْ لا إلهَ الاّ الله وَ أشهَدُ أنَّ محمداً رسول الله». وە باوەڕکردن بە دڵا بە هەرچی کە حەزرەتی محەمەد«س» لە لایەنی خوداوە هێناویەتی و ڕەفتاریش بکا بەو ئادابە کە لە ئایینی ئیسلامدا بڕیار دراوە و باوەڕی ببێ کە ئیمان کەم و زیاد ئەکا.

پێویستە کە ئادەمیزادی موسوڵمان تەماعی خۆی لە غەیری خودا ببڕێ، بەم مەعنا کە دروستکەر و فاعیل بۆ هەموو شتێ خودایە، ئەسبابی عادەتی نەبێ کەس پەیوەندی بەم جیهانەوە نییە.

لەسەر ئەم ئەساسە تەوەکول بکا بە خودای خۆی. پێویستە ئادەمیزادی موسوڵمان ملکەچ بێ، واتە فیز نەکا و خۆی لە خەڵک بە باشتر نەزانێ و ئەوەی کە بۆی بکرێ لە خزمەتی موسوڵمانان لەبەر ڕەزای خودا بیکا.

جا لەسەر ئەم یاسایە شێخ عەبدولقادر دەستی کرد بە دەرس‌وتنەوە و ئامۆژگـاری و ڕێنومایی قوتابیانی ڕێگەی دین بە پاک‌کردنەوەی نەفس لە خوو و ڕەوشتی پەسـت و دوور کەوتنەوە لە بیر و باوەڕی نابار و پارێز کردن لە کردەوەی پێچەوانە بۆ شەریعەت بە جۆرێ کە لە ماوەیەکی کەمدا عالەمێکی بە نووری ئیسلام ڕووناک کردەوە.

لەسەر ئەوە کە ئیبراهیم «دروبی» لە کتێبی «الباز الاشهب»دا نووسـیویە: حـەزرەتی ئەبووسـەعیدی مـەخزوومی لـە سالـی ٥١٣ی کۆچیـدا لـە جیهـان دەرچـووە و لـەو مێژووەوە حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لەسەر ئەو خوێندنگای ئەبووسـەعیدە لەسەر ئامۆژگاری ئەبووسەعید دانیشت و دەستی کرد بە ڕێنومایی و دەرس‌وتنەوە بـە قوتابیان. وە شێخ عەبدولقادر لەو مێژووەدا تەمەنی ٤٣ ساڵ بووە هەتا کاتی لە جیهان دەرچوونی کە ساڵی ٥٦١ بووە— واتە ٤٨ ساڵ- لەو خوێندنگادا دەرسـی وتووەتـەوە و ڕێنومایی موسوڵمانانی کردووە. شێخ عەبدولقادر نەوەد و یەک ساڵ ژیاوە. ئـەم تاکـە شیعرە بۆ ئەم مەبەستە گوتراوە:

إنّ باز الله سلطان الرجال          جاه فی العشق توفی فی الکمال

کە پیتەکانی «عشق» ٤٧٠ و «کمال» ٩١ دەردێنن و تێکڕاکەی ٥٦١ه.

وە لە پاش کۆچی دوایی شـێخ منداڵـەکانی لـە شـوێنەکەیدا دەرسـیان ئەگوتـەوە وەکوو لەمەولا باسیان ئەکەین.

شێخ عەبدولقادر چەند کتێبێکی بەنرخی داناوە، وەک:

١- غنیة الطالبین. ساڵی ١٢٨٨ی ک لە میسر چاپ کراوە.

٢- الفتح الربّانی. ساڵی ١٢٨١ لە بۆلاقی میسر چاپ کراوە.

٣- فتوح الغیب. لە میسر چاپ کراوە.

٤- حزب بشائر الخیرات. لە «اسکندریە»ی میسر چاپ کراوە.

٥- المواهب الرحمانیة، والفتوحات الربّانیه.

٦- یواقیت الحکم. حاجی خەلیفە لە «کشف الظنون»دا باسی کردووە.

٧- جلاء الخاطر من کلام الشیخ عبدالقادر. ئەمەیش هەر حاجی خەلیفە لە «کشـف الظنون»دا باسی کردووە.

٨- سرّ الأسرار. لە تەسەووفدا، نوسخەی دەسخەتی لـە کتێبخانـەی قادرییـەدا لـە بەغدا هەیە.

٩- رد الرافضة. دەسخەتە و نوسخەی لە قادرییەدا هەیە.

١٠- تفسير القرآن الكريم. دوو بەرگی دەسخەتە، لە کتێبخانەی شێخ رەشید «کرامە» لە تەرابلسی شامدا نوسخەی هەیە. بەڵام لە «دائرة المعارف»ی بەریتانیدا هەیە کە ئەو تەفسیرە شەش جڵدە و لە کتێبخانەی تەرابلسی لیبیادا هەیە.

وە گەلێ کتێبیش لە ژیان و بەسەرهات و کەراماتی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر دانراوە لەوانە:

١- اسنى المفاخر، دانراوی شێخی یافیعی، کە لە ٧٦٨ی ک.دا لە جیهان دەرچووە.

٢- مناقب الشيخ عبدالقادر، دانراوی شێخ قوتبەدین مووسای کوڕی محەمەدی بونینی حەنەفی کە لە ٧٧٦ی ک.دا کۆچی دوایی کردووە.

٣- تحفة الأكابر بمناقب الشيخ عبدالقادر. دانراوی شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی یوسفی مەغریبی. کۆچ کردووی ساڵی ١٠٩٦ی.ک.

٤- السيف الربّاني، دانراوی «ابن عزوز» چاپی بۆمبای ساڵی ١٣١٣ ک.

٥- قلائد الجواهر، دانراوی تادفی چاپی «دارالكتب العربيّة»ی میسر ١٣٣١ ک.

٦- الفتح المبين، دانراوی عەبدوڕەحمانی نەقیب چاپی میسر ساڵی ١٣٠٦.

گەلێ کتێبی دیکەیش جگە لەمانە دەربارەی دانراوە.

### خوێندنگا و کتێبخانەی حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی

ئیبراهیم دروبی لە کتێبی «الباز الاشهب»دا نووسیویە: قازی ئەبووسەعیدی مەخزوومی کە کاتی خۆی قازی شاری بەغدا بووە خوێندنگایەکی بەرز و باڵای لە گەڕەکی «باب الازج» لە خۆرهەڵاتی بەغدادا دروست کرد و گەلێ قوتابی زانیاری ئایینی دەرسیان تێدا خوێندووە و خوێندنیان تێدا تەواو کردووە.

وە حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا چووەتە ئەو خوێندنگا و زانیاری‌یەکانی عەقلی و نەقلی تێدا تەواو کردووە و لەسەر دەستی شێخ ئەبووسەعیدا دەرچووە.

وە شێخ ئەبووسەعید لە پێش کۆچی دوایی خۆیدا لە ساڵی ٥١٣دا ئەو خوێندنگایەی سپاردووە بە شێخ عەبدولقادر و ئەویش خەریکی خزمەتی زانیاری و

دەرس‌وتنەوە بووە بە جۆرێ کە وێنەی لە بەغدادا کەم بووە و گەلێ لە زانایانی ئیسلام لەسەر دەستی ئەودا خوێندنیان تەواو کردووە.

وە لەبەر ئەوە قەرەباڵغی زۆر بوو بە ناچاری تەکیەیەکی دروست کرد لە تەنیشت شوورای شاری بەغداوە لە «باب الازج»دا و هەروا لە ساڵی ٥٢١دا خوێندنگاکەیشی گەورە کرد بە جۆرێ کە بەشی قوتابییەکانی بکا. وە خودا دەستی دایێ وەکوو دەرسی ئەوتەوە و ڕێنومایی موسوڵمانانی ئەکرد وەهایش جێگەی نان‌خواردن و نان‌دانی دامەزراند و ئەو نان‌دانە تا ئێستە کە نزیکی نۆسەد ساڵ ئەکا نەبڕاوەتەوە.

وە ئەم زاتە خاوەن بەرەکاتە بە جۆرێ لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامەوە قوتابی و مورید و مەنسووب و پەیڕەوانی ڕوویان تێکرد و هاتن بۆ سوودوەرگرتن لە خزمەتیا عالەم لەو جۆرە تەوفیق و یارمەتی خوداییʼیە سەراسیمە و سەرسام بوو. وە کاتێ کە بیستی هەندێ لە هاوچەرخانی خۆی فەرموویوویان: عەبدولقادری گەیلانی بە ئەندازەی ئێمە کەسب و سولووکی نەبوو چلۆن ئاوا بەرەکاتی بەسەردا ڕژا و خەڵکی لێ گرد بووەوە؟ فەرمووی: «الأقران زادت مكاسِبهم علي، ؤ انا زادَت مواهب الله تعالى لنا عليهم» یانێ: ئەگەر چی کەسبم کەم بوو بەڵام بەخششی خودام زۆر بوو.

بە کورتی تەنها بە کەرەم و بەخششی خودا و بە هۆی دڵسۆزی خۆیەوە لە ماوەی ژیانی خۆیدا جیهانی ئیسلامی داگرت و پەیڕەوانی ڕێگەی زۆر بوون لە وڵاتی هیند و پاکستان و ئەفغان و تورکستان و «ماوراء النهر» و تورکیا و کوردستان و عێراق و حیجاز و سووریا و فەلەستین و میسر و سوودان و لیبیا و وڵاتی مەغریب و نەیجیریا لە ئەفەریقا و جاوە و ئەندەنووسیا و چین لە خۆرهەڵاتدا بە جۆرێ هەر وڵاتێ لە وڵاتانی ئیسلام ئەندازێکی زۆر مورید و پەیڕەوی حەزرەتی شێخ عەبدولقادری تێدا بوو.

وە هەموو پەیڕەوان و موریدانی بە ئیستیقامەت لەسەر کیتاب و سوننەت و ئیجماعی موسوڵمانان و ئەمر بە مەعرووف و نەهی لە مونکەر ڕەفتاریان ئەکرد. وە لە واقعیدا «مَنْ كانَ لله فَقد كانَ الله لَه».

وە پاش ئەمە بناغەی مەکتەبەی دانا و خەزانەی بۆ کتێبی ئایینی دروست کرد بە جۆرێ کە شیاو و موناسب بێ بە پلە و شوێنی و بە ڕەغمی زورووفی جیاجیا ئەو مەکتەبە تا ئێستە ماوەتەوە و ئێستە نزیکەی شەست‌هەزار بەرگ کتێبی تێدایە و

لەلایەن موتەوەلی ئەوقافی قادری‌یە سەیید یوسف و سەیید ئەحمەد موزەفەری گەیلانی‌یەوە سەرپەرشتی دەکرێ.

وە ئەم خوێندنگا و بارەگا و کتێبخانە لە چەرخەکانی رابوردوودا گەلێ بەلا و نەگبەتی بەسەردا هاتووە:

یەکەم: لە مێژووی شەشسەد و پەنجا و شەشی کۆچیدا بە هۆی هێرشی سوپای تاتارەوە کە بەغدا بە کوشتار و وێران‌کردن گیرۆدە بوو ئەو کتێبخانە و مزگەوت و تەکیە بە تالان رۆیشت و گەلێ لە ئەحفاد و نەتەوەی شێخ عەبدولقادر شەهید کران لە پێناوی جیهاد و بەرگری‌کردن لە دوژمن و تێکۆشان بۆ مانەوەی پایتەختی خەلیفەی عەبباسی «المستعصم بالله» کە بە دەستی تاتار شەهید کرا و لەناو چوو.

وە پاش ئەو رووداوەیش دەست کرایەوە بە ئاوەدان‌کردنەوەی ئەو مزگەوت و خوێندنگا و تەکیە، هەتا لە مێژووی ٩١٤ی کۆچیدا بە دەستی سوپای قزل‌باشی ئیسماعیلی سەفەوی خوێن‌رێژەوە دووبارە ئەو بارەگایە تالان کرا و وێران کرایەوە و جۆرەها زیان و بەلای بەسەردا هات تا ساڵی ٩٤١ی کۆچی بە یارمەتی خودا سوڵتان سولەیمانی قانوونی عوسمانی شاری بەغدای گرتەوە و لە چنگی سەفەوی‌یەکانی دەرهێنایەوە و مزگەوت و خوێندنگا و بارەگاکە ئاوەدان کرانەوە و سوڵتان سولەیمان فەرمانی‌دا گومەزێکی گەورەیان بەسەر مەرقەدی شێخەوە دروست کرد و ئیش و کاری شوێنەکە چووەوە دۆخی جاران. ئەم وەزعە لە دەوری شێخ زەینەدینی گەورەی گەیلانی‌دا بوو، کە لە ساڵی ٩٨١ی کۆچی‌دا لە جیهان دەرچووە.

وە زۆری پێ نەچوو بۆ جاری سێهەم بەغدا بە دەستی سوپای شاە عەباسی سەفەوی داگیرکرایەوە و وێران کرایەوە و سێ بارە کتێبخانە و مزگەوت و بارەگایش بەشی خۆی لەم وێرانکاری‌یەدا هەبوو، هەروەها مزگەوت و بارەگای ئەبووحەنیفەیش لە جاران خراپتر دەستی وێرانکاری پێ‌گەیشت.

هەتا بە میهرەبانی خودا لە مێژووی ١٠٤٨ی کۆچیدا سوپای سوڵتان مورادی چوارەمی عوسمانی کوڕی سوڵتان ئەحمەدخان بەغدای لە دەستی سوپای عەجەم وەرگرتەوە و سوڵتان سەرلەنوێ ئەو کتێبخانە و خوێندنگا و بارەگا و مزگەوتەی تازە کردەوە.

بۆ جاری چوارەم لە چەرخی ویلایەتی داوود پاشا لە ساڵی ١٢٤٦ی کۆچیدا شاری بەغدا کەوتە بەر هێرشی لافاوی دیجلە و وێران بوو و کتێبخانە و مزگەوتی شێخ عەبدولقادریش جارێکیتر گیرۆدەی زیان بوونەوە. بەڵام لە پەنای خوداوە و بەهۆی زیرەکی و لێهاتوویی زانای بەرز سەیید عەبدورەحمانی نەقیبەوە زوو چاک کرایەوە و ئاوەدان کرایەوە. وە لە ماڵی خۆی حەوسەد و پەنجا کتێبیدا بە یارمەتی کتێبخانەکە. هەروا لە ماڵی خۆی و ماڵی مەنسووبان ئەو کتێبخانە تەعمیر کرایەوە و کتێبەکانی گەیشت بە سێ هەزار بەرگ و لە لایەنی باقی گەورە و زانایانەوە یارمەتی درا.

وە ئێستە بە هەوڵ و کۆششی موتەوەلی سەیید یوسف عەبدوللا- وەک وتمان- ژمارەی کتێبەکانی نزیکی ٦٠هەزار بەرگە. هەروەها کتێبخانەی خاتوعاتیکەی گەیلانی کچی سەیید عەلی گەورە، لە نەتەوەی شێخ عەبدورەزاقی کوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر خرایە سەر کتێبخانەی قادرییە. هەروا کتێبی گەلێ لە زانایانی گەورەی بەغدای خراوەتە ناو.

### ئەوانەی لەو خوێندنگادا دەرسیان گوتووەتەوە

لەمەوبەر زانیمان کە ئەو خوێندنگا تایبەتی خوالێخۆشبوو ئەبووسەعیدی مەخزوومی بووە و لەپاش کۆچی دوایی ئەو شێخ عەبدولقادری گەیلانی دەرسی تێدا گوتووەتەوە و دوای کۆچی دوایی شێخ عەبدولقادریش کوڕەکانی و دوای ئەوانیش نەوەکانیان بەرودوا دەرسیان تێدا گوتووەتەوە. ئیتر پاش چەرخی نەوە و نەوەزاکانی ئەوەی کە دیار بێ وەکوو ئیبراهیم دروبی لە کتێبی «الباز الاشهب»دا نووسیویەتی ئەوەیە کە: زانای بەناوبانگی چەرخی خۆی شێخ عەبدوللا سوێدی کە لە زادەکانی ساڵی ١١٠٤ی کۆچی بووە و لە ساڵی ١١٧٠ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە. ئەم زانایە پاش ئەوە کە مونازەرەی کرد لەگەڵ زانایانی بارەگای نادرشای عەجەمدا لە ساڵی ١١٥٠دا و بۆڕی دان لە ئاستانەوە دەعوەت کرا و چووە لای سوڵتان و لەوێ کرا بە مامۆستا لە خوێندنگای شێخ عەبدولقادردا.

وە پاش عەبدوللای سوێدی شێخ عەلی عەلادینی موسلی کە لە ساڵی ١١٧٠ی کۆچیدا لەدایک بووە و لە ١٢٤٠دا لە جیهان دەرچووە و کاتی خۆی مامۆستای

خوێنـدنگای سـەییدە عاتیکـەی گـەیلانی بـووە و دوای ئـەوە بـووە بـە مامۆسـتای خوێندنگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی.

هەروەها شێخ حسەین کـە لـە ١١٩٠دا لـەدایک بـووە و لـە ١٢٤٦ی کۆچیـدا بـە تاعوون لە جیهان دەرچووە مامۆستای ئەم خوێندنگا بووە.

پاش ئەو سەیید ئیبراهیمی بەرزنجی کە لە ساڵی ١٢٦٣دا کۆچی دوایی کردووە.

دوای ئەویش عەبدولفەتاحی واعیز، کە لە ساڵی ١٢٤٦دا کۆچی دوایی کردووە.

دوای ئەویش ابوالثناء شەهابەدینی ئالووسـی مـوفتی بەغـدا و خـاوەنی تەفسـیری قورئانی پیرۆز لەم خوێندنگادا مامۆستا بووە.

دوای ئەویش سەیید محەمەد ئەمینی واعیز کە بـە یوسـفی دوەم بـەناوبانگ بـووە تیادا مامۆستا بووە.

پاش ئەو سەیید عەبدولفەتاحی مـودەڕیس کـوڕی سـەیید عەبدولحەمیـد کـە لـە ١٢٩٥ی کۆچیدا مامۆستا بووە.

دوای ئەویش شێخ عەبدوللەتیفی راویی، کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ حسـەین کە لە ساڵی ١٢٩٢دا لە جیهان دەرچووە.

پاش ئەو شێخ عەبدولحەقی هیندیی کە لە ساڵی ١٢٧٩ی کۆچیـدا کـۆچی دوایـی کردووە.

دوای ئەویش شێخ عەبدوسەلامی شەوواف کە ساڵی ١٣١٨ کۆچی دوایـی کـردووە لەو خوێندنگادا مامۆستا بووە.

دوای ئەمیش شێخ یوسفی عەتای موفتی بەغدا کوڕی سەیید محەمەد نەجیب کـە لە ساڵی ١٣٧١ی کـۆچیدا کـۆچی دوایـی کـردووە ئـەو زاتـە ساڵـی ١٣١٠بـووە بـە مامۆستای خوێندنگای حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و لـە مزگـەوتی هـەمان جێگەیشدا ساڵی ١٣٣٦ بووە بە خەتیب.

پاش ئەویش شێخ عەبدولمەلیکی شەوواف کراوە بە مامۆسـتای ئـەم خوێنـدنگا لـە ساڵی ١٣١٩دا.

دوای ئەویش شێخ قاسمی قەیسی موفتی بەغدا کراوە بە مامۆستا و خوتبـەخوێنی مزگەوتی گەیلانی.

منیش ئەڵێم: پاش ئەو شێخ محەمەدی قزلجی بووە بە مامۆستای ئەم خوێندنگا و لە مێژووی ١٣٨٠ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

وە پێش کۆچی دوایی ئەو شێخ کەمالەدینی تائی بوو بە مامۆستا. وە لە سەردەمی دەرس‌وتنەوەی ئەودا من خۆم لە ساڵی ١٣٨٠ی کۆچیدا لەبەر ئەوە کە شوێنی دەرس‌وتنەوەی شێخ محەمەدی قزلجی چۆڵ بوو و ئەو جێگە خرایە موسابەقەوە ئیمتیحانم‌دا و دەرچووم و کرام بە مامۆستا لەم شوێنەدا لەسەر میلاکی شوێنی دەرس‌وتنەوەی خوێندنگای سەییدە عاتیکەی گەیلانی کە گوێزرابووەوە مزگەوتی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر.

وە لە سەردەمی دەرس‌وتنەوەی مندا خوالێخۆش‌بوو شێخ عەبدولقادری خەتیبی مزگەوتی ئەعزەمی‌یە کرا بە مامۆستا، پاش کۆچی دوایی ئەویش شێخ عەبدوڵلا سۆفی لە جێگەکەیدا دانرا.

بۆ ئاگاداری بزانن! لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا دوو شوێن بۆ دەرس‌وتنەوە هەیە و شوێنی دەرس‌وتنەوەی خوێندنگای سەییدە عاتیکەی گەیلانیش گوێزراوەتەوە بۆ میلاکی شێخ عەبدولقادری گەیلانی کە واتە سێ شوێنی دەرس‌وتنەوە لەم خوێندنگادا هەیە.

وە لەبەر ئەوەی چەند شوێنی دەرس‌وتنەوە هەیە لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادردا مانیع نییە لەوەدا کە لە رابوردوودا یا لە داهاتوودا چەن مامۆستا بە یەکەوە لەناو خوێندنگای شێخ عەبدولقادردا بە یەکەوە دەرس بڵێنەوە.

تکام هەیە لە خودا کە تەوفیقی ئێمەش بدا بۆ خزمەتی عیلم و دین.

### باسی نەوەکانی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر

لە «فەتحالمبین»دا لە «ابن النجار»ەوە دەگێڕێتەوە و ئەڵێ: لە شێخ عەبدوڕەزاقم بیست فەرمووی: باوکم ٤٩ نەوەی نێر و مێی بووە، ٢٧ لەوان نێرینە بووە و ١١ کەس لەوان ناسراو و ناودارن:

یەکەم: عەبدوڵلا، ئەم زاتە لە خزمەتی باوکی و «ابن البنا»دا خوێندوویە و لە ساڵی ٥٠٨ی کۆچیدا لەدایک بووە و لە مانگی سەفەردا لە ساڵی ٥٨٩دا کۆچی دوایی کردووە.

دووهەم: عەبدوڕەزاق کە لە ٥٢٨ی کۆچیدا لەدایک بووە و لە خزمەتی باوکیا خوێندوویەتی و لەلای «ابوالحسنی ابن صرما» و غەیری ئەوانیش خوێندوویەتی و حەدیسی لێ ریوایەت کراوە و دەرسی گوتووەتەوە و ئیجازەی داوە و لە شەوی شەممەی ٦ی شەوالی ٦٠٣ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە و لە «باب الحرب» لە بەری کەرخدا بەخاک سپێرراوە و ٧٥ ساڵ تەمەنی بووە.

سێهەم: عەبدولعەزیز لە ٢٧ی شەوالی ساڵی ٥٣٢ی کۆچیدا لەدایک بووە و لە خزمەتی باوکیدا خوێندوویەتی و لەلای ئەبومەنسوور عەبدوڕەحمانی کوڕی محەممەدی قەزاز و غەیری ئەو خوێندنی تەواو کردووە و دوایی دەرسی گوتووەتەوە و گەلێ کەس لەسەر دەستی ئەودا خوێندنیان تەواو کردووە و پیاوێکی بەڕێز و دیمەن جوان بووە، زۆر خۆش‌خوو بووە و لە دەوروبەری ساڵی ٥٨٠ی کۆچیدا چووە بۆ جیهاد و لەگەڵ کافرە سەلیبی‌یەکاندا جەنگی کردووە و عەسقەلانی گرتووەتەوە، زیارەتی «بیت المقدس»ی کردووە، جا گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی عێراق و لە شاری عەقرەدا نیشتەجێ بووە هەتا لە رۆژی چوارشەممەی هەژدەی رەبیعولئەوەڵا لە ساڵی ٦٠٢ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە نزیکی عەقرەدا بەخاک سپێرراوە و لە وڵاتی کوێستانا نەوەی زۆر هەیە و تەمەنی حەفتا ساڵ بووە.

چوارەم: عیسا لە ٥٣٩ی کۆچیدا لەدایک بووە و لە خزمەتی باوکیدا خوێندوویەتی و لەلای «ابوالحسنی ابن صرما» و غەیری ئەوانیش خوێندوویەتی و دەرسی بە خەڵک گرتووە و وەعزی کردووە و فەتوای داوە و چەند کتێبی داناوە، وەکوو: جواهر الأسرار و لطائف الأنوار لە عیلمی تەسەووفدا.

پاش کۆچی دوایی باوکی رۆیشت بۆ شام و گوێی گرت بۆ حەدیس لە زانایانی ئەو عیلمە، بە تایبەتی لە عەلی کوڕی مەهدی کوڕی فەرەجی هیلالی لە ساڵی ٥٦٢دا و لەوێ حەدیسی ریوایەت کردووە لە باوکییەوە بۆ قوتابیان.

دوای ئەوە لە شامەوە چووە بۆ میسر و لەوێ دەرسی حەدیسی گوتووەتەوە. جا هەندێ ئەڵێن هەر لە میسردا کۆچی دوایی کردووە و «ابن النجار» ئەڵێ: لەسەر گۆڕی عیسای کوڕی شێخ عەبدولقادری گەیلانی قورئانم خوێندووە لە قەرافەدا لە میسر. ئەم زاتە لە دوازدەی رەمەزانی ساڵی ٥٧٣ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و تەمەنی ٣٤ ساڵ بووە.

پێنجەم: شێخ مووسا، لە دوادوایی مانگی رەبیعوڵئەوەڵی ساڵی ٥٣٩ی کۆچیدا لەدایک بووە. ئەم زاتە دەرسی فیقهی لە خزمەت باوکی و «ابن البنا» و غەیری ئەوانیشدا خوێندووە. جا چووە بۆ دیمەشقی شام و تێیدا نیشتەجێ بووە و دەرسی حەدیس و زانیاری‌یەکانی دیکەی گوتووەتەوە و موسوڵمانان زۆریان کەڵک لێ وەرگرتووە. پاش ماوەیەک لەوێوە چووە بۆ میسر و دوایی جارێکی دیکە گەڕاوەتەوە بۆ میسر و لەوێ دانیشتووە تا لە سەرەتای مانگی «جمادی الثانی»ی ساڵی ٦١٨ی کۆچیدا لە گەڕەکی (عقبە) لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی (قاسیون)دا نێژراوە. ئەم زاتە پاش هەموو کوڕەکانی شێخ عەبدولقادر کۆچی دوایی کردووە.

شەشەم[1] لە کوڕانی شێخ عەبدولقادر: شێخ عەبدولوەهاب بووە، ئەم زاتە لە سەرەتای ساڵی ٥٢٢ی کۆچیدا لەدایک بووە و لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا لە جێگەی باوکیدا دەرزی گوتووەتەوە. پاش کۆچی دوایی باوکیشی ماوەیەک خەریکی ئامۆژگاری و رێنومایی و دەرس‌وتنەوەوە و فەتوادان بووە، گەلێ لە زانایان لە خزمەتیدا وەکوو: شەریفی حسەینی بەغدایی و ئەحمەدی کوڕی «عبدالواسع» و... غەیری ئەوانیش خوێندنیان تەواو کردووە.

وە لە نەوەی شێخ عەبدولقادردا لەمەیان وریاتر و هۆشیارتر نەبووە، لە واقیعدا زانایەکی گەورە و شەرعزان و خاوەن بیروڕا لە گەلێ لە مەسەلەکانی ئوسوولدا بووە و پیاوێکی قسەخۆش و نوکتەزان بووە.

ئەم زاتە لە شەوی ٢٥ی شەوالی ساڵی ٥٩٣ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی (حەلبە) لە خۆرهەلاتی خوێندنگاکەی باوکیدا بەخاک سپێرراوە.

حەوتەم: شێخ عەبدولجەببار. ئەم زاتە لە خزمەتی باوکیدا دەرزی خوێندووە و حەدیسی شەریفی لە باوکی و ئەبوومەنسوور و غەیری ئەوانیش بیستووە. خۆش‌نووسێکی باڵادەست و لێهاتوو بووە، لەسەر رێبازی ئەهلی تەسەووف رۆیشتووە و هاوڕێی ئەهلی دڵ بووە.

ساڵی لە دایک‌بوونی بە تەواوی نەزانراوە. بەڵام زانراوە کە لە ١٩ی مانگی «ذی الحجە»ی ساڵی ٥٧٥دا کۆچی دوایی کردووە و لە هۆدەیەک لە هۆدەکانی مزگەوتی حەزرەتی شێخ عەبدولقادردا لە نزیکی مەرقەدی باوکی‌یەوە نێژراوە.

---

١- دەبوو ئەم ناوە دووەمی کوڕەکانی شێخ بوایە، بە هەڵە کەوتووەتە ئێرە.

هەشتەم: شێخ ئیبراهیم، ئەم زاتە لە خزمەتی باوکیدا خوێندوویەتی، هەروا دەرزی لای «ابن البناء» و غەیری ئەوانیش وەرگرتووە و لە بەغداوە چووە بۆ شاری «واسیط - کووت» و لەوێ نیشتەجێ بووە. هەتا لە ساڵی ٥٩٢ی کۆچیدا بۆ یەکجاری سەری ناوەتەوە.

نۆهەم: شێخ محەمەد، ئەمیش لە خزمەتی باوکیدا خوێندوویە، هەروەها لە خزمەتی «ابن البناء» و «ابوالوقت» و غەیری ئەوانیشدا خوێندوویە و لە شاری بەغدادا حەدیسی وتووەتەوە. لە ٢٥ی «ذی الحجە»ی ساڵی ٦٠٠ی کۆچیدا لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لەلای قەبری شێخ عەبدولوەهابی برایدا لە گۆڕستانی حەلبە نێژراوە.

ئەم گۆڕستانە ئێستە وا لە نێوان «محطە»ی قەتاری بەغدا و ئەو گۆڕستانەدا کە بە گۆڕستانی غەزالی ناسراوە. ئەم گۆڕستانەیش بۆیە پێی دەگوترێ گۆڕستانی غەزالی، چونکە «ابوالفتوح»ی برای ئیمامی غەزالی لەوێدا نێژراوە.

دەهەم: شێخ عەبدوڕەحمان کە لە ساڵی ٥٨٧دا کۆچی دوایی کردووە، لەمە زیاتر تا ئێستە هیچی دەربارە نەزانراوە.

یازدەهەم: شێخ سالح، ئەم زاتەیش ژیان و بەسەرهاتی نەزانراوە، ئەوەندە هەیە سەیید عەبدوڕەحمانی نەقیب لە کتێبی «الفتح المبین»دا نووسیویەتی کە شێخ عەبدولهادی سودیی یەمەنی لە ستایشی شێخ عەبدولقادردا نووسیویەتی:

ابـا صالـح! لله ثـم رسـوله　　　　اغثنی فانی صرت کالحوت فی البّر

لەمەوە دەردەکەوێ کە کوڕێکی بە ناوی (صالح)ەوە بووە.

دوازدەهەم: شێخ یەحیا. ئەم زاتە لە ساڵی ٥٥٠ی کۆچیدا بە ١١ ساڵ لە پێش کۆچی دوایی باوکیدا لەدایک بووە. ئەم زاتە لە خزمەت باوکیدا لە خزمەت محەمەدی کوڕی عەبدولباقی و غەیری ئەوانیشدا خوێندوویە و خوێندنی تەواو کردووە و گەلێ دەرزی حەدیسی گوتووەتەوە و موسوڵمانان سوودیان زۆر لێ وەرگرتووە. ئەم زاتە بچووکترین نەوەی شێخ عەبدولقادرە.

شێخ یەحیا لە بەغداوە چووە بۆ میسر و لەوێ کوڕێکی بووە ناوی ناوە عەبدولقادر، لە خۆشەویستی باوکی‌یەوە. دوایی لە میسرەوە گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا و کوڕەکەیشی لە کاتی گەورەییدا هێناوەتەوە بۆ بەغدا.

شێخ یەحیا لە مانگی شەعبانی ساڵی ٦٠٠ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و خەڵکێکی زۆر کاتی نوێژ لەسەرکردنی گرد بوونەتەوە و هەر لە خوێندنگاکەی باوکیدا نوێژیان لەسەر کردووە و لە گۆڕستانی حەلەبەدا بەخاک سپێرراوە.

دەربارەی کچەکانیشی شێخ عەبدوڕەحمان لە فەتحولموبینندا ئەفەرموێت: ناوداریان ئەمانەن:

خەدیجە: خێزانی کوڕی شێخ عەبدوڕەحمانی تەفسوونجی. فاطمة السمینة: کە خێزانی کوڕی «قضیب البان»ی مەوسیلی بووە. وە عایشە: کچێکی‌تریشی بووە شووی کردووە بە کوڕی شێخ موسلیمی سەممادی.

### باسی کوڕەزاکانی حەزرەتی شێخ

کوڕەکانی شێخ عەبدولوەهاب:

شێخ سولەیمان کوڕی شێخ عەبدولوەهاب لە ساڵی ٥٥٣ی کۆچیدا لەدایک بووە، لە رۆژی چوارشەممەی نۆی «جمادی الاخرە»ی ساڵی ٦١١ی کۆچیدا لەپێش شێخ عەبدوسەلامی برایا بە ٢٠ رۆژێک لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی حەلەبە لەلای گۆڕی باوکیدا نێژراوە.

### داوودی کوڕی سولەیمان

شێخ داوود، کوڕی شێخ سولەیمان، کوڕی شێخ عەبدولوەهاب، کوڕی شێخ عەبدولقادرە. حەدیسی لە خزمەتی شێخ عەبدولوەهابی باپیری و غەیری ئەویشدا وەرگرتووە. حافیزی دومیاتیش لە بەغدا حەدیسی لەم وەرگرتووە.

مێژووی لەدایکبوونی نەزانراوە، بەڵام لە شەوی شەممەی ١٨ی «ربیع الاول»ی ساڵی ٦٤٨ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە، لە رۆژی یەکشەممەدا لە گۆڕستانی حەلەبە لە نزیکی قەبری باوک و باپیریدا نێژراوە.

وە شەریف عیززەدین کە پیاوێکی باوەڕپێکراو بووە ئەڵێ: لە شاری «معرة النعمان»ی سەر بە پارێزگای «حەما»ی سووریادا کۆمەڵێ هەن لە نەتەوەی ئەم شێخ داوودی کوڕی شێخ سولەیمانەن و بە داوودی‌یە بەناوبانگن.

## عەبدوسەلامی کوڕی عەبدولوەهاب

ئەم زاتە لـە شـەوی ٨ی «ذی الحجـە»ی ساڵـی ٥٤٨دا لـەدایک بـووە و لـە رۆژی سێهەمی رەجەب لە ساڵی ٦١١ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی حەلەبە لەلای باوکیدا بەخاک سپێرراوە.

ئەم پیاوە لە خزمەت باوک و باپیرەیدا خوێندوویەتی و لەلای ئەوان خوێندنی تەواو کردووە و فەتوای داوە و لە دەوری خەلیفەی عەبباسیدا گەڵــێ ســەرۆکایەتی ئـایینی وەرگرت.

جارێک چوو بۆ سەفەری حـەج و کـرا بـە سـەرۆکی لێژنـەی هەڵـگرتنی پـەردەی کەعبەی پیرۆز و سەرپەرشتی مەعاشی کاردارانی هـەردوو حـەرەمی درایـە دەسـت و ئەویش بە رێکوپێکی کارەکانی برد بەڕێوە.

## باسی کوڕەکانی شێخ عەبدوڕەزاقی کوڕی شێخ عەبدولقادری گەیلانی

## عەبدوڕەحیمی کوڕی عەبدوڕەزاق

ئەم زاتە رۆژی چوارشەمەی ١٤ی «ذی القعدە» لە ساڵـی ٥٦٠ی کۆچیـدا لـەدایک بووە و رۆژی پێنجشەمەی ٧ی «ربیع الاول» لە ساڵی ٦٦٠دا کـۆچی دوایـی کـردووە و لەلای باوکی لە «باب الحرب»دا بە خاک سپێرراوە.

## ئیسماعیل کوڕی عەبدوڕەزاق

ئیسماعیل زانایەکی گەورەی خاوەنڕێز بووە، موسوڵـمانان گەڵــێ سـوودیان لــێ وەرگرتووە. لە بەغدادا کۆچی دوایی کردووە لە گۆڕستانی «بـاب الحـرب» لـە نزیکـی باوکیدا بەخاک سپێرراوە. مێژووی لەدایک بوون و کۆچی دوایی نەزانراوە.

## نەسری کوڕی عەبدوڕەزاق کوڕی شێخ

ئەبووساڵح نەسری کوڕی شێخ عەبدوڕەزاق لە شەوی ١٤ی «ربیع الثانی»ی ساڵـی ٥٦٤ی کۆچیدا لە شاری بەغدا لەدایک بووە. وە لە شەوی یەکشـەمەی ١٢ی شـەواڵی ساڵی ٦٥٦ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی «باب الحرب» نێژراوە.

ئەم زاتە لە خزمەتی باوکی و شێخ عەبدولوەهابی مامیدا دەرزی خوێنـدووە. هـەروا عیلمی لە ئەبوهاشمی روشانی و غەیری ئەویش وەرگرت و بـوو بـە زانایـەکی بـەرزی بەناوبانگ و گەلـێ دەرسی وتووەتەوە و حەدیسی فێری خەڵک کـردووە و ئامۆژگـاری و رێنومایی موسوڵـمانانی کـردووە و سـوودێکی زۆری گەیانـدووە بـە موسوڵـمانان و ئەنجام بووە بە یەکێ لە گەورە پیاوانی سەردەمی خەلیفـەی عەبباسـی «الظـاهر بـامر الله» کە ئەوەندە خەلیفەیەکی چاک و کارامە بووە باسـی تـەواو نابـێ. جـا خەلیفـەی ناوبراو هات شێخ نەسری کرد بە «قاضی القضاة» لەبەغـدادا و قـازی‌یـەکان هـەموو بـە فەرمانی ئەو دائەنران و پرسیار و گەڕانیان بە دوای ئەحکامدا لای ئەو بوو. شێخ نەسـر خۆی لەسەر مەزهەبی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو.

کاتێ شێخ نەسر کرا بە «قاضی القضاة» سێ مزگەوت لە بەغدادا هـەبوو جومعـەیان تێدا دەکرا. فەرمانی قازیێتی شێخ نەسر لە هەر سێ مزگەوتەکـەدا خوێندرایـەوە. بـۆ ئەوە هەموو موسوڵمانان لە پلە و پایەی ئەو شێخە ئاگادار بن.

وە شـێخ نەسـر لـە سـەردەمی خۆیـدا لـە خـوو و رەوشـتی جـوان و دادگـەری و لەخوداترسیدا وێنەی نەبووە: لەگەڵ ئـەو پایەشـدا هـەموو رۆژێکـی جومعـە بـە پـێ ئەڕۆیشت بۆ نوێژی جومعە. قازیێتی ئەو لە چوارشەمەی «ذی القعدة»ی سالـی ٦٢٢ی کۆچی‌یەوە دەستی پێکرد هـەتا «الظـاهر بـامر الله» لـە جیهـان دەرچـوو، پـاش ئـەو «المستنصر بالله» بوو بە خەلیفە و لە سەردەمی ئەویشدا چوار مانگ شێخ نەسر لەسـەر قازیێتی مایەوە و لە ٢٣ی «ذی القعـدة»ی ساڵی ٦٢٣ی کۆچیـدا لابـرا. وە دوای ئـەوە خەلیفە تەکیە و بارەگای درووسـت کـرد و شـێخ نەسـری لەسـەر دانـا و ئـەویش بـە خزمەتکردنی ئایین و موسوڵمانانەوە خەریک بوو. وە لەگەڵ ئەوەدا کە خەلیفە پلەی «قاضی القضاة»ی لـێ سەندبووەوە زۆر رێزی ئەگرت، چونکە لە واقیعدا رێـزی مـەقامی ئەگرت هەتا کۆچی دوایی کرد. ئەم زاتە نەوەی لـێ بەجێ‌ماوە، ناودارەکانیان دوو کوڕ و کچێکن: یەحیا و محەمەد و زەینەب کە بە «أمة الاله» ناوبانگی دەرکردووە.

### زەینەب «أمة الاله»

کچی شێخ نەسـر ئـافرەتێکی زانـا و بـەڕێز و لـەخوداترس بـووە، هـەروەها زانـا و مامۆستای حەدیس بووە و گەلـێ کەس لە ژنان و پیاوان سوودیان لـێ‌وەرگرتووە.

لەوانەی کە ئیجازەی ریوایەتی حەدیسی شەریفی پێداون لە شاری (خەلیل)دا لە فەلەستین: شێخ بورهانەدین ئیبراهیم کوڕی عومەری جەعبەری بووە، وەکوو دانەری «الروض الزاهر» لە کتێبەکەیدا نووسیویە. مێژووی لەدایک بوون و کۆچی دوایی زانراو نییە.

## یەحیای کوڕی شێخ نەسر

ئەم پیاوە بە یەکێ لە گەورە و زانایانی سەردەمی خۆی ناسراوە. دەرزی شەرع و حەدیسی لە باوکی و غەیری ئەویش وەرگرتووە. واعیزێکی زۆر چاک و قسەڕەوان بووە و لە تەسەووفدا خاوەن مەقام بووە و شیعری ناسکی داناوە. مێژووی لەدایک بوون و لە جیهان دەرچوونی دیار نییە.

## محەمەد کوڕی شێخ نەسر

ئەبوونەسر محەمەدی، کوڕی نەسری، کوڕی عەبدوڕەزاق، کوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر (خ). ئەم پیاوە شەرع و حەدیسی لە خزمەت باوکی و زانایانی دیکەدا خوێندووە تا پێگەیشتووە.

«حافظ زین الدین» عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی رەجەب لە تەبەقاتەکەیدا ئەڵێ: ئەبوونەسر محەمەدی کوڕی نەسر حەدیسی لە باوکی بیستووە و لە حەسەنی کوڕی عەلی عەلەوی و ئەبوو ئیسحاق یوسفی کوڕی محەمەدی کوڕی فەزلی ئەرمەوی و لە عەبدولعەزیمی ئەسفەهانی و «ابن المشتری» و غەیری ئەوانیشی بیستووە. وە زانایەکی بەرزی بەڕێز و پارێزگار و لەخودا ترس بووە و لە زۆر رەوشتیدا لە شێخ عەبدولقادری گەیلانی چووە. وە لە خوێندنگاکەی ئەودا خوێندوویە تا لە جیهان دەرچووە.

ئەگێڕنەوە: کاتێ کە باوکی کرا بە «قاضی القضاة» فەرمانی قازییێتی بۆ محەمەدی کوڕی وەرگرت، بەلام محەمەد پاش رۆژێ کە لە دادگادا دانیشت دەستی لە کارەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ سەر خوێندنگاکەی خۆیان و خەریکی دەرسوتنەوە بوو، ئیتر بە هیچ جۆرێ وەزیفەی قازییێتی وەرنەگرت (خ).

ئەم زاتە لە شەوی دووشەممەی ١٢ی شەوالی ساڵی ٦٥٦دا لە بەغدادا کۆچی دوایی کردووە و لە نزیکی حەزرەتی عەبدولقادری باپیرەیدا بەخاک سپێرراوە، کۆچ کردنەکەیشی دوای هاتنی تاتار بووە.

جا ئەم شێخ محەمەدە سێ کوڕی لە پاش بەجێما: ئەحمەد، عەبدولقادر، عەبدوڵلا. وا باسیان ئەکەین.

### ئەحمەد کوڕی محەمەد

ئەحمەد کوڕی محەمەد، کوڕی نەسر، کوڕی عەبدوڕەزاق کوڕی عەبدولقادر ناسراو بە «ابوالسعود».

شەریف عیزەدینی حسەینی ئەڵێ: ئەم زاتە پیاوێکی گەورە و زانا و تەواو بووە. لە رۆژی سێشەمە ٢٧ی (ربیع الاول) لە ساڵی ٦٨١دا لە بەغدادا ون بووە. لە ئەنجاما دەرکەوت کە وا لە ناو بیرێکدا کوژراوە.

وە مێژوونووس خاوەنی «قلائد الجواهر» ئەڵێ: عەبدولقادر و عەبدوڵلای برای ئەم ئەحمەدە هیچ شوێنەوار و هەواڵێکیان دیار نییە، بەڵام عەبدولقادر کوڕێکی بووە ناوی عەبدوسەلام بووە کە ئێستە باسی ئەکەین.

### عەبدوسەلام کوڕی عەبدولقادر کوڕی محەمەد

ئەم زاتە لای عەبدوڵلای مامی دەرسی خوێندووە.

بەرزالی ئەڵێ: ئەم زاتە پیاوێکی پیرۆز و شێوەجوان و خاوەن بەخشش بووە و هیممەتێکی بەرزی بووە و هاتوچۆی میسری کردووە و لە شامدا لە ٢٧ی «جمادی الاول»ی ساڵی ٧٣٠ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە رۆژی دووشەممەدا لە مزگەوتی موزەفەرییەدا نوێژی جەنازەی لەسەر کراوە و لە گۆڕستانی شێخ ئیبراهیمی ئورمەوی لە کێوی قاسیوندا بە خاک سپێرراوە.

### سەیفەدین یەحیا کوڕی ئەبووسوعوود

سەیفەدین یەحیا کوڕی ئەبووسوعوود ئەحمەد زەهیرەدین، کوڕی محەمەد سەیفەدین، کوڕی نەسر، کوڕی عەبدوڕەزاق کوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر (خ).

ئەم زاتە پیاوێکی چاک و لەخوداترس و بەڕێز بووە، لە شاری (حەما)دا دامەزرا و کردی بە جێگەی خۆی، هەتا لە ساڵی ٧١٤ی کۆچیدا لە جیهان دەرچوو. ئەم زاتەیش کوڕێکی لێ بەجێما ناوی شەمسەدین محەمەد بوو.

**شەمسەدین محەمەد کوڕی سەیفەدین یەحیا**

ئەم زاتە شێخێکی دانا و زانا بووە و لەلای کۆمەڵێ لە زانایانی بیت‌المقدس خوێندوویەتی و ریوایەتی حەدیسی شەریفی لە ئەبووزەکەریای یەحیاوە کردووە. ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: ئەبوومحەمەد محێدین عەبدولقادر و شێخ عەلائەدین عەلی.

**عەبدولقادر کوڕی شەمسەدین محەمەد**

ئەم زاتە هەر لە تەمەنی جوانیدا چووە بۆ حەج و لەسەر نووسراوی مێژوونووس مەقریزی لە کتێبی «درر العقود»دا ئەڵێ: محێدین ئەبوومحەمەد عەبدولقادر پاش گەڕانەوەی لە سەفەری حەجەکەی لە تەمەنی بیست و ئەوەندەدا لە جیهان دەرچوو. وا دەرئەکەوێ ئەم زاتە منداڵی لێ بەجێ نەمابێ.

**عەلائەدین عەلی کوڕی شەمسەدین**

ئەم زاتە لە شاری «حەما»وە چووە بۆ میسر و لە رۆژی سێ‌شەمەی ٢٤ی «جمادی الاخر»ی ساڵی ٧٩٣ی کۆچیدا لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە.

ئەمیش سێ کوڕی لێ بەجێماوە: شەمسەدین ئەبوعەبدوڵڵا محەمەد، شێخ بەدرەدین حەسەن، شێخ بەدرەدین حسەین.

**شەمسەدین محەمەد کوڕی عەلائەدین عەلی**

ئەم زاتە پیرۆزە لە شاری حەمادا ژیاوە و خەریکی خوداپەرستی بووە تا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی «مخلصیة» لە خۆرهەلاتی شاری حەمادا بە خاک سپێرراوە.

**بەدرەدین حەسەن کوڕی عەلائەدین عەلی**

ئەم زاتە پیرۆزە لە شاری حەمادا ماوەتەوە و هەر لەوێدا کۆچی دوایی کردووە و لـە گۆڕسـتانی سـەیفەدین یـەحیای بـاپیرە گەورەیـدا لـە دەرەوەی «بـاب النـاعورة»ی بەرانبەری تەکیەی قادری‌یەدا بە خاک سپێرراوە.

**بەدرەدین حسەین کوڕی عەلائەدین عەلی**

ئەم پیاوە پیرۆزەیش هەر لە شاری حـەمادا ماوەتـەوە هـەتا لـەوێ کـۆچی دوایـی کردووە و لە گۆڕستانی ناوبراودا نێژراوە.

بزانن! لە «قلائد الجواهر»دا باسی مێژووی لەدایک‌بوون و لە جیهان دەرچوونی ئـەم سێ برایە ناکات. وا ئێمە لەمەولا بە ریز باسی نەوەی ئەم سێ برایە دەکەین:

**محێدین عەبدولقادری کوڕی شەمسەدین**

ئەم زاتە لە ئەهلی چاکە و دین و لەخوداترس بووە، لە شـاری حـەمادا لـە جیهـان دەرچووە و لە گۆڕستانی خۆیاندا بەخاک سپێرراوە.

**شەمسەدین محەمەد**

کوڕی محێدین عەبدولقادر، کوڕی شەمسەدین محەمەد کوڕی عەلائەدین عەلی...

ئەم زاتە لە شاری حەما لەدایک بووە و خۆی و بـاوک و بـاپیرەی حەمـەوی– واتـە خەڵکی حەما- بوون و لە حەمادا لە جیهان دەرچوون و پیاوێکی باش و خاوەن چاکـە بووە. مێژووی لەدایک‌بوون و کۆچی دوایی دیار نییە. ئەم شەمسەدینە کـوڕێکی بـووە ناوی محێدین بووە.

•

**محێدینی کوڕی محەمەد**

ئەم زاتە پیاوێکی چاک و بەدین و خاوەن خوو و رەوشتی جوان و خاوەن رێز و پلە بووە لە ناو خاس و عامدا.

خاوەنی «قلائد الجـواهر» محەمـەدی کـوڕی یـەحیای تـادفی ئەڵـێ: قـازیێتی لـە رشتەی نەسەبیاندا هاتووەتە خـوارەوە. هـەروا دەڵـێ: ئـەم زاتـە لـە شـاری حـەماوە

تەشریفی هات بۆ شاری حەڵەب و لەوێ نیشتەجێ بوو و خوشکی منی مارە کرد و خودا لەو خوشکی منە چەن نەوەیەکی پێدا و پاش ماوەیێ لە شاری حەڵەبەوە گەڕایەوە بۆ حەما کە نیشتمانی خۆی بوو.

وە ئەڵێ: لە شاری حەڵەب و حەمادا گەلێ وەزیفە و ئیش و کاری بووە و ئێستەش وان بە دەستی نەوەکانی‌یەوە و برایەکی باوکیی بوو ناوی شێخ یەحیا بوو پێش کۆچی دوایی ئەم شێخ محێدینە ئەو لە جیهان دەرچووە. وە شێخ محێدین لە مانگی «ربیع الاول»ی ساڵی ٩٢٣ی کۆچیدا لە شاری حەما لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی خۆیاندا لە دەرەوەی «باب الناعورە» نێژراوە. کاتێ مرد تەمەنی لە ٦٠ ساڵ تێپەڕی‌بوو. ئەو زاتە چەن کوڕی لێ بەجێ‌ماون وەک: دەروێش محەمەد و شەرەفەدین عەبدوڵلا و عەفیفەدین حسەین. جا وا بەرودوا باسیان ئەکەن.

### دەروێش محەمەدی کوڕی محێدین عەبدولقادر

ئەم زاتە لە شاری حەمادا لەدایک بووە، لەوێ ژیاوە و لەوێ کۆچی دوایی کردووە. زاتێکی نەسابە و پاک و بێ‌گەرد و لەخوداترس بووە و ساڵێک پێش کۆچی دوایی باوکی لە جیهان دەرچووە. لە گۆڕستانی باپیرەی باوکیدا —لە لایەنی دایکی‌یەوە— بە خاک سپێرراوە، لە بەرانبەری زاوی‌یەی قادری‌یەوە.

### شەرەفەدین عەبدوڵلای کوڕی محێدین عەبدولقادر

شەرەفەدین عەبدوڵلا کوڕی محێدین عەبدولقادر، کوڕی محەمەد، کوڕی محێدین عەبدولقادر، کوڕی شەمسەدین محەمەد، کوڕی عەلائەدین عەلی، کوڕی شەمسەدین محەمەد، کوڕی سەیفەدین یەحیا، کوڕی زەهیرەدین ئەحمەد، کوڕی محەمەد ئەبوونەسر، کوڕی نەسر، کوڕی عەبدوڕەزاق، کوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر.

ئەم زاتە لە بنەڕەتدا خەڵکی حەمایە، بەڵام لە شاری حەڵەب لەدایک بووە، جوانێکی دیمەن‌جوان و خووشیرین و ڕەوشت‌بەرز و خۆ بەکەم‌گر و بەخشندە بووە. قورئانی پیرۆزی خوێندووە، هەروا هەندێ نەحو و سەرفی خوێندووە، دوای ئەوە چووە بۆ حەڵەب و شام و میسر و پاش ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ شاری حەما.

خاوەنی قلائد الجواهر ئەڵێ: خوشکی منی مارە کـرد. ئیتـر باسـی کـۆچی دوایـی نەکردووە، چونکـە لـە کـاتی نووسـینی کتێبەکەیـدا ئـەم لـە ژیانـدا بـووە و دۆعـای تەمەندرێژی بۆ کردووە.

**عەفیفەدین حسەین کوڕی محێدین عەبدولقادر**

ئەم زاتەش وەکوو شەرەفەدینی برای خەڵکی حەما بووە و لە حەڵەب لەدایک بووە و خوشکەزای محەمەدی کوڕی یەحیای (تاذفی) حەڵەبی «بیت القضاوة)یە. ئەڵێ: ئەم کوڕە جوانێکی لەخوداترس و بەپارێز و دنیانەویسـت بـووە. شـافیعی مەزهـەب بـووە. ئەڵێ: دەرزی حەدیسی لای من خوێندووە، وەکوو من خۆم خوێندبووم لـە خزمـەتی زانای چەرخ مەولانا شێخ شەهابەدین ئەحمەدی بارزی حسەینی شافیعیدا. لە ماڵـی شەرەفەدینی برایا لە شاری حەمادا دەرزم پێ ئەوت، لەو ساڵەدا کە مـن ئـەم کتێبـەم تێدا دانا، کە ساڵی ٩٥٠ی کۆچی بوو. وە ئەم زاتە دەستە و بەستە و کۆمەڵی زۆر بوو، بە سام و شەرم و شکۆ بوو، بەرگ و پۆشاک و خۆراکی هەموو جوان و چاک بوون. ئەم زاتە یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی شێخانی قادری لە شاری حەمادا.

ئاگام لێیە جارێ هات بۆ دیمەشقی شام. من لەو کاتەدا لە شامدا بووم و شـێخان و پیاوەگەورە و بەناوبانگەکانی شار هەموو رێزیان لـێئەگرت و دیدەنیان ئەکرد. جارێک لەگەڵ «نائب السلطنه»ی شام «امـیر الأمـراء» عیسـا پاشـای کـوڕی ئیـبراهیم پادشـادا کەوتنە یەک، عیسـا پاشـا گەڵـێ رێـزی گـرت. لـەو قسـانەی کـە لەگـەڵ خـۆی و شــەرەفەدین عەبدوڵـلای برایـدا کـردی ئـەوە بـوو: -خـودا وێنـەتان زۆر بکـات- وە خەڵکێکی زۆر تەریقەتیان لە سەردەستیدا وەرگرت.

وە هەموو رۆژێکی جومعە لـە پـاش نـوێژی جومعـە کـۆڕی زیکـری لـە مزگـەوتی ئەمەویدا لە خۆرهەڵاتی مەقسوورەکەوە هەبوو. خەڵکێکی زۆر لە پیاوچاوکان و زانایان و موفتییەکان لە کۆڕەکەدا دادەنیشتن. وە هاتنی بۆ شام لە رۆژی پێنجشـەمەی ٢٦ی شەعبانی ساڵی ٩٤٨ی کۆچیـدا بـوو. وە بـرای بەوەفایشـی شـەرەفەدین عەبدوڵـلای لەگەڵدا بوو، هەردووکیان بەیەکەوە لە شامدا مانەوە، هەتا لە رۆژی یەکشـەمەی ٥ی شەوالی هەمان ساڵـدا پێکـەوە سـەفەریان کـرد، وە خەڵـکی شـار بـۆ خوداحـافیزی لەگەڵیان رۆیشتن لە شامەوە هەتا «قابون»، رۆژی دەرچوونیان رۆژێکی دیاریی بوو.

ئەم زاتە لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٩٢٦دا لە حەڵەب لەدایک بووە. خودا دەوامی بدا و بە هۆی ئەمەوە سوود بە خەڵک بگەیەنێ.

جا کاتێ باسی نەتەوەی شێخ شەمسەدین محەمەد کوڕی عەلائەدین عەلی بە کورتی تەواو بوو، ئێستە باسی نەتەوەی شێخ بەدرەدین حەسەن و شێخ بەدرەدین حسەین ئەکەین کە برای شەمسەدین محەمەد کوڕی عەلائەدین عەلی‌ن.

**شەمسەدین محەمەد کوڕی بەدرەدین حەسەن**

ئەم زاتە لە حەمادا لەدایک بووە و هەر لەوێ ژیاوە و لەوێیش لە جیهان دەرچووە و پیاوێکی چاک و لەخوداترس و دنیانەویست بووە. دوای کۆچی دوایی هەر لە حەما لە گۆڕستانی باوک و باپیریدا بەخاک سپێرراوە.

**شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ بەدرەدین**

ئەم زاتە لە شاری حەما لەدایک بووە و لە حەمادا ژیاوە و پیاوێکی چاک و لەخوداترس و بەتاعەت بووە. لە شاری حەمادا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی باوک و باپیریدا لە دەرەوەی «باب الناعورە»دا نێژراوە.

جا لێرەدا بە تەرتیب باسی نەتەوەی ئەم دوو زاتە ئەکەین. لە پێشدا ئەڵێین:

**عەبدوڕەزاق کوڕی شێخ محەمەد**

ئەم زاتە لە شاری حەمادا لەدایک بووە، لە حەمادا ژیاوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە شێخ و مورشیدی سەیدەکانی قادری بووە و «شیخ المشایخ»ی شاری حەما و شارەکانی دیکەی شام بووە. پیاوێکی چاک بووە و لای فەرمانڕەوا و زانا و ناودارانی ولاتدا قسەڕەوا بووە. خۆش‌خوو و خۆش‌ڕوو بووە. بە شەرم و حەیا و ویقار بووە. هەرچەند ماڵی دنیای بۆ بهاتایێ لای نەدەمایەوە و خەرجی دەکرد لە ڕێگەی خودادا و هەرگیز داواکەری شتی نەدەدایە دواوە بێ ئەوەی شتی بداتێ.

سەفەر و هات‌وچۆی بۆ حەڵەب و دیمەشق و تەرابلس زۆر بووە. هەر کاتێ دیاری‌یەکی بۆ هاتبا بەشی کردووەتەوە بەسەر دانیشتوانی مەجلیسەکەیدا و پاداشی

باشیشی ئەدا بە خاوەن دیارییەکە. سوفرە و خوانی بەردەوامی بووە و هەرگیز بێمیوان نەبووە مەگەر بە دەگمەن هەڵبکەوتایە. وە زانایان لە وڵاتانی دەرەوە ئەهاتن بۆ دیدەنی و خەڵک زۆر باوەڕیان پێی بووە و قسەخۆش و خۆبەکەمگر بووە. وە گەلێ کەس خەرقەی ئیرادەتیان بە دەستی ئەو لەبەر کردووە.

خاوەنی «قلائد الجواهر» ئەڵێ: «من جملة قاضي القضاة نظام الدين ابوالمكارم» یەحیای تاذفی حەڵەبی، قازی حەڵەب، کوڕی قازی حەڵەب کوڕی کچی قازی حەڵەب لەگەڵ دوو برایدا: کەمالەدین موحەمەدی تاذفی شافیعی لە حەڵەبدا و عەللامە بورهانی ئەبوو ئیسحاق ئیبراهیمی تاذفی حەڵەبی هەروا باپیرم لەلایەنی باوکمەوە «قاضي القضاة» جەمالەدینی یوسفی تاذفی حەڵەبی (خ).

وە شێخ عەبدوڕەزاق لە شاری حەمادا لە ساڵی ۹۰۱ی کۆچیدا لە ٦ی مانگی شەوالدا کۆچی دوایی کردووە و کەسی لێ بەجێنەماوە.

**شێخ عەبدولباسیت کوڕی ئەحمەد**

ئەم زاتە لە شاری حەمادا لەدایک بووە، هەر لەوێ ژیانی بەسەر بردووە و لەوێیش لە جیهان دەرچووە. بەڵام پاش ماوەیێ لە ژیانی چوو بۆ قاهیرە و پاش ماوەیێ گەڕایەوە بۆ شاری حەما هەتا کۆچی دوایی کرد، دوای کۆچی دوایی عەبدوڕەزاقی ئامۆزای بە نزیکی دوو ساڵ. وە لە گۆڕستانی «باب الناعورە»دا بەخاک سپێررا و دوو کچ نەبێ منداڵی لێ بەجێ نەما، ئەوانیش دوای کوچی دوایی باوکیان مردن.

ئەم زاتە پیاوێکی چاک و خۆشنووسێکی باش بووە.

وە «ابوالنجا» کوڕی ئەحمەد کوڕی حەسەن کوڕی عەلائەدین عەلی لە شاری حەمادا لە جیهان دەرچوو بە هۆی ئەوەوە لە ئاوی جۆگەی «عاصي»دا خنکا، ئەمەیش لە ساڵی ۹۱۰ی کۆچی لە پێش کۆچی دوایی شێخ قاسمدا بوو، کە لەمەولا باسی ئەکەین.

جا باسی کوڕەکانی بەدرەدین حسەین ئەکەین:

**محێدین یەحیا کوڕی بەدرەدین حسەین**

ئەم زاتە لە شاری حەمادا لەدایک بووە و هەر لەوێ ژیاوە و لەوێیش کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتـە عـەینی ئـەعیانی سـاداتی شـێخەکانی قـادری بـووە لـە شـاری حـەما و شارەکانی دیکەی شامدا. لەلای خاس و عام خاوەن ڕێز و پایە بووە، ماڵ و دارایی زۆر بووە، لەگەڵ ئەمەیشدا زۆر خۆی بەکەم گرتووە و خـۆش‌خـوو و خـۆش‌ڕوو و زیـرەک بووە. زانا و زانیاریی زۆر خۆش ویستووە. خزمـەتی موسوڵـمانانی زۆر کـردووە تـا لـە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا لە شاری حەما لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی دەرەوەی «بـاب الناعورە»دا لەگەڵ باوک و باپیریدا بەخاک سپێرراوە. ئەم زاتە کوڕێکی لـێ بەجێ‌ماوە ناوی شەرەفەدین قاسم بووە.

**شەرەفەدین قاسم کوڕی محێدین یەحیا**

ئـەم زاتـە شـێخی شـێخان و عـەینی ئـەعیانی قادرییـە بـووە، تـەما و تەربییـەی موریدەکان لە زەمانی خۆیدا هەر بە دەست ئـەوەوە بـووە. پیـاوێکی خـوو و ڕەوشـت جوان بووە، خێر و چاکەی زۆر بووە و گەلـێ جار بە پەنامەکی چاکەی کردووە و شتی داوە بە خەڵک، لە قورئان خوێندن مانوو نەبووە و خاوەن هەیبەت و ویقـار بـووە و لـە ناو فەرمانڕەوایان و خەڵکی ولاتەکەیدا قسەڕەوا بووە. مـن چـاوم پێکـەوت لـە ساڵـی ٩١٠دا پێگەیشتم کاتێ لە خزمەتی باوکمدا چووین بـۆ شـاری حـەما و میوانـدارییێکی باشی کردین و لە شوێنەکەی خۆیدا داینـاین و مەسـرەفێکی زۆری بـۆ کـردین و لـە پیرۆزیی ئەوەوە خێر و بەرەکەتمان پێگەیشت.

لە شەوی دووشەمەی ٦ی «ربیـع الآخـر»دا لـە ساڵـی ٩١٦ی کوچیـدا لـە جیهـان دەرچوو و تەمەنی لە ٥٠ ساڵ تێپەڕیبوو. لـە گۆڕسـتانی بـاوک و باپیرەیـدا بـەخاک سپێرراوە.

جا لەمەولا باسی کوڕەکانی و کوڕەزاکانی ئەکەین:

**شەمسەدین محەمەد کوڕی قاسم**

ئەم زاتە لە شاری حەما لەدایک بووە و هەر لەوێ ژیانی بەسەر بـردووە و دوایـیش لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

تاذفی ئەڵێ: شێخمان و کوڕی شێخمان و پێشەوامان بۆ لای خودا و لـەخوداترس، شێخی قادری لە شاری حەما و شوێنەکانی دیکە دیمەن‌جوان و خوو و ڕەوشت بەرز و

بە شەرم و خاوەن بەخشش و چاکە بووە. کەس زیارەتی نەکردووە کە بە نائومێدی بگەڕێتەوە، بە گوێرەی توانا نانی داوە بە خەڵک و کاری پێویستی خۆی بە دەستی خۆی کردووە، دیاری لە خەڵک وەرئەگرت، بەڵام بە قەد خۆی پاداشی ئەدایەوە. لە مورید و شوێنکەوتووانی خۆی دەپرسی و بەسەری ئەکردنەوە و چۆن بۆی بگونجایە دەسگرۆیی ئەکردن.

لەدایکبوونی – تاذفی ئەڵێ- خودا تەمەنی درێژ بکات لە ساڵی ۸۸٥ی کۆچیدا بووە و گەورەترینی براکانییەتی.

### شێخ عەبدوڵڵا کوڕی شەمسەدین محەمەد

ئەم کوڕە براگەورەی کوڕانی شەمسەدین بووە، خۆشخولک و ڕەوشتجوان و هیمەتبڵند بووە. لە ساڵی ۹۲٦ی کۆچیدا لەدایک بووە.

وە براکانی شەمسەدین محەمەد لەسەر ئەم تەرتیبەن کە دێ:

### شێخ تاجولعارفین

کوڕی قاسم، کوڕی یەحیا، کوڕی حسەین... ئەم زاتە جوانێکی خوو و ڕەوشت شیرینە، خودا بە میهرەبانی خۆی پەروەردەیان بکا و بیانپارێزێ.

### شێخ شەهابەدین ئەحمەد

کوڕی قاسم، کوڕی یەحیا، کوڕی حسەین... ئەم زاتە لە شاری حەمادا لەدایک بووە و هەر لەوێش ژیانی بەسەر بردووە و لە جیهانیش دەرچووە.

ئەم زاتە جوان و بالاهیمەت و خاوەن پلە بووە لەلای گەورە و زانا و شێخەکان و فەرماندارەکاندا. خاوەنی «قلائد الجواهر» ئەڵێ: من چەند جار لە شاری حەما و حەڵەبدا بە خزمەتی گەیشتم، کاتێ هات بۆ تەفتیشی ئەوقافی حەڵەب باوکم لە ماڵی خۆمان دایبەزاند و خزمەتی خۆی و هەموو هاوڕێکانی کرد هەتا تەشریفی گەڕایەوە.

هەروا لە قاهیرە بە خزمەتی گەیشتم کاتێ کە لە سەفەری حیجازا بوو لەگەڵ عەبدولقادر و ئەبولوەفای برایدا، لە لایەنی فەرماندارانی میسرەوە زۆر ڕێزی لێ گیرا و

لەگەڵ قافڵەی میسردا ڕۆیشت بۆ حیجاز و بە ساغ و سەلامەتی گەڕایەوە بۆ شاری حەما.

ئەم زاتە لە ڕۆژی پێنجشەمەی ١٦ی مانگی رەمەزانی ساڵی ٨٨٦ی کۆچیدا لەدایک بووە، لە ساڵی ٩٣٦ی کۆچیدا لە شاری حەما لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی (جنینە) لە بەرابەری گۆڕستانی خۆیاندا نێژراوە.

### شێخ عەبدولقادر

کوڕی قاسم، کوڕی یەحیا، کوڕی حسەین... ئەم زاتە پیاوێکی دارای خوو و رەوشتی جوان و تەبیعەتی ناسک بووە. ئەهلی عیلمی خۆش ویستووە و زۆر هۆگری بەندەیی بۆ خودا بووە.

لە شەوی پێنجشەمەی ٤ی موحەڕەمی ساڵی ٨٩٣ی کۆچیدا لە دایک بووە.

ئەم زاتە کوڕێکی هەیە ناوی شەمسەدین محەمەدە، قورئانی پیرۆز و چەن کتێبی شەرعی شافیعی و حەدیسی لە من [دیارە ئەمە قسەی خاوەنی قلائد الجواهرە. م،ع،ق] بیستووە بەلای منەوە خوێندوویەتی، بەپێی خوێندنم لە خزمەتی شێخ شەهابەدین ئەحمەدی بارزیی جوهەنیی شافعیدا. لەدایک بوونی لە مانگی موحەڕەمی ساڵی ٩٣٤ی کۆچیدا لە شاری حەما بووە.

### شێخ بەرەکات

کوڕی قاسم، کوڕی یەحیا، کوڕی حسەین... لە براکانی شەمسەدین محەمەدی کوڕی قاسمە...

ئەم شێخ بەرەکات ناوە لە شاری حەما لەدایک بووە و لەوێیش ژیاوە. پیاوێکی لەخوداترس و ناسک و خۆبەنزنمگر بووە، تێکەڵیی خەڵکی نەدەکرد، هەمیشە خەریکی بەندەیی بۆ خودا بوو. لە شێخ عەبدولقادری برایم پرسی: بەرەکات لە چ ساڵێکدا لە دایک بووە؟ فەرمووی: نازانم، بەڵام من پێنج ساڵ لەو بچووکترم.

### محەمەد ئەبولوەفای کوڕی قاسم

یەکێتر لە براکانی شەمسەدین محەمەدی کوڕی قاسم.

ئـەم زاتــە لــە شــاری حــەمادا لــەدایک بــووە و لــەوێش ژیــاوە. زانایــەکی بــاش و لەخوداترس و دنیانەویست و (موحەددەس) و شێخی سەیدەکانی قادری بووە. قورئان و شەرع و حەدیسی پیرۆزی خوێند، جا چوو بۆ حەڵــەب و شــام و میســر و حیجــاز و سوودێکی باشی لە زانایانی ئەو وڵاتانە وەرگرت.

گەلــێ مورید و ئەتباعی هەیە و لەلای خاس و عام و فەرمانداران و زانا و نــاودارانی وڵاتدا خاوەنڕێزە. زۆر دڵقایم و خاوەن هیممەتە و لە هــیچ شــتێ ناترســێ، لەگــەڵ ئەوەدا کە بچووکترینی کوڕەکــانی بــاوکی خۆیــەتی بــە تەمــەن، بــەڵام لــە ڕێــزدا لــە هەموویان گەورەترە.

جا خاوەنی (قلائد الجواهر) ئەفەرموێت: ئەم سەییدانە لە نەوەی عەلائەدین عەلی‌ن کە باسمان کردن، لە کۆنەوە تا ئێستە لە شاری حەمادا نیشتەجێ بوون، خودا وێنەیان زۆر بکــات و ئەڵــێ ئاگــادار بــووم بــە ســەر ئیجازەنامــەکانی ئەوانــدا کــە داویــانن بــە قوتابی‌یەکانیان بە خەتی خۆیان، کەچی لە زنجیرەی باپیری خۆیاندا ناوی ئەبوونەســر محەمەدی کوڕی نەسری کوڕی عەبدوڕەزاق نابەن، لەگەڵ ئەوەدا کە مێژوونووسان بە ڕێزەوە باسیان کردووە، تەنانەت هەندێکیان نووسیویانە لە هەموو نەوەکانی حــەزرەتی عەبدولقادرا کەس بە قەی ئەبوونەسر محەمەد لە حەزرەتی شێخ عەبدولقادر نەدەچوو.

وە لە واقیعدا پیاوێکی پایەبەرز بووە. من باوەڕم بۆ ئەوە ئەچێ کــە ئــەو شــێخانەی باسیان نەکردووە ئاگاداری نەبوون و تەماشای کتــێبی مێژوونووسانیشــیان نــەکردووە، ئەنا بە ڕێزەوە ناویان دەنووسی.

## کوڕەکانی شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر

ئێمە لەم باسەدا پشت بە کتــێبی (فــتح المــبین)ی نووســراوی شــێخ زەهیرەدیــن عەبدوڕەحمانی حەسەنی و (قلائد الجواهر)ی دانراوی تاذفی ئەبەستین.

### محەمەد (هەتتاک)

کوڕی عەبدولعەزیز، کوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر. ئەم زاتە یەکێ بووە لە زانا و پیاوە گەورەکان، دەرزی حەدیسی پیرۆزی لە گەلــێ زانــا گــەورەکانی دەوری خــۆی

وەرگرتووە و دەرزی حەدیس و ئەدەبیان لێ وەرگرتووە. بە (هتاک) ناوبانگ دەرکردووە، چونکە ئەسرار و نهێنی زانیاریی دەرخستووە.

لە (قلائد الجواهر)ا ئەڵێ: لە نەوەی شێخ عەبدولعەزیزە شێخ محەمەد، هەروەها (زهرە)ی خۆشکی کە خوێندەوار و زانا بووە و جێگەی دانیشتنیان (حیال) بووە و شێخ محەمەد هەر لە (حیال) کۆچی دوایی کردووە و گۆڕیشی لەوێیە، بەڵام سەییدە زهرەی خوشکی لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێ بە خاک سپێرراوە.

**شەرشیقی کوڕی شێخ محەمەد هەتتاک**

لە فەتحولموبیندا ئەڵێ: حافیز ئەبوعەبدوڵلا زەهەبی فەرموویەتی: شەرشیق لە ساڵی ٦٥٢دا بە جوانی لە تەمەنی بیست و چوار ساڵیدا لە جیهان دەرچووە.

بزانن! دیارە کە شێخ عەبدولعەزیز تەشریفی رۆیشت بۆ جەنگ لەگەڵ کافرە سەلیبی‌یەکاندا جیهادێکی چاکی کرد لە عەسقەلان و عەسقەلانی گرتەوە، پاش ئەوە هات بۆ کوردستان و لە نزیکی ئەو شوێنی مەرقەدی ئێستەیە لە لای (عەقرە)دا دانیشت و ئەو وڵاتەی کرد بە نیشتمانی خۆی.

**شەمسەدین محەمەد (الاکحل)**

کوڕی محەمەدی هەتتاک... ئەم زاتە لە مانگی رەمەزانی پیرۆزی ساڵی ٦٥١ی کۆچیدا لە جێگە و نیشتمانی خۆیدا لە (حیال) لەدایک بووە.

ئەم زاتە حەدیسی پیرۆزی لە فەخری نەججار وەرگرتووە، هەروەها لە مەککەی موکەڕەمەدا لە عەبدوڕەحیمی کوڕی زەجاج و لە مەدینەی مونەوەرەدا لە عەفیفی وەرگرتووە. وە لە بەغدا و شاما حەدیسی پیرۆزی بۆ موسوڵمانان گێڕاوەتەوە... چەن جار چووە بۆ حیجاز بۆ حەج و زیارەتی پێغەمبەر -د-. وە نەوەکانی دەرزیان لێ وەرگرت و حەدیسیان لێوە ریوایەت کرد، وەکوو حیسامەدین عەبدولعەزیز و بەدرەدین حەسەن و عیزەدین حسەین و... غەیری ئەوانیش.

ئەم زاتە پیاوێکی چاک و لەخوداترس و خاوەن پلە و پایە بووە و شوێنکەوتووری زۆری بووە و لە هەموو لایەکەوە دیدەنیان کردووە لەبەر رێز و زانیاریی.

لە (قلائدالجواهر)دا ئەڵێ: کـە شـێخی مێژوونـووس شەمسـەدین کـوڕی ئەسـیری جەزەری لە مێژووەکەیدا نووسیویەتی: لە ڕۆژی شـەمەی هەشـتی ڕەمـەزانی ساڵـی ۷۲۲ی کۆچیدا شەمسەدین محەمەد کوڕی حیسامەدین شەرشیق ... هاتە دیمەشـق و لە زاوییەی سالاری‌یەدا دابەزی بە هیوای سەفەری حەج. وە بۆی گێڕاینەوە کـە لـە شەوی جومعەی نیوەی ڕەمەزانی ساڵی ٦٥١دا لە نیشتمانی خۆیدا لە دایک بـووە. وە فەرمووی: گۆڕی باوکی وا لە (جبال)دا لای خۆیان، هەروا باپیرە گـەورەی ئەبووبـەکر عەبدولعەزیز. وە جارێکی تر لە ساڵی ٦٨٤دا حەجی کـردووە و فـەرمووی: بـاوکم لـە سەر ئەوە ناونراوە بە (شەرشیق)[1] کە پیاوچاکێک لەو سـەردەمەدا خـەوێکی بینیـوە و ناوی شەرشیق بووە.

وە باسی ئەوەی کردووە پاش ئەوەی خەڵک پێیان زانی ـ گەورە و بچووک و ناودار و پیاوانی شار ـ زۆر ڕێزیان گرت و گەلێ لە پیاوانی دیاریی چوونـە سـەر ڕێبازەکـەی. هەروا لە ڕۆژێکی تایبەتیدا هاتـە مزگـەوتی ئەمـەوی، کـە ڕۆژی تـەواوکردنی دەرزی حەدیسی بوخاری بوو بە موسوڵمانان لە لایەنی (محدث)ی ناسراو (ابن البرزالـی)یـەوە کە بە سەر حاجیانیدا دەخوێندەوە و خەڵکێکی زۆر بیستیان.

وە ئەفەرموێت: (ابن الحجر)ی عەسقەلانی لە کتـێبی مێـژووی (الـدرر المنتشـرة)دا ئەڵێ: ئەو زاتە قورئانی لەبەر بووە و شەرعزان بووە و لە دیمەشقدا حەدیسـی پـیرۆزی لە (ابن النجار) و غەیری ئەویش بیستووە و هە لە دیمەشقدا و لە بەغدا و (جبال)یشدا، کە وڵاتی خۆیان بـووە، حەدیســی بـۆ تەلەبـە ڕیوایـەت کـردووە. وە بـە پیاوچـاکی و لەخوداترسی و سەخاوەت بەناوبانگ بووە. وە ئەو زاتە خۆی و خێزانەکەی بە خزمەتی ئیسلام و موسوڵمانان ناسراون.

خاوەنی (قلائدالجواهر) ئەڵێ: ئەم باسانەم لە کتێبی (الروض الزاهر) وەرگرتووە.

### بەدرەدین حەسەن کوڕی محەمەد ئەکحەل

حافیز محەمەدی کوڕی ڕافیع ئەڵێ: بەدرەدین حەسەن حەدیسی لـە بـاوکی‌یـەوە گێڕاوەتەوە و ڕۆیشتووە بۆ بەغدا و هات بۆ شام لە سەفەری حەجدا لە ساڵی ٧٤١دا و لە زاوییەی سالاری‌یەدا دابەزی، پاش چەن ڕۆژێ ڕۆیشت بۆ حەج. کاتێ کە لە حەج

---

١ ـ وا ئەزانم ئەم ناوە لە (شیرشیک) واتە (الاسد الشاطر فی الصولة) وەرگیراوە.

گەڕایەوە هەم هاتەوە شوێنەکەی پێشووی خۆی و مـن چـووم بـۆ لای و چـاوم پێـی کەوت، لە راستیدا پیاوێکی بە ویقار و خاوەن سەخاوەت بوو و لە هـەموو (مرویـات)ی خۆیدا ئیجازەی پێدام.

وە (ابن حجر)ی عەسقەلانی لە (انباء الغمر بانباء العمـر)دا ئەڵێ: بەدرەدین حەسەن پیاوێکی بەڕێز بوو لە شارانی وڵاتی خۆیانا. لەساڵی ٧٧٥دا کۆچی دوایـی کـرد، پـاش ئەوەی تەمەنێکی زۆری لە خزمەتی ئیسلامدا رابوارد.

**عەلادین عەلی کوڕی شەمسەدین محەمەد**

ئەم زاتە لە وڵاتی خۆیەوە دەرچووە بۆ میسـر و لـەوێ نیشـتەجێ بـووە و خـۆی و نەوەکانی لە میسردا دامەزران، پاش ئەوە کە (ملک ئەشرەف برسای) لە (ئامەد)ەوە وە هات بۆ قاهیرە.

جا خاوەنی (الروض الزاهر) ئەڵێ: شێخمان شێخ عەلادین پیـاوێکی بـە هیمـەت و هەیبەت و وەقار بووە، کەم هەڵـکەوتووە کەسـێ بـۆ کـارێ رۆییشـتبێ بـۆ لای و بـە نائومێدی گەڕابێتەوە. لە چەرخی خۆیدا لە میسردا لە گەورە پیاوە ناودارەکانی میسـر ناسراوە. دوو جار حەجی کردووە، بە گوێرەی وتەی ئاگـاداران لـە ساڵـی ٧٨٤ یـا ٥ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ٨٥٣دا بە تاعوون لە جیهان دەرچووە و لە شـوێنێکدا کە بە (سیدی عدی بن مسافر) ناسراوە لە (قرافە)ی میسردا نێژراوە.

پاش خۆیشی خێزان و پەیوەندانی لەوێدا نێـژراون. هـەروەها شـێخ عـەلادین کـە شەمسەدین محەمەدی ئامۆزایەتی لەو شوێنەدا بە خاک سپێرراوە لەگـەڵ کوڕەکانیـا: شێخ شەرەفەدین مووسـا و شـێخ بـەدرەدین. وە کـۆچی دوایـی شـێخ شەمسـەدین محەمەد لە چواری سەفەری ساڵی ٨٤٠دا بووە و کوڕەکانیشی ساڵێ پاش ئەو ساڵە بە هۆی تاعوونەوە بە شەهیدی لە جیهان دەرچوون.

وە شێخ عەلادینی خاوەن تەرجەمە کوڕێکی لە تاعوونی ساڵـی ٨٤١ رزگـار بووبـوو لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ حیجاز، کەچی بە خواستی خودا، لە رێگـەدا لـە پـێش ئـەوەدا بگەن بە (طوور) تووشی تاعوون بوو و پێش ئەوە بگەن بە طوور کۆچی دوایـی کـرد و دوایی لە ژوورێکی مزگەوتی طووردا بە خاک سپێررا. ئەو کوڕە تەمەنی لە بیست ساڵ کەمتر بوو.

وە پاش ئەو ڕووداوە خودا چەن کوڕی دا بە شێخ عەلادین، هەندێکیان لە جیهان دەرچوون و هەندێکیان ماون. کاتێ شێخ عەلادین کۆچی دوایی کرد دوو کوڕ و دوو کچی لێ بەجێما، یەکێ لە کوڕەکان پاش کۆچی دوایی باوکی مرد، ئەوانی دیکە ماون.

وە شێخ عەبدولقادری برای شێخ عەلادینیش ساڵی ٧٤١ بە تاعوون لە شاری دیمەشقدا کۆچی دوایەی کرد و لە گۆڕستانی (صوفیە)دا بە خاک سپێررا و کەسی لە شوێن بە جێ نەماوە.

وە چوونی شێخ عەبدولقادر بۆ شام پاش گەڕانەوەی (ملک اشرف برسای) بوو لە شاری (ئامەد) لە نۆزدەی موحەڕەمی سەرەتای ساڵی ٨٣٦ی کۆچیدا.

وە لە (قلائد الجواهر)دا ئەڵێ: شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی شێخ عەبدولقادر نەوەی لێ بەجێماوە و لە شوێنی خۆیانا و لە سەر جێگە و ڕێگەی خۆیان بە ڕیزەوە ماونەتەوە. لەوانە: شێخ حیسامەدین کە پیاوێکی خوو و ڕەوشت جوان و خاوەنی سوفرە و خوان و ڕێزە.

هەروا لە (قلائد)ا ئەڵێ: لە وڵاتی حەلەبدا لە دێی (باعو) سەر بە (عزاز) کۆمەڵێ لە نەوەی شێخ عەبدولقادر هەن پێیان ئەڵێن: (اولاد الشیخ) لەوێدا تەکیەیان هەیە و زۆر بەڕێزن و بە قسەی خۆیان لە نەوەی شێخ عیسای کوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادرن.

لەو شێخانی دێی (باعو)یە شێخ عەبدولعەزیز کە پیاوێکی خاوەن پایە و ڕێز و نان و خوان بووە و هەر لەو گوندەدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی باوک و باپیرەیدا بە خاک سپێرراوە.

وە شێخ ئەحمەدی برای عەبدولعەزیز کە ئینسانێکی خوو و ڕەوشت جوان و نەفس بەرز بووە و شێخ عوسمان کوڕی شێخ عەبدولعەزیز کە پیاوێکی بەرز بووە و شێخ مووسای برای عەبدولعەزیز و عەبدوڕەزاق کوڕی شێخ مووسا و شێخ زەینەدین عومەر کە لە ئەهلی زانیاری و فەزل بووە و گەلێ نەوەی لە دیمەشقدا هەیە. لەوانە سەیید عەبدولقادر و سەیید ئەحمەد کە لەو شوێنەدا نەقیبی ئەشراف بوون.

هەم لە (قلائدالجواهر)ا ئەڵێ: لە قاهیرەدا لە کۆنەوە تا ئێستە کۆمەڵێ هەن هەر زۆر ئەبن و جێگەیان زاوییەی (قرافە)یە کە بە (سیدی عدی بن مسافر) ناسراوە. نازانم

ئەوانە لە نەوەی شێخ عیسای کوڕی شێخ عەبدولقادرن، کە لە قاهیرەدا کۆچی دوایی کردووە ـ وەکوو حافیز ئیبنونەججار لە مێژووەکەیدا ئەڵێ ـ، یا خود لە نەوەی شێخ عەبدولعەزیزن کە لە (جبال)ەوە هاتن بۆ میسر وەکوو باسمان کردن.

هەر لە (قلائد)ا ئەڵێ: لە شاری بەغدادا کۆمەڵێ هەن لە مەقامی شێخ عەبدولقادردا، داوای ئەوە ئەکەن کە لە نەوەی حەزرەتی عەبدولقادرن ئەوانەی ڕێزیان هەیە لە لای خاس و عام.

وە من نووسەری ئەم کتێبە لە سەر ئەوەی بۆم روون بووەتەوە ئەڵێم: نەوەکانی حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی لە نەتەوەی شێخ ئەبوبەکر عەبدولعەزیزی کوڕی شێخ لە ئەوەڵەوە تا ئەمڕۆ خاوەن تەوەلی‌یە بوون لە سەر بارەگای حەزرەتی عەبدولقادر و لە سەر مزگەوت و خوێندنگا و کتێبخانە و ئەوقافی سەر بەو مەقامە و تەنانەت بەشێ لە ماڵی خۆیان لە ڕێگەی خودادا وەقف کردووە.

وە نەقیبەکانی بەغدا لە نەتەوەی شێخ عەبدولعەزیز لە سەر ئەم ریزەن:

یەکەم: شێخ زەینەدین، کوڕی شێخ محەمەد شەرەفەدین، کوڕی شەمسەدین محەمەدی هەتتاک کوڕی شێخ عەبدولعەزیز. ئەم پیاوە ئەملاکی خۆی وەقف کردووە بۆ خەرجی کار و باری مزگەوت و خوێندنگای گەیلانی.

ئەم پیاوە لە ساڵی ١٠٨٥ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە نزیکی مزگەوتی گەیلانیدا بە خاک سپێرراوە.

دووەم: شێخ نوورەدین، کوڕی شێخ وەلی‌یەدین، کوڕی زەینەدین کە یەکێ بووە لە پیاوچاکان و ئیمام بووە لە مزگەوتی گەیلانیدا و لە ساڵی ١٠٧٥دا کۆچی دوایی کردووە.

سێهەم: شێخ حیسامەدین، کوڕی شێخ نوورەدین کە نموونەیێ بووە لە تاعەت و لەخوداترسی و لە ساڵی ١١٦٣ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

چوارەم: شێخ محەمەد دەروێش کوڕی شێخ حیسامەدین کە پیاوێکی ڕەشت جوان بووە، لە ساڵی ١١٧٥ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

پێنجەم: شێخ زەینەدینی بچووک کە شەرعزان و (محدث) بووە، لە ساڵی ١١٩٢ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

شەشەم: شێخ مستەفای کوڕی شێخ زەینەدین کە خاوەنی خێر و چاکە بووە، لە ساڵی ١٢٠١ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

حەوتەم: سەیید سلێمان کوڕی سەیید مستەفا کە پیاوێکی شەرعزان بووە، لە ساڵی ١٢٣٥ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

هەشتەم: سەیید موورادی کوڕی سەیید عوسمان، لە ساڵی ١٢٦٨ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

نۆهەم: سەیید عەلی کوڕی سەیید سولەیمان، کە لە ساڵی ١٢٨٩ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە. ئەم زاتە بە فەرمانی سوڵتانی سەرپەرشتی ئەوقافی قادرییەی کردووە، ئەم فەرمانەی لە ساڵی ١٢٦١ی کۆچیدا وەرگرتووە.

دەهەم: سەیید سولەیمان کوڕی سەیید عەلی نەقیب، ئەم زاتە زۆر بەڕێز بووە، لە مانگی (ذی الحجة)ی ساڵی ١٣١٥ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

یازدەهەم: سەیید عەبدوڕەحمان کوڕی سەیید عەلی کە زاتێکی زانا و خانەدان و خێرۆمەند و خاوەن پلە و پایە بووە، لە ساڵی ١٣٤٥ی کۆچیدا جیهانی بەجێ هێشتووە.

دوازدەهەم: سەیید مەحموودی حیسامەدین کوڕی سەیید عەبدوڕەحمان کە لە ساڵی ١٩٠٦ی زایینی‌دا کۆچی دوایی کردووە.

سیازدەهەم: سەیید ئەحمەد عاسیمی گەیلانی کوڕی سەیید عەبدوڕەحمان کە لە ساڵی ١٣٧١ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

چواردەهەم: سەیید ئیبراهیم سەیفەدینی گەیلانی کوڕی سەیید مستەفا، کوڕی سەیید سولەیمان کە لە ساڵی ١٣٨٠ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە. وە لە پێش کۆچی دوایی ئەم زاتەدا سەیید بورهانەدینی کوڕی سەیید عەبدوڕەحمان و سەیید یوسفی کوڕی سەیید عەبدوللای بڕای سەیید عەبدوڕەحمان سەرپەرشتی کردنی ئەوقافی قادری‌یەیان گرتە دەست. وە سەیید بورهانەدین لە ساڵی ١٣٩٣ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

لە پاش کۆچی دوایی ئەم سەیید سالمی کوڕی سەیید عەبدوڕەحمان لە جێگەیدا دانیشت، وە لە پاش کۆچی دوایی ئەو لە ساڵی ١٤٠١ی کۆچیدا سەیید ئەحمەد

موزەففەری، کوڕی سەیید مەحموودی، کـوڕی سـەیید عەبـدوڕەحمان لـە جێگەیـدا دانیشت.

ئێستە کە مێژووی ١٤٠٣ی کۆچی و ١٩٨٣ی زایینییـە سـەیید یوسـف و سـەیید ئەحمەد موزەففەر بە یەکەوە سەرپەرشتی ئەوقافی قادرییە ئەکەن.

ئەم سەیید یوسفە پیاوێکی وریا و لێهاتوو و بە ئیدارە و شارەزایە، لە ماوەی بیسـت ساڵی سەرپەرشتی خۆیدا ئەم بارەگای بە تەواوی لە بناغەوە تازە کردەوە بـەبێ ئـەوە (منارە) و گومەز و شوێنەواری کۆنی بگۆڕێ. خـودا یارمـەتییان بـدا و سـەرکەوتوویان کات.

هەروەها چەن کەسێ لە سەییدەکانی نەتەوەی شێخ عەبدوڕەزاق کوڕی حـەزرەتی شێخ عەبدولقادر نەقابەتی ئەشرافیان لە بەغدادا بووە، وەکوو ئەمانە:

یەکەم: سەیید عەبدوڕەحمان فەیزوڵلا نەقیب بووە لە سـەر ئـەو شـوێنە پـیرۆزە و خزمەتی کردووە، تا لە ساڵی ١٢١٢دا کۆچی دوایی کردووە.

دووەم: سەیید عەلیی گەورە باوکی خاتوون عاتیکەی گەیلانی، کە خاوەنی ئـەوقاف و خوێندنگا و کتێبخانە بووە لە نزیکی مزگەوتی شێخ عەبدولقادری باپیرە گەورەیەوە. وە عەلی عەلادینی موسڵی مامۆستای خوێندنگاکەی بووە و چـەن زانـای گـەورە لـەو خوێندنگا دەرچوون و پێگەییشتوون، لەوانە: ئەبوسەنا شەهابەدین سەیید مەحموودی ئالووسی دانەری تەفسیری (روح المعانی). ئەم خاتوون عاتیکە بڕیاری ئەوەی داوە کـە هەر کەسێ (متولی) ئەوقافی حـەزرەتی شـێخ عەبـدولقادر بـێ (متـولی) خوێنـدنگا و کتێبخانەکەی ئەویش بێ و خۆی لە گەڕانـەوەی سـەفەری حەجـدا لـە شـام کـۆچی دوایی کردووە. وە سەیید عەلی باوکی لە ساڵی ١٢٨١ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

سـێهەم: سـەیید عەبدولعـەزیزی کـوڕی سـەیید عەبـدولقادر، ئـەمیش نەقابـەتی ئەشرافی بووە و ساڵی ١٢٤٦ی کۆچی بە تاعوون لە جیهان دەرچووە.

چوارەم: سەیید مەحموودی کوڕی سەیید زەکەریا، ئەمیش نەقابەتی ئەشرافی بووە لەگەڵ تەولییەی ئەوقافی قادرییەدا و لە ساڵی ١٢٥٨ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە. ئەم زاتانە لە نەتەوەی شێخ عەبدوڕەزاقی کوڕی حەزرەتی عەبدولقادر بوون.

وه له سەر زانیاریی راستەقینەی خۆم ئێستە گەلێ لە نەتەوەی شێخ عەبدولقادر لـە وڵاتی ئەفغاندا هەن. وه سەیید ئەحمەد ناو کە یەکێکە لەوان لە سەردەمی خۆمدا دوو جار هاتووە بۆ بەغدا بۆ زیارەت.

وه شـێخ عەبـدولقادر گـەلێ نەتـەوەی لـە وڵاتی (حضـرموت)دا هەیـە و سـەیید عەبدوڕەحمان کە زاتێکی چاک و لەخوداترس و بەڕێزە یەکێکە لەوانە و لەوێوە چـووە بۆ (سعودیە) و ئێستە لە شاری (جدە)دا دانیشتووە و لە سەردەمی منـدا دووسـێ جـار هاتووە بۆ بەغدا بۆ زیارەت و پاش چەند رۆژێ گەڕاوەتەوە بۆ شوێنی خۆی.

جا بۆ یادگار ناوی (متـولی) و نەقیبـەکانی نەتـەوەی شـێخ عەبدولعـەزیزی کـوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادرم بە هۆنراوەیی نووسیوە هەتا شێخ زەینەدینی گەورە کە لە ساڵی ٩٤٦ی کۆچیـدا فـەرمانی نەقابـەتی لـە ئەسـتەمبووڵ لـە سـەردەمی سوڵـتان سلێمانی قانوونیدا وەرگرتووە. وه لە شێخ زەینەدین بەرەوژووریش ناوی رشتەکەم تـا حەزرەتی فەخری عالەم نووسیوە و بەم شێوە دەڵێم:

خـاوەن تـەولی‌یـە و نەقابـەی نـادر
لـە سـەر مـەقامی شـێخ عەبـدولقادر
یوسـف سـەلیلی عەبدولـڵای مەسـعوود
ئەحمـەد موزەففـەر وەلـەدی مـەحموود
بورهـان و سـالم لـە عەبـدوڕەحمان
عەبـدوڕەحمانی عەللامـەی زەمـان
عـەلی سـەلمان و سـەیید مسـتەفا
ئـەمجار زەینـەدین مەعـدەنی وەفـا
محەمـەد دەروێـش جـا حیسـامەدین
(ابـن نورالـدین) (ابـن ولـی الـدین)
ئـەمجار زەینـەدین خـاوەنی فـەرمان
لـە عەهـدی عـالی سوڵـتان سـولەیمان
جـا شـەرەفەدین ئـەمجا شەمسـەدین

محەمـــەد ئەکحـــەل عـــالمی ئـــەمین
جا حیسامەدین مەشـــهوور بـــە شەرشـــیق
محەمـــەد هـــەتتاک مورشـــیدی تـــەریق
جـــا عەبدولعـــەزیز غـــازیی بـــە ئیمـــان
لەگـــەڵ ســـەلیبیی شـــاری عەســـقەلان
شـــێخ عەبـــدولقادر پـــیری خودادۆســـت
کوڕی شێخ مووسا شێری جەنگیدۆســـت
عەبدولـــلا و یـــەحیا و محەمـــەد داوود
مووسا و عەبدوڵلا هەم مووسای مەسعوود
جا عەبدوڵلای مـەحز، حەســـەن (مثنـــی)
جـــا ئیمـــام حەســـەن پـــاکی دڵ مینـــا
نەســـلی حەیـــدەر و فاتیمـــەی زەهـــرا
(بضـــعه)ی رەفیعـــەی (ســـید الـــوری)
ســـەلات و ســـەلام تـــا ســـاتی قیـــام
لە ســەر خــۆی بێــت و ئوممــەتی کــیرام

## رشتەی تەریقەیان

رشـــتەی تەریقـــەی ئـــەم بوزورگانـــە
ئـــەڕوا و ئەگاتـــە ئـــەو پـــیرە جوانـــە
(قطـــب العـــارفین)، (غـــوث الســـالکین)
عەبـــــدولقادری مەنبـــــەعی تـــــەمکین
لـــە ئـــەبوو ســـەعید مەعـــدەنی ئـــەدەب
ئـــەویش لـــە عـــەلی هـــەکاری نەســـەب

لــــە (ابــــوالفرج) تەرسووســــی ماجیــــد
ئــەویش وەری گــرت لــە عەبدولواحیــد
ئەویش لە شـیبلی، شـیبلی لـە جونەیـد
جونەید لە (سەری)ی لە دنیـا بـێ قەیـد
سەریی لە مەعرووف، مەعرووف لـە داوود
داوود لـە حـەبیب عەجـەمی مەسـعوود
ئـەو لـە حەسـەنی بەسـری پـڕ ئـەنوار
حەسـەن لـە عـەلی حەیـدەری کـەڕار
حەیـدەر لـە زاتی سـەییدی سـەروەر
(علیــه الســـلام کقطــر المطــر)
(و علـــی الآل مـــع الاصـــحاب)
(الـــی زمـــان عـــرض الحســـاب)
ئێمـــەیش نیســـبەتمان هەیـــە بەوانـــە
نیسـبەتیان هەیـە بـەو شـاهە جوانـە
تەبعەن ئـەو شـاهەیش بەچکـەی بابایـە
یـــانی مەنســـووبی ڕەسوولولـــلایە
ڕەســـوولێکی وا ڕەئووفـــە و ڕەحـــیم
هـات لای خـوداوە بـە فـەیزی عـەمیم
فـەیزی خـۆی باراند بـە سـەر جیهانـا
چ لـــە ئاشـــکرا و چ لـــە پـــەنهانا
بـــارانێکی وا نمێکـــــی بەســــە
بۆ ئیحیای ڕۆحـی ئـەو کەسـەی کەسـە

خــودا بــۆ خــاتر ڕەهبــەری ئەقــدەس
ئەگــەر ناکەســم بمگــۆڕە بــە کــەس
نمــیّ لـــەو فـــەیزە بنێـــرە بۆمـــان
بــۆ (نــامی) بەســە بــۆ دیــن و ئیمــان

وە لە نەتەوەی شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر- خ- ڕشـتەی سەیدەکانی نـەهری‌یـە کـە ئەگـەن بـە شـێخ محەمـەد هـەتتاک حـەزرەتی شـێخ عەبدولعەزیز، وەکوو شەجەرەکەمان بەم جۆرەی خوارەوە بەرچاو کەوتووە:

لە حەزرەتی شێخ عەبدولعەزیز شێخ محەمەدی هەتتاک، وە لە شـێخ محەمـەدەوە سەیید حاج، وە لە سەیید حاجەوە سەیید عەبدوڵلا و لە سـەیید عەبدوڵـلاوە سـەیید ئیبراهیم و لەم زاتە سەیید محەمەد و لەم زاتەوە سـەیید حـاجی دوەم و لـەم زاتـەوە سەیید ئیبراهیمی دوەم و لەم زاتەوە سەیید ساڵح و لەم زاتەوە سەیید ئەحمەد و لـەم زاتەوە سەیید تاها و لەم زاتەوە سەیید عوبەیدیللا و لەم زاتەوە سەیید عەبدولقادر و لە سەیید عەبدولقادرەوە سەیید عەبدوڵلا.

ئەم زاتانە لە شێخ سەییدحاج کوڕی سەیید محەمەد هەتتاکەوە تـا ئەگاتـە حـاجی سەیید عەبدوڵلا هەر یەکەیان پێویستی بە هەندێ تەرجومەی ژیان هەیە.

بـە تایبـەتی حـەزرەتی شـێخ تاهـا کـە خەلیفـەی حـەزرەتی مـەولانا خالیـدی نەقشبەندی بووە و مورشیدێ بووە کە جیهانـێ بـە هـۆی ئـەنواری قـەلب و سـەفای دەروونی پاکی ئەوەوە پاک و ڕووناک بووەوە. وە گەلێ خولەفای خاوەن پایە و مایەی بوون لە زانای بەرز و شێخ و سەییدی بەڕێز. وە گەلێ ناودار و پیاوچـاک لـە ناوچـەی نەهرییە و دەوروبەری و لە سابلاغ و شنۆ و لاجان و ناوچەی تەرگەوەر و مەرگـەوەر و بگرە لە ناوچە دوورەکانی دیکەیشەوە هاتوون بۆ خزمەتی.

وە یەکێ لەو خەلیفە خاوەن پلانە شـێخ عوبەیـدیللای کـوڕی بـووە کـە پیـاوێکی داگری زانیاری و ئەدەب و حەسەب و نەسەب و ڕێبازی نەقشبەندی و قـادری بـووە و ڕووناکی و فەیزەکانی بە کوردستاندا بلاو بووەتەوە.

ئەمە بێجگە لە خزمەتە ماڵـی‌یـەکانیان کـە پێشـکەش بـە گـەل و موسوڵـمانان و زانایانی ولاتیان کرد کە بە ڕاستی ئێمە ناتوانین بەیانی بکەین. وە ئەو خانەدانە چـەن

خانەدانی لێ بووەتەوە، وەکوو خانەدانی شێخ کەمال کە ئـەو خانەدانـەیش خانـەدانی شێخ رەشیدی لۆلانی لێ بووەتەوە.

جا ئەگەر خودا یارمەتی داین تەرجومەی ئـەو زاتـە بەڕێزانـە دەنووسـم، وە ئەگـەر دەستم نەڕۆیشت با هەر هیچ نەبێ ناویان لەم کتێبەدا بنووسین.

وە بێجگە لە ساداتی نەهری‌یە، نەمان بیسـتووە. لـە نـەوەکانی شـێخ عەبـدولقادر، بنەماڵەیێ لە کوردستانی عێراقدا ببـێ. بەڵـێ شـێخەکانی چوێسـە و مێرگـەدرێژ لـە قەزای پێنجوێندا داوای ئەوە ئەکەن کە لە نەتەوەی حـەزرەتی شـێخ عەبـدولقادرن و شێخ قادری چوێسە هات بۆ زیارەتی حەزرەتی شێخ عەبـدولقادر و هاتـە خوێنـدنگای گەیلانی و قسەی بۆ کردم و وتی:

یەکەم کەسێ لە نەتەوەی حەزرەتی شێخ عەبدولقادر هاتووە بـۆ قـەزای پێنجـوێن شێخێک بووە ناوی شێخ مستەفا بووە، وتوویەتی: کـوڕی شـێخ ساڵـح[1] کـوڕی شـێخ عەبدوڕەزاقی کوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادرە.

ئەم شێخ مستەفا یەکەم ژنێ کە مارەی کردووە بێـوەژن بـووە و دوو کـوڕی بـووە: محەمەد و ئەحمەد.

محەمەد باپیرە و سەرڕشتەی شێخانی (کۆنەپۆشی)یە و ئەحمەد باپیرەی شـێخانی (عازەبانی)یـە ـ کـە دێیەکـە سـەر بـە قـەزای دەربەنـدیخان و لـە نزیکـی چنـارە و ئەحمەدبرندەدایە ـ لەگەڵ ئەوەیشدا کە شێخانی عازەبانی خۆیان داوای ئەوە ئەکـەن کە لە نەتەوەی حەزرەتی عەبدولقادرن، هـەروا شـێخانی کۆنەپۆشـی داوای سـیادەت ئەکەن، وە من شەجەرەی ئەوانم نەدیوە تا بزانم چۆنە.

وە شێخ قادر ئەڵێ: پاش مردنی ئەو ژنە بێوەژنە شێخ مستەفا کچێکی لە نەتـەوەی (پیریوونسی) هەنجیران مارە کردووە، وە لەو ژنە دوو کوڕی بووە: سەعدی و جونەید.

جا شێخ مستەفا لە دێی (خونیانە) لە جیهان دەرچـووە و گـۆڕی لەوێیـە. وە پـاش مردنی شێخ مستەفا شێخ سەعدیی کوڕی دەوامی لە سەر خوێندن کردووە تا بووە بـە زانایەکی موناسب، دوای ئـەوە چـووە لـە دێـی چوێسـە نیشـتەجێ بـووە و خـەریکی

---

١ـ نەمدیوە کە عەبدوڕەزاق کوڕی سالح ناوی ببێ، بەڵام نەسری کوڕی عەبدوڕەزاق (ئەبوو سالح) کونیەی بووە، یانی کە سالح کوڕی نەسری کوڕی عەبدوڕەزاقە.

خزمەتی دین و زانیاری بووە و ئەم زاتە باپیرەی شێخانی چوێسەیە وەکوو لە شەجەرەکەدا نووسراوە.

وە شێخ جونەید چووە بۆ دێی (مێرگەدرێژ) و لەوێ دانیشتووە و نەتەوەی لێ کەوتووەتەوە و شێخەکانی مێرگەدرێژ لە نەتەوەی ئەون.

وە حاجی شێخ قادر شەجەرەی نەسەبی خۆیانی بۆ ناردم کە بەم شێوەیە:

السيد عبدالقادر، ابن السيد طاها، ابن السيد شمس‌الدين، ابن السيد محمود، ابن السيد طاها، ابن السيد شمس‌الدين، ابن السيد سعدى، ابن السيد قلندر، ابن السيد مصطفى، ابن السيد صالح، ابن السيد عبدالرزاق، ابن حضرة السيد الشيخ عبدالقادر.

## شێخانی دێی نزارە لە قەزای پێنجوێن

شێخ جەمال ناوی، کوڕی شێخ ئەحمەدی، کوڕی شێخ مەحموودی نزارە شەجەرەی شێخانی نزارەی بۆ هێنام، لەو شەجەرەدا لە شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عومەری نزارەیی‌یەوە نەسەبەکەیان تا حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی نووسرابوو بەمشێوە:

الشيخ محمد، ابن الشيخ عمر، ابن الشيخ وسيم، ابن الشيخ عبدالعزيز، ابن الشيخ محمد، ابن الشيخ طاها، ابن الشيخ شمس‌الدين، ابن الشيخ سعدى، ابن الشيخ قلندر، ابن الشيخ مصطفى الملقب بـ(کۆنەپۆشی) ابن الشيخ صالح، ابن الشيخ عبدالرزاق، ابن الشيخ عبدالقادر.

وە ئەو شەجەرەیە مۆری گەلێ پیاوی گەورە و دیاریی وەکوو شێخ مەحموودی موفتی و شێخ حسەینی قازیی و سەیید عەلی غالبی بەرزنجی و سەیید ئەحمەدی تیماری بەرزنجی و شێخ مەعرووفی کوڕی سەیید ئەحمەدی ئیمامی گڵەزەردەیی بەرزنجی و سەیید ئەحمەدی نەقیب و شێخ مستەفای بەرزنجی و سەیید حەسەنی سوورێنی ... پێوەیە. ئەم سەیید حەسەنە نووسیویەتی: خۆم لە مورشیدی خۆم حەزرەتی کاک ئەحمەدی شێخم بیستووە کە ئەو شەجەرە راستە. هەروەها مۆری سەیید حەسەنی زەنگنە و شێخ مەعرووفی قەرەداغی مودەڕیس لە سلێمانی و شێخ عەبدوسەلامی مودەڕیس لە مزگەوتی شێخ سەلامی پێوە بوو.

وە ئاشکرا و زانراوە لە لای ئەهلی ئەو ناحیەی نزارە کـە شـێخ مـەحموودی نـزارە، کوڕی شێخ محەمەدی، کوڕی شێخ عومەری کوڕی شێخ وەسیمە.

ئەم شێخ مەحموودە شەش کوڕ و کچێکی لێ بەجێماوە:

یەکەم: شێخ ئەحمەد. لەم شێخ ئەحمـەدە شـەش کـوڕ بـەجـێمـاوە: عەبدولـلا، حسـەین، رەئووف، جەمال، عومەر، عوسمان.

دووەم: شێخ سادق. لە شێخ سادقیش چوار کوڕ بەجێماوە: قـادر، رەشـید، خالیـد، هادی.

سێهەم: شێخ محەمەد، کە دوو کوڕی هەیە: عەتا، محەمەد.

چوارەم: شێخ حەمەسالح، کە کوڕێکی بووە نـاوی شـێخ فـەرەج بـووە و لـە شـێخ فەرەج تاهیر و ئەنوەر بەجێماون.

پێنجەم: شێخ محەمەد ئەمین، کە کوڕێکی لێ بەجێماوە ناوی جەلالە.

شەشەم: شێخ حەمەسەعید، کوڕێکی بووە ناوی عەلی بووە و لـە عـەلی حسـەین و مستەفا و مەحموود بەجێماون.

وە کچەکـەی شـێخ مـەحموود نـاوی مەنیجـە بـووە و شـووی کـردووە بـە بـرای حەمەڕەشید خانی (ونینە).

وە لە سەر ئەم شەجەرە شێخانی چوێسە لە شێخ سەعدی کوڕی شێخ قەلەنـدەردا لەگەڵ شێخانی نزارەدا ئەگەنەوە بە یەک.

## بنەماڵەی شێخانی کاکۆ زەکەریا

وەکوو لە پێشەوە باسمان کرد دوو بنەماڵە لە نەتەوەی ئیمام حەسەنی کوڕی ئیمام عەلی ـ خ ـ بێگومان لە وڵاتی کوردستاندا هەن.

یەکەم: بنەماڵەی شێخەکانی نەهری‌یە کە ئەڕۆنەوە سەر شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی.

دووەم: بنەماڵەی شێخەکانی کاکۆ زەکەریا کە ئەچنەوە سەر شێخ ئەبولحەسەن عەلی تەقی‌یەدینی شازلی. وە ئەویش دیارە کە لە نەتەوەی ئیمام حەسەنی موجتەبایە.

جا لە بەر ئەوە کە من ئەم باسەم لە سەر رووناکی ئەوە نووسیوە کە سەیید عەبدوسەمەدی تووداری لە کتێبی (نورالانوار)دا نووسیویەتی و ئەو زاتەیش موریدی شێخ شەهابەدینی کاکۆزەکەریا بووە، کە لە مێژووی ١٠٣٠ەوە تا نزیکی ١١٠٠ خەریکی ئیرشاد و رێنوومایی بووە .. لەم کتێبەدا رشتەی نەسەبی شێخەکانی کاکۆ زەکەریا لە شێخ شەهابەدینەوە ئەنووسم تا ئەگاتە پێغەمەر ـ د ـ .

جا ئەنووسم:

شیخ شهاب‌الدین، ابن الشیخ رضی‌الدین، ابن الشیخ رضا معین‌الدین، ابن الشیخ موسی، ابن الشیخ محمود الملقب بشجاع‌الدین، ابن الشیخ عبدالرحمن الملقب برکن الدین، ابن الشیخ احمد شیخ‌الاسلام، ابن الشیخ عبدالله الملقب بالصامت، ابن الشیخ محمدصادق المشهور بالفاضل، ابن الشیخ نعمةالله الولی، ابن الشیخ ذکریا الملقب بکمال‌الدین، ابن الشیخ عبدالرحمن الملقب بالاهدل، ابن الشیخ حسن المشهور بالزاهد، ابن الشیخ سلیمان المنزوی، ابن الشیخ خالد، ابن الشیخ حسن الملقب باللبید، لزیادة معرفته وادبه، و بالولید لکثرة اولاده. ابن الشیخ تقی‌الدین علی ابن الحسن الشاذلی، ابن الشیخ عبدالله، ابن الشیخ عبدالجبار، ابن الشیخ تمیم واسمه الشیخ محمد و اشتهر

بالتميم، ابن الشيخ هرمز واسمه محمد باقر، ابن الشيخ حاتم واسمه احمد، ابن الشيخ قصي، ابن الشيخ يونس، ابن الشيخ يوسف، ابن الشيخ يوشع، ابن الشيخ ورد واسمه عبداللطيف، ابن الشيخ بطال واسمه محمدجعفر، ابن السلطان احمد، ابن السلطان محمد، ابن السلطان الامام حسين واسمه عيسى، و سمى بالحسين لشبهه بالامامحسين، و كان يقال فى حقه: عيسى اشبه بالحسين من البنفسج البنفسج، ابن الامام محمد المكنى بأبى على و أبى عيسى والملقب بالحسن المثلث ابن الامام الحسن المثنى، ابن الامام حسن السبط ابن الامام على ابن ابىطالب و فاطمة الزهراء بنت الرسول ـ ص ـ.

كرام لهم عين السيادة منبع
شموس لهم برج الكرامة مطلع
فيا نسبا كالشمس ابيض و اضحا
و يا شرفا من هامة النجم ارفع

## شێخ عەلی تەقیەدین ئەبووحەسەنی شازلی

ئەم زاتە قوتبی زەمان و تاقانەی چەرخی خۆی بووە.

لە شەرحی (البنانی علی الحزب)دا ئەڵێ: شاتیبی پێویستییەکانی خۆی بە هۆی ئەمەوە لە خودا داوا ئەکرد. جا پێغەمبەری لە خەودا بینی و لەم رووە لێی پرسی، پێغەمبەر ـ د ـ پێی فەرموو:

هو ولدي، والولد جزء منالوالد، من تمسک بالجزء فقد تمسک بالکل، سالت الله تعالی بأبی الحسن سألته بی.

## ئادابی تەریقەی شازلییە

لە پاش ئەو ریازەتە کە مەشهورە بە (الفیە) .. بریتییە لە زیکری کەلیمەی تەوحید و زیکری کەلیمەی جەلالە و مولازەمەی سوننەت و بەجێهێنانی ئەورادی سۆفییە و زیکری ئاشکرا بە زمان.

وە فەرموویەتی: لە خودا بێئاگابوون لە هەموو گوناهێ گەورەترە، چونکی هەرچی گوناهـ و تاوانە هەموو لەوەوە پەیدا دەبن کە ئادەمیزاد لە خودا بێئاگا بێ.

وە فەرموویەتی: گەییشتن بە گوناهـ لە خۆشەویستی دنیاوەیە، چونکی هەتا دڵ لە خۆشەویستی دنیا خاڵی نەبێ خۆشەویستی خودای تێ ناچێ. وە تەئسیری خوێندنەوەی (احزاب)ەکانی زۆر روون و ئاشکران. وە دانراوەکانی لە تەفسیری قورئان و حەدیسی پێغەمەر و رەوشتی پیاوچاکاندا مەشهوورن.

حەزرەتی شێخ عەلی تەقی‌یەدین ئەبولحەسەنی شازلی ــخ ــ کوڕی شێخ عەبدولجەببار وەکوو نووسیمان ـ ئەم زاتە لە وڵاتی مەغریبدا لە دایک بووە. کاتێ گەورە بوو کەوتە هاتوچۆ بە شوێن یەکێ لە پیاوچاکاندا تا ئیرشادی بکا، بۆ ئەم مەبەستە لە مەغریبەوە هات بۆ شاری بەغدا.

لە بەغدا گەییشت بە یەکێ لە پیاوچاکان و پێی فەرموو: کە بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی و لەوێ مەبەستی دەست ئەکەوێ. ئەویش لە سەر ئەم قسە گەڕایەوە بۆ مەغریب هەتا گەیی بە خزمەتی قوتبی زەمان (ابن مشیش) و بە هۆی ئەوەوە گەییشت بە مەبەستی خۆی.

ئەو زاتە فەرمانی‌دا بە عەلی ئەبولحەسەن کە بچێ بۆ ئەفریقا و لە (شاذل)دا نیشتەجێ ببێ، وە پاش ماوەیێ لەوێوە بڕوا بۆ وڵاتی توونس. ئەویش فەرمانی مورشیدەکەی بەجێ هێنا. بە کورتی ئەبولحەسەن بوو بە مەرکەزی ئیرشاد لە هەموو وڵاتی مەغریبدا و گەلێ خەڵک بە نووری دڵی پیرۆزی ئەو نوورانی بوون.

وە لە ساڵی ٦٥٦دا لە توونسەوە کەوتە رێ بۆ حیجاز هەتا گەییشتە وڵاتی میسر و لە وڵاتی میسردا مایەوە، جا لە میسرەوە رێ کەوتەوە بۆ حیجاز هەتا گەییشتە سارای (عیناب) لە خاکی میسرا، لە مانگی رەمەزانی پیرۆزدا کۆچی دوایی کرد و هەر لەو شوێنەدا بە خاک سپێررا و ئارامگای لەوێدایە.

لە مێژووی ٦٥٦دا پاش کۆچی دوایی حەزرەتی ئەبولحەسەن .. شێخ حەسەنی کوڕی لە جێگەیدا دانیشت و ئیرشادی ئەکرد، بەڵام زۆربەی کاتی خۆی لە دەرس‌وتنەوەدا بە سەر ئەبرد.

ئەم زاتە گەلێ ئەولادی بوو کە بە هۆی تاعوونەوە مردن و تەنها سێ کوڕیان دەرچوون: تاها و عەبدوڵڵا و خالید. جا تاها لە وڵاتی میسردا دانیشت و عەبدوڵڵا چوو بۆ دیمەشقی شام و لەوێ مایەوە. خالیدیش چوو بۆ کوردستان. ماوەیێ بە گوێرەی توانا لەگەڵ (مغول)ەکاندا لەگەڵ چەند کەسێکدا شەڕی کرد، پاش ئەوە لە ناحیەی

مەریوان دانیشت و خەریکی بەندەیی و تاعەتکردن بۆ خودا بـوو و بـوو بـە جێگـەی باوەڕی موسوڵمانان.

وە لەو سەردەمەدا کە لە مەریواندا دەنگی چاکی و دۆعا گیرابـوونی ئـەم زاتـە بـڵاو بووەوە بە هەموو شوێنێکدا، لەو کاتەدا بـە رێکـەوت مـیرزا ئەحمـەدی کـوڕی مـیرزا محەمەد ناوی هەمەدانی دوچاری نەخۆشی گـولیی ئـەبێ و پزیشـکەکان بۆیـان چـار ناکرێ. ئەویش پشت بە خوا کوڕەکەی دێنێ بۆ خزمەتی شێخ خالید بەڵکو بە دۆعـای ئەو خودا شیفای بۆ بنێرێت. بە میهرەبانی خودا پاش چەن رۆژێ کوڕە لەو ناساغییـە رزگار ئەبێت.

جا میرزا محەمەد لە سوپاسی خـودادا و بەرابـەر بـەم نیعمەتـە کـە کوڕەکـەی لـە خزمەتی شێخ خالیدا شیفای بۆ هات، رۆیشت گوندی (هـەزار کـوورە)ی لـە ناحیـەی کەلاتەرزان بە پارە کڕی و بەخشـی بـە جـەنابی شـێخ خالیـد. جـا شـێخ خالیـد لـە مەریوانەوە چوو بۆ هەزارکوورە و ناوی گۆڕی بە خالدییـە و لەوێـدا خـەریک بـوو بـە بەندەیی کردن بۆ خودا و رێنومایی موسوڵمانان. وە ناوی خالـدییـە بـۆ ئـەو گونـدە مایەوە هەتا سەردەمی شـێخ زەکـەریا، ئـەو ـ ئـەو نـاوەی گـۆڕی و کـردی بـە کـاکۆ زەکەریا. وە ئەمەی خوارەوە دەقی قەباڵەی فرۆشتنی ئەم گوندەیە بە میرزا محەمـەد و بەخشینی لە لایەنی ئەوەوە بە شێخ خالید:

لە یەکەمدا نووسراوە:

بسم الله اشرف الاسماء، بعد الحمد و الصلاة: فان عبدالله ابن المرحوم عبـدالرحیم بـاع ملکه الصحیح الشرعی الموروثی، اعنی قریة (هەزار کـوورە) کلهـا بجمیـع مایسـند الیهـا بمقابل سبعة مثاقیل من الذهب بمیرزا محمد الهمـدانی فقبلـه فـورا، ثـم تسـلمه الـثمن فتسلمه البائع. و الصلاة و السلام علی الشارع.

لە دووهەمدا ـ واتە لە بەخشینەکەدا بە شێخ خالید ـ هەر لە سـووچی کاغـەزی ئـەم قەباڵەدا جەنابی میرزا محەمەدی هەمەدانی بە خەتی خۆی چـەن دێـرێکی نووسـیوە کە ئەمە مەعناکەیانە:

مـن کـە مـوخلیس و دڵبەسـتەی خانـەدانی پێغەمبـەرم مـیرزا موحەممـەدی هەمەدانیم پاش ئەوە کە دێی هەزار کوورەم کڕی و بوو بە موڵـکم و تەسـەڕوفم تێـدا

کرد .. لە ڕێگەی خودادا و لە بەر ڕەزای خودا ئەم دێی هـەزار کوورەمـە بەخشـی بـە شێخ خالید و کردم بە ماڵ و دارایی ئەو.

ئیتر شێخ خالید لەم گوندەدا مایەوە تا کۆچی دوایی کرد، پاش خـۆی سـێ کـوڕی لێ بەجێما: عەبدوڵلا و سەلمان و سولەیمان. وە شێخ سولەیمان لە جێگەی باوکیـدا دانیشت.

## شێخ سولەیمان کوڕی شێخ خالید

شـێخ سـولەیمان لـە بەنـدەیی کـردن بـۆ خـودا و ڕێنومـایی موسوڵـمانان و ئامۆژگاری‌کردنیان و سەرپەرشتی کار و باری کۆمەڵایەتیدا جێگـەی بـاوکی گرتـەوە، بەڵام مەلاچاک نەبووە. تەنها کوڕێکی بوو ناوی حەسـەن و نازنـاوی زاهیـد بـوو. ئـەم شێخ حەسەنەیش کوڕێکی بووە ناوی عەبدوڕەحمان و نازناوی (اهدل) بووە.

شێخ حەسەن بە دەستی (بوداق) ناوی ستەمکار کە لە نەتەوەی (موزدەک) بووە بە پلەی شەهادەت گەییشتووە و کوژراوە. گۆڕەکـەی لەگـەڵ گـۆڕی شـێخ سـولەیمانی باوکیدا وا لە دامێنی قەبری خوالێخـۆش‌بـوو شـێخ خالیـدەوە، وە گـۆڕی شـێخ لـەو شیوەوە نزیکترە کە لە (دەرەویان)ەوە دێت.

## شێخ عەبدوڕەحمانی ئەهدەل

شێخ عەبدوڕەحمان، کوڕی شێخ حەسەنی، کوڕی شێخ سـولەیمانی، کـوڕی شـێخ خالید. ئەم عەبدوڕەحمان ناوە کاتێ کە باوکی شەهید کراوە تەمەنی یازدە ساڵ بووە، لە جێگەی خۆیانا قورئانی پیرۆز و کتێبە وردەی بـیر و بـاوەڕ و حیکمـەت و ئـەدەبی خوێندووە. دوای باڵغ‌بوونی چووە بۆ وڵاتی میسر و لـەوێ خوێنـدنی تـەواو کـردووە، پاش ئەوە چووە بـۆ مەکـە و حـەجی کـردووە و دوایـی چـووە بـۆ مەدینـە زیـارەتی پێغەمەری ـ د ـ کردووە، لـە پاشـان لـەوێوە ڕۆیشـتووە بـۆ شـاری (بوخـارا) و لـەوێ تەریقەتی (طیفوریـە)ـ کـە ئێسـتە پێـی ئەڵـێن (نقشـبندی)یەـی وەرگرتـووە. جـا گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی خۆی و لە جێگەی باوک و باپیرەیدا دانیشتووە.

ئەم شێخ عەبدوڕەحمانـە لـە عوولـوومی زاهـیرەدا زۆر شـارەزا و بـەناوبانگ بـووە، هەروەها لە عیلمی تەسەووفدا یەکێ بـووە لـە موتەسـەویفە بـەرزەکان و ئیرشـادێکی

باشی کردووە و گەلێ کەرامەتی لێ دەرکەوتووە، تەمەنی خۆی لە خزمەتی عیلم و دیندا بەسەر بردووە، تا لە ولاتی خۆیاندا بۆ یەکجاری سەری ناوەتەوە، تەنها کوڕێکی لێ بەجێ‌ماوە کە ناوی زەکەریا بووە.

## شێخ زەکەریا کوڕی شێخ عەبدوڕەحمانی ئەهدەل

ئەم شێخ زەکەریا، وەکوو باوکی، کاتێ کە شێخ عەبدوڕەحمانی باوکی لە جیهان دەرچووە تەمەنی یازدە ساڵ بووە، هەر لە ولاتی خۆیاندا قورئان و کتێبە وردەکانی خوێندووە، جا لە سەر ڕەوشتی باوکی چووە بۆ ولاتی میسر و لە جامعالازهردا خوێندنە باوەکانی ئیسلامی وەرگرتووە و ئیجازەی وەرگرتووە.

ئەوسا لەوێوە چووە بۆ مەکەی موکەڕڕەمە و حەجی کردووە و چووەتە مەدینە و سێ ساڵ لە مەدینەدا ماوەتەوە، دوای ئەوە لە مەدینەوە چووە بۆ بەغدا و تەریقەتی تەیفووریەی وەرگرتووە و سولووکی تێدا کردووە. هەروا تەریقەتی قادریەشی وەرگرتووە. پاش ئەوە لە هەر دوو تەریقەتەکەدا شاەزا بووە و پێگەیشتووە، ناوبانگی بە (کمال الدین) دەرکردووە.

جا لەوێوە بەرەو ولاتی بەلخ و بوخارا کەوتە ڕێ، کاتێ گەیشتە شاری بەلخ ماوەیێ لەوێ دانیشت و نیشانەی کەرامەت و پیرۆزیی لە ناو خەڵکدا دەرکەوت. بە تەقدیری خودا کچی میری بەلخ کە ناوی (بیبی اراک) بووە تووشی نەخۆشی مێشک ئەبێ. جا لەبەر شۆرەت و ناوبانگی شێخ زەکەریا چوونە خزمەتی و داوای دۆعایان لێ کرد. ئەویش دۆعای بۆ کرد و بە میهرەبانی خودا شیفای بۆ هات. میری بەلخ کە ئەمەی لە شێخ زەکەریا دی ئەو کچەی خۆی لێ مارە کرد. پاش ماوەیێ لەگەڵ خێزانەکەیدا لە شاری بەلخەوە گەڕانەوە بۆ ولاتی کوردستان. کاتێ گەیشتنە شاری کرمان خێزانەکەی کوڕێکی بوو و ناویان نا (نعمة الله) بە هۆی منداڵ بوون و ناساغی خێزانیەوە ماوەی ساڵێک لە کرمان مانەوە.

پاش ئەوە گەڕانەوە بۆ لای خۆیان و لە خالیدیەیە دانیشتن و لە سەر ڕەوشتی باوک و باپیرەی خۆی خەریکی ڕێنومایی موسوڵمانان و خزمەتی زانیاری و ئایین بوو. وە پاش گەڕانەوەی بۆ نیشتمان خواستی لە سەر ئەوە بوو نانی ڕەنجەشانی خۆی بخوات. لە سەر ئەم خواستە دەستی کرد بە کشت و کاڵ و سوودێکی باشی وەرگرت.

جارێ لە جاران خەرمانێکی گەورەی ئەبێ مانگێ لەبەر ئەوە بای شەماڵ نەبوو بۆیان ناکرێ خەرمانەکە شەن بکەن و تارمەکە هەروا دەمێنێتەوە.

ئەڵێن: رۆژێ شێخ زەکەریا ئەڕوا بۆ سەر خەرمانەکە و رووی دڵ ئەکاتە ئەو خەرمانە، بە خواستی خودا وەکوو چۆن شەماڵ هەڵبکا وەها ئەو خەرمانەی پاک کرد و دانەکەی لە کایەکەی جیا کردەوە. لەو رۆژەدا خێزانەکەی ئەچێ بۆ لای بۆ سەر خەرمانەکە، کاتێ ئەگاتە سەر خەرمان و تەماشا دەکات خەرمان سوور بووە و سووریی خەرمانەکە بێ کا دیارە و کا هیچ لەو ناوەدا نییە .. بە شێوەی گفتوگۆی ئەو رۆژە دەڵێ: (کا کۆ زەکەریا؟ ) واتە: ئەی زەکەریا کای ئەم خەرمانە لە کوێیە؟ ئەویش ئەڵێ: کایەکەی بە شنەی بای رەحمەتی خودا دوور کەوتووەتەوە. لەو رۆژەوە بۆ یادی ئەو کەرامەتە ئەو دێ کە جێگە و نیشتمانیان بووە لە خالیدییەوە ناوەکەی گۆڕراوە بۆ (کاکۆ زەکەریا).

جا شێخ زەکەریا رۆژ بە رۆژ ناوبانگی بە وڵاتەکەدا بڵاو ئەبێتەوە و لە هەموو لایەکەوە موسوڵمانان دێن بۆ خزمەتی بۆ کەڵک وەرگرتن لە زانیاری و تەسەووف و بەرەکاتی و، دارایی و سامانی شێخ زۆر ئەبێ و لە دەور و بەری کەلاتەرزاندا چەند دێ لە میرزا عەبدولکەریمی کوڕی میرخالیدی کوڕی میرئەحمەدی بابان بە پارە ئەکڕێ و وەقفیان ئەکات لە سەر نەوەی نێرینەی خۆی پشتاوپشت، بۆ ئەوە مایەی خانەدانی نان‌دان بۆ خۆیان و داخوازانی زانیاری و موریدان بمێنێتەوە. ئەمانە ناوی دێکانە: (عەلی هەمەدان) لەگەڵ قشلاخەکانیا، واتە وردەی دەوری و (ئەسفەرەنگین) و (بن) و (گاوران) کە ئێستە بە (شێخ عەتار) بەناوبانگە و (وەنینە) و (گولان) و قشلاخەکانی و (هەنگەژاڵە) و (لاویسان) و (بلچە سوور) و (مامۆڵە) و (سوورکەوڵ) و قشلاخەکانی کە بریتین لە (نێزل) و (گڵیە) و (بێدەرە) و (شاییدەر) و (چۆیین). ئەم گوندانە هەموو لە دەستی میرزا عەبدولکەریمدا بوون و شێخ زەکەریا بە پارە و بە بەیعی شەرعی وەری گرتن و میرزا عەبدولکەریم بە یاسای ئەو رۆژە قەباڵەی بۆ کردووە و تەسلیمی شێخ زەکەریای کرد. ئەمەی خوارەوە دەقی قەباڵەی کڕین و فرۆشتنەکەیە:

بسم الله الذی احل البیع و حرم الربا، الحمد لله الذی علم نبیه احکام کل محتاج الیه فی الآخرة و الاولی، و الصلاة و السلام علی سیدنا محمد المصطفی و علی کل من آل الیه بالإیمان، سیما آله و أصحابه أصحاب الصفا.

اما بعد: فقد باع میرزا عبدالکریم، ابن میر خالد، بن میر احمد البابانی ـ راغبا ـ أملاکه الواقعات فی (پشت ڕێ) و (کورەوز) اعنی بها (علی همدان) و قشلاقاتها و (ئەسفەرەنگین) و(گاوران) و (ونینه) و (گوڵان) بقشلاقاتها: (هەنگەژاڵە) و(لاویسان) و (بلچه سوور) و (مامۆڵە) و قریه (سرخ کەول) بقشلاقاتها: (نێزڵ) و (گڵیه) و (بیدەرە) و (چۆیین) بمقابله احد و مائتی (٢٠١) مثقال من الذهب بالشیخ ذکریا، ابن الشیخ عبدالرحمن الخالدی الشاذلی الحسنی، فقبله فورا علی هذا الثمن ثم سلمه جمیع الثمن فتسلمه منه البائع. فله ان یتصرف فیها کیف یشاء. و وقعت المبایعة المذکورة فی ضحوة الخمیس الخامس من ربیع الاول سنة خمس و سبعین و ستمائة من هجرة سید الانام، علیه الصلاة و السلام.

هەر لە لای ئەو قەباڵەدا وەقفنامەکەیش بەم شێوەی خوارەوە نووسراوە:

بسم الله اولا و آخرا، و الحمدلله باطنا و ظاهرا، و الصلاة و السلام علی سیدنا محمد سید الوری، الذی بعث للدین ناصرا، و علی آله و صحبه و عترته و حزبه.

اما بعد: فان القری المشتریات المسفورات فی هذه الورقة مع قریة (کاکو ذکریا) التی اصابتنی بالوراثة، و کان اسمها قبل (خالدیة) .. جعلتها موقوفة علی اولادی الذکور، فذکور أولادهم أبدا، و علی الفقراء، و جعلت تولیتها فی ید أرشد الاولاد علما و صلاحا و زهدا، و ذلک لیس بقصد حرمان الاناث، بل رغبة فی بقاء هذا الاحسان.

و انا الواقف الضعیف ذکریا الشاذلی الحسنی

وە میرزا عەبدوڕەحیمی هەوشاریش، کە یەکێ بووە لە موخلیسانی شێخ زەکەریا، دێهاتی (دۆڵی تەنوورە)ی مەریوانی هەموو کڕیوە و وەقفی کردوون لە سەر شێخ و نەوەکانی شێخ.

وە دێی (هەجمنە) لەگەڵ قشلاخەکانیا کە (هەزارخانی) و (نیاوا)یە موڵکی محەمەد سەعید بەگی پایگەلانی بوون و محەمەد سەعید بەگ وەقفی کردوون لە سەر شێخ و وەچەکانی وەکوو یەک. وە دێی هەنجیرانیش پیریوونس ئاوەدانی کردووەتەوە، وە دێی بێسارانیش بابا شێخ کڕیویەتی و سوپاس بۆ خودا هەتا ئێستە بە دەستی نەتەوەی پاکی خۆیەوە ماوەتەوە. وە ئەم دێهاتانە کە وتمان، (هەنجیران) نەبێ، هەموویان بە دەستی شێخەکانی کاکۆ زەکەریاوەن کە لە نەتەوەی شێخ نیعمەتوڵڵای وەلیی کوڕی شێخ زەکەریان.

وە هەنجیرانیش بە دەستی شێخەکانی هەنجیرانەوەیە کە لە نەتەوەی پیریوونسن.

ئەم ئەندازەم لە ترسی ئاڵ و گۆڕی زەمانە نووسی بۆ یادگار هەتا ئەم راستییانە ون نەبن و لە یاد نەچن.

وە وەقفنامەکانی میرزا عەبدوڕەحیم و محەمەد سەعیدبەگی پایگەلانیش ئەنووسمەوە بۆ ئەوەی بۆ یادگار بمێنن:

وەقفنامەی میرزا عەبدوڕەحیم لە سەر تەرجومەی بە کوردی ئەمەیە کە دەڵێ:

بەندەی موخلیس بە خانەدانی نەبەوی ئەملاکی بەتەلا کڕیوی خۆم کە لە دێهاتی دۆڵی تەنوورەی مەریوانا هەن هەمووم وەقف کردن لە سەر مورشیدی خۆم شێخ زەکەریای خالیدی و ئەولادەکانی.

وە من واقیفی تاوانبار عەبدوڕەحیم.

وە ئەمەیش تەرجومەی وەقفنامەی محەمەد سەعیدبەگە:

ماڵی بەمیرات بۆ هاتووی خۆم کە دێی (هەجمنە) لەگەڵ قشلاخەکانیا (هەزارخانی) و دێی (نیاوا)یە وەقفم کردن لە حەزرەتی شێخ زەکەریا و نەوەکانی و نەوەزادەکانی هەتا هەتایە بە موساوات تا ڕۆژی قیامەت.

جا سەیید عەبدوسەمەد دانەری (نور الانوار) ئەڵێ: ئیتر هیچ ئاگادار نیم کە پیریوونس چۆن دێی هەنجیرانی ئاوەدان کردووەتەوە. ئەوەندە ئەزانم لە کۆتایی قورئانێکی دەسخەتی خۆیدا نووسیویەتی:

(وقفت قرية انجيران علي اولادي و أحفادي لا مرتبا و لا مشوشا، وقفا لايباع، و لا يؤجر، و لا يوهب، و لا ينذر، و هم يصرفون المنافع على انفسهم، و ورادهم و طلبتهم، و فقرائهم.

الواقف الاثيم يونس ابن ذكريا الخالدى الشاذلى الحسنى. ربنا تقبل منا انك انت السميع العليم).

من کە تەرجومەی (نور الانوار) ئەنووسم ئەڵێم: مەبەست لە (وەقفی مورەتتەب) ئەوەیە تا چینی پێشوو تەواو نەبێ ئەو مەوقووفاتە نەگات بە چینی دوایی. وە مەبەست لە (وەقفی موشەوەش) پێچەوانەی ئەمەیە، واتە لە پێشدا چینی دوایی تەماشا ئەکا و تا ئەوان پێویستیان پێی بێ نەدرێ بە چینی پێشوو. وە مەبەست لە (لا

مرتب و لا مشوش) ئەوەیە بە تێکڕایی بەش بکرێتەوە بە سەر تاکەکانی هەموو چینەکانا. واتە ئەگەر چینی یەکەم دە کەس و چینی دوەم دە کەس و چینی سێهەم دە بوون .. ئەو واریداتە وەکوو یەک بە سەر ئەو سی کەسەدا بەش ئەکرێتەوە.

## نەوەکانی شێخ زەکەریا

شێخ زەکەریا دوازدە کوڕی بووە:

١ـ شێخ نیعمەتوڵلای وەلی.

٢ـ بابا عەلی کە لە کاکۆ زەکەریایە.

٣ـ شێخ حەسەنی سوورکەوڵ.

٤ـ شێخ محەمەد شەریف، کە بە شێخ شەربەتی بەناوبانگە.

٥ـ پیریوونس، کە لە هەنجیران نێژراوە.

٦ـ ئەمیر تاهیری کەلان.

٧ـ بابا شێخی بێساران.

٨ـ ئەمیر (متوکل)، کە بە پیر تەوەکەلی گاڕان ناوبانگی دەرکردووە.

٩ـ شێخ عەتار، کە کونیەی (بابا ذا النون)ەو لە دێی (وەنینە)دا بە خاک سپێرراوە.

١٠ـ شێخ یوسف، کە بە (سەوزەپۆش) ناسراوە و وا لە دۆڵی (سوور کەوڵ)دا.

١١ـ پیر محەمەدئەمین، کە ئەویش لەو نزیکانەدایە و ئێستە شوێنەکەی بە (نێزڵ) بە ناوبانگە.

١٢ـ پیر محەمەد کە وا لە کاکۆزەکەریادا و هەر بە منداڵی لە کۆڕی زیکردا ئاگری تێچووە و سووتاوە.

جا شێخ نیعمەتوڵلای وەلی سێ کوڕی لێ بەجێماوە: محەمەدسادق و عەبدوڕەئووف و شێخ عەبدولحافیز.

وە خێزانەکەی پیریوونس کچی ئەمیرێ لە ئەمیرەکانی ئیسلام بووە سێ کوڕی لێی بووە: شێخ ئیسماعیل و شێخ عیسا و شێخ مووسا. شێخ مووسا نەوەی نەبووە. شێخ ئیسماعیل دوو کوڕی بووە: شێخ ئیبراهیم و شێخ ئیسحاق. جا شێخ ئیسحاق بەر لە ژنهێنانی کۆچی دوایی کردووە و شێخ ئیبراهیم ماوەتەوە و ژنی هێناوە و شێخەکانی هەنجیران لە نەتەوەی ئەون.

وە باو وایە کە شێخ عیسا باپیری شێخەکانی سۆڵەیە، یانی سۆڵەیی ـ وەکوو هەنجیرانی ـ لە نەتەوەی پیریوونس و لە سەییدەکانی شازلین و حەسەنی نەسەبن.

وە شێخ حەسەن کوڕی حەزرەتی شێخ زەکەریا کوڕێکی بووە ناوی (بابا موراد) بووە و بابا موراد دوو کوڕی بووە: شێخ ئەبوبەکر و شێخ ئیبراهیم. ئیتر ئەولادەکانی شێخ زەکەریا ـ بێجگە لەمانە باسمان کردن ـ نەتەوەیان لە پاش بەجێ‌نەماوە.

## خەلیفەکانی شێخ زەکەریا

ئەم زاتە گەلێ خەلیفە و برادەری ئایینی خاوەن‌پایەی پێگەیاندووە لەوانە:

یەکەم: شێخ عەبدوالخالقی شارەزووری کە عەللامەی باتین و زاهیر بووە.

دووەم: شێخ عەبدولغەفاری مەردۆخی هەورامی لە هەموو زانیارییەکدا تاقانەی دەوری خۆی بووە. بنەچەی ئەم زانا گەورە لە وڵاتی شامەوە هاتوون بۆ سەبزەوار و پاش ماوەیێ هاتوونەتە هەورامان و ماوەیێ لە هەوراماندا بوون، دوای ئەو ماوە هەندێکیان رۆیشتوون بۆ (دەگا شێخان). وە هەندێکیان رۆیشتوون بۆ خاکی ئەردەڵان، وەکوو لەمەولا باسیان ئەکەین. وە هەندێکیشیان هەر لە هەوراماندا ماونەتەوە.

سێهەم: عەبدوسەمەد، کە بە عەبداڵ‌سەمەد ناوبانگی دەرکردووە، کە گەلێ بە دنیادا گەڕاوە، لە پاشان هاتووە لە سەر دەستی شێخ زەکەریادا تەریقەتی وەرگرتووە. لەمەولا باسی ئەم زاتە دەکەین.

چوارەم: مەلا مەحموودی مەراغەیی، کە لە نەتەوەی سەیید عەلییە و ئەڕواتەوە سەر ئیمام مووسای کازم.

پێنجەم: پیر ئیبراهیمی (سەوڵاوا) کە لە پێشدا پیاوێکی خراپەکار بووە، لە پاشان لە سەر دەستی شێخ زەکەریادا تەوبەی کردووە و بووە بە پیاوێکی گەورە.

شەشەم: مەلا یەعقووب جانی یەکەم کە لە نەتەوەی پیرخزری شاهۆیە و باپیرەگەورەی سەییدەکانی چۆڕە، وەکوو مەلا ئەبوبەکری (مصنف) و لق و پۆپەکانی.

حەوتەم: بابا یەحیای بەرزنجی.

شێخ زەکەریا لە ساڵی ٧٧٥ی کۆچیدا شەهید کراوە و ئارامگای لە سەر تەپۆلکەیەکە لە دێی کاکۆ زەکەریادا لە ژوور گۆڕی شێخ خالیدی باپیریانەوە.

## شێخ نیعمەتوڵڵای وەلی

ئەم زاتە کوڕی شێخ زەکەریا و لە (بیبی اراک)خانی خێزانیەتی و لە کرماندا لە دایک بووە و لە هەژدەساڵیدا خوێندنی تەواو کردووە. لە پاشان لە خزمەتی باوکیدا خەریکی تەریقەت بووە هەتا تەمەنی گەییشتووە بە چل ساڵی لە ناو بەردەلانەکانی لاژووورووی (کەندە)دا خەریکی خەلوەت و ریازەت کێشان بووە، ئێستە ئەو شوێنە مەشهوورە بە (چلەخانە).

وە لە پاش کۆچی دوایی باوکی لەبەر ئەوە کە براکانی لە شوێنی خۆیاندا بژین، ئەو رۆیشت بۆ بەغدا و ماوەیێ لە بەغدا مایەوە و کچی شێخ شەرەفەدینی کوڕی شەمسەدینی کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی مارە کردووە. لەو ژنە محەمەد سادقی بووە. پاش ماوەیێ چووە بۆ شام و لە شامەوە بۆ میسر و لە میسرەوە هاتووە بۆ حیجاز و سەفەری یەمەنی کرد و لە یەمەنەوە رۆیشت بۆ هیندستان، وە لەوێوە چوو بۆ (ماهان) و لە ماهانا خودا عەبدوڕەئووفی پێ بەخشی. جا رۆیشت بۆ کرمان و لە کرماندا مایەوە و لە کرماندا لە دایکی محەمەد سادق شێخ عەبدولحافیزی بوو.

وە لەو کاتەدا کە شێخ نیعمەتوڵڵای وەلی لە شاری کرماندا بوو شێخ زەکەریای موهاجیر چوو بۆ خزمەتی، تەریقەتی لێ وەرگرت و سلووکی کرد هەتا بوو بە خەلیفە و ویستی بگەڕێتەوە بۆ کوردستان. لەوێدا شێخ نیعمەتوڵڵا داوای لە ئەمیری کرمان کرد کارێ بکا دێی (بست) لە ناحیەی خورخورەی سەر بە (سنە) بدەن بە شێخ نیعمەتوڵڵا و ئەو دێیان پێدا و ئەویش بەخشی بە شێخ زەکەریای موهاجیر و شێخ زەکەریا گەڕایەوە بۆ کوردستان و لە سەر ئەو دێ دانیشت تا کۆچی دوایی کرد و ئێستە نەتەوەی لەو دێدا ماون.

وە شێخ نیعمەتوڵڵا لە کرماندا مایەوە خەریکی ئیرشاد بوو، پێش کۆچی دوایی خۆی شێخ عەبدوڕەئووفی کوڕی ناردەوە بۆ بەغدا و شێخ محەمەد سادقی ناردەوە بۆ کاکۆزەکەریا. تەنیا شێخ عەبدولحافیزی لە لا مایەوە، ئەویش لە پاش کۆچی دوایی باوکی لە کرماندا رۆیشت بۆ شیراز و لەوێ دانیشت هەتا لە جیهان دەرچوو. ئەم زاتە گەلێ نەتەوەی لێ بەجێماو، تا ماوەیێ وەزیفەی خەتابەتی شیراز بە دەست ئەوانەوە بوو.

## شێخ محەمەد سادقی کوڕی شێخ نیعمەتوڵڵا

وەک وتمان شێخ محەمەد سادق گەڕایەوە بۆ کوردستان و لە کاکۆ زەکەریادا دانیشت و خەریکی خزمەتی دین و زانیاریی و موسوڵمانان بوو. موسوڵمانان گەلێ سوودیان لێ وەرگرت و لەبەر بەرزیی پایەی زانیاری و فەزلی بە (شێخ محەمەد سادقی فازڵ) ناوبانگی دەرکرد.

ئەم زاتە کتێبێکی لە (انساب)دا داناوە و ناوی ناوە (قاموس الانساب).

شێخ محەمەد سادق دوو کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ عەبدوڵلا و شێخ ئیسماعیل. شێخ عەبدوڵلا لەبەر ئەوە قسەی نەدەکرد بە (صامت) ناوبانگی دەرکرد. شێخ ئیسماعیل قسەی ئەکرد و خەریکی ئیرشاد بوو و لە دێی (ئەسفەرەنگین)دا کۆچی دوایی کردووە و گۆڕی لەوێیە. بەلام شێخ عەبدوڵلای سامیت لە کاکۆ زەکەریادا کۆچی دوایی کرد و گۆڕی وا لە پشتی گۆڕی شێخ زەکەریای باپیرەیەوە، بە ئەندازەی پێنج گەز. ئەم شێخ عەبدوڵلا تاقە کوڕێکی لێ بەجێما ناوی ئەحمەد بوو و لە جێگەیدا دانیشت.

## شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەبدوڵلا

ئەم زاتە پیاوێکی چاک و لەخوداترس بووە، پاش ماوەیێ رۆیشت بۆ سەفەری حەج و خاتوو رەحمەی خێزانی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ حەج و پاش حەجکردن چوون بۆ زیارەتی مەدینەی مونەوەرە، جا بە رێگەی دەریادا و لە خەتی ئەسفەهانەوە هاتن هەتا گەیشتن بە شاری جام و لەوێدا خێزانەکەی کوڕێکی بوو ناویان نا عەبدوڕەحمان و لە شاری جامدا مایەوە، پلەی (شیخ الاسلام)ی وەرگرت. پاش ئەوە رۆیشتەوە بۆ مەدینەی مونەوەرە و عەبدوڕەحمانی لەگەڵ خۆیا برد و لەوێ مایەوە هەتا عەبدوڕەحمان ئیجازەی عیلمی وەرگرت و شێخ ئەحمەد لە مەدینەدا لە جیهان دەرچوو و عەبدوڕەحمان هاتەوە بۆ کوردستان لە کاکۆ زەکەریادا دانیشت.

## شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی شێخ ئەحمەد

ئەم زاتە پیاوێکی زانا و بەڕێز بووە و لەقەبی (رکن الدین) و نازناوی شیعریی (سید) بووە، گەلێ کتێبی داناوە، کتێبێکی بە فارسی بە شیعر داناوە، ئەمە یەکەم شیعریەتی:

حمـــد بـــی حـــد خـــدای یکتـــا را
آنکه جان داد و عقل [و] دین، ما را

ئەم شێخ عەبدوڕەحمانە پێنج کوڕی بووە: شێخ ئەحمەد کـە مەشـهوورە بـە (بابـا شێخ)، شێخ ڕەحمەتوڵلا، شێخ یاسین، شێخ یوسف، شێخ شەمسەدین.
وە سلێمان بەگی بانە حەفیدی ئـەم شـێخ ڕەحمەتوڵـلای دوەمەیـە، کـە لەقـەبی (اختیارالدین) بووە، هەروەها باوکیشی ئەم لەقەبەی بووە.
لە (نور الانوار)دا ئەڵێ: مەلا حەمزەی دۆنیزی حەفیدی سلـێمان بەگـە و سلـێمان بەگ لە ئەحفادی شێخ عەبدوڕەحمان (رکن الدین)ە کەوابێ سلێمان بەگ لە سەییدە حەسەنی‌یەکانە لە شێخانی کاکۆ زەکەریایە و مـەلا مووسـای بـاپیری سلـێمان بـەگ چووە بۆ بانە. وە دریژەکەی ئەمەیە: مەلا حـەمزەی دۆنیـزی کـوڕی عـەباس بەگـە و عەباس بەگ، کوڕی سلێمان بەگی کوڕی داود بەگی، کـوڕی مـەلا مووسـای، کـوڕی شێخ ڕەحمەتوڵلای کوڕی شێخ عەبدوڕەحمان (رکن الدین)ە.

## شێخ یوسفی کوڕی شێخ عەبدوڕەحمان

ئەم شێخ یوسفە زاتێکـی زانـا و بـەرز و بـەڕێز بـووە، گـەلێ بەرهەڵسـتی تـیرەی (باطنیە)ی کردووە و بەزاندوونی. وە لە سـەردەمێکدا رووس لـە سـنووری شـیماڵەوە هاتوونەتە ناو وڵات، شێخ یوسف دوو هەزار کەسـی ئـازای ئامـادە کـردووە و جـەنگی لەگەڵدا کردوون و شکاندوونی و گەڕاونەتەوە.
ئەم شێخ یوسفە گەلێ عاقڵ و زانا و خاوەن ماریفەت بووە و گەلێ واتەی جوانی لێ ئەگێڕنەوە.
ئەڵێ: هەر گەلێ و هەر کۆمەڵـێ لـە هـەر شـوێنێکدا بـبن بـەر لـە هـەموو شـتێ پێویستیان بە زانست هەیـە و زانسـت دوو جـۆرە: یەکـەم زانسـتی دیـنی و دووهـەم زانستی دنیایی. ئەم دوو زانستە بەسراون بەیەکەوە. کـەوابێ پێویسـتە پادشـای وڵات بەر لە هەموو شتێ تێکۆشێ بۆ دامەزراندنی زانست، وە هەر بـە پادشـا و کاربەدەسـت دەکرێ کە زانست بە ناو خەڵکدا بلاو بکاتەوە.

وە پێویستە پادشا دادگەر بێ و دەست و دەهەندەدار بێ تا خەڵک لەبەر جەور و ستەمدا هاوار نەکەن و، سەردار سەربازی ئەوێ بۆ پارێزی وڵات. وە پێویستە هەموو خەڵکی نیشتمان بپارێزێ وەکوو چۆن دایکی منداڵ منداڵەکەی ئەپارێزێ.

وە پێویستە خەڵکی نیشتمانەکەیش فەرمانی ئەو گەورە بەجێبێنن. وە هەمیشە کار و کاسبی بکەن هەتا لات و داماو نەکەون. وە هەر وڵاتێ کار و کۆششی تێدا نەبێ سووک و رسوا و دواکەوتوو ئەبێ. وە پێویستە گەل بەکار و پیشەسازیی بێ، جا ئەگەر ئەو پیشەسازی‌یە دروستکردنی بەرگ و پۆشاک بێ ئەوە ئەبێ بە هۆی شانازی ئەو وڵاتە بە سەر وڵاتانی دیکەدا. وە ئەگەر ئەو پیشە بازرگانی بێ ئەوە ئەبێ بە هۆی دارایی و دەستەڵات بۆ ئەو گەلە. وە ئەگەر باخەوانی بێ ئەوە ئەبێ بە هۆی کامەرانی ئەو گەلە.

بە تێکڕایی گەل پێویستی بە کار و زانست و پیشەسازی هەیە و ئەمانەیش هەموو لە سەر راوێژی گەل و ئیدارەی کاربەدەست و گەورەی وڵاتە.

بە کورتی شێخ یوسف پیاوێکی ژیر و خوێندەوار بووە و گەلێ خزمەتی وڵاتی کردووە.

لە پاش کۆچی دوایی دوو کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ رەشید و شێخ مەحموود کە لە جێگەی خۆیدا دانیشتووە.

## شێخ مەحموودی کوڕی شێخ یوسف

ئەم شێخ مەحمووده لەقەبی (شجاع‌الدين) بووە، ئەم زاتە پیاوێکی لەخوداترس بووە، تەریقەتی نەقشبەندی بۆ سلووکی موریدەکانی بەکار هێناوە، پیاوێکی قارەمان و پاڵەوان بووە. کاتێ کە تورکەکانی شیمال چوون ناوچەی رەشت و گێلانیان گرت، ئەم شێخ مەحمووده بە دووسەد کەسەوە چووە ناوچەی رەشت و جەنگێکی بەناوبانگی کرد و تورکەکانی لە وڵات دەرکرد، بەڵام کاتێ گەڕایەوە لە رێگەدا بە فێڵ دەرمانخواردیان کرد و کۆچی دوایی کرد.

ئەم زاتە پێنج کوڕی لێ بەجێما: شێخ محەمەد و شێخ حەیدەر و شێخ لوتفوڵڵا و شێخ ئەحمەد و شێخ مووسا. شێخ مووسا کوڕێکی چاکی بووە ناوی شێخ رەزا بووە کراوە بە جێنوشینی باوکی.

## شێخ ڕەزای کوڕی شێخ مووسا

ئەم شێخ ڕەزا لەقەبی (معین‌الدین) بووە و پیاوێکی بەتوانا و خاوەن دەستەڵات بووە و لێهاتوویی‌یەکی باشی بووە. لە وڵاتی خۆی دەرچووە بۆ خوێندن و لە خزمەتی ئیبنوجەجەری هەیتەمی‌دا زۆری خوێندووە، هەتا ئیجازەی داوەتێ. ئەمە شێوەی ئیجازەکەیەتی:

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين، رب اذا أراد بعبد خيرا فقهّه في الدين و الهمه رشده، و الصلاة و السلام علي سيدنا محمد الذي لا نبي بعده، و علي آله و صحبه و أتباعه و حزبه.

أما بعد: فيقول راجي عفو ربه الاكبر احمد بن حجر: لما تدرس عندنا افضل السادة الحَسَنيين الشيخ رضا الكردي الشاذلي الكاكو ذكريائي تجاه المسجد الحرام مدة مديدة، و قرأ كتبا عديدة، حتى بلغ بفضل الله حد النهاية .. ساغ له ان يتمكن علي سجادة التدريس للهداية، فاجزته ان يدرس. و الله المعين و به نستعين. و صلي الله علي سيد المرسلين و علي آله و اصحابه اجمعين.

و آخر دعوانا: ان الحمد لله رب العالمين.

ئەم شێخ ڕەزایە کتێبێکی گرانبەهای لە ڕەوشتی تەریقەی: نەقشبەندی‌یە و قادری‌یە و شازلی‌یە و ڕەفاعی‌یە و کەبرەوی‌یە و خەلوەتی‌یە و مەولەوی‌یە و چەشتی‌یەدا .. داناوە و ناوی ناوە (مسلک المسالک). ئەم زاتە تەنیا شێخ ڕەزی‌یەدینی لێ بەجێ‌ماوە.

## شێخ ڕەزی‌یەدینی کوڕی شێخ ڕەزا

ئەم زاتە لە خزمەتی باوکیدا خوێندنی تەواو کردووە و سلووکی تەریقەنشینی کردووە و سەرامەد بووە بە جۆرێ بووە بە مورشیدێکی تەواو بۆ داخوازان و سالیکان. پاش ئەمانە بە گوێرەی توانای خۆی و تەوفیقی خودا خەریکی ئیرشاد و خزمەتی دین بووە.

وە کاتێ گەییشتە تەمەنی پیری، واتە لە چل و پێنج تێپەڕی، عادەتی وا بووە لە بەرەبەیانەوە تا هەتاوکەوتن خەریکی زیکر و ویرد ئەبوو و پاش ئەوە نانێکی ئەخوارد و دەستی ئەکرد بە دەرس وتنەوە تا نیوەڕۆ، وە لە پاش نوێژی نیوەڕۆ ئیسراحەتێکی

ئەکرد، جا دەستی ئەکرد بە وەعز و ئامۆژگاری تا نوێژی عەسر، وە لـە نێـوان عەسـر و مەغریبدا لە ناو موریدەکانیدا رای‌ئەبوارد، وە ئەگەر بەڕۆژوو بوایێ پاش بانگی مەغریب بەربانگی ئەکردەوە و نوێژی مەغریبی ئەکرد. ئەگـەرنا هـەر نوێژەکـەی ئـەکرد، دوای مەغریب خەریکی بەندەیی‌کردن بۆ خودا ئەبوو و هەتا نوێژی عیشا. بە کورتی هـەموو کاتەکانی خۆی بە بەندەیی کردنەوە سەرف ئەکرد مەگەر کاتی نوستن و ئیسـراحەت. بەم شێوە دەوامی کرد هەتا کۆچی دوایی کرد و تەنها شەهابەدینی لێ بەجێ‌ما کە لـە جێگەکەیدا دانیشت.

### شێخ شەهابەدینی کوڕی شێخ رەزی‌یەدین

ئەم زاتە لە تەمەنی حەڤدە سالیدا لە سەردەستی باوکیدا خوێندنی تەواو کردووە و لە بیست سالیدا دەستی کردووە بە ئیرشاد لە سـەر رێبـازی نەقشـبەندی و رەوشـتی بەرزی ئەم زاتە لە لای خەلکی ولاتدا دیار بووە.

وە مەولانا عەبدوڕەحمانی بانـەیی کۆمەلـە شـیعرێکی جـوان و تـەڕ و پـاراوی لـە ستایشی شێخ شەهابدا داناوە.

جا کاتێ سوپای عەجەم هاتە سەر مەریوان و کاکۆ زەکەریا تالان کرا هەموو دارایی دێکەیان برد. تەنانەت پێنج دانە پەموو لـە قۆزاخـەکانیا کـە کـاتی خـۆی بـە دۆعـای جەنابی شێخ زەکەریا خودا کردبوونی بە ئالتوون .. ئەوانەیشیان بە تالان برد.

جا شێخ شەهاب بۆ دۆعای شەڕ لەو لەشکرە ئەم چەن شیعرەی داناوە کە دەلێ:

پیریـــوونس هانـــا! پیریـــوونس هانـــا!
مەزلـــوومان دایم لا تۆشـــەن هانـــا
نـــەبیرەی ئـــەکرەم شـــاهی مـــەردانی
فەرزەنـــد دلبەنـــد شـــێخ زەکـــەریانی
پـــەی وایەمەنـــدان عەجـــەب دەریـــانی
چـــون شـــێر کـــەمین حـــازر مەیـــدانی
ئینتیقـــام ســـوککان بابـــای ئـــەکرەمت
بـــە شـــەپۆل کـــین قـــەلب (قـــولزم) ت

بستان جە لەشکر عەجەم بێ ئەندێش
نەمازی یەکێ بشۆ وە جای وێش
شەهاب هەرچی هەن نەسل رەسوولەن
زورڕییەی تاهیر عەلی و (بەتوول)ەن

درۆی تێدا نیە تا ئەو لەشکرە گەییشتە هەنجیران دوو هەزار کەسیان لێ مردن، هەزار کەسیان مابوو کە گەڕانەوە، ئەوانیش لە گەڕانەوەدا مردن.

شێخ شەهابەدین چووە بۆ حەج و زیارەتی ئارامگای حەزرەتی فەخری عالەمی کردووە و لای ئارامگاکەدا ئەم شیعرانەی خوێندووەتەوە:

جەمالیۆم دییەن یاران تەعالا سونع رەببانی
مەلایەک یا پەریزادەن موشەککەل شکل ئینسانی
یەدەینش چون یەد بەیزا، دوو ئەبرۆ نەقش(بسم الله)
دوو دیدە نەرگس شەهلا و (مازاغ البصر) خوانی
بە عاریز مەشعەل نوورەن، بە بالا شەمع کافوورەن
جەبینش مەتلەع نوورەن، پەرێ (افواج نوورانی)
بە گۆنا یوسفی چاهەن، بە خەت خزر و بە روو ماهەن
بە لەب عیسای مەسیحاهەن، مبەخشۆ ئابی حەیوانی
بە دەندان شەککەر و قەندەن، بە بالا شۆخ و دڵ بەندەن
هەزار دڵ پێش ئەرامەندەن، یەکێ چون پیر کەنعانی
جە دەفتەرخانەیی شاهیش هەژاران سەد هەزارانەن
نیەن مەیلش جە کەس پەرسۆ عێراقی یا خۆراسانی
دوو مشکین قەوس ئەبرۆشەن، ریدایی دڵبەریش دۆشەن
(شەهاب)ش پەی سیاپۆشەن خودا وینۆش بە ئاسانی

**باسی ئەوانەی بە دەستی موبارەکی خۆی خەرقەی لە بەر کردوون**

ئەوانە نەوەدونۆ کەسن، ئەم چەن کەسانەیان کە وا ناویان ئەهێنین لە عیلمی زاهیر و باتیندا تەواو بوون و لە زۆربەی عیلمەکاندا کتێبیان هەیە:

سەیید ئیبراهیم، شێخ محەمەدی شیردار، شێخ کەریمی بەرزنجی، سەیید عەبدوڵلای هەورامی، سەیید فەتحوڵلای موسڵی، سەیید عەبدوسەمەدی تووداری، سەیید مستەفای نەهری‌یەیی، شێخ عەبدوڕەحمانی مەردۆخی، شێخ ڕەسووڵی قەرەداغی، سەیید شەمامەی بایینچۆیی، شێخ محەمەدی ئەباریقی بەغدایی، خەلیفە ڕۆستەمی حەوتاشی، شێخ ئیبراهیمی خوڕخوڕەیی، شێخ مستەفای تەختەیی، سەیید محەمەد مەولانی ئامۆزای شێخ شەهاب، سەیید بایەزیدی سابڵاغی، سەیید ئەحمەدی کوڕی مەلا مووسای تەوەکەڵی، سەیید مەلا حەمزەی دۆنیزی، شێخ حسەینی ئەبولمەعالی موسڵی، شێخ ئەبوو یوسف عەتای میسری، شێخ محەمەدی زاهیدی زەهاوی، شێخ محەمەدی دێوانی، سەیید هەیبەتوڵلای تاڵشی، شێخ عەبدولمەجیدی داغستانی، شێخ مووسای گەیلانی، سەیید مەولانا ڕەجەبەدینی تاوگۆزی، شێخ ئیمامی ملەیی، شێخ محەمەدی خانەگایی، شێخ مەحموودی خانەقینی، شێخ عەبدوڕەحیمی حافیزی دیاربەکری، شێخ سەنەدی سەنووسی، شێخ عەبدوڵلای قماتی کوڕی شێخ محەمەدی، کوڕی شێخ ئەحمەدی، کوڕی شێخ محەمەدی، کوڕی شێخ ئەحمەد شەهابی (الرملي)، سەیید ئەحمەدی زەینی مەکی، سەیید عەبدوڵلا (الجليل المدني)، سەیید سەلاحی حەمایی ... ئەمانە لایەنی مەلایەتی‌یان زیاد بووە، ئەوانە کە نەنووسراون دەستێکی وایان لە مەلایەتیدا نەبووە.

**بۆ ئاگاداری**

ئەم زنجیرەی ساداتی کاکۆ زەکەریایەم لە کتێبی دەسخەتی دانراوی سەیید عەبدوسەمەدی تووداری وەرگرتووە، ئەو زاتە لە کتێبەکەیدا نووسیویە کە: لە ساڵی ١٠٤٦ی کۆچیدا سەیید ساڵحی باوکی و سەیید عەبدولمەجیدی برای لە لایەنی سوپای قزڵباشی سەفەوی‌یەوە شەهید کراون وە خۆیشی بریندار کراوە و بە برینداری پەنای بردووەتە بەر جەنابی مورشیدی خۆی شێخ شەهابەدینی کاکۆ زەکەریایی، وە پاش ماوەیێ لە خزمەتی شێخ شەهابدا ڕۆیشتووە بۆ حەج و بە هۆی پەرێشانی

ولاتەوە ماوەی بیست و دوو ساڵ لە گەڕانی ولاتا بـوون. جـا هاتوونەتـەوە بـۆ کـاکۆ زەکەریا و پاش ئەوەی لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا ژنی هێنـاوە و کـوڕێکی بـووە ناوی ناوە (صابر الدین) و لە ساڵی ۱۰۹۹ی کۆچیدا کتێبی (نور الانـوار)ی لـە مێـژووی ساداتی کوردستاندا داناوە، بەڵکو بە پیرۆزیی ناوی ئـەو پیـاوە چاکانـەوە سـابیرەدینی کوڕی بەهرەیەکی دەست بکەوێ.

لەم باسانەوە دەرئەکەوێ کە سەیید عەبدوسـەمەد لـە مەوالیـدی ۱۰۳۰ی کـۆچی بووبێ و لە ساڵی ۱۰٤٦دا ـ کـە ئـەو شـازدە سـاڵ بـووە ـ گـیرۆدەی بـەلای سـوپای قزلباش بووە. وە لە ساڵی ۱۰۹۳ی کۆچیدا کە تەمەنی شەست و سێ ساڵ بـووە ژنی هێناوە و لە ۱۰۹٤ی کۆچیدا محەمەد سابیرەدینی کوڕی لە دایک بووبێ و لـە ساڵـی ۱۰۹۹دا کە محەمەد سابیر شەش‌حەوت ساڵە بووە کتێبی (نور الانوار)ی دانـاوە و لـەو کاتەدا سەیید عەبدوسەمەد تەمەنی شەست و نۆ ساڵ بـووە. ئیتـر مانـەوەی خـۆی و جەنابی شێخ شەهابەدینی مورشیدی بە روونی بۆ ئێمە دیار نییە.

وە ئەم خێزانە بەڕێزە کە بە هەموو جۆرێ خزمەتی موسوڵمانانیان کردووە لـە دەور و بەری ٦٧٥ی کۆچی‌یەوە لە کوردستاندا لە دێی (خالدیە) کاکۆ زەکەریادا نیشـتەجێ بوون تا ئەم مێژووە کە سەیید عەبدوسەمەد نووسیویەتی ئەکاتە چوارسەد و سی ساڵ، بەرودوا و یەک لە دوای یەک دەوامیان کردووە و لە دوای ئەو مێژووەیش هەرچەندی تر زیاد بووبێ هەر لە سەر رێبازی پێشوو قازانجیـان بـە ولات گەیانـدووە و خزمـەتی دین و زانیاری‌یان کردووە و خواردنیان داوە بـە دامـاوان و بـە گـەلێ شـێوەی دیکـە جۆرەها خزمەتیان کردووە.

بۆیە زۆر پێویستە کە ناویان لە دەفتەری مێژوودا بنووسرێ بۆ ئەوە دڵی دڵـداران و چاوی هۆشیاران بە تەماشا کردنی ناوەکانیان رووناک بێتەوە.

بەداخەوە ئەو کتێبانە کە هەندێ لەو زاتانە دایان‌ناون و کردوویـانن بـە دیـاری بـۆ ولات وەکـوو (قـاموس الانسـاب) دانـراوی شـێخ رەزا (معـین الـدین) موجـازی شـێخ ئیبنوحەجەری هەیتەمی و وەکوو (مسلک المسالک)ی هەمان شێخ رەزا ... و ئەوەندە نەبێ کە لە (نور الانوار)دا ناویان هەیە هیچی دیکەیان لێ نازانین و مەگەر هـەر خـودا بزانێ چییان بەسەر هاتووە.

وە بۆ زیادە ئاگاداری و دەرخستنی ڕاستیی، سەیید عەبدوسەمەد نووسـیویەتی: لـە (قاموس الانساب)ی شێخ ڕەزادا نووسراوە: فەقێ ئەحمەدێکی کورتەباڵای بەناوبانگ بە (گردە) هاتە مەدرەسەی ئێمە و بە زمانی عەرەبی قسـەی ئـەکرد و ئـەیوت: مـن لـە سەییدەکانی بەغدا و لە نەتـەوەی شـێخ عەبـدوڕەئووفی کـوڕی شـێخ نیعمەتولـلای وەلیم. ماوەیێ لای ئێمە دانیشت جا ڕۆیشت بۆ هەورامان لە تەوێڵەدا نیشتەجێ بوو و بە (غەزائی) ناوبانگی دەرکرد. نازانم ژنی هێناوە یا نە!

جا سەیید عەبدوسەمەد ئەڵێ: من عەرزتان ئەکـەم: بـۆم ڕوون بووەتـەوە کـە ئـەو فەقێ ئەحمەدە ژنی هێناوە و نەتەوەی لێ کەوتووەتەوە و هـەر لـە دێـی تەوێڵەیشـدا کۆچی دوایی کردووە.

وە لە سەفەری حیجازا لە شاری بەغدا چوومە بنج و بنەوانی قسـەکەی ئـەو فـەقێ ئەحمەدە و بۆم دەرکەوت ئەو فەقێ ئەحمەدە کوڕی شـێخ محەمـەدی کـوڕی شـێخ عەبدولئەحەدی، کوڕی شێخ عەبدولواحیدی، کوڕی شـێخ مـەحموودی، کـوڕی شـێخ عەبدوسـەمەدی، کـوڕی شـێخ عـەلی، کـوڕی شـێخ عەبـدوڕەئووفی، کـوڕی شـێخ نیعمەتوڵلای وەلی، کوڕی شێخ زەکەریایە.

جا منیش کە دانەری ئەم کتێبەم ئەڵێم: لە لای ئەهلی ماریفـەتی دێـی تەوێڵـەی هەورامان ڕوون و زانراوە کە دایکی شـێخ عوسمـان سـیراجەدینی خەلیفـەی مـەولانا خالید ـ خ ـ ناوی حەلیمە و کچی مەلا ئەبوبەکری ناسراو بە مەلا هەیبەکر بووە و ئەو مەلا ئەبوبەکرە لە نەتەوەی فەقێ ئەحمەدی غەزائی بووە. بـەم پێیـە شـێخ عوسمـان سیراجەدین لە لایەنی دایکی‌یەوە لە نەتەوەی ئیمام حەسەنی موجتەبایە.

جا لەبەر ئەوە کە سەیید عەبدوسەمەد لە (نور الانوار) لەم شوێنەدا ڕشتەی نەسەبی خۆی نووسیوە منیش بۆ وەفا بە حەقی خزمەتی ئەو شەجەرە ـ ڕشتە ـ کە لەم کتـێبی خۆمەدا ئەنووسم: نووسیویە:

اعلم ان هذا الحقير الفقير، اقل السادات، بل اقل خلق الله السيد عبدالصمد، ابن السـيد الشيخ صالح، ابن السيد مراد المشهور بالعلامة النيسابوري، ابن الشـيخ ابـي صـالح محمـد الملقب بصلاح الدين، ابن السيد الشيخ احمد، ابن السيد الشيخ محمـد، ابـن الشـيخ اميـر شريف، ابن الشيخ امير كامل، ابن الشيخ السيد عبدالله، ابن السيد الشيخ اميـر علـي، ابـن امير محمد، ابن السيد امير شريف العلامة، ابن السيد الشيخ امير محمد ابن اميـر حمـزة،

ابن قطب الطریق الشیخ السید امیر کلال، ابن امیر حمزة، ابن السید خواجـه شـاه احمـد، ابن امیر داود، ابن السـید ولیالدین، ابن السید عبدالحق، ابن السـید عبدالله، ابن السـلطان رضا، ابن السلطان حیدر، ابن السلطان جعفر، ابن الامام علی النقی، ابن الامام محمد تقی، ابن الامام علی الرضا، ابن الامام موسی الکاظم، ابن الامام جعفر الصادق، ابن الامام محمـد الباقر، ابن الامام علی زینالعابدین، ابن الامام حسین السبط، ابن أمیر المؤمنین علی، کرم الله وجهه، و فاطمة الزهراء، رضی الله عنها، بنـت سـیدنا رسـول العـالمین حضـرة محمـد المصطفی ـ صلی الله علیه و سلم ـ.

وە من خۆم دانەری ئەم کتێبە ئەڵێم: سەییدەکانی دێـی (هۆیـە) کـە دانیشـتووی هەورامانی ئەودیون، کە نزیکی سێسەد ساڵە وان لەو شوێنەدا و گەلێ زانای ئـایینی و پیاوی بەندەی راستی خودایان بووە، وەکوو سەیید عینایەتوڵلا، کـە خـۆم لـە بیـارەدا دیومە و کوڕی سەیید هیدایەتوڵلایە کە لای حاجی سەیید حەسەنی چۆڕی ئیجازەی وەرگرتووە و کتێبێکی بەنرخی لە مەنتیقدا بە ناوی (گەلەنبەوی بورهان)ەوە هەیە. وە وەکوو سەید عەبدولحەکیم کە ئیمام و مودەڕیس بووە لـە شـاری خانەقینـدا ... ئـەم زاتانە لە سەر شەجەرەی خۆیان لە نەوەی سەیید عەبدوسەمەدی تووداڕین کە پێشـتر شەجەرەکەیانم نووسی. وە ئەمەی خوارەوە شەجەرەی ساداتی (هۆیە)یە.

بسم الله الرحمن الرحیم

السید برهان الدین، ابن السید حسن، ابن السید احمد المشهور بسـلطان سـید احمـد، ابن السید محمد ابن السید عبدالرحمن، ابن السید عبدالقادر، ابن السید صالح، ابن السید کاظم، ابن السید احمد، ابن السید حمزة، ابن السید رسـول، ابـن السـید نصـرالدین، ابـن السید حسین، ابن السید صابر، ابن السید عبدالصمد، ابن السید صـالح، ابـن السـید مـراد المشهور بالعلامة النیسابوری، ابن السید صلاحالدین، ابن السید الشیخ احمد، ابـن السـید الشیخ محمد، ابن السید الشیخ امیر شریف، ابن السـید الشـیخ أمیـر کامـل، ابـن السـید الشیخ عبدالله، ابن الشیخ امیر علی محمد، ابن السید شریف العلامـة، ابـن السـید الشـیخ امیر محمد، ابن السید امیر حمزة، ابن السید امیر کلال، ابن السید امیر حمزة، ا بن السید شاه احمد، ابن السید امیر داود، ابن السید ولی الدین، ابن السـید عبـدالحق، ابـن السـید عبدالله، ابن السید سلطان رضا، ابن السید سلطان حیدر، ابن السید السـلطان جعفـر، ابـن

الامام على النقى، ابن الامام محمد التقى، ابن الامام على‌الرضا، ابن الامام موســى الكــاظم، ابن الامام جعفر الصادق، ابن الامام محمد الباقر، ابن الامام على زين‌العابـدين، ابـن الامــام حسين، ابن أمير المؤمنين على الى آخره.

## باسی بنەماڵەی شێخانی مەردۆخی

ئەوەی لە ناو زانایانی کوردەواریدا باو و بڵاوە ئەوەیە: کە باپیرە گەورەی ئەو بنەماڵە لەم وڵاتەدا شێخ محەمەدی مەردۆخی‌یە، بەڵێ لە مێژووی هاتنی ئەم زاتەدا بۆ ئەم وڵاتە گەلێ قسە هەیە، ئەوەی کە جێگەی باوەڕ بێ ئەمەیە کە ئەم شێخ محەمەدە لە ئەسڵدا لە شامەوە دەرچوون و شوێنەکەیان دێیەکە ناوی (مەردۆخ)ە و سەر بە موحافەزەی (سویدا)یە لە وڵاتی شامدا کە ئێستە بە (سوریە) ناسراوە.

وە ئەوەیش کە بچێ بە دڵەوە، ئەوەیە کە: باپیرە گەورەی ئەم خێزانە کاتی خۆی لەبەر ستەمی ستەمکار، یا هەر لە سەر ئارەزوو لەو وڵاتەوە هاتوون بۆ شیمالی ئێران، وەکوو چۆن هەندێ تر لە سەییدەکان وایان کردووە. وە لە چەرخی ئاشووبی تاتاردا گەڕاونەتەوە بەرەو عێراق. وە ئەم شێخ محەمەد ناوە شاری هەورامانی پەسەند کردووە بۆ ئەوەی تیا نیشتەجێ بێ و خۆی و نەتەوەی تیا دابنیشن.

وە بە گوێرەی تەماشا کردنی رشتەی ئەو نەتەوەیە کە لەو زاتەوە پەیدا بوون زاهیر وایە کە لە دەوروبەری مێژووی ٨٠٠ی کۆچیدا لە هەورامانا دامەزرابێ و ژنی هێنابێ، چونکی یەکەم نەتەی کە ناوی مەلا گوشایش بووە لە مێژووی ٨٤٤ی کۆچیدا دەستی کردووە بە خزمەتی دین و زانست و ئەوەی کە سەیید عەبدوسەمەد لە (نور الانوار)دا ئەڵێ: ئەو شێخ محەمەدە موریدی پیر شەهریاری بەناوبانگ بووە .. راست نییە، چونکی پیر شەهریار ـ لە سەر نووسراوی ئایەتوڵلا ـ لە مێژووی ٥٦٧دا کۆچی دوایی کردووە.

هەروا ئەوەیش کە ئایەتوڵلا بە وەرگرتن لە کتێبی مێژووی هەورامانەوە ئەڵێ بابا محەمەد مەردۆخ لە مێژووی ٦٨٠ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە پاش ٩٨ ساڵ کچی شێخ شەهابی دزاوەری مارە کردووە بە ئەمری پیر شەهریار و دوازدە ساڵ دوای ئەوە

نەچووەتە لای و پاش ئەوە لە شەوی زاواییدا لە مێژووی ٧٩٠دا مردووە و پاش مـردنی ئەو گوشایش لە دایک بووە .. سەراسەر هەڵەیە و پێچەوانەی واقیعە.

چونکی لە سەر نووسینی خۆی پیر شـەهریار لـە ٥٦٧دا کـۆچی دوایـی کـردووە و پەیوەندی بە چەرخی شێخ محەمەدەوە نییە، هەروا مانەوەی ئینسانێ تـا تەمـەنی ٩٨ ساڵ جا ژن بێنێ ئەویش دوورە لە یاساوە.

وە پینە کردنی ئەوەیش بەو قسە کە وتوویەتی: دوو ئینسانی پیر شـەهریار نـاو لـە هەورامانا بوون و بابا شێخ محەمەد مەردۆخ لە چەرخی پیر شەهریاری دوەمدا بووە .. ئەمەیش پێچەوانەی واقیعە، چونکە بە (اتفاق)ی خەڵـکی هـەورامان پـیر شـەهریاری خاوەن دین و خاوەن پایەی ئیرشاد تەنیا یەکێ بووە کە مەشهوورە موریدی حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بووە و حـەزرەتی شـێخ تـاریفی کـردووە و فەرموویـەتی (اخی مصطفی رجل صالح) هەر ئەو سەیید مستەفا کە سـەییدە و نیسـبەتی بـۆ (علـی عریض) بووە و لەقەبی لە هەورامانا پیر شەهریارە ئیتر کەسێکی دیکە بەو ناوە نەبووە.

بەڵێ کابرایێ لە هەورامانا فەرمانڕەوا بووە لە ناو هەورامامی‌یەکانا کە ناوی (شـالیارە سیاو) بووە، بەڵام ئەم کابرا پەیوەندی بە دینەوە نەبووە.

وە بۆ پشتیوانی ئەم باسە حیکایـەتێکی بـاو هەیـە: گۆیـا پـیر شـەهریار دیـوانێکی شیعری بووە مەشهوور بووە بە ناوی (ماریفـەت) واتـە مەعریفـەت و لـە نـاو خەڵـکی هـەورامانا خۆشەویسـت و بەبایـەخ بـووە و گـەلێ کـەس لەبـەریان کـردووە، جـا لـە سەردەمی مەلا گوشایشدا کە خوێندنی دەرزی قورئان و تەجویـد کەوتووەتـە نـاوەوە یەکێ لە پیرەژنێکی پرسیوە و وتوویەتی: داپیرە قورئان قەدیمە یا ماریفـەت و پـیری؟ ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێ: تاتەم ماریفەت‌وپیری قەدیما قروونە هیزی گوشایشە کـووری ئاردەن! واتـە بابـە ماریفـەتی پـیر شـەهریار کۆنـە، قورئـان دوێـنی گوشایشـە کـوێر هێناویەتی!

ئەمەیش هەر تەئییدی ئەوە ئەکا کە تەنیا پیر شەهریارێ بووە لە هەورامانا و گـەلێ لە پێش چەرخی شێخ محەمەدی مەردۆخی و مەلا گوشایشدا بووە.

جا با بڕۆینەوە سەر مەبەستی خۆمان. وتمان مەلا گوشایش یەکەم نەتەوەی شـێخ محەمەد بووە، شێخ محەمەد لە هەورامانا لـە جیهـان دەرچـووە. وە پـاش ئـەو مـەلا

گوشایشی کوڕی خوێندوویەتی و بووە بە زانایەکی باش و دەستی کردووە بە ئیرشاد و دەرس‌وتنەوە لە هەوراماندا.

## مەلا گوشایش

مەلا گوشایش کوڕی بابا محەمەدی مەردۆخ، پاش ماوەیێ لـە مـردنی بـاوکی، لـە هەورامانا ناو دەرئەکا و بە مەولانا گوشایش ناوبانگی دەرئـەچێ. وە ئـەبێ بـە خـاوەن جێگە و ژن دێنێ. وە لە مێژووی ٨٤٢ی کۆچیدا زۆر ناوبانگ دەرئەکا و لـە سـەر ئـەو خزمەتی عیلمە و دینە دەوام ئەکا هـەتا لـە سالـی ٨٧٣ی کۆچیـدا لـە هـەورامانا لـە جیهان دەرئەچێ و دوو کوڕی لێ بەجێ ئەمێنێ: مەلا عەباس و مەلا عەبدولغەفار.

مەلا عەباس لە هەورامانا ماوەتەوە باپیرەی قازی‌یەکانی هەورامانـە بـەم ریـزە: لـە مەلا عەباس مەلا ئیسماعیلی قازیی هەورامان و لـە مـەلا ئیسـماعیل مـەلا سـەعدیی قازیی و لە مەلا سەعدی مەلا یەعقووبی قازیی و لە مەلا یەعقووب مەلا سەعدی دوەم و لە مەلا سەعدی‌یەوە مەلا شەریفی قازیی و لە مەلا شەریف مەلا محەمەدی قازیی و لە مەلا محەمەد مەلا حسەینی قازیی و لە مەلا حسەین مەلا عەبدولعەزیزی قـازیی و لە مەلا عەبدولعـەزیز مـەلا عەبدولـڵای قـازیی، کـە دانـەری کتـێبی مێـژووی وڵاتی هەورامانە .. پەیدا بووە.

ئـەم کتێبـەم نـەدیوە، بیسـتوومە هۆنراوەیـە وەکـوو (شـانامە) بـەڵام بـە شـێوەی هەورامی‌یە و لە سەردەمی (دارا) و بەهەمەنی کوڕیەوە هێناویەتی تا سـەردەمی خـۆی کە هەزار و سێسەد و شتێکی کۆچی‌یە.

ئەم کتێبە لە لای (مەحموود خانی دزلی) بوو، کاتـێ کـە ئـەمیر محەمـەد خـانی شابەختی لە چەرخی رەزاشادا هاتووە بۆ هەورامان و چووەتـە دزلـی و ئـەو کتێبـەی بەرچاو کەوتووە و بە بەهانەی ئەوەوە چاپی بکات بردوویەتی و لە دەسـتی دەرچـووە. وە من بە هەندێ بەڵگەدا وا ئەزانم کـە نوسـخەی لـە شـاری سـنەدا لـە کتێبخانـەی ئایەتوڵڵای مەردۆخیدا بێ.

وە مەلا عەبدولکەریمی سنەیی بـاوکی مـەلا عـەلی مـودەڕیس و مـەلا حەسـەنی شەکیبا لە رشتەی قازی‌یەکانی نەتەوەی مەلا عەباسنریال هەروا مەلا قاسمی سـنەیی

باوکی مەلا عەبدوڵڵای (فخرالاسلام) و مەلا عەبدوڵڵای (فخر الشـریعة)ی بـاوکی مـەلا حەسەنی فەخرزادە و مەلا محەمەدی (یمین العلماء) لەم رشتەن.

## شێخ عەبدولغەفار

شێخ عەبدولغەفاری کوڕی مەلا گوشایش لە مێژووی ٨٤٧ی کۆچیدا لە هەورامانـدا لە دایک بووە. ئەم زاتە پیاوێکی زانا و بەڕێز بووە و دەرسـی گوتووەتـەوە و ئیرشـادی کردووە و لە هەورامانەوە گواستوویەتییەوە بۆ دێی (دەگاشێخان) و لە سنووری نێـوان هەورامان و مەریوانا نیشتەجێ بووە و ئینسانێکی زۆر خاوەن بەهرە بووە.

من نازانم لای چ مورشیدێک تەریقەتی وەرگرتـووە، ئایـا لـە لای مـەلا گوشایشـی باوکی یا لای غەیری ئەو بووە؟ بە عەقڵی خۆم و پێی وەزعـی زەمانـە ئـەبێ موریـدی یەکێ لە شێخەکانی کاکۆ زەکەریا بێ لە نەتەوەی شێخ زەکەریا، نەک شـێخ زەکـەریا خۆی، چونکی شێخ زەکەریا لە مێژووی ٧٧٥دا کۆچی دوایی کردووە و (وصال رحمت) مادەی ئەبجەدی مێژووی کۆچی دوایی‌یەتی.

وە ئەوەی سەیید عەبدوسەمەد نووسیویە کە: شـێخ عەبدولغـەفاری مـەردۆخی لـە برادەران و خەلیفەکانی شێخ زەکەریا بـووە .. بـە گـوێرەی تەماشـا کـردنی مێـژووی هەردوولایان دەرئەکەوێ گومانە و راستی‌یەکەی ئەوەیـە ئـەبێ خەلیفـەی یـەکێ لـە کوڕەکانی بێ.

بە هەر حاڵ شێخ عەبدولغەفار، کە بە شێخ عەبدولغەفاری یەکەم ناسراوە، بـاپیرەی شێخەکانی دەگاشێخانی مەریوان و باقلاوا و (تەختە) و (قزڵـبلاخ) و (هـەزارکانیان) و (مێرگەسار) و (دەژن) و (تەنگی سەر) و (کاشتەر) و (قەرەداخ) ... بووە.

وە بە هۆی دانیشتنی ئەوەوە دێی (دەگاشێخان) ئەو ناوەی وەرگرتووە، واتـە دێـی شێخەکان، وە ئەو دۆڵی بەینی دەگاشێخان و هەورامانە ناوبراوە بە چەمی شـامی‌یـان، واتە وادی شامی‌یەکان، چونکی ئەو باسی ئەوەی کـردووە کـە ئەسڵـەکەیان لـە وڵاتی شامەوە هاتوون.

وە ئەمەیش هەم پاڵپشتی ئـەوە ئـەکا کـە شـێخ محەمـەدی مـەردۆخ لـە بـەرەی شیمالی ئێرانەوە داپەڕیبێ بۆ هـەورامان، چـونکی کـەس نەیبیسـتووە کـە لـە پـێش زەمانی شێخ عەبدولغەفاری یەکەمدا لەو بنەماڵە لە دەگاشێخانا کەس دانیشتبێ.

وە ئەم شێخ عەبدولغەفارە لە دێی دەگاشێخان لە مێژووی ٩٣٤ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و گۆڕی لە دەگاشێخانە و کوڕێکی بووە شەمسەدینی ناو بووە.

## شەمسەدینی کوڕی عەبدولغەفاری یەکەم

ئەم زاتە لە ساڵی ٩١٢ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ٩٨٥دا لە دێی (دەرەهەرد) لە ناحیەی کەلاتەرزانا کۆچی دوایی کردووە و بە شەمسەدینی یەکەم ناسراوە.

ئەم شێخ شەمسەدینە پیاوێکی زانا و بەڕێز و هەڵکەوتووی ڕۆزگار بووە و لە زانیاری‌یەکانی: ریازیات و زیج و تەقاویم و حورووفدا دەستی باڵای هەبووە.

ئەم شێخ شەمسەدینی یەکەمە سێ کوڕی لە پاش بەجێماوە:

١ـ شێخ مستەفا کە چووە بۆ دێی تەختە لە نزیکی شاری حەسەن‌ئاوادا، کە لەو رۆژگارەدا جێگەی ئەمیرە ئەردەلانیەکان بووە و نزیکی شاری سنەی ئێستەیە. وە ئەو شوێنەی کردووە بە نیشتمان بۆ خۆی و نەتەوەکانی.

٢ـ شێخ حەسەن کە باپیرەی شێخ مەعرووفی (دەرەقووڵە)ی باپیرەی شێخە زاناکانی قەرەداغە، وە شێخ حەسەن هەر وەکوو باپیرەی قەرەداغی‌یەکانە باپیرەی شێخەکانی (هەزارکانیان)یشە.

٣ـ شێخ عەبدولغەفاری دوەم کوڕی شەمسەدینی یەکەم.

## شێخ عەبدولغەفاری دوەم

ئەم پیاوە عەللامەی چەرخ و هەڵکەوتووی جیهان بووە، لە زانیاری‌یەکانی ئەستێرەناسی و پزیشکی و ریازیاتا زۆر شارەزا و باڵادەست بووە.

بۆ وەرگرتنی تەریقەت چووە بۆ خزمەتی مورشیدی گەورە شێخ شەمسەدین لە دێی (شوش) لە نزیکی عەقرە و عیمادی‌یەدا و لای ئەم شێخە تەریقەتی وەرگرتووە و بووە بە خەلیفەی و گەڕاوەتەوە بۆ هەورامان و بە ئیجازەی میرەکانی هەورامان لە (دەگاشێخان)دا، کە جێگەی خۆیان بووە، دانیشتووە و خەریکی دەرس‌وتنەوە و ئیرشادی موسوڵمانان بووە.

ئەم زاتە لە ساڵی ٩٠٩ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١١٠٢٦ کۆچی دوایی کردووە.
ئەم زاتە خودا کوڕێکی پێ بەخشیوە ئەویش لەبەر پیرۆزیی ناوی مورشیدەکەی و بۆ یادی باوکی خۆشەویستی ناوی ناوە شەمسەدین.

## شەمسەدینی دوەم کوڕی عەبدولغەفاری دوەم

ئەم زاتە پیاوێکی زانا و خۆشنووس بووە و لە عیلمی تەجویدا زۆر شارەزا بووە. زۆربەی مەتنی عیلمەکانی بە خەتی خۆی نووسیوەتەوە و ئەو کتێبانە هەموو لە کتێبخانەی ئایەتوڵلای مەردۆخدا لە شاری سنە هەن.
ئەم زانا بەرزە لە ساڵی ١٠٢٣ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١١١٤دا لە شاری حەسەنئاوا کۆچی دوایی کردووە. جا با لە پێشدا باسی نەتەوەی ئەم شەمسەدینی دوەمە بکەین جا ئەوسا ئەگەڕێینەوە بۆ لای باسە نەتەوەی براکانی عەبدولغەفاری دوەم، کە شێخ مستەفای تەختە و شێخ حەسەنە، وەک باسمان کردن.

## شەمسەدینی دوەم

کوڕی عەبدولغەفاری دوەم. ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێماوە:
یەکەم: شێخ حەسەن باوکی شێخ ئیبراهیم، باوکی شێخ شەهابەدین باوکی شێخ نیعمەتوڵلای وەلی، باوکی شێخ عەبدوڕەحمان، هەموو شێخانی دێی (باقلاوا) لە نزیکی ناوچەی کەلاتەرزانا لە نەتەوەی ئەم شێخ حەسەنەن.
دوەم: شێخ عەبدولموئمین، کە ئیمامی جومعەی شاری (حەسەن ئاوا)ی پایتەختی میرانی ئەردەلانی بووە.
ئەم زاتە زانا و خۆشنووس بووە، هەر کتێبێکی خوێندووە بە خەتی خۆی بە پارچەی بچووکی وەها نووسیویەتییەوە کە بۆ باخەڵ بشێ، ئەم زاتە لە ساڵی ١١٠٦٦ لە دایک بووە و لەساڵی ١١٢٨دا کۆچی دوایی کردووە و کوڕێکی لێ بەجێماوە ناوی (جمال الدین) بووە.

## جەماڵەدینی کوڕی شێخ عەبدولموئمین

ئەم زاتە زانا بووە بە شەرع و حەدیس و نەحو و سەرف و ئیمامی جومعەی شاری حەسەن ئاوا بووە، لە ساڵی ١١٠٨ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١١٦٩ی کۆچیدا لە هەمان شاردا کۆچی دوایی کردووە و چوار کوڕی لێ بەجێماوە: عەبدولموئمین، شەمسەدین، عەبدوڵلا، محەمەدساڵح.

جا لە شەمسەدین شێخ عەلی و لە شێخ عەلی ئەبولفەزل و لە ئەبولفەزل شێخ محەمەد کەریم (اعتماد المشایخ) و عەبدوسەمەد و لە شێخ محەمەد کەریم شێخ عەلی بەجێماوە.

وە لە شێخ عەبدوڵلا شێخ مەحموود و شێخ محەمەدی ئیمامی مزگەوتی (هاجەرە خاتوون) و لە شێخ محەمەد شێخ عەبدوڵلا و لە شێخ عەبدوڵلا شێخ لوتفوڵلا کە لەقەبی (مؤید العلماء) بووە .. بەجێماوە.

وە لە شێخ محەمەدساڵح شێخ عەبدوڵلا و شێخ عەلی و لە شێخ عەلی شێخ عەبدولعەزیز و لە عەبدولعەزیز شێخ عەبدولعەلی بەجێ ماوە.

وە لە شێخ عەبدوڵلا شێخ جەلالەدین و لە شێخ جەلالەدین دوو کوڕ بەجێماوە: یەکەم شێخ عەبدوڵلا و لە شێخ عەبدوڵلا شێخ نەجمەدین. دوەم شێخ عەبدولحەمید و لە شێخ عەبدولحەمید شێخ یەحیای مولەقەب بە (اعتضاد الاسلام) و لە شێخ یەحیا عەبدولحەمید باوکی (داریوش) ئەحمەدخان مەعریفەت بەجێماوە.

## شێخ عەبدولموئمینی دوەم

ئەم پیاوە زاتێکی بەڕێز و لەخوداترس بووە، لە هەموو زانیاری‌یە باوەکاندا خاوەن پایە بووە، کتێبی (در النظیم) دانراوی ئەوە. لە ساڵی ١١٥٢ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٢١١دا کۆچی دوایی کردووە و لە پشتی کتێبی (در النظیم)ەوە ئەم شیعرانە نووسراون:

شیخ موئمین کەرد خەتم این کیتاب
خەتم عومرش (نیز شد پس بالصواب)
دەر صەفەر کەردش سەفەر سووی بەهەشت
مەزرەعەی دنیای فانی را بی هیشت

چەنـــد روزی مانـــەد بـــا دەرد و ئەلـــەم
کەرد ریحلـەت زیـن جیهـانی پـر ز غـەم
چـــون بــە خــود میــزد نیــدای (اخرتــی)
(اخرتــی) تــەئریخ فــەوتش ئــەی فــەتی
۱۲۱۱

کەلیمەی (اخرتی) بە هەمزەی بێ مەد (أخرتی) واتە قیامەتی تـالیبی دیـن ئەکاتـە (۱۲۱۱)ی کۆچی.

ئەم شێخ عەبدولموئمینە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ حەسەن، کە لە زانیاری‌یە باوەکاندا خـاوەن پایـە بـووە و ریازیـاتی بـاش زانیـوە و خۆشـنووس بـووە و کتێبـە دەسـخەتەکانی (دارالاحسـان)ی مزگـەوتی جومعـەی شـاری سـنە بـە خـەتی ئـەو نووسراون.

وە ئەم شێخ حەسەنە دوو کوڕی لێ بەجێمـاوە: عیسـامەدین [عصـام الـدین] کـە کەسی لێ بەجێنەماوە و عەلادین کـە لـە نەققاشـی و حـەککاکی و دروسـتکـردنی لاپەڕەی (اسطرلاب)دا دەستی باڵای بووە. لەم عەلادینـەیش کـوڕێ لـێ بـەجێمـاوە ناوی بەهادین بووە کە ئەویش لە حەککاکی و (اسطرلاب)سازیدا هونەرمەند بووە.

دوەم لە کوڕەکـانی شـێخ عەبـدولموئمینی دوەم نـاوی جەمالـەدین بـووە کـە بـە جەمالەدینی دوەم ناسراوە.

**جەمالەدینی دوەم**

ئەم زاتە لە دوورلەدنیایی و لەخوداترسیدا بەناوبانگ بووە و لـە شـەرع و ئوسـووڵ و عولوومی عەرەبیدا باڵا بووە. لەساڵی ۱۱۷۱دا لەدایک بووە و لە ساڵی ۱۲۵٦دا کـۆچی دوایی کردووە.

ئەم شێخ جەمالەدینی دوەمە چوار کوڕی لێ بـەجێمـاوە: شـێخ عەبـدولموئمین و شێخ عەبدولوەهاب و شێخ عەبدولمەجید و شێخ عەبدوڕەحمان. شێخ عەبـدوڕەحمان پیاوێکی بەڕێز و زانا و فەسیح و بەلیغ بووە و دەستی شاعیری بووە و دیوانی شـیعری هەیە و چاپ نەکراوە. ئەم زاتە لە سـاڵـی ۱۲٤۷ لـە دایـک بـووە و لـە سـاڵـی ۱۳۱۲دا کۆچی دوایی کردووە.

وە شێخ عەبدولمەجید لە تەفسیر و حەدیسدا زۆر ئاگادار بووە و لە ساڵی ١٢٤٥دا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٣٢٢دا کۆچی دوایی کردووە و کەسی لێ بە جێ نەماوە.

وە شێخ عەبدولوەهاب پیاوێکی لەخوداترس بووە و لە ساڵی ١٢٤٤دا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٣١٦دا کۆچی دوایی کردووە.

لەم شێخ عەبدولوەهابە شێخ شوکروڵڵای ئیمام پەیدا بووە کە ئینسانێکی بە پارێز و لەخوداترس بووە. ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٨٤دا لە دایک بووە و لە بیست و یەکی مانگی شەعبانی ساڵی ١٣٥١دا کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە چوار کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ حەبیبوڵلای ئیمامی جومعەی (دارالاحسان) و شێخ عەبدوڵلا و شێخ شەمسەدین و شێخ فەخرەدین.

شێخ عەبدولموئمینیش، کە بە عەبدولموئمینی سێهەم ناسراوە، لە ساڵی ١٢٤١دا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٣١٤دا کۆچی دوایی کردووە .

ئەم زاتە ئیمامی نوێژی جومعەی (دارالاحسان) بووە لە ماوەی پەنجا و دوو ساڵدا بێ کرێ و بۆ خودا بێ ئەوە شتێ لە کەس وەربگرێ ئیمامی ئەم مزگەوتە بووە. ئەم زانا بەرزە باوکی شێخ محەمەد مەردۆخ ئایەتوڵلایە.

جا کە باسی شێخ عەبدولغەفار و نەتەوەکەیمان تەواو کرد، ئێستە باسی شێخ مستەفا و شێخ حەسەن ئەکەین.

## شێخ مستەفای کوڕی شێخ شەمسەدینی یەکەم

ئەم شێخ مستەفا پیاوێکی هەڵکەوتوو و بلیمەت و تاکە پیاوی سەردەمی خۆی بووە ئەدیب و شاعیر و بەڕێز و لەخوداترس بووە؛ لە وڵاتی خۆیانا زۆری خوێندووە، لە هەموو زانیارییەکانا خاوەن پلەی بەرز و توانا بووە، کاتێ تێگەییشتنی تەواو بووە و سەردەمی پێگەییشتنی بووە چووە بۆ خزمەتی شێخ ئەحمەدی ئیبنوحەجەر لە مەککەدا و لای ئەو خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە و هاتووە بۆ کوردستان و لە تەختەدا دەرسی گوتووەتەوە.

دیوانێکی شیعری بەرزی تەسەووفی و غەرامی غەیبی و مەعنەوی هەیە، زۆربەی ئەو دیوانە لای ئێمە هەیە، لەبەر کەشکۆڵەکەی خوالێخۆش بوو مەحموود پادشای جاف روونووسمان کردووە.

وە لە سەر نووسراوی شێخ عەبدوسەمەی تووداری، خەلیفەی شێخ شەهابەدینی کاکۆزەکەریایی بووە، بەلام بە باوەڕی من ئەبێ خەلیفەی باوکی شێخ شەهابەدین بووبێ، چونکە ئەم حاجی شێخ مستەفا لە ساڵی ٩٥١ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ١٠٤٧دا کۆچی دوایی کردووە، بەلام شێخ شەهاب، هەرچەن مێژووی لە دایک بوونی نەزانراوە، ئەوە زانراوە کە لە ساڵی ١٠٤٦ی کۆچیدا مورشید بووە و لە ١٠٩٩دا لە ژیاندا بووە.

ئەم شێخ مستەفا لە دێی تەختەدا لە جیهان دەرچووە و ئارامگای یەکجاریی لەوێیە. دوای خۆی دوو کوڕی لێ بەجێماوە: یەکەم شێخ ئەحمەدی بەناوبانگ بە شێخ ئەحمەدی عەللامە؛ دووەم شێخ ئەبوبەکر.

## شێخ ئەبوبەکر

ئەم زاتە پیاوێکی چاک و زانایەکی باش بووە. ئەم زانا باوکی شێخ مەجدەدین و باوکی شێخ موعینەدینی، باوکی شێخ عەبدولغەفوورە، کە گوێزاویەتی‌یەوە بۆ ناحیەی (بیلەوار) لە نێوان کرماشان و سنەدا و لە دێی (کاشتەر)دا نیشتەجێ بووە.

ئەم شێخ عەبدولغەفوورە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ محەمەد و شێخ ئەحمەد، جا لە شێخ ئەحمەد شێخ محەمەد وەسیم پەیدا بووە و لە شێخ محەمەدیش دوو کوڕ بەجێماوە:

یەکەم: شێخ ئیسماعیل کە باوکی شێخ حەبیبوڵلای مودەڕیس بووە و شێخ حەبیبوڵلا باوکی شێخ ئیسماعیلی دووەمی بە باباشێخ ناسراو و باوکی شێخ محەمەد موسلیمە.

دووەم: لە کوڕەکانی شێخ محەمەد شێخ ئیبراهیم باوکی شێخ ئەحمەدی بە (ڕۆحانی) ناسراو بەجێماوە.

## شێخ ئەحمەدی عەللامە

ئەم شێخ ئەحمەدە لە ساڵی ١٠١٦ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٢١٤دا[1] لە تەختە کۆچی دوایی کردووە. ئەم شێخ ئەحمەدی عەللامە کتێبێکی تایبەتی ئەوێ

---

١- ئەم مێژووە لەوە ئەچێ ١١١٤ بێ. (لە کتێبە ئەسڵی‌یەکەش‌دا هەر ١٢١٤ نووسراوە). ن.ب

کە دەربارەی ژیان و بەسەرهات و دەرس‌وتنەوە و خزمەتی زانیاریی و سوودگەیاندن بە موسوڵمانان بنووسرێ. ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ محەمەد وەسیم و شێخ مەحموود.

## شێخ محەمەد وەسیم

لە دەوروبەری ١٠٤٠ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە خانەدانی خۆیانا لەو نزیکانەدا زانیاری‌یە باوە ئیسلامی‌یەکانی تەواو کردووە، پاش ئەوە لە ولاتی خۆیانەوە چووە بۆ ولاتی (بابان) و لە قەلاچوالانی پایتەختی بابانەکاندا بووە بە مودەڕیس و بە وێنەی خۆر کە لە ئاسۆوە هەڵبێ و لە دەمی نیوەڕۆدا نوورپەخشانی بکا ... وەها رووناکی بە خاکی باباندا بلاو کردووەتەوە و بووە بە یەکە زانای ئەو چەرخە و گەلێ لە قوتابی و داخوازانی زانیاریی لە ولاتانەوە هاتوون بۆ خزمەتی. لەوانە زانا و شاعیری ناودار (مەلا خدری رووداری)ی دانەری نامیلکەی (دەوڵەت نامە) کە من خۆم بە ناوی (ئیقباڵ نامە)وە لە هەورامی‌یەوە کردوومە بە سۆرانی .. یەکێ بووە لەو شاگردانە کە سوودیان لێ وەرگرتووە.

مەلا خدر لە نامیلکەی عەقیدەی هەورامی‌یانەدا ئەڵێ:

پێسەش فەرماوان یاگەو گرد کەسیم     ئوستادی شێخی محەمەد وەسیم

واتە: وەهای فەرمووە ئەوەی کەوا لە جێگەی هەموو کەسێکدا بۆم: مامۆستام و شێخم شێخ محەمەد وەسیم

ئەم شێخ محەمەد وەسیمە گەلێ کتێبی داناوە، بەلام بەداخەوە لە ناوچوون. لەوانە نامیلکەی «سنن الصلاة» کە سوننەتەکانی نوێژی چوار ڕکاتی گەیاندووە بە ١٦٨٦ سوننەت!

ئەم زاتە لە عیلمی ریازیاتا و لە عیلمی حورووفدا زۆر خاوەن دەست بووە، وا باوە «کوشووفات»ی هەبووە.

لە خوالێخۆش‌بوو مامۆستا شێخ عومەری مامۆستای تاقانەی خۆمم بیست فەرمووی: شەش رۆژ لە پێش کۆچی دوایی‌دا چووەتە ناو تەلەبەکانی و فەرموویەتی: ئەگەر کەسێ شەش رۆژی بە دنیاوە مابێ چی بکا باشە؟ ئەوانیش هەر یەکە قسەیەکی کردووە ... بەلام خۆی فەرموویەتی: نە، نە، هەر ئیشێکی کردبێ ئەگەر

خێر بێ هەر ئەوە بکا. بەم شێوە هەموو ڕۆژێ ئەم پرسیارەی کردووە، تا ڕۆژێ کە سبەینێی ئەو ڕۆژە کۆچی دوایی کردووە. ئەڵێ: ئەگەر تاقەڕۆژێکی مابێ چی بکا؟ ئەوانیش وەکوو پێشوو وەڵامی ئەدەنەوە و خۆیشی هەر وەک پێشوو قسە ئەکا. بە کورتی ئەو ڕۆژەیش ـ کە ڕۆژی کۆچی دوایی ئەبێ ـ دەرسی خۆی ئەڵێتەوە و نوێژی عەسر ئەکا و ئەڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی. پاش چەن دەقیقەیێ لە ماڵەوە گیان بە پەروەردگاری خۆی ئەسپێرێ و جیهان بەجێ دێڵێ.

بە داخەوە وەکوو مێژووی لەدایکبوونی بە تەواوی نازانرێ مێژووی کۆچی دواییشی نازانرێ. گۆڕی پیرۆزی لە گۆڕستانی قەڵاچوالانە.

## شێخ مەحموودی کوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامە

ئەم زاتە سێ کوڕی بووە: شێخ محەمەدکەریم و شێخ محەمەدجەسیم و شێخ ئەحمەد، کە بە شێخ ئەحمەدی دوەم بەناوبانگ بووە.

جا لە شێخ محەمەدکەریم عەبدولغەفار و لە شێخ عەبدولغەفار چوار کوڕ بەجێماون: شێخ عەبدولکەریم و شێخ عەبدوڕەحیم و شێخ محەمەدئەمین و شێخ ئیبراهیم. وە لە شێخ محەمەدئەمین شێخ شەهابەدین و لە شەهابیش حاجی شێخ ئیسماعیلی «مەجزووب» بەجێماوە.

وە شێخ عەبدوڕەحیم تەنها شێخ زیای «مەجنوون»ی لێ بەجێماوە.

وە شێخ عەبدولکەریم ٥ کوڕی لێ بەجێماوە:

یەکەم: شێخ مەحموود باوکی شێخ عەبدولغەفاری، باوکی شێخ محەمەد ساڵح، باوکی شێخ عەبدوڵڵا و شێخ عەلادین و شێخ قیوامەدین و شێخ سەلاحەدین و شێخ نیزامەدین.

دوەم: شێخ محێدین باوکی شێخ کەمالەدین و شێخ جەمالەدین.

وە لە شێخ جەسیمی کوڕی شێخ ئەحمەدی دوەم شێخ محەمەد و لە شێخ محەمەد شێخ ئیمامەدین و لە شێخ ئیمامەدین شێخ محەمەدی «فخرالعلما» و شێخ ئیسماعیل و شێخ ئیبراهیم بەجێماون.

جا شێخ محەمەدی فەخرولعولەما لە ساڵی ١٢٩٩دا بە بێ نەتەوە لە جیهان دەرچووە.

وە لە شێخ ئیسماعیل: شێخ مەسعوود و شێخ مەحموود و شێخ ئەحمەد و شێخ حەبیبوڵلا و، لە شێخ حەبیبوڵلا شێخ محەمەد جەمیل و شێخ محەمەد نەزیر بەجێماون. وە لە شێخ ئیبراهیم: شێخ محەمەدسەعید و شێخ محێدین و شێخ سەلام و شێخ نیزام بەجێماون. وە لە شێخ نیزام شێخ ئیبراهیم نیزامزادە و ئەسعەدی باوکی شێخ موعینەدین بەجێماون.

### شێخ ئەحمەدی دوەم

کوڕی شێخ مەحموودی، کوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامە. ئەم زاتە لە ساڵی ١١٠٦ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١١٨١ کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە پیاوێکی بەڕێز و لە خوداترس و پارێزکەر بووە و خۆی لە کاروباری دنیایی کەنار گرتووە هەتا جیهانی بەجێ هێشتووە.

ئەم زانا ٢ کوڕی لە پاش بەجێماوە: یەکەم عەللامەی چەرخی خۆی شێخ محەمەد قەسیم. دوەم عەللامەی زەمان حاجی شێخ محەمەد سەعیدی مزگەوتی «دارالاحسان» لە شاری سنەدا.

### شێخ محەمەد قەسیم

ئەم زاتە لە ساڵی ١١٤٣ کۆچیدا لە شاری سنەدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٢٣٦ی کۆچیدا لە هەمان شاردا کۆچی دوایی کردووە. ئەم پیاوە یەکە هەڵکەوتووی ڕۆزگاری خۆی بووە.

لە سەر نووسراوی کوڕەزاکانی: ئەم زاتە لە تەمەنی منداڵیدا لای شێخ محەمەد وەسیمی مامی باوکی هەندێ شەرعی خوێندووە، پاش ئەوە زانیارییە عەقڵی و نەقلییەکانی لە خزمەت زانای گەورە مەلا عەبدولقادری گۆرانیدا خوێندووە. ئەویش لە خزمەتی زانای پایەبەرز شێخ محەمەد وەسیمدا خوێندوویە، ئەویش لە خزمەتی حاجی شێخ زەکەریای گۆرانی کوڕی پوورکیدا بووە، ئەویش لە خزمەتی شێخ محەمەدی مەدەنیدا بووە، کە زۆر تەمەندرێژ بووە، ئەویش لە خزمەتی شێخ ئیبنوحەجەری هەیتەمیدا، ئەویش لە خزمەتی شێخی ئیمام زەکەریای ئەنساریدا، ئەویش لە خزمەتی ئیبنوحەجەری عەسقەلانیدا، ئەویش لە خزمەتی زەینی عیراقیدا،

ئەویش لــە خزمــەتی ئیبنولعــەتاردا، ئــەویش لــە خزمــەتی قــوتبی رەببــانی یــەحیای نەوەویدا، ئەویش لە لای ریسلانی «اردملی»، ئــەویش لــە خزمــەتی خــاوەنی شــامیلی ســەغیردا، ئــەویش لــە لای خــاوەنی حــاوی، ئــەویش لــە خزمــەتی قــوتبی رەببــانی ئەبولقاسمی رافیعیدا، ئــەویش لــە خزمــەتی ئەبولفــەزل، ئــەویش لــە خزمــەتی شــێخ محەمەدی ئیبنویەحیادا، ئەویش لە خزمــەتی «حجـة الاسـلام» غەزالیـدا، ئــەویش لــە خزمەتی «امام الحرمین» دا، ئەویش لە خزمەتی «أبو محمد الجوینی» باوکیدا ئەویش لە خزمەتی قەفالی مرووزیدا، ئەویش لە خزمــەتی ئەبوســورەیجدا، ئــەویش لــە خزمــەتی ئەنماتیدا [انماطی]، ئەویش لە خزمەتی ئیبراهیمــی موزەنیــدا، ئــەویش لــە خزمــەتی پێشەوای موسوڵمانان محەمەد ئیدریسی شافیعیدا، ئــەویش لــە خزمــەتی موســلیمی کوڕی خالیدی زنجیدا، ئەویش لــە خزمــەتی عەبدولمــەلیکی کــوڕی عەبدولعــەزیزدا، ئەویش لە خزمەتی عەتای کوڕی رەباحــدا، ئــەویش لــە خزمــەتی عەبدوڵــلای کــوڕی عومەردا، ئــەویش لــە خزمــەتی حــەزرەتی پێغەمەردا ـ د ـ ئــەویش لــە جــوبرەئیلی ئەمینەوە، ئەویش لە حەزرەتی زاتی «واجب الوجود»ەوە.

خوالێخۆشبوو شێخ محەمەد قەسیم لە تەعلیقاتی ئیجازەنامەکەیدا کە داویەتی بە زانای گەورە مەلا عەلی کوڕی خوالێخۆشبوو مەلا نەسروڵلای زێباری شەرحی نــاوی مامۆستا مەلا عەبــدولقادری گــۆرانی ئــەکا ئەڵــێ: مامۆســتای بــەڕێز و تــەواو مــەولانا عەبدولقادری سیسیی ئەردەڵانیی شارەزووریی.

یانی مەلا عەبدولقادر خەڵکی دێی «سیس» بووە کە وا لە ناحیــەی «لــەیلاخ» دا، وە ئەو زاتە لەو کاتەدا لە ناو ئەردەڵانیدا بووە و لە ئەسڵا شارەزووری بووە.

هەروا ئەفەرموێت: بە منداڵی لە خزمەتی زاناتر و گەورەترین کەسی چەرخی خۆی مامی باوکم شێخ محەمەدوەسیمی تەختــەییدا نامیلکەی «منطق الطیر»ی شێخ عــەتارم بە فارسی خوێند و مەتنی مەنهەجی قازی زەکــەریای ئەنساریشــم تــا باســی «تــیمم» خوێند.

وە نووسیویەتی لە شێخەکانی منە لە دوادوایی تەواو کردنی «علومی الهیە» دا.

هەروا لە داوێنی ئیجازەنامەکەی مەلا عەلیدا نووسیویەتی: لە مامۆستاکانی منە کــە لە خزمەتیاندا خوێندوومە: مەولانا مستەفای سۆرانی «بالیسانی» کە لــە خزمــەتی ئــەم زاتەدا هەندێکم لە «مطول» خوێند، هەروەها شەرحی موختەسەری مونتەها لە عیلمــی

ئوسوولی فیقهدا کە دانراوی قـازی «عضـدی ایجـی»یـە، لەگـەڵ دوو حاشـیەی دوو زانای گەورە سەعدی تەفتازانی و سەیید شەریفدا هەتا تەواو بوون وە تەواوی شەرحی عەقائیدی «عضدیە»ی دانراوی جەلالـەدینی دەووانی لەگـەڵ حاشـیەی موحاکـەماتی زانای پایەبەرز مەولانا ئەحمەدی ماوەرانیدا و، «اثبات الواجب»ی جەلالـەدینی دەووانی و حاشیەی حەنەفی‌یە و حاشەیەی لە سەر حاشیەی میرزاجانی شیرازی و حەدیسـی «انما الاعمال بالنیات» لە سـەرەتای کتـێبی «فـتح المـبین» لـە شـەرحی ئەربـەعینی ئیمامی نەوەویدا و هەندێ لە تەفسیری قازی بەیزاویم لە لا خوێند.

وە ئەم مەولانا مستەفای بالیسانی‌یە ئیجازەی لە مەولانا سیبغەتولـڵای حەیـدەری وەرگرتووە، ئەویش لە باوکی، ئیبراهیمی حەیدەری، ئـەویش لـە ئەحمـەدی دووەمـی حەیدەری باوکی، هەروا سیبغەتوڵلای دوودەرزیی.

لە سەرەتای فاتیحەوە لە تەفسیری قازی بەیزاوی لە لای بـاپیری خوێنـدووە ـ بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی رشتەی ئیجازە و ئیسناد ـ ئەویش لە باوکییەوە مەولانا حەیدەر خاوەنی موحاکەمات، ئەویش لە خزمەتی باوکیدا مەولانا ئەحمـەدی یەکـەم خـاوەنی موحاکەمات ... تا دوا رشتەی ئیجازەی ماوەرانی‌یەکان ـ خ ـ.

وە لە شێخەکانی منە لە کاتی رابوردنم بە دیمەشقی شـامدا لـە سـەفەری حـەجی خۆمدا لە دیمەشقی‌یەکان و لە موسافیرین: شێخ محەمـەدی چەلـەبیی کـوڕی شـێخ ئیبراهیمی عەلیجی داغستانی کە ئیجازەم لێ‌وەرگرت، بۆ وتنەوەی دەرسی زانیاری‌یە عەقلی و نەقلی‌یـەکان، ئـەویش ئیجـازەی لـە شـێخ محەمـەدی کـوڕی سـولەیمانی کوردیی مەدەنی وەرگرتووە، ئەویش لە شێخ سەعیدی سونبولی مەککی، ئـەویش لـە شێخ مەنسووری میسری، ئەویش لە سولـتانی «مزاحـی»، ئـەویش لـە عـەلی زیـاری، ئەویش لە شێخ ئەحمەدی «ابن الحجر الهیتمی» ... تا دوایی رشـتەی پێشـوو کـە لـە خوالی خۆش بوو مامی باوکمەوە شێخ محەمەد وەسیم بەیانم کرد.

وە لە شێخەکانمە شێخی گـەورە و بـەڕێز، شـەرعزان، جێگـەی شـانازیی زانایـانی شافیعی: ئەحمەد کوڕی شێخ «عبید العطار»، ئەویش ئیجازەی لە گەڵێ زانـای خـاوەن پایە وەرگرتبوو تا گەیشتوون بە حەزرەتی فەخری عالەم.

و سمعت منه الحديث‌الاولی، حدیث الرحمة. و سعمت منه سورة الصف، و سعمت منه اربعین حدیثا مسلسلة بالسادة الاشراف بسند واحد، و قد ذکرها شیخه الجنینی فی ثبته و هو ایضا ذکرها فی ثبته التی کتبها للحقیر و أمر بکتابتها لی. انتهی المقصود منها.

وە لە کۆتایی ئیجازەنامەکەوە نووسیویەتی:

کتبت هذه فی غرة جمادی الاولی سنة مائتین و ثمانی عشرة بعد الالف من هجرة من له العز والمجد والشرف.

وە ئەم زاتە وەکوو مامۆستا و ئیجازەپێدەری مەلا عەلی زێباری بووە مامۆستای دەیان زانای بەرزی دیکە بووە، لەوانە: مەولانا خالیدی کوردیی شارەزووریی میکایەلی، ئەم زاتە کاتێ گەیوەتە دواپلەی خوێندنی لە وڵاتی بابانەوە چووە بۆ وڵاتی ئەردەڵان بۆ خزمەتی هەڵکەوتووی سەردەمی خۆی شێخ محەمەد قەسیمی سنەیی، وەکوو شێخ محەمەد عەبدوڵلای خانی لە کتێبی «البهجة السنية فی آداب الطريقة العلمية»دا ئەفەرموێت:

فرحل ـ ای مولانا خالد فی ایام تحصیل العلوم ـ بعدها الی سنندج و نواحیها، و قرأ فیها العلوم: الحسابیة و الهندسیة، والاسطرلابیة، والفلکیة علی العالم المدقق چغمینی عصره، وقوشجی مصره، من فی اشارته شفاء کل داء، ونجاة کل علیل بالجهل سقیم: الشیخ محمد قسیم السنندجی، و کمل علیه المادة علی العادة. فرجع الی وطنه قاضی الاوطار.

وە شێخ محەمەد قەسیم حەجی ماڵی خودای کردووە وەکوو لە ئیجازەنامەی مەلا عەلی زێباریدا نووسراوە، بەڵام ساڵەکەی دیاری نەکراوە.

ئەم زاتە لە شەوی پێنج شەمەی چواری (جمادی الثانية)ی ساڵی ١٢٣٤ی کۆچیدا لە شاری سنەدا کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زانا مەزنە سێ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: محەمەدحەسەن و محەمەدحسەین و ئەحمەد، کە بە ئەحمەدی سێهەم ناوی دەرکردووە.

جا لە محەمەدحەسەن شێخ عەلی و شێخ عەبدوڵلا و شێخ یوسف بەجێ‌ماوە. وە شێخ محەمەدحسەین نەتەوەی نەبووە.

وە شێخ ئەحمەد پیاوێکی زانا و بەنرخ بووە، بە هۆی پەرێشانیی شاری سنەوە لەگەڵ کوڕەکانیدا کۆچی کردووە بۆ بەغدا و لەوێ دامەزراوە و لە ساڵی ١٢٧٤ی

کۆچیدا لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ مەعرووفی کەرخیدا بە خاک سپێرراوە.

ئەم شێخ ئەحمەدی سێهەمە سێ کوڕی لێ بەجێماوە:

یەکەم: عەبدولفەتاح کە لە شەوی یەکشەممەی مانگی شەوالی ساڵی ١٢٣٥دا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٣١٠دا کۆچی دوایی کردووە.

دووەم: شێخ جەعفەر کە لە پازدەی رەجەبی ساڵی ١٢٣٧دا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٣٠٣دا لە جیهان دەرچووە.

سێهەم: شێخ تاها، ئەم زاتە زانایەکی بەرز و بەڕێز و تاقانەی دەوری خۆی بووە، خۆشنووسێکی بێوێنە و زانایەکی هەڵکەوتوو بووە، چەن دانراوێکی بەنرخی هەیە.

یەکێ لەوانە: شەرحی (تهذیب المنطق)ە لە عیلمی مەنتیقدا، کە بە بڕوای من دانراوێکی زۆر نایابە.

یەکێ تریان: شەرحی (تهذیب الکلام)ە، کە ئەم دوو تەهزیبە دانراوی سەعدی تەفتازانین.

شەرحی (تهذیب الکلام)ەکەی کتێبێکی بێوێنەیە، نوسخەی ئەم دوو شەرحە بە خەتی دانەرەکەی ـ کە لە جوانیدا دەڵێی خەتی (ابن مقلە)یە ـ نووسراونەتەوە و لە کتێبخانەی شێخ عەبدوڵلای سنەییدان، کە لە نەتەوەی شێخ تاهای (مؤلف)ە، وە ئەو کتێبانە لە لایەنی زانا بەرزەکانی بەغداوە بە عیبارەتی ستایش و پیاهەڵدان (تقریظ) کراون.

جا لە شێخ محەمەد حسەین کوڕی حاجی شێخ قەسیمی عەللامە شێخ مەحموود و شێخ عیسا و شێخ مووسا بەجێماوە. وە لە شێخ مووسا شێخ یەحیا بەجێماوە.

وە لە شێخ محەمەد حەسەن کوڕی حاجی شێخ قەسیم شێخ یوسفی مودەڕیس و شێخ عەبدوڵلا و شێخ عەلی بەجێماوە.

وە لە شێخ یوسفی مودەڕیس پێنج کوڕ بەجێماون: شێخ ئەبولحەسەن و شێخ محەمەد کازم و شێخ عەبدولخالیق و شێخ عەبدوڕەحیم و شێخ عەبدولحەمید.

وە لە شێخ ئەبولحەسەن شێخ عەبدولعەلی (یمین الاسلام) و شێخ محەمەد ئەمین بووە. وە لە شێخ عەبدولخالیق شێخ جەلالەدین بەجێماوە و لە شێخ عەبدوڕەحیم شێخ محەمەد قەسیم بەجێماوە و لە شێخ عەبدولحەمید شێخ ئیسماعیل بووە.

وە شێخ عەبدولعەلی سێ کوڕی لە پاش بەجێماوە: شێخ ئەحمەد و شێخ حەسەن و شێخ یەحیا.

وە لە شێخ عەبدوڵڵای برای شێخ یوسفی مودەڕیس سێ کوڕ بەجێماوە: شێخ عەبدولحەکیم (مجد الاسلام) و شێخ عەبدولغەفار و شێخ عەبدولغەفوور.

جا لە شێخ عەبدولحەکیم عەبدولوەهاب بەجێماوە و لە شێخ عەبدولغەفووریش شێخ محەمەد بەجێماوە کە دانیشتووی دێی (سەرڕێز)ە.

**شێخ محەمەد سەعید**

کوڕی شێخ ئەحمەدی دوەم، کوڕی شێخ مەحمود، کوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامە، کوڕی حاجی شێخ مستەفا ...

ئەم زاتە لە ساڵی ١١٥٢دا لە دایک بووە و لە ١٢٣٦دا کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە هەڵکەوتوویەکی بێوێنەی چەرخی خۆی بووە و لە ڕەوشت و خووی بەرزدا تاقانە بووە و لەخوداترس و دنیانەویست بووە و لە زانیاری‌یە باوە ئیسلامی‌یەکاندا ئاگادار و بالادەست بووە.

بە هۆی ئەوەوە کە ئەم سیفەتە بەرزانەی تێدا کۆ بووەتەوە لەو ڕۆژەدا والی ئەردەڵان (أمان الله خان)ی گەورە بەوپەڕی پێ خۆشحاڵی و دڵسۆزی‌یەوە کردوویە بە مودەڕیسی مزگەوتی (دارالاحسان) کە یەکە مزگەوت بووە لە هەموو شارەکانی کوردستاندا کە (ئەمانوڵلاخان) دروستی کردووە. هەروەها بڕیاری داوە کە تەدریسی ئەو مزگەوتە بدرێ بە خوێندەوارترین نەوەی شێخ محەمەد سەعید لە پاش خۆی. شێخ محەمەد سەعیدیش بەوپەڕی دڵگەرمی‌یەوە دەرسی گوتووەتەوە و لە هەموو ناوچەیەکی وڵاتەوە قوتابی و شاگردان داباریون بە سەریدا.

وە یەکێ لە قوتابیانی وڵاتی بابان کە چووە خزمەتی بۆ خوێندن مەلا محەمەدی بەناوبانگ بە موفتی زەهاوی بووە و یەکێ تریان سەیید عەبدوڕەحیمی مەولەوی بووە و یەکێکی دیکەیان مەلا خزری نالی بووە و .. جگە لەمانەیش کۆمەڵێکی دیکە کە دەفتەرێکیان دەوێ بۆ نووسینی ناو و نیشانی پیرۆزیان.

وە کوڕەکانی خۆیشی لە ریزی قوتابیانی خوێندنگاکەدا خەریکی خوێندن بوون. وە هەر یەکێکیان بوو بە زانایەکی بەرز و ناودار لە کوردستاندا و لە ئەنجامدا گەلێ کتێبی بایەخداریان دانا. وەکوو لەمەولا باسیان ئەکەین.

وە ئەمانە کوڕەکـانی حـاجی شـێخ محەمـەدسـەعیدن: شـێخ عەبـدولقادر، شـێخ محەمەدوەسیم، شێخ محەمەدجەسیم، شێخ محەمەدنەسیم.

### شێخ عەبدولقادر

ئەم زاتە کوڕی گەورەی شێخ محەمەدسـەعیدە و لـە ساڵـی ١٢١١ی کۆچیـدا لـە دایک بووە و لە ساڵی ١٣٠٤دا لە تەمـەنی ٩٠ ساڵـیدا[1] لـە شـاری سـلێمانی کـۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە پاش کۆچی دوایی باوکی لە مزگەوتی (دارالاحسـان) لە شوێنەکەی باوکیدا دانیشتووە و لە سەر ڕێبازی باوکی بە جوانترین شێوە دەرسی گوتووەتەوە و لە هەموو لایەکەوە قوتابیان بۆ خوێندن هاتوونەتە خزمەتی.

وە براکانیشی لـە خزمەتیـدا خوێندوویانـە و دەرسیشـیان گوتووەتـەوە و سـفرەی زانیارییان ڕاخستووە، بە تایبەتی زانیارییە عەقڵییە ئیسلامییەکان.

ئەم زاتە سـێ شـەرحی لـە (تهـذیب الکـلام) کـردووە: (قـدیم)، (جدیـد)، (اجـد). هەرچەند (اجد)ەکەیان زۆر بەسوودترە ... (جدید)ەکەیان زیاتر لـە نـاو خەڵـکدا بـڵاو بووەتـەوە. حـەزرەتی کـاک ئەحمـەدی شـێخ لـەبارەی ئـەم دیـاردەوە لـە شـێخ عەبدولقادری پرسیوە، ئەویش لە وڵامیدا فەرموویەتی: قوربان وا ئەزانم کـە ئیخلاسـم لە دانانی ئەم جەدیدەدا زۆرتر بووبێ.

وە گەلێ لە زانایانی کوردسـتان حاشـیەیان لـە سـەر (تقریـب المـرام)ی شـەرحی تەهزیب نووسیوە، وەکـوو: مـەلا ئەحمـەدی نۆدشـی و مـەلا عـەلی قزڵـجی و مـەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی و باباشـێخی کـوڕی شـێخ مـەعرووفی قـەرەداغی و شـێخ محەمـەدی بـەرزنجی... بـە تایبـەتی مامۆسـتای بـەرزم شـێخ عومـەری قـەرەداغی حاشیەیەکی (مدونە)ی لە سەر تەهزیب نووسیوە، کە نزیکی بیسـت و دوو مەلزەمەیـە و من خۆم ئەو (تقریب المرام)ی حاشیەم بۆ مامۆستا نووسیوەتەوە و بۆ خۆیشم لە سەر (تقریب المرام)ی خۆم نووسیوەتەوە.

هەروا خواڵێخۆشبوو شێخ عەبدولقادر دانراوێکی نایابی لە (عیلمی خودای تەعالا)دا هەیە و بە (ڕیسالەی عیلمییە) ناوبانگی دەرکـردووە. وە نامیلکەیـەکی لـە عەقائیـددا

---

١- ئەبێ ٩٣. هەروەها دوو لاپەڕە دواتریەدا هەر ئەنووسرێ ٩٣ ساڵی.

هەیە و حاشیەیەکی مودەووەنەی لە سەر حاشیەی لاری هەیە و بە خەتی خۆم لە سەر کتێبی خۆم نووسیومەتەوە.

بە کورتی ئەم زاتە خودا کردبووی بە یارمەتیدەری دین و بلاوکەرەوەی زانیاری، هەتا بە قەزا و قەدەری خودا لە رووداوی (کاروانسەرا)ی شاری سنەدا ناحەزان و دوژمنان کارێکی وایان لە بارەگەی والی کوردستاندا ئەنجامدا کە شێخ عەبدولقادر بە ناچاری شاری سنەی بەجێهێشت و رووی کردە وڵاتی عێراق و چەند رۆژێ لە شاری هەوراماندا مایەوە تا بزانێ خودا چی ئەکا. لەو رۆژانەدا کتێبی (خواجە حافظ) ئەگرێتەوە، کە کتێبەکە ئەکاتەوە ئەڵێ:

دلم از وحشت زندان سکندر بگرفت
رخت بربندم تا ملک سلیمان بروم

لەم تەفائولەوە هەڵدەستێ خۆی و خێزان و خانەوادە و هەر چوار کوڕەکەی روو دەکەنە شاری سلێمانی. کە نزیک ئەبێتەوە خەڵکی سلێمانی پیاوانە و مەردانە پێشوازی ئەکەن و لە سلێمانیدا بە خۆشی دایئەمەزرێنن.

دوای ئەوە لە سەر زمانی ئەو عەریزەیەک پێشکەشی سوڵتان عەبدولمەجیدی عوسمانی ئەکەن لەگەڵ نوسخەیەک لە شەرحی تەهزیبەکەیدا و باسی کۆچکردنەکەی شێخی لە سنەوە بۆ سلێمانی بۆ ئەنووسن. کە عەریزەکە ئەگاتە ئەوێ سوڵتان عەبدولمەجید وەلامێکی جوانی بۆ ئەنووسێتەوە و مانگانەیەکی رەسای بۆ دیاری ئەکا و خۆشحاڵی خۆی بە هاتنی ئەو دەردەبڕێ. ئەمە دەقی وەلامەکەی سوڵتانە:

بسم الله الرحمن الرحيم

بعد السلام عليكم، قد ظهر فضلكم من اثركم، و نحن تفاءلنا بيوم قدومكم المصادف ليوم دخول عساكرنا المنصورة بلدة (سيواس تەپۆل)، فهـا خصصنا لكم شهرية تكفي معيشتكم فان لم يكف فاكتبوا لنا بعد فراغنا من غوائل الحرب. و لا تنسونا من الدعاء. و السلام.

ئیتر ئەم زاتە لە سلێمانیدا مایەوە و دەستی کرد بە: دەرسوتنەوە و کتێبدانان و خزمەتی دین، هەتا لە ساڵی ١٣٠٤ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی

تایبەتیدا لە رۆژئاوای گردی سەیواندا بە خاک سپێرراوە. وە یەکێ لە نەتەوەکانی نووسیویە کە لە تەمەنی ٩٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

شێخ عەبدولقادر ٤ کوڕی پایەبەرز و زانای لێ بەجێماوە: شێخ عەبدولکەریم و شێخ محەمەد سەعید و شێخ مەحموود و شێخ ئەحمەد.

ئەم کوڕانە پاش کۆچی دوایی شێخ گەڕانەوە بۆ شاری سنە بۆ سەر جێگە و نیشتمانی خۆیان، تەنها شێخ عەبدولکەریم نەبێ کە لە سلێمانی مایەوە و بە دەرس‌وتنەوەوە خەریک بوو تا کۆچی دوایی کرد.

وە پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم شێخ عەبدولەتیفی کوڕی لە جێگەکەیدا دانیشت. ئەم شێخ عەبدولەتیفە پیاوێکی کۆمەلایەتی و بەکەڵک بووە، لەگەڵ ئەوەیشدا زانایەکی زۆر بەتوانا و پایەبڵند بووە، ئەگەر بارودۆخی بۆ بگونجایە پیاوێکی زۆر بەرز و دیاری دەبوو.

وە لە شێخ عەبدولەتیف شێخ عەبدوللا و باباعەلی و محەمەد سەعید بەجێماون.

وە لە شێخ مەحموودی کوڕی شێخ عەبدولقادری موهاجیر چوار کوڕ بەجێماوە: شێخ موحسین و شێخ محەمەدسادق و شێخ مەسعوود ـ کە چووە بۆ میسر و لەوێ ماوەتەوە ـ وە شێخ عەبدولغەنی.

وە لە شێخ ئەحمەدی (حجة العلماء) کوڕی شێخ عەبدولقادر دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ محەمەدی قازی و شێخ عەبدولمەجیدی (معتمد الشريعة).

جا با بڕۆینەوە سەر باسی ئەوانەی ماونەتەوە لە کوڕەکانی شێخ محەمەد سەعیدی مودەڕیس کە سێ کەسن: شێخ محەمەدوەسیم، شێخ محەمەدجەسیم، شێخ محەمەدنەسیم.

### شێخ محەمەد وەسیم

لە پاش کۆچی کوڕی گەورەی شێخ محەمەدسەعید کە شێخ عەبدولقادر بوو بۆ شاری سلێمانی. شێخ محەمەدوەسیم لە خوێندنگای (دارالاحسان)دا دانیشت و خەریکی دەرس‌وتنەوە بوو و (مدونه)یەکی لە سەر (تقریب المرام)ی شەرحی (تهذیب الكلام) نووسی. ئەم (مدونه) چاپ کراوە.

وە لە کاتی دەرس‌وتنەوەی ئەمدا شێخ محەمەدجەسیمی برای یارمەتی‌دا لە دەرس‌وتنەوەدا. ئەم شێخ محەمەدوەسیمە لە ساڵی ١٢١٩دا لە دایک بووە و لە ساڵی

١٢٧٥دا کۆچی دوایی کردووە. واتە ٤ ساڵ پاش هیجرەتی شێخ عەبدولقادر ژیاوە. وە دوو کوڕی لێ بەجێ‌ماوە:

یەکەم: شێخ ڕەزای (حجة الاسلام) کە لە ساڵی ١٢٤٨دا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٣٢٦دا لە جیهان دەرچووە.

دوەم: شێخ جەلالەدین کە لە ساڵی ١٢٥١دا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٢٨٥دا کۆچی دوایی کردووە.

**شێخ محەمەد جەسیم**

ئەم زاتە کوڕی سێهەمی شێخ محەمەدسەعیدە و لە پاش کۆچی دوایی شێخ محەمەدوەسیم ماوەیێ لە سەر مەدرەسەی (دارالاحسان) دانیشتووە و دەرسی گوتووەتەوە و نامیلکەی (کشف الغطا)ی لە عیلمی کەلامدا داناوە و شێخ محەمەد نەسیمی برای لە دەرس‌وتنەوەدا یارمەتی داوە. بەلام زۆری پێ نەچووە کە لە سەر ئەو مەدرەسە نەماوە و لە مێژووی ١٣٠٦دا لە شاری سنەدا کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە ٣ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە:

یەکەم: شێخ عەبدوللا کە بە (صدرالشریعة) ناوبانگی دەرکردووە، باوکی شێخ عەبدولەتیف و شێخ ئەحمەد و شێخ محەمەد.

دووهەم: شێخ ئەبولخەیر باوکی شێخ عەلادین.

سێهەم: شێخ ئەبولحەسەن (صدرالعلماء) باوکی شێخ (ابوالبها)ی (صدرالعلما)ی باوکی قوتبەدین و فەخرەدین و تاها.

**شێخ محەمەد نەسیم**

کوڕی چوارەم لە کوڕەکانی شێخ محەمەد سەعید. ئەم زاتە لە شاری سنەوە چووە بۆ عێراق و لە سەر خوێندنگای مزگەوتی خورماڵ بە ڕەسمی دامەزراوە و لە پاش ماوەیەک لە خورماڵ کۆچی دوایی کردووە، مێژووی چوونی بۆ عێراق و ساڵی لەدایکبوون و کۆچی دوایی نازانم.

بەلام بە گوێرەی هەندێ بەڵگە وائەزانم کە لە مێژووی ١٣١٠دا لە جیهان دەرچووبێ.

ئەڵێن: ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ عەبدولەتیف و شێخ یەحیا کە لە هەڵەبجەدا ژیاون.

## شێخ حەسەن

کوڕی شێخ شەمسەدین، کوڕی شێخ عەبدولغەفاری یەکەم. ئەم زاتە لە دێی دەگاشێخانی مەریوانەوە گەڕاوەتەوە بۆ شاری هەورامانی تەخت هەتا کۆچی دوایی کردووە. یەک کوڕی لێ بەجێماوە ناوی شێخ عەبدولەتیف بووە. ئەم شێخ عەبدولەتیفە زانایەکی ناونجی بووە و لە هەورامانەوە گوێزاویەتی‌یەوە و هاتووە بۆ عێراق و لە دێی (خادگێلان)[1] لە خواری دێی بیارەوە بە مەلایەتی دانیشتووە و خزمەتی دینی کردووە تا لە جیهان دەرچووە و کوڕێکی لێ بەجێماوە ناوی شێخ مەعرووف بووە، ئەم شێخ مەعرووفە زانایەکی گەورە و پایەبەرز بووە و لە جێگەی باوکیدا دانیشتووە و خزمەتی موسوڵمانانی کردووە هەتا کۆچی دوایی کردووە و لە قەراخی چەمی بیارەدا کە دێتە خوارەوە بۆ شارەزوور و لەو شوێنەدا کە بەناوبانگە بە (دەرەقووڵە) لە بەری هەڵەبجەوە بە خاک سپێرراوە و گۆڕەکەی دیاری و ناسراوە و خەڵک زیارەتی دەکەن.

شێخ مەعرووف کوڕێکی لێ بەجێماوە ناوی شێخ عەبدولەتیف بووە.

## شێخ عەبدولەتیفی کوڕی شێخ مەعرووف

هەرچەند بە روونی ساڵی لەدایک بوونی نازانرێ بەڵام هەندێ بەڵگەدا وا دیارە کە لە ساڵی ١١٣٨ی کۆچیدا لە دایک بووبێ.

ئەم زاتە لە خزمەتی شێخ مەعرووفی باوکی و لە لای هەندێ لە زانایانی خاکی باباندا خوێندوویە هەتا ئیجازەی وەرگرتووە. وا دەردەکەوێ لە شاری قەڵاچوالان ئیجازەی وەرگرتبێ.

---

١- هەندێ کەس ئەڵێن: خاد بە مەعنا (خاتوون)ە و (گێلان) (گەیلانی‌یە) بووە، ناوی کچێکی مەلا ئەبوبەکری موسەنیف بووە کە شووی کردووە بە زانایەک و ئەو دێیەی بە ناوی (خادگەیلانی‌یە)وە دروست کردووە.

وە لەبەر ناوبانگی و لەبەر زانیاریی و پلەبەرزیی، پاشای بابان فەرمانی بۆ دەردەکا بۆ ئەوە ببێ بە مامۆستای خوێندنگای (زەردیاوا) کە مەرکەزی ناحیەی قەرەداغ بووە و جێگەی (وەلیعەهدی میری بابان) بووە و نزیکەی ٦٠٠٠ خانووی تێدا بووە.

جا لەو مێژووەدا کە ساڵی ١١٦٣ی کۆچی بووە شێخ عەبدولەتیف بە ماڵەوە چووە بۆ زەردیاوا و بووە بە مامۆستای ئەوێ و بووە بە هۆی بووژاندنەوەی زانیاری‌یە ئیسلامی‌یەکان لەو ناوچەدا و رۆژ بە رۆژ لە سەر بناغەی زانیاری و رەوشتی بەرز و شەخسییەتی هەڵکەوتووی خزمەتی زۆرتر ئەبوو و زیاتر پایەی بەرز ئەبووەوە و بوو بە یەکە زانای قەرەداغ و سەنگاو و بوو بە مەرجەعی فەتوا و رێکخەرەوەی نێوانی خەڵک. لەگەڵ ئەمانەیشدا دیوەخانێکی پیاوانەی بۆ نان‌دان بە موسوڵمانان لە میوان و قوتابی و ئاموشۆکەری ئەو رۆژە بووە. کە ئەم خووە بەرزانە لە لای میری بابان دەرکەوت، ئەویش مەردانە چوو دەرامەتی شەرعی دێهاتی ئەو ناحیەیە - کام دێی باش بوو - بەرەورووی شێخ عەبدولەتیفی کردەوە بۆ ئەوە بتوانێ خزمەتی زانیاری و دین و موسوڵمانان بکا.

لە قەرەداخا واریداتی دێهاتی: باخچە و نەوتی و شیوی قازی و دووکەرۆ و بلکان و دەلووجە و قەڵاقایمەز و ... لە سەنگاویشدا واریداتی: گۆپتەپە و دەرەوار و ئوغلیجە و دەربەندسووتاو .. ئەم دێهاتانەی بە فەرمانی تایبەتی دا بە شێخ عەبدولەتیف و نوێنەری شێخ عەبدولەتیف واریداتی شەرعی ئەو دێهاتەی کۆدەکردەوە و ئەیناردەوە بۆ سەرف‌کردن لە خوێندنگا و دیوەخان و ماڵ و منداڵی شێخ عەبدولەتیفدا، ئەویش بە سەرگەرمیی مەشغووڵی خزمەتی دین ئەبوو. ئەم زاتە بەو شێوەیە تەمەنی خۆی سەرف کرد، هەتا بە فەرمانی خودا لە ساڵی ١٢١٢ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد و لە (گردی گومەزی)دا بە خاک سپێرراوە.

خوالێخۆش‌بوو شێخ عەبدولەتیف ٤ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ عومەر، کە بە شێخ هۆمەر بەناوبانگ بووە و شێخ عوسمان و شێخ ئەحمەد و شێخ محەمەد.

### شێخ عومەر

ئەم زاتە پیاوێکی زانا و رەوشت جوان و پایەبەرز بووە. خەڵکی ناوچەکە بە هەموو بەشەکانیانەوە سوودیان لە ژیانی وەرگرتووە: قوتابیان لە زانیاری‌یەکەیی و

موسوڵمانانی دێهات و شارستانی لە ئامۆژگاریی و ڕێنومایی و میریی لە نیاز و ڕەفتاری باش و ڕێکخستنەوەی نێوانی خەڵک و کوژاندنەوەی ئاگری ناکۆکی و ئاژاوە.

کاتێ کە مەولانا خالیدی نەقشبەندی منداڵ بووە و باوکی مردووە بە ئامۆژگاری شێخ عومەر ڕۆیشتووە بۆ خوێندن و خەریکی خوێندن بووە تا بووە بەو پیاوە هەڵکەوتوە. وە پاش ئەوە مەولانا خالید چووە بۆ هیندوستان و لە خزمەتی شێخ عەبدوڵلای دەهلیدا ڕێبازی نەقشبەندی وەرگرت و هاتەوە بۆ کوردستان .. ئەم شێخ عومەری مامۆستایە تەریقەتی لێ وەرگرت و لە خزمەتیدا سلووکی کرد، تا ئەنجام بوو بە خەلیفەی مەولانا. مامۆستا شێخ عومەر لە مەلایەتی‌یەوە بوو بە مەلا و مورشید بە مەعنای کەلیمە و بە زاهیر و باتین تەعلیم و تەربییەی موسوڵمانانی ئەکرد. تا لە قەرەداغدا لە جیهان دەرچوو وە لە گردی گومەزی نێژرا.

شێخ عومەر ٥ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ حسەین و شێخ عەلی و شێخ سولەیمان و شێخ عەزیز و شێخ مەعرووف. جا لە شێخ حسەین شێخ مەحموود بووە و لە شێخ مەحموود دوو کوڕ بەجێ‌ماوە: شێخ قادر کە کەسی لە پاش بە جێ نەماوە و شێخ عارف کە شێخ حسەین و شێخ ڕەئووفی لێ بەجێ‌ماون.

وە لە شێخ عەلی شێخ کەریم و لە شێخ کەریم کوڕێ بووە بەڵام بە وەجاخ‌کوێری مردووە. شێخ سلێمانیش نێرینەی لە پاش بەجێ‌نەماوە.

وە لە شێخ عەزیز شێخ تاها و شێخ ئەحمەد و لە شێخ ئەحمەد شێخ محەمەد بەجێ‌ماوە.

وە شێخ مەعرووفی کوڕی شێخ عومەر لە قەرەداغەوە هاتووە بۆ شاری سلێمانی و بووە بە ئیمام و مودەڕیسی ئەو مزگەوتە کە ئێستە پێی دەوترێ: مزگەوتی شێخ مارف. واتە شێخ مارفی کوڕی شێخ هۆمەری قەرەداغی.

ئەم شێخ مارفە لە شاری سلێمانیدا دەرسی گوتووەتەوە هەتا کۆچی دوایی کردووە. سێ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە:

یەکەم: شێخ عەبدوڕەحمان کە زانایەکی ناونجی بووە و لای شێخ بەهادین دەستی کردووە بە سلووکی تەریقەتی نەقشبەندی و بووە بە خەلیفەی ئەو و لە سەر گێڕانەوەی خەڵکی شارەکە و هەندێ کەسی باوەڕپێکراو پیاوێکی زۆر چاک و لەخوداترس بووە. لە پاش ئەوەی بووە بە خەلیفەی شێخ بەهادین جارجار لە

خزمەتیدا رای بواردووە و لە سەر فەرمانی ئەو ماوەی ساڵێ چووە بۆ شاری بەسرە بۆ ئیرشاد و رێنومایی موسوڵمانان، پاش ئەو گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و بە بێ پەیوەندی لەگەڵ براکانیدا رای بواردووە و تا کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە نەوەی نێرینەی نەبووە و تەنیا کچێکی بووە کە ناوی (ئامینەخان) بووە زۆر خوداپەرست و لەخوداترس بووە.

دوەم لە کوڕەکانی شێخ مارف: باباشێخ بووە، کە خوێندوویە تا بووە بە زانایەکی بەرز و بەڕێز و گەلێ حاشیەی جوانی لە سەر تەهزیب و شەرحی شێخی موهاجیر هەیە و خۆی تەهزیبەکەی لە خزمەتی شێخی موهاجیردا خوێندووە.

ئەم باباشێخە پێش ئەوەی ژن بێنێ کۆچی دوایی کردووە و گۆڕەکەی وا لە گردی سەیواندا لە تەپە گەورەکەیانا.

سێهەم لە کوڕەکانی شێخ مارفی کوڕی شێخ هۆمەری قەرەداغی: شێخ محەمەدئەمین بووە، کە ئەویش زانایەکی بەرز بووە و لە خزمەتی شێخ عەبدولقادری موهاجیردا تەهزیبی خوێندووە و ئەویش حاشیەی لە سەر تەهزیب هەیە. مامۆستای تاقانەم ـ خ ـ لە تەعلیقاتیدا بە سەر تەهزیبەوە گەلێ جار قسە لە باوکی و باباشێخی مامییەوە نەقڵ دەکا.

ئەم شێخ محەمەدئەمینە لە سلێمانیدا کۆچی دوایی کردووە و گۆڕی لە گردی سەیوانە لە لای گۆڕی باوک و براکانیدا. ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێ ماوە: شێخ مەعرووف و شێخ عومەر وەکوو باسیان ئەکەین.

شێخ مەعرووف باوکی شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ محەمەد ئەمین و باباشێخە. دوو کچی بووە، یەکەم ناوی حەبیبەخان بووە و شووی کردووە بە شێخ تاهای چنارەیی باوکی شێخ جەلال و شێخ ئەحمەدی چنارە. وە شێخ جەلال لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بوو بە قازی و لە (سیتەک) دائەنیشت. وە لە دواییدا گوێزرایەوە بۆ سلێمانی لەوێ کۆچی دوایی کرد و چەن کوڕی لێ بەجێ ما، وەکوو نیزامەدین و ئەبوبەکر و نووری و ...

کچی دوەم ناوی فاتمەخان بووە و شووی کردووە بە حاجی شێخ ئەمینی خاڵ و شێخ عەلی لێ بووە، کە باوکی حاجی شێخ محەمەدی خاڵ و شێخ مستەفا و شێخ ئەحمەد و حسەین بووە.

## شێخ مەعرووفی کوڕی شێخ ئەمین

ئەم شێخ مەعرووفە لە خزمەتی باوکیدا خوێندوویەتی و بووە بە مەلا و لە سەر مزگەوت و قوتابخانەی خۆیان دانیشتووە. ئەم زاتە پیاوێ بوو لە عەقڵ و هۆشیاری و کۆمەڵایەتی و رەوشتی پیاوانەدا لە ژیانی خۆمدا وێنەیم نەدیوە. بە تایبەتی لە خزمدۆستیدا. لەگەڵ ئەم رەوشتانەدا لە سەر دەرس‌وتنەوە دەوامی کرد هەتا لە ساڵی هەزار و سێسەد و حەفتاو...ی کۆچیدا لە جیهان دەرچوو و لە گۆڕستانی سەیوان لە لای باوک و برای خۆیدا بە خاک سپێررا.

ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بە جێ ما: شێخ مستەفا و شێخ محەمەد. شێخ مستەفا لە مزگەوتا دانیشت تا کۆچی دوایی کرد.

## شێخ عومەری کوڕی شێخ ئەمین

ئەم زاتە لە ساڵی ١٣٠٣ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە خوێندنگای خۆیاندا خوێندوویەتی.

لە مامۆستای رەحمەتیم بیست ـ کاتێ ویستم دەست بکەم بە تەسریفی زنجانی ـ فەرمووی: حاجی شێخ عەبدوڕەحمانی مامم بە باوکمی فەرموو: ئەمین! مارفت دایە دەستی حەول و قووەتی خۆت تا سەرکوێرت کرد. پیاوەتی بکە بێ عومەر بدەرە دەستی حەل و قووەتی خودا بەڵکوو بەهرەیەکی دەست بکەوێ! باوکیشم فەرمووی: کاکە! شەرت بێ وازی لێ بێنم بۆ خۆی، چۆن ئەخوێنێ با بخوێنێ. جا فەرمووی: لە مادەی (اظهار)دا کەوتمە پێش کاکمەوە.

بە کورتی ئەم زاتە لە پاش تێگەییشتن و خۆگرتنی لە خوێندندا هەتا باوکی ماوە لە خزمەتی ئەودا خوێندوویەتی، دوای ئەو لە لای مامۆستا مەلا حسەینی پیسکەندی خوێندوویەتی و هاوینان چووە بۆ زەردیاوا و لەوێ لە خزمەتی مامە شێخ نەجیبدا خوێندوویە.

مامۆستام لە رووی ئامۆژگاری قوتابی‌یەکانییەوە لە سەر وردی لە دەرزخوێندندا فەرمووی: لە خزمەتی مامە شێخ نەجیبدا دەستم کرد بە (جمع الجوامع)، ئەویش لەبەر زانیاریی و شارەزایی خۆی گوێی بە هەندێ پرسیاری قوتابی نەدەدا. بەو شێوە پێشەکی (جمع الجوامع)م لە خزمەتیدا تەواو کرد، کە هاتمەوە بۆ سلێمانی و بە دەرزە

خوێندراوەکانا چوومەوە دەبینم لە گەڵێ باسدا هەروا بێ وردەکاری و لێکۆڵینەوە بە سەریا رۆیشتووم، هەتا بە ناچاریی دووبارە دەستم کردووە بە (جمع الجوامع) و لە خزمەتی مامۆستا مەلا حسەینی پیسکەندیدا لە سەرەتاوە پێشەکی‌یەکەم خوێندەوە و لە سەری رۆیشتم هەتا تەواوم کرد.

جا لە مامۆستام پرسی: شێخ نەجیبی مامت زانایەکی چۆنە؟ فەرمووی: بە قەناعەتی خۆم لە مەلا سەعدی تەفتازانی کەمتر نییە، بەڵام شان و شوێن ئەوی بەرز کردووە و مامم وەها مایەوە.

مامۆستای گەورەم تا کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم هەر لە مزگەوتی خۆیدا دەرسی وتەوە و چەن قوتابی پێگەیاند، تا بوون بە زانای بەرز و بەرێز، وەکوو: مەلا محەمەدی کوڕی مەلا مەحموودی کوڕی حاجی مەلا سەلامی بانەیی و مەلا عەبدولقادری بانەیی (سماقانی) و سەیید عەبدولکەریمی ئالانی کە لە موکری‌یاندا بووە بە مودەڕیسی دێی (باغلوجە) و سەیید حسەینی موکری‌یانی (تائر بوغەی) کە بوو بە مەلای خواڵێخۆشبوو شێخ عەلادین لە دێی (دووڕوە)دا و پاش ماوەیێ رۆیشت بۆ شاری بۆکان و بوو بە مودەڕیسی ئەوێ تا کۆچی دوایی کرد.

وە پاش ئەوەی کە چەرخ گۆڕا، لە مێژووی ١٣٣٧ی کۆچیدا دەوڵەمەندان و ناودارانی شاری سلێمانی مزگەوتی خانەقای مەولانا خالیدیان چاک کردەوە. زۆربەی ئەم کارە بە کۆششی حاجی عەبدوڵلای سالی و حاجی فەقێ محەمەدی برایی و حاجی سەیید ئاغا و حاجی مەلا محێدینی برای بوو. ئەم پیاوانە بڕیاریان‌دا کە مامۆستا شێخ عومەر بکەن بە مامۆستای ئەم مزگەوتە، چونکە ئەو مزگەوتە گەورە شیاوی ئەو پیاوە زانا و بەڕێزەیە. بەم شێوە مامۆستایان هێنا و کردیان بە مودەڕیس و قوتابی لە هەموو وڵاتێکەوە وەکوو بولبول بۆ گوڵ لە دەوری گرد بوونەوە و دەرگای دەرس‌وتنەوە و بلاوکردنەوەی زانیاری ئیسلامی کرایەوە.

وە مامۆستای گەورەم لە هەموو جۆرێ و هەموو چینێ قوتابی بۆ هات، ئەویش لە هەموو جۆرە عیلمێکدا لە: نەحو و سەرف و مەنتیق و (آداب البحث) و بەلاغە و ئوسوولی فیقهـ و، ئوسوولی دین و فیقهـ و، ریازیات، بە هەموو بابەکانییەوە لە فەلەکییات و حیساب و هەندەسە و جەبر و موقابەلە و (اسطرلاب) و روبعی موجەییەب و روبعی موقەنتەرات ... ئەمانەی بە دەرس ئەگوتەوە و لە ماوەی هەژدە ساڵدا کە لە

خانەقادا لە ژیاندا بوو گەلێ کتێبی بەنرخی دانا و گەلێ قوتابی بە توانا و لێهاتووی پێگەیاند وەکوو: مەلا حسەینی گوڵپی و مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی بیارە و مەلا سەیید عەبدولحەکیم و مەلا عینایەت و مەلا عەبدوڵلای چورستانی و مەلا سالحی هەڵەبجە و شێخ محەمەد خاڵ و مەلا محەمەدی رەئیس و مەلا محەمەدئەمینی مەولانایی و شێخ عەبدولوەهابی نەرگسەجاڕی و مەلا سەیید عارف و مەلا محەمەدسەعیدی ساحیبی و مەلا مستەفای سەفوەت و مەلا ئەحمەدی برایی و مەلا عەبدوڕەحیمی پەرخی و مەلا مەعرووفی خاوییەیی و ... چەندینی دیکە لە دەریای زانیاری ئەو دڵ‌تەڕ و دەم‌بەفەڕ بوون.

ئەمانە بێجگە لەوانەی کە ماوەیێ لە خزمەتیدا خوێندوویانە و لە پێش تەواو کردنی خوێندن و ئیجازە وەرگرتندا لەوێ نەماون و چوون بۆ خوێندنگای تر و لای مەلای دیکە خوێندوویانە، وەکو: مەلا یەحیای بانەیی کە بلیمەتی رۆژگار بووە و مەلا عارفی بانەیی کە هەڵکەوتوو و تاقانەی سەردەمی خۆی بووە و مەلا محەمەد ئەمینی هەورامی کە ئینسانێکی زانا و بەتوانا بووە.

وە ئەو کتێبانەی کە مامۆستام دایناون ـ وەکوو ئێستە لە بیرم بێ ـ ئەمانەن:

١ـ حاشیەی مودەووەنە لە سەر تەسریفی مەلا عەلی.

٢ـ حاشیەی لە سەر گەلەنبەوی ئاداب.

٣ـ مودەووەنەی لە سەر گەلەنبەوی بورهان.

٤ـ شەرحی مەقوولاتی مەلا عەلی قزڵجی.

٥ـ نامیلکەکەی لە عیلمی فەرائیزدا .. ئەمانە چاپ کراون.

وە حاشیەی مودەووەنەی لە سەر فەریدەی جەلالەدینی سیووتی و لە سەر گەلەنبەوی شەرح و لە سەر عەبدوڵلا یەزدی و لە سەر (أقصی الامانی) لە عیلمی بەلاغەدا و لە سەر (جمع الجوامع) لە ئوسوولی فیقهدا و لە سەر (تقریب المرام) شەرحی (تهذیب الکلام) و شەرحی لە سەر فەرائیزی مەلا عەلی قزڵجی و کتێبی (المنهل النضاخ فی اختلاف الاشیاخ) لە مەسائیلی خیلافی‌یەی فیقهی شافیعیدا و مودەووەنەی لە سەر ریسالەی حیساب و (تشریح الافلاک) و ئوستورلابی عامیلی و ... چەند کتێبی دیکە. ئەمانەیش بێجگە لە فەتاواکانی لە وەلامی موسوڵمانانا. ئەم کتێبانە تا ئێستە چاپ نەکراون، هیوامان وایە رۆژێ لەبار بێ بۆ چاپ‌کردنیان.

## باسێکی ناسک

هەموو کاتێ مامۆستام پاش نوێژەکان خەریکی خوێندنی نیوەی دوایی جوزئی (عـم) ئەبوو. لەبەر دەرگای حوجرەکەیدا لێم پرسی: قوربان! ئەم جۆرە قورئان خوێندنەت چییە؟ فەرمووی: باوکم لە کاتی سەرەمەرگدا لای شێخ عەبدولقادری موهاجیر بووە، گیانی سپاردووە، نیو سەعاتێ خەریکی ئاو گەرم‌کردن و رێکخستنی پێویستی کفن و دفنی بوون، لە ناکاو! شێخ عەبدولقادر چاو ئەکاتەوە! جا ئەوانەی کە لە خزمەتیدا دەبن عەرزی ئەکەن: قوربان تۆ مردبوویت ئێستە چۆن وا چاوت کردەوە؟! ئەویش ئەڵێ: نەخەیر من نەمردووم و لەم ماوەدا لە حوزووری خودادا بووم، ئامۆژگاری ئەکردین ئەیفەرموو: هەر کەسێ رۆژێ دووسەد ئایەت لە قورئان بخوێنێتەوە ئیمانی پارێزراو ئەبێ. کاتێ ئەم قسەی گێڕایەوە ئیتر بۆ یەکجاری چاوی نایەوە بەیەکدا.

جا مامۆستام فەرمووی: لەو کاتەوە ئەم رووداوەم لە باوکمەوە بیستووە تا ئێستە رۆژی دووسەد ئایەت لەم سوورەتە وردانە ئەخوێنمەوە، چونکی لەبەر دەرس‌وتنەوە و پرسیار و ئیش و کاری موسوڵمانان ماوەی دانیشتن و دەورکردنەوەی قورئانم نییە.

ئەم زاتە لە مێژووی ١٣٥٥ی کۆچیدا لە تەمەنی ٥٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان لەگەڵ برا و باوک و باپیرەیدا بە خاک سپێرراوە.

مامۆستام ٤ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە، شێخ ئەنوەر، کە ئەویش کۆچی دوایی کرد و شێخ عەبدوڕەحمان و کەمالەدین و باباعەلی.

## شێخ عوسمانی کوڕی شێخ عەبدولەتیف

ئەم زاتە ٥ کوڕی بووە: شێخ عەبدوڵڵا و شێخ قادر و شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ عەبدوسەمەد و شێخ سەمیع. ئەم کوڕانە هەموو خوێندەوار بوون.

وە شێخ عەبدوڵڵا سێ کوڕی بووە: شێخ عەبدولەتیف و شێخ حەسەن و شێخ محەمەدئەمین. ئەم سێ کوڕە هەموو خوێندەوار و زانا بوون، بە تایبەتی شێخ عەبدولەتیف و شێخ حەسەن، وەکوو باسیان ئەکەین.

## شێخ عەبدولەتیفی کوڕی شێخ عەبدوڵڵا

ئەم زاتە لە زانیاریی و کارامەیی و لێهاتووییدا تاقانەی دەوری خۆی بووە. لە سەر خوێندنگای زەردیاوا دانیشتووە و دەرسی گوتووەتەوە و زانیاریی بە کوردستاندا بڵاو کردووەتەوە و لە سەر ئەم رێگە پیرۆزە رۆییشتووە هەتا لە زەردیاوادا کۆچی دوایی کردووە. ئەم شێخ عەبدولەتیفە دوازدە کوڕی بووە:

یەکەم: شێخ عەبدوڵڵا کە یەکە زانا بووە لە قەرەداغدا و تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە و تەمەسوکی بە شێخ عوسمان سیراجەدینی خەلیفەی مەولانا خالید کردووە. وە ئەوەندە بە توانا و پێگەییشتوو بووە، بووە بە خەلیفەی شێخ عوسمان و بووە بە ئینسانێکی خاوەن (توجهات) و مورید و مەنسووب.

لە سەر فەرموودەی شێخ عوسمان ئەم شێخ عەبدوڵڵا گەییشتووەتە پایەی (قطبية) و پێش ئەوە هەواڵ بە وڵاتدا بڵاو ببێتەوە شێخ عوسمان خۆی لە (تەوێڵە)دا هەواڵی کۆچی دوایی شێخ عەبدوڵڵای راگەیاندووە و نوێژی جەنازەیان بە یاسای نوێژ لە سەر غائیب بۆ کردووە. وە کۆچی دوایی لە زەردیاوادا بووە و نەوەی لێ بەجێنەماوە.

دوەم لە کوڕەکانی شێخ عەبدولەتیف: شێخ مەحموود بووە، ئەویش موریدی شێخ عوسمانی سیراجەدین بووە و لە شاری هەڵەبجەدا دانیشتووە و شێخ عوسمان زوبەیدەی کچی خۆی لێ مارە کردووە. لەو کچە شێخ مەحموود کوڕێکی بووە ناوی شێخ ساحیب بووە و خوێندوویە و بووە بە زانا و بە گەنجی لە ساڵی ١٣٢٠دا کۆچی دوایی کردووە.

سێهەم تا حەوتەم لە دوازدە کوڕەکەی شێخ عەبدولەتیف شێخ ئەحمەد و شێخ کەریم و شێخ عەلی و شێخ عەبدوڵڵای دوەم و شێخ سالح. ئەمانە کۆچیان کردووە و نەوەی نێرینەیان لێ بەجێ نەماوە.

هەشتەم: شێخ عەبدوڕەحمان، ئەم زاتە کوڕێکی بووە ناوی شێخ عەلی بووە، شێخ عەلی خوێندنی تەواو کردووە و بووە بە مەلا. ماوەیێ لە قەرەداغدا و ماوەیێ لە دێی سۆڵەدا مەلا بووە، پیاوێکی عاقڵ و فازل بوو. ئەم زاتە کۆچی دوایی کرد و دوو کوڕی لێ بەجێما.

نۆهەم: شێخ قادر، لەم شێخ قادرە شێخ عەبدوڕەحیم و لە شێخ عەبدوڕەحیم شێخ لەتیف و محەمەد و حسەین، بەجێماون.

دەهەم: شێخ جەلال کە زاتێکی زانا و لەخوداترس بووە. لە شاری سلێمانیدا لە مزگەوتی خەفافەکان ئیمام و مودەڕیس بووە. تەمەنێکی بە کەرامەت و دین و قەناعەت لەگەڵ دەرس‌وتنەوە و خزمەتی دیندا بە سەر برد تا کۆچی دوایی کرد. لەم زاتە شێخ محەمەد بەجێ‌ماوە.

یازدەهەم: شێخ محەمەد، ئەم شێخ محەمەدەیش زانایەکی بەرز و بەڕێز و لەخوداترس و نەفس‌بەرز بووە. ئەمیش لەگەڵ شێخ عەبدوڵلای قوتبدا خەلیفەی شێخی سیراجەدین بووە و ئیمام و مودەڕیسی مزگەوتی محەمەد پاشای جاف بووە لە هەڵەبجە و بە راستی و دڵسۆزی خزمەتی زانیاری و دینی کردووە.

ئەم زاتە سێ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ محێدین و شێخ عەبدولەتیف و شێخ عومەر. وە لە پاش کۆچی دوایی شێخ محەمەد جەنابی شێخ محێدین لە جێگەیدا دانیشتووە و پاش ماوەیەکی کەم شێخ محێدینیش کۆچی دوایی کردووە. جا شێخ عەبدولەتیف لە سەر خوێندنگا و مزگەوتەکە دانیشت و بە باشی خەریکی ئیمامەت و دەرس‌وتنەوە و رێنومایی و خزمەت‌کردنی موسوڵمانان بوو بە جۆرێ کە لەوە باشتر ئینسانی وا لە تواناادا نەبێ.

وە ماوەی چەن ساڵێ کرا بە قازی مەحکەمەی شەرعی هەڵەبجە و لە قەزاوەتا لە سەر رێبازی (سەلەفی سالیحین) بوو و چەن ساڵێ پێش کۆچی دوایی لە سەر قەزاوەت نەما، هەتا لە ساڵی ١٣٤٦ی کۆچیدا لە جیهان دەرچوو.

پاش کۆچی دوایی شێخ عەبدولەتیف شێخ عومەر لە سەر مزگەوت و خوێندنگاکەی دانیشت، ئەمیش لە سەر هەمان رێگا خزمەتی زانیاری و موسوڵمانی کرد تا لە ساڵی ١٣٧٣دا کۆچی دوایی کرد.

ئەم زاتە ٧ کوڕی لێ بە جێ ما: شێخ محەمەد و شێخ رەئووف و ئەنوەر و نووری و زاهید و ئەحمەد و ئەسعەد.

دوازدەهەم لە کوڕەکانی شێخ عەبدولەتیفی کوڕی شێخ عەبدوڵلای کوڕی شێخ عوسمان:

**شێخ نەجیب**

ئەم زاتە لە لای باوکی لە خوێندنگای خۆیاندا خوێندوویەتی جا لە لای شێخ حەسەن، هەتا ئیجازەی وەرگرتووە و لە راستیدا تاقانەی زەمان و عەللامەی

کوردستان بووه. کتێبی زانیاری لە هەر زانیاری و لە هەر باسێکدا بووبێ بە بێ موتالەعە بە دەرس گوتوویەتی‌یەوە بە جۆرێ پیاوی زیرەک و زانای ویستووە خۆی ئامادە بکا و لە تەقریر و شەرحی بگات.

وە لەگەڵ ئەوەدا [کە] چەند کۆسپ و رووداوی نابار داوێنیان گرت ئەو هەر لە سەر دەرس‌وتنەوە و رێنومایی و نان‌دان بە موسوڵمانان دەوامی کرد و چەنها قوتابی لە سەر دەستی ئەودا پێگەیشتن و ئیجازەیان لێ وەرگرت و چەنها هەتیوی بێ‌کەس لە خوێندنگای ئەودا و لە سەر ژیواری خانەدانی ئەو پێگەیی و تەمەنێکی بەنرخی لە رێگەی دین و زانیاری و خزمەتی موسوڵمانانا بەسەر برد، تا لە ساڵی ١٩٣٢ی زایینیدا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی زەردیاوادا بە خاک سپێررا.

ئەم زاتە سێ کوڕی لێ بەجێ‌ما: شێخ مستەفا و شێخ مەجید و شێخ حامید.

شێخ مستەفا تاقانە زانای قەرەداغ بوو و لە هەموو زانیاری‌یەکاندا بێ‌وێنە بوو و لە دەرس‌وتنەوەدا بە کۆشش و دڵسۆز و دامەزراو بوو. گەلێ کەس لە دەرچووان لە خوێندنگاکە ئیجازەیان لە خزمەتدا وەرگرت. لە ماوەی ژیانیدا گەلێ هەڵوێستی مەردانەی بوو و زۆر کۆمەڵایەتی و رەوشت‌بەرز و خزم‌دۆست و بەوەفا بوو. لە کۆڕ و کۆمەڵی گەورەدا سەربەست و بەڕێز بوو. خانەدانی بە ڕێز و نرخەوە بۆ موسوڵمانان راگرت.

گەلێ فەتاوای جوانی داوە لە سەر مەسەلە شەرعییەکەیان بۆ ئەو کەسانە کە داوای فەتوایان لێ کردووە.

کتێبێکی لە حیساب و ریازیاتدا بە زمانی کوردی داناوە. یاسای کۆن و نوێی تێدا کۆ کردووەتەوە، بە خەتی درێژ یاسای کۆنی لە یاسای تازە جیا کردووەتەوە. ئەو کتێبە چاپ نەکراوە و ئەگەر چاپ بکرێ گەلێ سوودی ئەبێ.

ئەم زاتە لە دوا دوایی ژیانیدا لە زەردیاواوە گواستییەوە بۆ سلێمانی و پاش ماوەیێ لە ساڵی ١٩٧١ی زایینیدا کۆچی دوایی کرد و ٢ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: جەمال و بەهادین.

### شێخ حەسەنی کوڕی شێخ عەبدوڵڵا

ئەم پیاوە تاقانەی زەمان و عەللامەی کوردستان بوو. لە خوێندنگاکەی خۆیاندا خوێندوویەتی هەتا نزیکی خوێندن تەواو کردن، پاش ئەوە چووە بۆ بەغدا و لە

خوێندنگای محەمەد فەیزی ـ موفتی زەهاوی ـ و لای ئەو خوێندوویە تا ئیجازەی وەرگرتووە. پاش ئیجازە وەرگرتن گەڕاوەتەوە بۆ قەرەداغ و لە پاش ماوەیێ گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا و بە هۆی موفتی زەهاوی‌یەوە کراوە بە مودەڕیسی ڕەسمی بۆ شاری کفری (صلاحیه) و لەو مزگەوتەدا کە ئێستە پێی ئەڵێن: مزگەوتی (کرماج) دائەنیشێ و دەست ئەکا بە دەرس‌وتنەوە و قوتابی لە هەموو لایەکەوە لێی گرد ئەبنەوە بە جۆرێ ئەو مزگەوتە بە ناوی (مزگەوتی مەدرەسە)وە ناو دەرئەکات. وە بە دەرس‌وتنەوە و ڕێنومایی و ئامۆژگاری هەموو ئەو وڵاتی گەرمیانە ئاوەدان ئەکاتەوە و لە سەر ئەو ڕێبازە ڕۆیشت تا کۆچی دوایی کرد.

شێخ حەسەن ٢ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ محەمەد و شێخ عەبدوڵلا. شێخ محەمەد زانایەکی بەرز و بەڕێز بووە و کراوە بە مامۆستای خوێندنگای (تووز خورماتوو) بە ڕووناکی زانیاری و ڕەوشت و خووی بەرز و بەخشەندەیی ... ئەو وڵاتەی ڕووناک کردووەتەوە و گەلێ خزمەتی ئایینی ئیسلامی کردووە و کاتی خۆی مەشهوور بووە لە وڵاتدا کە پیاوی وەها خاوەن عەقڵ و بەدین و ڕەوشت نایاب بووە و تەمەنی بەم یاسا بە سەر بردووە تا کۆچی دوایی کردووە.

وە شێخ عەبدوڵلای کوڕی شێخ حەسەن چووەتە ناو ڕیزی سوپاوە و بووە بە (موفتی ئالا) و لەو شارەدا ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کردووە.

وە شێخ محەمەدی کوڕی شێخ حەسەن نەوەی نێرینەی نەبووە. بەڵام شێخ عەبدوڵلا کوڕێکی لێ بەجێ‌ماوە ناوی عەلی بووە و لە خوێندنگاکانی عوسمانیدا خوێندوویەتی و (حوقووق)ی تەواو کردووە و بووە بە مودیری ناحیە و لە سەر کار و باری وەزیفە ڕۆییشتووە تا کۆچی دوایی کردووە. یەک کوڕی لێ بەجێ‌ماوە ناوی عەبدوڵلایە و ئێستە نیشتەجێی بەغدایە.

## شێخ محەمەد ئەمینی کوڕی شێخ عەبدوڵلا
## کوڕی شێخ عوسمان، کوڕی شێخ عەبدولەتیف

ئەم زاتە لە (دەلووجە)دا دانیشتووە و خاوەن نان و قۆناغ بووە و شەش کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: کاکە حەمە، عەبدوڕەحمان، ئیسماعیل، ئەحمەد، قادر، عەبدوڵلا.

قادر و عەبدوڵڵا نەوەیان نەبووە و لە کاکە حەمە عەبدوسەمەد و لـە عەبدوسـەمەد؛ رەشید و لە رەشید رەئووف؛ بەجێماوە.

وە شێخ ئیسماعیل ٤ کوڕی بووە: عەبدوڕەحیم و عەلی و عوسمان و محەمەد.

عەبدوڕەحیم خوێندوویەتی تا پێگەییشتووە و بـووە بـە زانایـەکی بـەرزی بـەڕێز و دوای ئیجازە وەرگرتن شێخ عومەری زیائەدین کردوویەتی بە مامۆسـتای خوێنـدنگای خانەقای بیاوێڵە لە نزیکی هەڵەبجەدا و ماوەیێ لەوێ تەدریسێکی چاکی کردووە، جـا لە پێش ئەوەدا ژن بێنێ کۆچی دوایی کردووە. هەروا شـێخ عوسمـان و شـێخ عـەلی برایشی بە بێ نەوە سەریان ناوەتەوە.

وە شێخ محەمەدی کوڕی شێخ ئیسماعیل شـێخ مسـتەفای لـێ بـووە و لـە شـێخ مستەفا: ئەحمەد و محەمەد و ماجید و ئەمجەد و بەختیار و هۆشیار بەجێماون.

وە لە شێخ ئەحمەد: شێخ مەعرووف و شێخ کەریم و شێخ عارف بەجێماوە.

ئەم کوڕانە ڕۆییشتوون بۆ شاری خانەقین. شـێخ مـەعرووف ئیمـام بـووە و کـەریم بازرگان بووە و عەبدولقادر و کەمال و جەمال و باهیری لێ بەجێماوە.

وە لە شێخ عارف: عەلی بووە و لە عەلی: عـارف و ئەحمـەد و مـەحموود و حامیـد بوون.

## شێخ قادری کوڕی شێخ عوسمان

لە دێی شیوی قازیدا دانیشـتووە. لـەم زاتـە شـێخ ئەحمـەد بـووە، کـە بـووە بـە خەلیفەی شێخی بەهادینی کوڕی شـێخ عوسمـانی تەوێڵـە. ئـەم شـێخ ئەحمـەدە ٥ کوڕی بووە: شێخ سالح و کاکە حەمە و شێخ قادر و شێخ مەحموود و شێخ سەمیع.

شێخ سالح گەلێ کوڕی بووە، کۆچی دواییان کردووە. یەکێ لەوانـە نـاوی باباشـێخ بووە، کە زانایەکی ناونجی بووە .. پاش ئەوە کە لە (شیوی قـازی)وە گواسـتوویانەتەوە بۆ (بێسەلمێن) لە شارەزووردا .. پێش ئەوە ژن بێنێ کۆچی دوایی کردووە.

لە هەموو نەوەکانی شێخ سالح تەنها شێخ عارف ماوەتەوە. لە عارف: شێخ نووری و شێخ عەبدولکەریم و شێخ لەتیف ماونەتەوە. ئێستە لە شاری سلێمانیدان.

وە لە شێخ کاکە حەمە ٤ کوڕ بەجێماوە: شێخ حەسەن و شـێخ حسـەین و شـێخ عەزیز و شێخ رەشید. شێخ عەزیز لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بووە بـە قـازی و لـە

شاری بەسرەدا دانیشتووە و لەوێ ژنی هێناوە و کوڕێکی لێ بەجێماوە ناوی ئەسعەدە، زانکۆی شەریعەتی تەواو کردووە ئێستە لە شاری بەغدادا مامۆستایە.

وە لە شێخ قادر ٣ کوڕ بەجێماون: شێخ مەعرووف و شێخ سەعید و شێخ عەلی. جا لە شێخ سەعید شێخ عەزیز بووە کە ئێستە لە شاری سلێمانیدایە.

وە لە شێخ عەلی: شێخ ئەحمەد و شێخ محەمەد و کچێکی ئامینەناو بووە. جا شێخ ئەحمەد بە منداڵی مردووە و شێخ محەمەد ژنی هێناوە و کچێکی لێ بەجێماوە ناوی (عاصمە)یە و شووی کردووە بە (خیرالدین عبدالرزاق) و ئێستە لە شاری سلێمانیدایە.

(ئامینە)یش خێزانی من بوو و ٢ کوڕ و ٢ کچی بووە. کوڕەکان: محەمەد و سەلاحەدین و کچەکان عالییە و عەتییە. ئامینە لە شەوی چوارشەمەی ١٤ی سەفەری ساڵی ١٤٠٣ی کۆچیدا، ڕێکەوتی یەکی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٢ی زایینی کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی برایەوە بۆ چنارە لە لای گۆڕی شێخ عەلی باوکی و (رضیە) خانی دایکیدا بە خاک سپێررا.

وە لە شێخ مەحموودی کوڕی شێخ ئەحمەدی شیوی قازی کوڕێ بەجێماوە ناوی شێخ محێدین بووە.

وە لە شێخ سەمیعی کوڕی شێخ ئەحمەد ٣ کوڕ بەجێماوە: شێخ عومەر و شێخ عوسمان و شێخ عەلی. ئەمانە نەوەیان هەیە.

### شێخ عەبدوسەمیع

کوڕی شێخ عوسمانی کوڕی شێخ عەبدولەتیف، ئەم پیاوە بە بێ نەوە جیهانی بەجێ هێشتووە.

### شێخ عەبدوسەمەد

کوڕی شێخ عوسمان کوڕی شێخ عەبدولەتیف، کوڕێکی بووە ناوی شێخ عوسمان بووە. شێخ عوسمان کوڕێکی بووە ناوی شێخ فەرەج بووە. وە شێخ فەرەج کوڕێکی هەیە لە (کەلار)ە ناوی عەلییە.

## شێخ عەبدوڕەحمان

کوڕی شێخ عوسمان، کوڕی شێخ عەبدولەتیف باپیرەی شێخەکان، ئەم زاتە وەکوو شێخ قادری برای هەر ڕۆییشتووە بۆ دێی (شیوی قازی) و لەوێدا نیشتەجێ بووە.

ئەم شێخ عەبدوڕەحمانە ٢ کوڕی بووە: شێخ ئەمین، شێخ عوسمان. شێخ ئەمین بە بێ نەوە مردووە. شێخ عوسمانیش یەک کوڕی لێ بەجێماوە ناوی شێخ فەرەج بووە. وە لە شێخ عەبدوڕەحمان سێ کوڕ بەجێماوە: شێخ کەریم و شێخ مستەفا. شێخ کەریم نەوەی نێرینەی زۆر بوون هەموو مردوون، تەنیا شێخ ساڵح ناوێکیان ماوە. بەڵام شێخ مستەفا ٤ کوڕی بووە: شێخ عەبدوسەمەد و شێخ عەبدوڵلا و شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ عەبدوڕەحیم. ٥ کچیشی بووە: ئامینە و عاسیمە و سەفییە و فاتیمە و ڕەزییە.

لە شێخ عەبدوسەمەد ٢ کوڕ بەجێماوە: شێخ ئەمین و شێخ عوسمان. شێخ ئەمین بەبێ نەوە مردووە. شێخ عوسمانیش یەک کوڕی لێ بەجێماوە ناوی شێخ فەرەج بووە.

وە لە شێخ عەبدوڕەحمان سێ کوڕ بەجێماوە. شێخ محەمەد و شێخ حسەین و شێخ عارف. شێخ حسەین و شێخ محەمەد نەوەیان نەماوە. شێخ عارف کوڕێکی بووە ناوی شێخ مەعرووف بووە، لە شێخ مەعرووف: تاهیر و کاوە و کامەران و نەهرۆ و ئەحمەد بەجێماوە.

وە لە شێخ عەبدوڕەحیمی کوڕی شێخ مستەفا ٦ کوڕ بەجێماوە: شێخ مەعرووف و شێخ سەعید و شێخ عەلی و شێخ نەجیب و شێخ ئەحمەد و شێخ تاهیر.

شێخ مەعرووف نەوەی نییە، وە لە شێخ سەعید ـ کە لە حەلاوەخانی خوشکی شێخ حەسەنی قەرەچیوار بووە ـ چەن کوڕ بەجێماون: شێخ عەلی کە لە ئەوقافدا فەرمانبەر بوو و ئێستە خانەنشینە و لە هەولێردایە و شێخ محەمەد و شێخ حسەین. وە لە شێخ عەلی شێخ مستەفا بەجێماوە و لە شێخ مستەفا شێخ حەسەن و حسەین و جەعفەر و فەرەیدوون و دلێر بەجێماون.

وە لە شێخ ئەحمەد شێخ ئیسماعیل و لە شێخ نەجیب شێخ حسەین و شێخ لەتیف بەجێماون.

وە شێخ عەبدوڵلا چووە بۆ شاری ئەستەموول و چووەتە ریزی سەربازی و بووە بە سەرۆکی مەحکەمەی تەمییز و نەگەڕاوەتەوە بۆ کوردستان تا لە ئەستەموول کۆچی دوایی کردووە. ٣ کوڕی لێ بەجێماوە: خالید و جەلال و مستەفا. کە لە تورکیادا ماونەتەوە.

وە کچەکانی شێخ مستەفای کوڕی شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی شێخ عوسمانی کوڕی عەبدولەتیف بەسەرهاتیان بەم شێوەیە:

ئامینەخان شووی کردووە بە شێخ حسەینی کوڕی شێخ عەبدولکەریم، برای شێخ حەسەنی قەرەچیوار و کوڕێکی بووە ناوی شێخ عەبدولکەریم بووە و شێخ عەبدولکەریم: شێخ محەمەد و شێخ ئیسماعیل و مەعرووف و جەعفەر و عەبدولوەهاب و سەعید و ڕەئووف و موعتەسەم و حسەینی بووە.

وە عاسیمەخان شووی کردووە بە شێخ سەمیع و شێخ عوسمانی شیوی قازی لێ بووە.

وە سەفییەخان شووی کردووە بە شێخ قادری کوڕی شێخ ئەحمەدی شیوی قازی و شێخ عەلی و شێخ سەعید و شێخ مەعرووف و شێخ ئیسماعیل و شێخ محێدینی لێ بووە.

وە فاتیمەخان شووی کردووە بە کاکە حەمە.

ڕەزییەخانیش شووی کردووە بە شێخ عەبدوڕەحمانی چنارەیی.

با بگەڕێینەوە بۆ باسی کوڕەکانی دیکەی شێخ لەتیفی گەورەی باپیرەی شێخەکانی قەرەداغ.

## شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدولەتیف

ئەم زاتە لە زەردیاردا بە بێ نەوە مردووە.

## شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عبدولەتیف

ئەم زاتە لە دێی (دووکەڕۆ)دا دانیشتووە و ٢ کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ مەحموود و شێخ سەلام. شێخ مەحموود ٣ کوڕی لێ بووە: شێخ محەمەد ئەمین و شێخ ئەحمەد و شێخ محەمەد.

لە شێخ محەمەد ئەمین ٣ کوڕ بەجێ‌ماوە: شێخ قادر و شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ لەتیف. شێخ لەتیف نەوەی نەبووە. شێخ قادر کوڕێکی بووە ناوی حەکیم بووە. شێخ عەبدوڕەحمانیش کوڕێکی بووە ناوی شێخ قادر بووە.

وە لە شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ مەحموودی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەبدولەتیف ٢ کوڕ بەجێ ماون: شێخ عەبدوڵلا [کە] بە بێ نەتەوە مردووە و شێخ محەمەد، ئەم شێخ محەمەدە کوڕێکی بووە لە سلێمانیدا بە بێ تاوان تووش بووە و کوژراوە.

وە شێخ محەمەدی کوڕی شێخ مەحموودی کوڕی شێخ ئەحمەد تەنیا کوڕێکی بووە ناوی شێخ مەحموود بووە. ئەم شێخ مەحموودە کوڕی زۆر بوون، بەڵام تەنیا دووانیان ماون: شێخ عەلی و نووری. وە شێخ سەلامی کوڕی شێخ ئەحمەد نەوەی نەبووە.

## وردبوونەوەیێ لە رشتەی شێخانی مەردۆخی

ئەم شێخانی مەردۆخی‌یە لەو مێژووەوە هاتوونەتە وڵاتی کوردستان تا ئەم مێژووە کە ١٤٠٣ی کۆچی‌یە لە هەموو بەشێ لە بەشەکانی رشتەکاندا زانای بەتوانا و خزمەت‌گوزاری دین و زانیاریان بووە.

وە لە هەموو رۆژێکیشدا داوای ئەوەیان کردووە کە لە نەوەی ئیمامی حەسەنی کوڕی ئیمام عەلین. وە بە گوێرەی شەرع هەر کەسێ ئەمینە لە سەر نەسەبی خۆی و هەر کەسێ داوای نیسبەت‌دانی خۆی بۆ لای هەر کەسێ بکا کەس مافی ئەوەی نییە بەرگری لە داواکەی بکات، مادام بەڵگەیەکی رێک و راستی وای بە دەستەوە نەبێ کە داواکەی ئەو بداتە دواوە.

وە من بەش بە حاڵی خۆم باوەڕم وایە ئەم شێخانە لە نەوەی حەزرەتی حەسەنی کوڕی عەلین بە سێ بەڵگە:

یەکەم: کە باو و بڵاوە: (الناس مؤتمنون علی انسابهم). وە هەر کەسێ داوای هەر نەسەبێ بکات بە بێ بەڵگەی بەهێز بەرگری لێ ناکرێ.

دوەم: ئەم زاتانە شەجەرەی نەسەبیان هەیە تا ئەگاتە لای حەزرەتی ئیمام حەسەن کوڕی ئیمامی عەلی ـ خ ـ وە گەلێ لە سادات و زانای باوەڕپێکراو وەکوو: حەزرەتی

کاک ئەحمەدی شێخ و شێخ عومەری بیارە- زیائەدین - و موفتی زەهاوی و شێخ عەلی حیسامەدین و گەلێ زانای دیکە مۆریان کردووە.

وە دیارە ئەم زاتانە بە بێ ئاگاداری و بەڵگە و باوەڕی پتەو شەجەرەی نەسەب بۆ ئەو زاتانە مۆر ناکەن.

وە ئەم دوو بەڵگە باوەڕی ئینسان بەهێز ئەکەن لە سەر ئەوە کە نەسەب و نیسبەتدانەکەیان راستە.

بەڵگەی سێهەم: قەناعەتێکی ویجدانی بۆ ئینسان پەیدا ئەبێ لە سەر ئەم بەردەوامبوونی زانیاری و رێز و خزمەتی جیهانی ئیسلامە لە لایەنی ئەم زنجیرە شێخانەوە، واتە لە مێژووی ۸۰۰ی کۆچییەوە تا ئێستە کە ٦٠٠ ساڵ ئەکا ئەم رشتە بە دەرسوتنەوە و دانانی کتێبی بەنرخ لە جۆرەها زانیاری ئیسلامیدا لە: نەحو و سەرف و مەنتیق و ئاداب و بەلاغە و حیکمەت و ئوسوولی فیقهـ و ئوسوولی دین و ... زانیارییەکانی دیکەوە خەریک بوون و بەردەوامی ئەم جۆرە پیرۆزییە پاڵشتی ئەو نەسەب و نیسبەتە دەکا.

زیاد لە مەسەلەی زانیاری ئایینی ئیسلام زانیاری بۆ کردەوەی باش ئەوێ و بە مێژوو بۆ ئێمە دەرکەوتووە ئەم رشتە پیاوە لەخوداترس و پیاوی چاک بوون و گەلێ پیاوی وەلی و چاکیان تێدا بووە، وەکوو شێخ عەبدولغەفاری خەلیفەی شێخ شەمسەدینی (شووشی) کە لەگەڵ شێخ بابا رەسوولی بەرزەنجیدا هەردووکیان هاو ئیرادەت بوون و خەلیفەی ئەو زاتەن.

وە شێخ مستەفای تەختەیی و شێخ وەسیم کوڕە گەورەی شێخ ئەحمەدی عەللامە کە ویلایەت و کەشف و کەرامەتیان لە ناو جیهاندا دیار بووە و شێخ عومەری کوڕی شێخ عەبدولەتیف خەلیفەی مەولانا خالید بووە و لە قەلاچوالاندا لە ناو بابانەکانا دانیان بە پیاوچاکییدا ناوە. وە شێخ عەبدوڵلای قوتب و شێخ محەمەدی برای کە ئەم دوو زاتە کوڕی شێخ عەبدولەتیف و خەلیفەی حەزرەتی شێخ عوسمانی سیراجەدین بوون.

وە شێخ ئەحمەدی شیوی قازی، کوڕی شێخ قادری، کوڕی شێخ عوسمانی کوڕی شێخ عەبدولەتیفی گەورە، ئەم زاتە خەلیفەی شێخ محەمەد بەهادین بووە. هەروەها

شێخ عەبدورەحمانی قەرەداغی، کوڕی شێخ مەعرووفی، کوڕی شێخ عومـەری کـوڕی شێخ عەبدولەتیف.

وە شێخ سەلیمی سنەیی خەلیفەی شێخی زیائەدین بووە و شوێنەواری تـەقوا و لەخوداترسی و خۆشەویستی بۆ حەزرەتی فەخری عالەم لە ئەدەب و شیعرەکانیدا دیار و ئاشکرایە.

وە شـێوەی ئـەو شـەجەرەیە کـە بـە مـن گەیشـتووە لـە شـێخ عەبدولـەتیفی قەرەداغییەوە بەم شێوەیە:

الشیخ عبداللطیف، ابن الشیخ محمد معروف، ابن الشیخ عبداللطیف، ابن الشیخ محمد حسن، ابن الشیخ شمس‌الدین، ابن الشیخ عبدالغفار، ابن الشیخ ملا گوشایش، ابن الشـیخ محمد المردوخی، ابن الشیخ یوسف، ابن الشیخ سلیمان، ابن الشـیخ محمـد قسـیم، ابـن الشیخ عبدالکریم، ابن الشیخ احمد شهاب الدین، ابن الشیخ عبدالله، ابن الشیخ قاسم، ابـن الشیخ اسماعیل، ابن الشیخ ابراهیم، ابن الشیخ عبدالله، ابـن الشـیخ عیسـی، ابـن الشـیخ حسین، ابن الشیخ محمدعلی، ابن السید حسن الطبرستانی، ابن الشیخ زیـد، ابـن الشـیخ محمد القائم بالحق، ابن الشیخ زید، ابن الشیخ محمد، ابن الشـیخ ابـی محمـد اسـماعیل، ابن الشیخ ابی محمد حسن، ابن الشیخ ابی حسن، ابن الامام الحسن المجتبی، ابـن علـی المرتضی و فاطمة الزهراء بنت سید الانام فخر الکائنات محمد ـ ص ـ.

جا بەم بۆنەوە من نەسەبی مامۆستای گـەورەم خوالـێخـۆش‌بـوو شـێخ عومـەری بەناوبانگ بە (ابن القرەداغی)م گەیانـد بـە شـێخ عەبدولـەتیفی گـەورەی قـەرەداغی و لەوەوژووریش بە هۆنراوە هەمووم نووسی:

عومـــەر نـــەجیبی کـــوڕی نەجیبـــە
عەللامـــەی نـــافیع بـــەرز و نەســـیبە
باوکی ئەمینە و بـاپیرەی مـەعرووف
ئیبنی عومەری بە تـەقوا مەوسـووف
لـــە عەبدولـــەتیف شـــێخی قـــەرەداغ
قـــەرەداغی کـــرد بـــە میســـالی بـــاغ

(ابن الشيخ حسين، ابن شمس الدين)
لە دنیادا بوون بە مورشـید بـۆ دیـن
لـە عەبدولغـەفار کـوڕی گوشـایش
خـادیمی قورئـان بـە بـێ ئـالایش
لـە محەمـەدەوە یوسـف، سـلیمان
محەمـەد قەسـیم فـازیلی زەمـان
لە عەبدولکەریم، لە ئەحمەد شەهاب
عەبدوڵلا و قاسم بە یاسای حیسـاب
لـە ئیسـماعیل و ئیبراهیمـی پـاک
عەبدوڵلا و عیسا و حوسەین رووناک
محەمەد عەلی، جا سـەیید حەسـەن
تەبەرسـتانی (مهجـر) نـەک وەتـەن
زەیـد و محەمـەد (قـائم بـالحق)
زەیـد و محەمـەد هـەم بزانـە حـەق
ئـەبو محەمـەد ئیسـماعیل عەلـەم
ئـەبو محەمـەد حەسـەن خاترجـەم
شێخ ئەبولحەسەن لە سـولبی ئیمـام
حەسەن موجتـەبا (فـي علـم العـلام)
(مـن فاطمـة الزهـراء البتـول)
(وردة بيـت حضـرة الرسـول)
(و مـن علـي حيـدر الكـرار)
(حِـبّ النبـي الرسـول المختـار)

هـــەزار درووود و ســـەلامی مومتـــاز
بـۆ رۆحـی بـەرزی خـاوەنی ئیعجـاز
هەم بۆ ئال و سەحب بـاقی تـابیعین
(رضـــــی الله عـــــنهم أجمعـــــين)
پـــەروەردگارا بـــە لـــوتفی ســـامی
ببەخشە جورمی عەبدی خۆت (نامی)

ئەو شەجەرەی کە نووسیمان بە مـۆری گـەلێ لـە مامۆسـتا گـەورە و ناودارەکـانی کوردستان مۆر کراوە، وەکوو:

یەکەم: شێخ عەبدورەحیمی بەرزنجی زانای بەناوبانگ، برای شـێخ عەبدولکـەریمی مامۆستای مەولانا خالیدی نەقشبەندی.

دووەم: شێخ حسەینی قازی، کوڕەزای شێخ حەسەنی گلەزەردە.

سێهەم: کاک ئەحمەدی شێخ کوڕی شێخ مەعرووفی نۆدێیی، وە نووسیویەتی:

(هذه شجرة صحيحة، نطقت بها نقول صريحة، ولذا مهرتها على يقـين. و انـا الملهـوف الحزين احمد النودهي البرزنجي).

چوارەم: خالید پاشای بابان.

پێنجەم: شێخ عەبدولقادری موهاجیر، دانـەری (تقريـب المـرام) شـەرحی (تهـذيب الكلام).

شەشەم: سەیید ئیبراهیم کوڕی خوالێخۆشبوو شێخ سەعیدی حەفید.

## بنەماڵەی سەییدەکانی خانەگا لە هەورامانا

ئەم سەییدانی خانەگا و پاوە لە سەر شەجەرەی خۆیان لە نەتـەوەی ئیمـام عـەلی عەریزی کوڕی ئیمام جەعفەری سادقن. ئەم کوڕە لەبەر ئەوە لـە شـوێنێکدا بـووە لـە حیجازا ناوی (عریض) بووە بە عەلی عەریزی ناوبانگی دەرکردووە.

**ئەمەیش شێوەی شەجەرەکەیانە:**

السید محمد، والسید احمد، والسید مصطفی، والسید بابا شیخ ابناء السید عبدالرحمن، ابن السید احمد، ابن السید عبدالکریم، ابن السید ابی‌بکر، ابن السید سلیمان، ابـن السـید ابی‌بکر، ابن السید عمر، ابن السید الحاج قانون، ابن السید ناصر، ابـن السـید حسـن، ابـن السید احمد الملقب بالجنید، ابن السید حسن تاج‌الدین ابی‌احمد، ابن السید حسین، ابـن السید عثمان الغازی الملکی، ابن السید مسعود، ابن السید سلیمان، ابن السـید فضل‌الله، ابن السید محمد، ابن السید فضل‌الله، ابن السید علی، ابـن السـید فضـل الله، ابـن السـید حسین، ابن السید حسین، ابن السید احمد، ابن السید حسـین، ابـن السـید احمـد، ابـن السید علی‌العریضی، ابن الامام جعفرالصادق، ابـن الامـام محمـدالباقر، ابـن الامـام علـی زین‌العابدین، ابن الامام حسین، ابن الامام علی ابن ابی‌طالب مـن فاطمـة الزهـراء البتـول بنت سید المرسلین محمد ـ ص ـ.

**وە لە پەراوێزی شەجەرەکەدا نووسراوە:**

السید عبدالکریم، ابن السید عبدالحکیم، ابن السید عبدالکریم، ابن السید محمود، ابن السید احمد، ابن السید اسماعیل، ابن الحاج السید یوسف، ابن الحاج السید قانون.

ئەم «قانون»ە یەکێکە لەوانەی لە ناو دەقی شەجەرەکەدا نووسیمان.

وە وا باو و زانراوە کە سەییدەکانی «هانەسوورە» لەم سەییدانی «خانەگا»ن. واتە: سەیید نەجیبی، کوڕی سەیید عەبدوڕەحیمی، کوڕی سەیید عەبدوڕەحمانی، کوڕی سەیید نەسروڵلا. ئەم زاتە لە سەییدەکانی خانەگایە و، هاتووەتە خاکی هەڵەبجە.

وە ئەوانەی شەجەرەکەیان مۆرکردووە ئەمانەن: سەیید حسەینی بەرزنجی، سەیید مەحموودی خەتیبی سلێمانی، سەیید عەلی کوڕی سەیید بابا رەسووڵی بەرزنجی و شێخ مەحموودی موفتی و شێخ عەبدوسەلامی جێگری قازی و شێخ مەعرووفی قەرەداغیی مودەڕیس لە سلێمانی و سەیید حەسەنی بەرزنجی مودەڕیس لە سلێمانی و مەلا ئەحمەدی چاوماری موفتی سلێمانی و سەیید عەبدوسەمەدی قازی سلێمانی و سەیید ئەحمەدی نەقیبی بەرزنجی و سەیید نەسروڵلای هانەسوورەیی خالسی و سەیید ئەحمەد. ـ خ ـ .

وە سەییدەکانی «دشە» و «پاوە» و «شمشێر»یش لە نەوەی عەلی «عریضی»ن.

## رشته و بنەماڵەی سەییدەکانی «کەلجی»

سەییدەکانی کەلجی ئەڕۆنەوە سەر سەیید مستەفای بەناوبانگ بە پیرشەهریار کە لە هەورامانی تەختدا دانیشتووە و وایش باوە کە لە خەلیفەکانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی‌یە و شێخ عەبدولقادر دەربارەی فەموویەتی: «ان اخی مصطفی رجل صالح».

وە ئەم شێخ مستەفا ئیرشادی موسولمانانی کردووە و نەوەد و نۆ پیر لە سەردەستی ئەمدا پێگەییشتوون. وە ئەم پیرشەهریارە لە نەوەی سەیید عەلی «عەریزی» کوڕی ئیمام جەعفەری سادقە ـ خ ـ.

### وە شەجەرەی یەکێ لە خانەدانە سەییدەکانی کەلجی بەم شێوەیە:

السید فتح المبین، ابن السید محمد امین الکلجینی، ابن السید قطب‌الدین، ابن السید احمد، ابن السید محمود، ابن السید علی، ابن السید قاسم، ابن السید پلیاسا، ابن السید ولیاس، ابن السید یائیل، ابن السید طاهر، ابن السید صالح، ابن السید نبیج، ابن السید أقە، ابن السید رستم، ابن السید مصطفی، ابن السید معروف، ابن السید بابیل، ابن السید مسعود، ابن [السید] سلیمان، ابن السید فضل‌الله، ابن السید محمد، ابن السید محمد، ابن السید حسین، ابن السید احمد، ابن السید علی‌العریضی، ابن الامام جعفرالصادق، ابن الامام محمدالباقر، ابن الامام علی زین‌العابدین، ابن الامام حسین، ابن الامام الهمام علی بن ابی‌طالب و فاطمة الزهراء وردة الرسول المختار سیدنا محمد ـ ص ـ.

بۆ زانیاری: سێ ناوم لەم شەجەرەدا چاوپێکەوت: پلیاسا، ولیاس، یاپیل. وە ئەم ناوانە دوورن لە ناوی عەرەبییەوە، یا ئەم ناوانە بۆ کەسانێکن لە ولاتی عەجەمدا لە دایک بوون، وە یا خود تێکدراون و شێوەکەیان گۆڕاوە، وەک بڵێین: پلیاسا لە ئەسلدا «ابو الیاس» بووبێ و ولیاس «ابو الیاس» و «یاپیل» «بابل» بووبێ. بە هەرحاڵ نووسەری

شـەجەرەکە وای نووسـیوە. هـەروەها دووجـار نـاوی «محمـد» بـەرودوا بـە یەکـەوە نووسراون و بە یەکەم و دوەم جیاکراونەتەوە.

وە بزانن! ناوی «مەلا جان الله» و نەتەوەی مەلا جانوڵلاهی لە هەوراماندا هـەن و وا باوە ئەو مەلا جانوڵلا لە نەتەوەی مـەلا مسـتەفای پیرشـەهریارە، وە هەنـدێ ئەڵـێن: مەلا «جاروڵلا»، لە باتی «جانوڵلا».

وە دێیەک لە هەورامانی ئەودیو هەیە بە نـاوی «فـەقێ‌کـان» واتـە خوێنـدەوارەکان ناسراوە. ئەڵێن: خەڵکی ئەو دێ لە نەتەوەی مەلا جانوڵلان. وە مەلا جانوڵـلا یەکـەم جار لە گوندی «دیوەزناو» لە گوێچـەمی سـیرواندا نیشـتەجێ بـووە و لـە ناسـاغیدا کۆچی دوایی کردووە و وەسیەتی کردوە: کە پاش مردن بیدەن بە سەرپشـتی قـاتری سواریی خۆیاندا و باش دایبەستن و بکەونە شوێنی تا لە هـەر شـوێنێکدا خـۆی دا بـە زەویـدا لـەو شـوێنەدا گـۆڕی بـۆ هەڵـبکەنن. ئـەوانیش وا ئەکـەن و قاترەکـەی بەرەوهەورامان ئەڕوا هەتا ئەگاتە هەورامانی تەخت و لە نزیکـی گـۆڕی پیرشـەهریاردا خۆی ئەدا بە زەویدا! ئەوانیش تەرمەکـەی لـێ دائـەگرن و لـە نزیکـی پیرشـەهریاردا گۆڕی بۆ هەڵئەکەنن و لەوێدا بە خاکی ئەسپێرن.

جا ئەم مەلا جانوڵلا کوڕێکی بووە ناوی مەلا محەمەد بووە و لە مەلا محەمەد مـەلا عومەر بووە و لە مەلا عومەر سێ کوڕ بوون: مەلا محەمەد و مەلا عەلی و مەلا یوسف.

مەلا محەمەدیش دوو کوڕی بووە: مەلا وەهاب، مەلا عەبدوڵلا.

لە مەلا وەهاب: مـەلا عەبدولعـەزیز و مـەلا محەمـەد و لـە مـەلا عەبدوڵـلا: مـەلا عەبدوڕەحمان و مەلا محەمەد بەجێماون.

وە لە مەلا عەلی کوڕی مەلا عومەر سێ کـوڕ بـەجێمـاون: مـەلا ئەحمـەد و مـەلا محەمەد و مەلا مەحموود. وە لە مەلا ئەحمـەد مـەلا عەبدولکـەریم بـووە و لـە مـەلا محەمەد مەلا سەلیم بووە و لە مەلا مەحموود مەلا نیعمەت بووە.

وە لە مەلا یوسفی کوڕی مەلا عومەر مەلا قادر بووە و لە مـەلا قـادر مـەلا ڕەحـیم بووە. بەم شێوە کە نووسرا.

## شەجەرەی بنەماڵەی سەیدەکانی «کاژاو»
## لە نزیکی بەرزنجەدا لە پارێزگای سلێمانی

ئەم خانەدانە ئەچنەوە سەر بەڕێز: حاجی شێخ خالیدی کاژاوی، ئەویش لە نەتەوەی سەیید محەمەد تاجولعاریفین ئەبولوەفایە، کە لە دوازدەی مانگی ڕەجەبی سالی ٤١٧ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە مانگی «ربیع الاول»ی سالی ٥٠١ لەو شوێنەدا کە ئێستە پێی دەوترێ «پووشێن» لە جەنووبی دێی بەرزنجەوە کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە یەکێکە لە پیاوچاکە گەورەکانی ولاتی ئێمە و، گەلێ لە پیاوچاکان ستایشیان کردووە و بە «تاجالعارفین ابوالوفا»ی «نەرجسی» واتە «نەرگسەجاڕی» ناسراوە.

وە بە بیری من و بە بەڵگەی بوونی ئەم شێخانی نەرگسەجاڕە لە مێژووی پێش چوارسەدی کۆچیدا لەو شوێنی خۆیانەدا، کە هیچ تیرەیێ لە سادات لە ولاتی کوردستاندا ـ سەییدەکانی نەوەی ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام مووسای کازم نەبێ، کە ئیمام حەمزە خۆی هاتووەتە ناوچەی قەرەداغ و لە دێی تەکیەی ئێستەدا نیشتەجێ بووە تا کۆچی دوایی کردووە و نەتەوەکانی لەوێدا ماونەتەوە ـ پێش ئەمان نەبوون، ئەمانە دوای سەییدەکانی تەکیەی قەرەداغ هاتوون بۆ کوردستان و لە گوندی «ئەوسای» نەرگسەجاڕی خۆرئاوای قەزای هەڵەبجەدا نیشتەجێ بوون.

وە بە گێڕانەوە و دەماودەم بەڵکو بە شێوەیەک کە گەییوەتە پلەی «تەواتور» ئەڵێن: شێخ عەبدولقادری گەیلانی ـ خ ـ کاتێ کە لە مێژووی ٤٩٨ی کۆچیدا لە ولاتی گێلانەوە هاتووە بە هیوای خوێندن بەرەو بەغدا بە خەتی هەوراماندا هاتووە و ڕێگەی کەوتووەتە دێی نەرگسەجاڕ و لە ماڵی شێخ مستەفای نەرگسەجاڕیدا ماوەتەوە. ماوەیەک لەوێ ماوەتەوە تا ماندوویێتی دەرچووە و گەلێ لەو باخەدا کە وا

لە شانی دێکەوە بووە دانیشتووە و رایبواردووە و پاڵی داوە بەو دارپەڵکەوە کـە بەسـەر ئاوی ئەو باخەوەیە. هەروا گـەلێ جـار لەسـەر ئـەو بـەردە پانـە کـە لەسـەر حـەوزی مزگەوتەکە بوو نوێژی کردووە ... لەمەوە دەردەکەوێ پەیوەندی شـێخ عەبـدولقادری گەیلانی لەگەڵ ئەبولوەفای نەرگسەجاڕیدا گەرم بووە.

ئەم شتانە هەموو بەڵگەن لە سەر ئەوە کە شێخ محەمەد تاجولعاریفین لە شـێخانی نەرگسەجاڕە و، ئەم شێخانە لە پێش مێژووی ٤٠٠ی کۆچیدا هاتوونەتـە ئـەو شـوێنە. بەڵام لەبەر ئەوە کە ئەو شوێنە ئاو و زەوی‌یەکی باشی نییە گەلێ لـە وەچـەکانیان بـە ناوچەکانی دیکەدا بڵاوەیان کردووە.

وە ئەم شێخانی نەرگسەجاڕە لەگەڵ شێخانی «مێرگە درێـژ»ی قـەزای پێنجوێنـدا، کە خۆیان بە نەتەوەی شێخ مستەفای کوڕی شێخ ساڵحی کوڕی شێخ نەسری، کوڕی حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی ئەزانن و لەگەڵ شێخانی چویسەدا بن‌ئـامۆزان... ژن و ژن‌خوازی و خزمایەتی‌یان بووە. ئەمەیش پاڵپشتی ئەو پەیوەندی‌یە کۆنە ئەکا کە لە نێوان «شێخ ئەبولوەفا» و «شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا» بووە، تەنانەت ستایشـێکی وای کردووە کە بۆ کەس نەکراوە. فەرموویەتی:

«لیس علی باب الحق رجل کردی مثل الشیخ ابی‌الوفا، و هو القائـل: امسـیت عجمیـا و اصبحت عربیا. و نقل عنه ـ رض ـ إنه نرجسی الاصل، قبیلة من الأکراد».

وە ئـەم شـێخانی نەرگسـەجاڕە زیـاد لـەوە کـە پیـاوی زانـا و چـاک و خـاوەن تەسەووفیان بووە، وەکوو خوالـێ‌خۆش‌بوو شێخ مارفی خەلیفەی شێخ عومەری بیـارە و شێخ مارفی یەکەم کە باپیرە گەورەی ئەم شێخ مارفەیە... گەلێ پیـاوی خانـەدان و چاک و خاوەن پلەیان بووە.

**ئەمە شێوەی شەجەرەی کاژاوی‌یەکانە:**

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله رب العالمین، والصلاة و السلام علی سیدنا محمد و آله و صحبه اجمعین.

لە پاش هەندێ پێشەکی کە نووسینیان بە پێویست نازانم نووسراوە:

السید محمد خالد، ابن السـید محمد، ابن السـید خالد، ابن السـید محمـد، ابـن السـید احمد، ابن السـید رسول، ابن السـید زاهد، ابن السـید سلیمان، ابن السید یحیی، ابن السـید

سليمان، ابن اليسد احمد، ابن السيد خالد[١]، ابن السيد احمد، ابن السيد حسين، ابن السيد محمد[٢]، ابن السيد سليمان، ابن السيد احمد، ابن السيد داود، ابن السيد محمد المختفى، ابن السيد محمد المجتبى، ابن السيد محمود المظفر، ابن الامام محمد الباقر، ابن الامام زين العابدين، ابن الامام حسين الشهيد، ابن الامام الهمام على ابن ابى‌طالب و فاطمة الزهراء البتول بنت حضرة الرسول ـ ص ـ.

بزانن! ئەو شەجەرە کە لە پێشەوە نووسیم شەجەرەی هەندێ لەو سەییدانە بوو کە لە نەتەوەی سەیید یوسفی کوڕی سەیید ئەحمەد ناون.

وە ئەمەیش شەجەرەی نەوەکانی شێخ محەمەد کاژاوی‌یە کە زانایەکی گەورە بووە و لە کاتی مودەڕیسیدا لە شاری سولەیمانی‌یەوە بەرەو عەجەم گوێزاوی‌یەتی‌یەوە و ئەم شێخ محەمەدە لە نەتەوەی سەیید یوسفی کوڕی سەیید ئەحمەدن و لەگەڵ شەجەرەی پێشوودا لە سەیید ئەحمەدا گرد ئەبنەوە.

وە سەرەتاکەی لە سەیید عەلی مودەڕیسەوە بەم جۆرە دەست پێدەکات:

السيد على ابن السيد باباشيخ، ابن السيد عبدالله، ابن السيد محمد الكاژاوى، ابن السيد عبدالله، ابن السيد محمد، ابن السيد عبدالرحمن، ابن السيد محمد، ابن السيد يوسف، ابن السيد احمد، ابن السيد رسول، ابن السيد زاهد، ابن السيد سليمان...

تا دوایی وەکوو شەجەرەکەی پێشوو.

بۆ ئاگاداری بزانن! شەجەرەی سەییدەکانی کاژاوی بە مۆری گەلێ لە ساداتی بەرزنجە و گەلێ لە زانایانی باوەڕپێکراو مۆر کراوە.

بەتایبەتی مۆری حەزرەتی کاک ئەحمەدی شێخی کوڕی شێخ مەعرووفی نۆدێیی کە بە عەرەبی نووسیویەتی:

هذة شجرة صحيحة استفاضته، منذ ايام عديدة كانوا بيت مجد و اهل بيت فى شهرزور اكثر من سبع مائة سنين، كانوا مشهورين، معتقدا فيهم، و اهل نفوس، و من طعن فيهم فليس طعنهم الا الزور. و انا الفقير الحقير مطلع على ماحرر. السيد احمد النودهى.

---

١ ـ ئەم زاتە حاجی شێخ خالیدی کاژاوی‌یە، باوکی فاتیمەیە کە شووی کردووە بە شێخ مووسای بەرزنجی و، پاش کۆچی دوایی ئەو شووی کردووە بە شێخ عیسا و دوازدە کوڕی لێ بووە.

٢ ـ ئەمە شێخ محەمەد تاجولعازیفینە کە بە ئەبولوەفا ناوبانگی دەرکردووە. گۆڕی لە گوندی پووشێندایە.

وە پێویستە ئاگادار بن کە دێی «پووشێن» یا «کاژاو» بە لای خەڵکی سلێمانی‌یەوە بە شارەزوور ناو نابرێن. ئەمەیش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوە کە خانەدانی شێخ محەمەد تاجولعارفین کاتی خۆی لە شارەزووردا بووە و لە شارەزوورەوە کشاونەتەوە بۆ پووشێن وە بۆ کاژاو.

کە وابێ راستە کە شێخ محەمەد کاتی خۆی لە شێخانی نەرگسەجاڕ بووە و لەوێوە هاتووە بۆ پووشێن تا کۆچی دوایی کردووە.

هەروا بزانن! کەلیمەی «فوسان» کە لە «قلائد الجواهر»دا نووسراوە پیتی «ف»کەی «پ»ی فارسی بووە و «سین» «شین» و «ئەلف» «یا» بووە، واتە ئەکاتە «پووشێن» کە جێگەی ئەبولوەفا بووە.

بزانن! ئێمە لەبەر ئەمانەت چی لە نوسخەی شەجەرەکاندا نووسرابوو تا دوایی وەک خۆی نووسیمان. بەڵام هەرچەند بە کتێبی ئەنسابی ئیمامەکاندا گەڕام لە نەوەی ئیمام حسەیندا ناوی مەحموودم نەدی، واتە مەحموود موزەفەر کە بە کوڕی ئیمام محەمەد باقر نووسراوە من دەستم نەکەوتووە.

وە زۆربەی باوەڕم لەسەر ئەوەیە کە ئەو ناوە مەحموود نی‌یە بەڵکو محەمەدە، وە ئەم محەمەدە کوڕی ئیمام جەعفەری سادقە و لەقەبی موزەفەرە، واتە ئەو شەجەرە بە محەمەد موزەفەر ئەبڕێتەوە کە کوڕی ئیمام جەعفەرە نەک ئیمام محەمەدی باقر.

بەڵێ ئیمام محەمەد باقر کوڕێکی بووە ناوی عەلی بووە، پێی ئەڵێن «علـی سجاد»، وە گەلێ سادات نیسبەتی خۆیان لە عەلی کوڕی ئیمام جەعفەر ئەدەن و، لەبەر ئەوە کە لە «عریض»دابووە کە شوێنێکە لە حیجازدا پێی ئەڵێن عەلی عەریزی و، گەلێ لە سادات نەتەوەی ئەم عەلی عەریزی ناوەن.

بە کورتی کتێبی مێژوو لەم ناوانە و لە رشتەیاندا و لە جێگەی دانیشتن‌یانا گەلێ گۆڕان و شێواندنیان تێدایە، بۆیە پێویستە نووسەر ورد بێ و گەلێ ئاگادار بێ و، بە گوێرەی توانا نەکەوێتە هەڵەوە.

لە ولاتی ئێمەدا وا باوە کە سەییدی کەڵجین لە نەتەوەی عەلی سەجادی کوڕی ئیمام محەمەدی باقرن، کەچی کە ئەوە بزانین کە ئەچنەوە سەر سەیید مستەفای پیرشەهریار، وەکوو لە شەجەرەی «سید فتح المبین»ەوە دەرئەکەوێ... ئەمانە عەلی عەریزین و لە نەوەی ئیمام جەعفەری سادقن!

جا با لەم شوێنەدا لەسەر زانیاری خۆم باسی هەندێ لە پیاوانی شەجەرەی دووەم بکەین:

یەکەم: سەیید عەلی، ئەم زاتە لە ١٣٣٠ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ١٣٣٩دا دەستی کردووە بە خوێندن لە خزمەتی سەیید بابا شێخی باوکیدا و، لە ساڵی ١٣٥٠دا ئیجازەی لە لای باوکی وەرگرتوەو لەو ڕۆژەوە تا ئێستە کە ١٤٠٣ کۆچی‌یە خزمەتی زانیاری و دین ئەکا.

دووەم: سەیید باباشێخ. ئەم زاتە لە سنووری ١٣٠٢دا لە شاری بانەدا لە دایک بووە و لە لای سەیید عەبدوللای باوکی خوێندوویەتی.

پاش مردنی باوکی چووە بۆ بیارە و لە خزمەتی مەولانا عەبدولقادری کانی‌کەوەیی مامۆستای خانەقای بیارەدا خوێندوویەتی تا ئیجازەی وەرگرتووە، پاش ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ شاری بانە و، لەگەڵ شێخ یەحیای مامیدا بە یەکەوە دەرسیان گوتووەتەوە. هەتا ساڵی ١٣٣٥ی کۆچی کە گرانیی داکەوتووە، ئەو کاتە لە ترسی هێرشی سوپای ڕووسی قەیسەری لە شاری بانە دەرچوون بۆ دێی چوێسە و حاجی شێخ یەحیا لەوێ کۆچی دوایی کردووە. دوایی هەموو خێزانەکە کە بیست کەس ئەبوون هێنانی بۆ هەورامان و لە دێی بارام‌ئاوادا نیشتەجێ بوون، تا ئەو گرانی‌یە لاچوو. دوای ئەوە چوو بۆ دێی «ئەڵمانە» وە بوو بە مودەڕیسی فەرەجوڵلا بەگ.

وە لە ساڵی ١٣٥٠ی کۆچیدا لەگەڵ فەرەجوڵلا بەگدا بە یەکەوە چوون بۆ حیجاز و حەجیان کرد و گەڕانەوە. لەو ماوە بەولاوە ڕۆژبەڕۆژ دارایی زیادی دەکرد و، هەروا لە خزمەتی دین و جێبەجێ‌کردنی پێویستی نەدار و داماواندا لە پێشکەوتندا بوو... هەتا ساڵی ١٣٧٦ی کۆچی. لەو ساڵەدا لە سەفەرێکدا کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەیان هێناوە بۆ ئەڵمانە و، لەوێ بە خاکیان سپارد.

ئەم زاتە لە ڕێز و بەرزی و پیاوەتی و حەق‌پەرستی و سەربەستی و ڕاگرتنی هەستی خەڵکیدا بێ‌وێنە بووە. وە لە پێش کۆچی دوایی باباشێخدا سەیید عەلی کوڕی لە مەریواندا مودەڕیس بووە و لەبەر ئەوە شوێنەکەی چۆڵ نەبێت شێخ حسەینی برای باباشێخ لە جێگەکەیدا دانیشت.

سێهەم: سەیید عەبدوللای کوڕی شێخ محەمەدی کاژاوی. ئەم زاتە لە سنووری ساڵی ١٢٨٥ی کوچیدا لە شاری سلێمانیدا لە دایک بووە و پاش خۆگرتن و

هەستکردن لە خوێندنگای باوکیدا دەستی کردووە بە خوێندن و، لە پاش ئەوە باوکی لە سلێمانی دەرچووە بۆ دەوری سابلاغ. ئەویش لە خزمەتیا بووە و خەریکی خوێندن بووە، وە کاتێ باوکی لە سابلاغەوە چووە بۆ بانە ئەویش هاتووەتەوە و، لە شاری بانەدا ئیجازەی وەرگرتووە.

پاش ماوەیێ لە شاری بانەوە بە سەفەر هاتووەتەوە بۆ شاری سلێمانی و، ساڵی ١٣٢٠ لە سلیمانی کۆچی دوایی کردووە.

چوارەم: شێخ محەمەدی کاژاوی کوڕی شێخ عەبدوڵلای کاژاوی.

ئەم زاتە لە کاژاو لە عیراقدا لە دایک بووە و کە کاتی خوێندنی هاتووە دەستی کردووە بە خوێندن و، چووە بۆ «رەواندز» و لە خزمەتی مەلا عومەری خێلانیدا خوێندوویەتی و، لەوێوە چووە بۆ تورجان لە وڵاتی موکریان و، لە خزمەتی مەلا عەلی قزلجیدا خوێندوویەتی. جا گەڕاوەتەوە بۆ شاری سلێمانی و، لە خزمەتی شێخ عەبدولقادری موهاجیردا «تهذیب الكلام»ی خوێندووە و، دوایی ئیجازەی لێوەرگرتووە و، بوو بە مودەڕیس لە مزگەوتی بارچاوەشدا و خەریکی دەرسوتنەوە بووە و بە شێوەیەکی چاک دەرسی گوتووەتەوە، جا چووە بۆ خزمەت شێخ محەمەد بەهادین لە تەوێلە و تەریقەتی لێ وەرگرتووە و، گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی.

جا پاش ماوەیێ بۆ یەکجاری شاری سلیمانی بەجێ دێڵێ و، لەگەڵ شێخ یەحیای برایدا ـ کە ئەویش زانایەکی باش بووە ـ پێکەوە دەچن بۆ شاری سابلاغ و، ماوەیێ لەوێ دەمێننەوە. پاش ماوەیەک لەوێیشەوە بەرەو بانە کۆچ دەکات و، لە بانەدا یونسخانی بانە ئەیکا بە مودەڕیسی خۆی و بە تەواوی لەوێ دادەمەزرێ و، تەدریسێکی باش ئەکات. تا شێخ محەمەد کۆچی دوایی ئەکات. پاش کۆچی دوایی ئەو شێخ یەحیای برای لە شوێنەکەیدا دائەنیشێ هەتا شێخ عەبدوڵلای کوری شێخ محەمەد ئیجازە وەرئەگرێ.

دوای ئیجازەوەرگرتنی شێخ عەبدوڵلا بە یەکەوە دەرس دەڵێنەوە تا شێخ عەبدوڵلا کۆچی دوایی دەکات، دیسان جارێکی دیکە شێخ یەحیا بە تەنیا لە جێگەکەدا دەمێنێتەوە هەتا باباشێخی کوڕی شێخ عەبدوڵلا ئیجازە وەرئەگرێ، جا وەکوو یاسای پێشوو لەگەڵ شێخ یەحیای مامی باوکیدا بە یەکەوە دەرس دەڵێنەوە. هەتا ساڵی ٣٦ کە سوپای رووس ئەگاتە دەوروبەری بانە، ئەوانیش بەرەو عێراق کۆچ ئەکەن و، شێخ

یەحیا لەوێ کۆچی دوایی ئەکات و بابا شێخ خێزانەکەی ئەبا بۆ هەورامان، وەکوو باسمان کرد.

یەکێکی دیکە لە پیاوانی ناو شەجەرەکە شێخ خالیدە. ئەم زاتە حاجی خالیدی کاژاوە، لە نەتەوەی شێخ ئەبولوەفایە، پیاوێکی زانا و لەخوداترس و خاوەن پلەو پایە بووە. پاش ئەوە کە شێخ عیسا و شێخ مووسا لە بەرزنجەدا دائەنیشن فاتمەی کچی خۆی لە شێخ مووسا مارە دەکا و، دوای کۆچی دوایی شێخ مووسا مارەی ئەکا بۆ شێخ عیسای برایی و، گەلێ نەوەی لێی ئەبێ، وەکوو باسیان ئەکەین.

وە حاجی شێخ خالید گەلێ نەتەوەی زانای لێکەوتووەتەوە، وەکوو شێخ نووروڵلای خالیدی و، شێخ شوکروڵلای خالیدیو، شێخ عیزەدینی خالیدی... وە ئەم زاتانە ژن و ژنخوازی‌یان لەگەڵ نەتەوەی شێخ عیسای بەرزنجیدا هەبووە. بە تایبەتی لەگەڵ شێخ بابارەسووڵی گەورەدا، وەکوو لەمەولا باسی ئەکەین.

## بنەماڵەی سەییدەکانی تەکیەی قەرەداغ کە نەتەوەی ئیمام حەمزەن ـ خ ـ

سەییدەکانی وڵاتی کوردستان ـ وەکوو وڵاتانی دیکەی ئیسلام ـ یا لە نەتەوەی ئیمام حەسەن یا لە نەتەوەی ئیمام حسەینی کوڕانی ئیمامی عەلی و فاتیمەی زەهران. جا کاتێ باسی سەییدەکانی نەتەوەی ئیمام حەسەن ـ ئەوەی لە کوردستاندایە ـ کرا... دێینە سەر باسی نەتەوەی ئیمام حسەین.

وە نەتەوەی سەییدەکانی کاژاوی کە ئەچنەوە سەر مەحموود موزەفەر و، سەییدەکانی «کەڵجین» کە ئەڕۆنەوە سەر عەلی عەریزی کوڕی ئیمام جەعفەر ـ خ ـ وان لە پێش نەتەوەی ئیمام مووسای کازمەوە بۆیە باسی ئەوانیشم پێشخست.

جا ئێستە باسی نەتەوەی ئیمام مووسا ئەکەم، وە لەبەر ئەوە کە ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام مووسا خۆی هاتووە بۆ قەرەداغ و، شوێنی زانراو و دیارە لە پێشدا باسی نەتەوەی ئەم ئەکەم کە بریتین لە سەییدەکانی تەکیە و، سەییدەکانی حەیدەری‌یە. دوای ئەمانە باسی نەتەوەکانی دیکەی ئیمام مووسا ئەکەم، وەکوو: سەییدەکانی بەرزنجە کە لە نەتەوەی ئیسماعیلی موحەددیسی کوڕی ئیمام مووسایە و، مەلا جەلالی خورماڵی کە لە نەتەوەی سەیید عەبدوڵڵای کوڕی ئسماعیلی موحەددیسە، جا دوای ئەمانە سەییدەکانی بریفکانی و، پیرخدریی ئەنووسم کە لە نەتەوەی ئیمام عەلی‌ڕەزای کوڕی ئیمام مووسای کازمن ـ خ ـ .

وە لە پێش باسی سەییدەکانی تەکیەدا دەقی دوو شەجەرەیانم لە لایە ئەیان-نووسم، جا لەبەر رووناکی ئەوانەدا قسە ئەکەم.

شەجەرەی یەکەم شەجەرەی خوالێخۆشبوو مامۆستای گەورە و بەڕێز شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی‌یە، کە بەم شێوەیە:

السید عبدالله، ابن السید اسماعیل، ابن السید محمد، ابن السید علی، ابن السید خضر، ابن السید اویس، ابن السید نورالدین، ابن السید مصطفی، ابن السید صلاحالدین، ابن

السيد عوض، ابن السيد علاءالدين، ابن السيد عوض، ابن السيد نورالدين، ابن السيد الياس، ابن السيد سيفالدين، ابن السيد احمد، ابن السيد شمسالدين، ابن السيد علاء-الدين، ابنالسيد خضر، ابن السيد يوسف، ابن السيد على، ابن السيد محمود، ابن السيد محمد، ابن السيد محمد، ابن السيد حمزة، ابن السيد الامام موسىالكاظم، ابن الامام جعفرالصادق، ابن الامام محمد الباقر، ابن الامام على زينالعابدين، ابن الامام حسين السبط الشهيد، ابن الامام الهمام على ابن ابىطالب و فاطمة الزهراء بنت الرسول المصطفى المختار سيدنا محمد ـ عليه الصلاة والسلام.

ئەم شەجەرە بە مۆری گەلێ لە زانا و گەورە و بەرزەکانی کوردستان مۆرکراوە، وەکوو: شێخ مەعرووفی نۆدێیی و، کاک ئەحمەدی شێخی کوڕی و، سەیید عەبدوڕەحیمی بەرزەنجی و، سەیید عەبدولکەریمی بەرزنجی و، سەیید عەبدوڵڵای خەتیبی سلێمانی و، زانایانی قەزای هەڵەبجە و، خەڵکی دیکە...

شەجەرەی دووهەمیش شەجەرەی بنەماڵەی حاجی شێخ ئیسماعیلی کوڕی حاجی شێخ ئەمینە. بەم شێوە:

امين ابن السيد محمد، ابن السيد عمر، ابن السيد احمد، ابن السيد الياس، ابن السيد سيفالدين، ابن السيد عوض، ابن السيد نورالدين، ابن السيد مصطفى...

تا کۆتایی دێت وەکوو شەجەرەکەی پێشوو.

جا لەبەر ئەوە لە وڵاتی کوردستاندا چاپخانە نەبووە بۆ چاپکردن و زیندووکردنەوە و بووژاندنەوەی دانراو و بەرهەم و، بشێوەی بێسامان و بێئەندازەیش لە وڵاتەکەدا بووە، گەلێ دانراو و نووسراو لە هاتوچۆ و ئەمبەرە و بەردا لەناوچوون و، گەلێ لەو نووسراوانە لەبەر بێدەستی دەفرۆشران و، بایەخ بە باسی زانایان و گەورە پیاوان نەدراوە و، بەسەرهاتیان تۆمار نەکراوە... بە داخەوە لە سەد کەسدا بەسەرهاتی یەکێکمان بە ڕێکیی دەست ناکەوێت. بەلام لەم خانەدانەدا ناوی چەن کەسێ هەیە.

ئەوەیشتان لەبیر بێ کە ئیمام هەمزە ـ حەمزە ـ بۆیە ئەو شوێنەی هەڵبژاردووە، چونکە کەنار و پەنا و دوور لە قەرەباڵغە و، شوێنی ژیوارێکی وای نییە مەگەر کەسێ زۆر قنیاتی ببێ و دوور لە دنیا بێ. ئەم سیفەتانەیش هەمیشە لە نەتەوەدا نامێنێتەوە، جا لەسەر ئەساسی بێدەرەتانی شوێنەکە گەلێ لە سەییدەکانی تەکیە شوێنی باوک و باپیری خۆیان بەجێهێشتووە و، روویان کردووەتە شوێنێکی تر ـ دوور یا نزیک ـ

وەکوو سەییدەکانی جەباری کە چوون بۆ لای کەرکووک و لەوێ دانیشتوون، لەو شوێنەدا کە ئێستە بە ناوی جەباری‌یەوە ناسراوە. وە سەییدەکانی دێی «بەلخە» و «زەیدۆمەر» لە ناحیەی قەرەداغدا، وە ئەو بنەماڵە کە کۆچیان کردووە بۆ شاری هەولێر و لەوێدا ماونەتەوە. وە وەکوو شێخ محەمەدە کۆسەی باپیری شێخ عەبدوللای خەرپانی کە لە تەکیە دەرچووە و لە دەوری ئەحمەدئاوای نزیکی مەرکەزی ناحیەی گولعەنبەر ـ خورماڵدا نیشتەجێ بووە و پاش ماوەیێ نەتەوەی رۆیشتوون بۆ خەرپانی و هەڵەبجە و ئێستە وان لە هەڵەبجەدا. وە وەکوو گەلێ لەو سەییدانی دیکەی تەکیە کە لەم سەدەی چواردەهەمەدا لە شاری سلێمانیدا دامەزراون، وە لەسەر هەمان شێوە گەلێ کەس لەو بنەماڵە پیرۆزە کە لە وڵات دەرچوون و، بە شوێن خوێندندا گەڕاون ڕێیان لە وڵات و شوێنی باش کەوتووە و تیادا دامەزراون و، نەگەڕاونەتەوە بۆ جێگەی خۆیان و، پاش ماوەیێ ناوی تەکیەی قەرەداغ و خزمانیان لەبیر چووەتەوە.

ئێمە گەلێ داخ ئەخۆین بۆ ئەوە کە دەسمان بە تەرجومەی حاڵ و بەسەرهات و ژیانی زانایان و خاوەن‌بارەکانی ئەو رشتە زێڕە بەڕێزە نەگەیشتووە کە بە دەیان زانا و پیاوی هەڵکەوتوویان بووە. تەنیا ئاگام لە چەن کەسێکیان هەیە لێرەدا ئەیان‌نووسین، بەڵکوو لە پاش ماوەیێ لەملا و لەولا بگەین بە هەندێ لەوانەی مەبەستمانە و بە شوێنیاندا دەگەڕێین.

دەبێ ئەوە بزانین ئەوەی کە ئێمە خۆمان چاومان پێکەوتووە یا خود لە پیاوی باوەڕپێکراومان بیستووە ئەمەیە کە هەموو سەییدەکانی نیشتەجێی دێی تەکیە ئەوانیش لەوان جیابوونەتەوە هەموویان دارای رەوشتی بەرز و قنیات و لەخوداترسی و، دنیانەویستی بوون و، لە دەهندەیی و میوانداری و قسەخۆشی و نوکتەپەردازیدا... پیاو گەلێکی وابوون نرخیان تەواو نابێ.

بەهەرحاڵ باسی کەسێ ئەکەین کە تەرجومەی زانراو بێ و شتێکیمان لە بارەیەوە دەست کەوتبێ.

جا لەو کەسانەیە کە زانایەکی بەرز و بەڕێز بووە «مەلا جامی» یا «مەلا شێخ جامی». ئەم زاتە شێخ جامی، کوڕی سەیید حسەینی، کوڕی سەیید ئەحمەدی، کوڕی سەیید ئوەیسی، کوڕی سەیید سەیفەدینی، کوڕی سەیید عەوەزە. دەبێ ئەوە بزانین ئەم

سەیید عەوەز ناوە باپیرەی رشتەی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی‌یە کە لە زانیاری و ڕێزدا تاقانەی وڵات بووە.

هەروەها ئەم شێخ عەوەزە خوێشی زانایەکی بەرز بووە و حاشیەی لەسەر ئیزهـار و شەرحی جامی لەسەر «کافیة» هەیە. وە گەلێ زانا لە نەتەوەی ئەم شێخ عەوەزە بـوون و، حاشیەیان لەسەر کتێبی «انوار» و «وضوح»ی مەلا ئەبوبەکری موسەننیف هەیە.

مێژووی لەدایک‌بوونی خوالێ‌خۆش‌بوو مـەلا جـامی نـەزانراوە، بـەڵام بـە گـوێرەی هەندێ بەڵگە و ئەو دەسنووسـانە کـە لێـی بـەجێ‌مـاون و لـە کـاتی خوێندنیـدا لـە دەوروبەری ١١٤٣دا نووسیونی... دەبێ لە نزیکی ١١٢٠ای کۆچیدا لەدایک بووبێ.

ئەم زاتە بۆ خوێندن گەلێ لە شار و شوێنە ناودارەکـانی کوردسـتان گـەڕاوە و لـە: موسڵ و هەولێر و دەورو بەریاندا خوێندوویە، دوایی گەڕاوەتەوە بۆ خۆشناو و لـە دێـی «تەلە» کە سەر بە ناوچەی «سۆران»ە خوێندوویە.

وە ئەم زاتە وەکوو زانا و خاوەن‌بارە و هەڵکەوتوو بووە... خەتێکی جوانیشی بـووە و دەسخەتێکی نایابی بە خەتی خۆی لە پاش بەجێ‌ماوە.

بەهەرحاڵ پاش تەواوکردنی خوینـدن هاتووەتـەوە بـۆ تەکیـە و، لـەوێ خـەریکی دەرس‌وتنەوە بووە و مزگەوتی تەکیەی کردووەتەوە کە لـە ناوچـەی قەرەداغـدا بـێ- وێنەیە و، تەمەنی خۆشەویستی خۆی لە ڕێگەی خوێندن و خزمەتی زانیاری و ئاییندا بەسەر بردووە.[١]

لە دوایی دەسخەتی «موصل الطلاب»ەوە ئەم شیعرەی نووسیوە:

جامی از بندگی خویش ملول
دارد از خواجگیت چشم قبول

---

١ ـ خوالێ‌خۆش‌بووی باوکم گەلێ جار کە هەڵی ئەنام بۆ خوێندن ئەیوت: کوڕم باوک و باپیرمان هـەر بـە خوێندەواری هاتوونەتە خوارەوە تا یەک دوو پشت پێش ئێمە. ئەی‌وت: شێخ یوسفی باپیرمان ـ کە کوڕی شێخ جـامی بـووە ـ خوێنـدەوار بـووە و، دوو کـوڕی بـوون تـا «مسـتعد»ی و نزیکـی ئیجـازە وەرگـرتن خوێندوویانە، لەو کاتەدا بەرودوا هەردووکیان مردوون. جا باوکم ئەیفەرموو: ئەڵێن: شێخ یوسف دوای ئەو کارەساتە جەرگ‌بڕە وای لێ هاتووە چەند ساڵ فەرقی ترش و شیرینی نەکردووە! م، ع، ق.

ئەم شێخ جامی‌یە باپیرەی یەکێ لە دوو تیرەی گەورەی شێخانی تەکیەیە و، بە شێخ جامیی گەورە ناسراوە. ئەم زاتە باپیرەی پێنجەمی محەمەد عەلی قەرەداغی‌یە، کە ئێستە لە ژیاندایە و، ئیمام و خەتیبە لە بەغدا.

### شێخ عەبدوڵلای خەرپانی

ئەم زاتە کوڕی شێخ ئیسماعیلی، کوڕی شێخ محەمەدە کۆسەیە.

شێخ محەمەدە کۆسە لە تەکیەدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١١١٠دا لە تەکیە ژنی هێناوە، جا گوێزاوی‌یەتی‌یەوە بۆ دەوروبەری گوڵعەنبەر و لەوێ نیشتەجێ بووە تا کۆچی دوایی کردووە و گۆڕی لە نزیکی ئەحمەدئاوای ئێستەدایە.

لە شێخ محەمەدە کۆسە شێخ ئیسماعیل بەجێ‌ماوە، ئەویش هاتووە لە دێی خەرپانیدا دانیشتووە و لەوێ ماوەتەوە تا خودا شێخ عەبدوڵلای پێ بەخشیوە.

ئەم شێخ عەبدوڵلا هەرچەند مێژووی لەدایکبوونی دیار نییە بەڵام بە پێی ئەوە کە وا باو و زانراوە نزیکەی ١٠٠ ساڵ تەمەنی بەسەر بردووە و لە ساڵی ١٢٥٤ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە...

ئەبێ لە دەوری ساڵی ١١٥٥دا لە دایک بووبێ.

بەهەرحاڵ ئەم زاتە پاش فام کردنەوە دەستی کردووە بە خوێندن و بۆ خوێندن لە خوێندنگاکانی نزیکی خۆیاندا گەڕاوە و خەریک بووە، تا گەیشتووەتە پلەی تێگەیشتن و پێگەیشتن ئەوسا چووە بۆ هەڵەبجە و لەوێشەوە بەرەوخوار بووەتەوە بۆ: کەرکووک و ، هەولێر و، خۆشناو و، بۆ خزمەتی «حەیدەری»یەکان لە «ماوەران»دا، لە پاش تەواوکردنی خوێندن، لە خزمەت سەیید خزری حەیدەریی مامی سیبغەتوڵلای حەیدەریی بەناوبانگدا ئیجازەی وەرگرتوەو گەڕاوەتەوە بۆ لای خۆیان و لە خەرپانیدا خەریکی دەرس‌وتنەوە بووە.

وە لەبەر ئەوە کە زانایەکی گەورەو بەرێز بووە و تەدریسێکی باشی کردووەو، قوتابی لە هەموو لایەکەوە لێی گردبوونەتەوە... میری بابان زۆر چاودێری کردووە و، دێی خەرپانی و ئاوی کۆلیژی پێداوە و، لە چەمی دەرەقووڵە هەندێ باخ و ئاشی بووە و هەروەها لە دێی تەوێڵەیشدا هەندێ باخی دراوەتێ. ئەویش لەبەر ئەوە کە لە بارەی ژیواری ماڵی خۆی و میوان و قوتابی و ئاموشۆکەرەوە دڵی ئاسوودە بووە و دڵی لای

نەبوونی و بێژیواریی نــەبووە... بــە شــێوەیەکی وەهــا دەرســی گوتووەتــەوە شــیاوی ستایش و ڕێز بێ.

بە کورتی ماوەی ٧٠ ساڵ دەرسی وتووەتەوە، لە زستانا لە ناو دێی خەرپانیــدا بــووە و هاوینان چووەتە «هۆبە» کە لە لاژووررووی خــەرپانی‌یەوەیــە و کــانی و باخــە، لــەوێ دەرسی وتووەتەوە و وا دیارە ناوبەناو زستانان لە هەڵــەبجەیش دانیشــتووە و لــەوێیش دەرسی وتووەتەوە.

وە لە پاش کۆچی مەولانا خالید بۆ بەغدا شێخ عەبدوڵلا لە خانەقای مەولانا خالیــدا دەرسی وتووەتەوە، بەڵام ئەمە هەر ماوەی چوار پێنج ساڵێ بووە و ئیتر گەڕاوەتەوە بۆ شوێنەکەی پێشووی خۆی و وەکوو جاری جاران دەرسی وتووەتەوە.

لە پیاوی باوەڕپێ‌کراوم بیســتووە کــە ســێ پشــت لــە خزمــەتی شــێخ عەبدوڵــلادا «مطول»ی مەلا سەعدیان خوێندووە و ئیجازەیان وەرگرتووە.

وەک بڵــێین: یــەکێ هــاتووە «مطــول»ی لــە خزمەتیــدا خوێنــدووە و، ئیجــازەی وەرگرتووە و دوای ئــەوە ژنی هێنــاوە و کــوڕی بــووە و کوڕەکــەی خوێندوویــەتی تــا گەییوەتــە «مطــول» هــاتووە لای شــێخ عەبدوڵــلا «مطــول»ی خوێنــدووە و ئیجــازەی وەرگرتووە و دانیشتووە و ژنی هێناوە و کوڕی بووە و کوڕەکەی خوێندوویەتی تا کاتی (مطول) و ئەمیش هاتووە ـ وەکوو باوک و باپیری! ــ لای شــێخ عەبدوڵــلا «مطــول»ی خوێندووە.

مەگەر هەر خودا بزانێ کە لە مــاوەی ٧٠ ســاڵ دەرس‌وتنــەوەدا چەنــد کــەس لــە خزمەتی شێخ عەبدوڵلادا خوێندبێتیان! بــەڵام ئــەوە ئــەزانین هــەر کەســێ لــە هــەر لایەکەوە ویستبێتی خوێندنێکی شایاوی باش بخوێنێ ڕۆییشتووە بــۆ خزمــەتی شــێخ عەبدوڵلای خەرپانی، یا مەلا جەلالی خورماڵی، یا مەلا ئیبراهیمی بیارە. ئەم سیانە لە نزیکی یەکدا بوون و ماوەی نێوان خوێنــدنگاکانیان مــاوەی دوو ســەعات و نیــو ڕێگــە زیاتر نەبووە. ئەم پیاوانە هەرسێکیان لە زانــا گــەورەکانی چــەرخی خۆیــان بــوون بــە تایبەتی لە زانیاری‌یەکانی: بەلاغە و، فیقهـ و، ئوسوولی فیقهـ و، ئوسوولی کەلامدا.

لە خواڵێ‌خۆش‌بوو مامۆســتا شــێخ بابڕەسووڵــی مودەڕیســی عەبابــەیلێم بیســتووە ئەیفەرموو: بە ڕێکەوت ٤ موستەعید لە خزمەتی شێخ عەبدوڵلادا بوون: مــەلا یوســفی تەشاری و مەلا یاسینی تەوێڵەیی و مەلا محەممەدی زەهــاوی ـ کــە بــووە بــە مــوفتی

عێراق و بە موفتیزەهاوی ناسراوە ـ و، مەلا خدری «نالی»ی شاعیری بەرز و ناسراو. وە پایەی زانیاری ئەمانە وەها بووە و ئەوەندە جیاوازییان بووە تا مەلا یوسفی تەشاری حازر بووبێ مەلا یاسین دەرزی بە فەقێی خۆی نەوتووە و تا مەلا یاسینیش حازر بووبێ مەلا محەممەدی زەهاوی دەرزی بە فەقێی خۆی نەوتووە و، هەتا مەلا محەممەدیش دیار بووبێ مەلا خدری نالی دەرزی نەوتووەتەوە.

وە بیستوومە کە مەولانا خالید لە کاتی خوێندنی خۆیدا لای هەرسێ زاناکە ـ شێخ عەبدوڵلا و، مەلا جەلال و مەلا برایمی بیارە خوێندوویەتی. تەنانەت بیستوومە کاتێ مەولانا خالید بووە بە شێخی ئیرشاد داوای لە شێخ عەبدوڵلای مامۆستای خۆی کردووە کە «تمسک»ی پێ بکات و تەریقەتی لێ وەر بگرێ ئەویش پێی فەرمووە: من ئێستە کاتی ئەوەم نەماوە تەریقەت وەربگرم و پیر بووم. بەڵام حەز ئەکەم مەعنای فلان جێگەی حاشیەی عەبدولغەفووری جامیم بۆ تەقریر بکەی. ئەویش کاتێ مەعنای جێگەکەی بۆ ئەکات شێخ عەبدوڵلا ئەفەرموێ: باوەڕم هەیە کە تۆ بە سەفا و رووناکی دڵ تەواوای لێکدانەوەی مانای ئەم جێگەت پەیداکردووە و تۆ خاوەنی حاڵ و مەقامی.

سەردەمی ژیان و دەرسوتنەوەی شێخ عەبدوڵلای خەرپانی سەردەمی زێڕینی وڵاتی بابان بووە و شێخ عەبدوڵلا هاوچەرخی مەلا برایم و مەلا جەلال و مەلا ساڵحی تەڕەماری و ئیبنوئادەمی باڵەکی و مەلا محەممەدی ئیبنولحاجی جێشانەیی و شێخ عەبدولەتیفی گەورەی قەرەداغی و شێخ حەسەنی گڵەزەردە... بووە کە زۆر زانا بووە... هەروا هاوچەرخی مەلاکانی قەلاچوالان بووە کە بە هۆزی «غەزایی» بەناوبانگن، وەکوو مەلا مەحموودی غەزایی و غەیری ئەویش... ئەوانە هەموو تاقانەی رۆزگار بوون.

بە تایبەتی لەگەڵ مەلا جەلالی خورماڵدا میانەیان زۆر خۆش بووە و لە کاتێکدا شێخ عەبدوڵلا لە لایەنی بابانەکانەوە خەرپانی و هەندێ باخی دێی تەوێڵەی دراوەتێ و بە دەستییەوە بوون و خەڵکی ئەو ناوچە ویستوویانە بە بەهانەی ئیجارەوە لە دەستی وەربگرن مەلا جەلال لە ژێر پەردەی نوکتەیەکی ناسکدا بۆ شێخ عەبدوڵلا دەنووسێ:

از بهر تست مخصوص «خرپانی» و «تەویلە»
هشیار باش نستانندت به مکر و حیله

بە «تەوری‌یە» نیسبەتی تەوێڵەی لێ ئەدات. ئـەویش بـە یاسـای ناسـکیی میانـەی خۆیان وەڵامی ئەداتەوە و ئەم شیعرەیشی بۆ دەنووسێ:

«جیم» جهل و «الف» احمقی و ، «لام» لجاج
همه در نـام تـو جمعند جلالا! چه علاج؟

کاتێ نامەکە ئەگات کوڕەکەی مەلا جەلال وەری‌دەگرێ و لـەو کاتـەدا خەڵـک لـە دەوری باوکیدا دانیشـتوون، نامەکـە ناخوێنێتـەوە، دوایـی بـاوکی داوای لـێ دەکـات بیخوێنێتەوە، ئەویش گورج شیعرەکە دەگۆڕێ و ئاوای دەخوێنێتەوە:

«جیم» جود و «الف» آگهی و ، «لام» لبیب
همه در نام تو جمعند جلالا! چه عجیب؟

باوکی ئەڵێ: ڕۆڵە بە خودا شێخ عەبدوڵلا شیعری وا بۆ من نانووسێ.

شیعرەکەیشـی بـێ‌تـام مەکـە! بیـدەرە دەسـتم بـزانم چۆنـە ئەیداتـە دەسـتی و ئەیخوێنێتەوە، ئەڵێ: ئەمەیە شـیعری خۆشـی شـێخ عەبدوڵـلا، ئیتـر تـۆ بـۆ خراپـی ئەکەی؟! بۆ زانین! لەو کاتەدا کە شێخ عەبدوڵـلا لـە سـلێمانیدا مـودەڕیس بـووە بـۆ پیرۆزی ئیجازەی ـ هاوڕێ لە هـاوڕێی ـ لـە هاوچـەرخ و هاوماموٚسـتای خـۆی شـێخ مارفی نۆدێیی وەرگرتووە. ئەمەیش دەقی ئیجازەکەیە:

سلام اشرق سناه، و عبق شذاه، اتحفه للعلامة الفهامة، المحقق المدقق، عالی الجناب، اخی: الشیخ عبدالله اولاه مولاه فی اولاه و اخراه، و منع ما یهواه، و وقاه جمیع مایخشاه!

و بعد: فان السید زین‌العابدین المدنی ـ علیه الرحمة ـ لما جاء الی سـلیمانیة اخبرنـی بانه اجیز فی المدینة المنورة بقراءة جمیع ما یقرأ علی وجه الارض، وان یجیز بها مـن رآه اهلا لها، و قد اجازنی، و اجاز السید عبدالصمد السعدانی، و اجاز السید محمد الـدیلیژەیـی بقراءة جمیع ما یقرأ علی وجه الارض، و اجازنا ـ ایضا ـ بان نجیـز مـن شـئنا مـن السـادة العلماء و غیرهم.

فیا اخی الشیخ عبدالله! اجزتک بقراءة جمیع ما یقرأ علی وجه الارض، و اجزتک ـ ایضا ـ ان تجیز بها من شئت من المسلمین، و ما زلتم سالمین. والسلام علیکم.

محمد الملهوف

محمد الشهیر بالمعروف

شێخ عەبدوڵلا لە تەندروستی هەستەکان ـحواس ـ یا بێوێنە بووە و لە دوادوایی ژیانیا قوتابی لە دوورەوە کتێبیان بو کردووەتەوە و ئەو کتێبەکەی خوێندووەتەوە.

لە پێش کۆچی دوایی شێخ عەبدوڵلادا پزیشک و دوکتۆری ئەو سەردەمە پێیان وتووە: خوێندنەوە زیان لە چاوت دەدات و دەبێ دەست لە خوێندنەوە هەڵبگری، بەلام لەبەر ئارەزووی زۆری لەسەر خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە و هۆگریی بە کتێبخانە گەورە پڕ زێڕەکەیەوە نەیتوانیوە گوێ بۆ ئامۆژگاری پزیشکان بگرێ و تا دوا هەناسەی لەگەڵ کتێبەکانیدا ژیاوە.

بە کورتی شێخ عەبدوڵلا تەمەنی لەگەڵ کتێب و دەرس‌وتنەوەدا هێناوە و بەو شێوەیش تەواوی کردووە.

شێخ عەبدوڵلا لەگەڵ ئەوەدا زانایەکی وا بەرز و دیاریی بووە، پیاوێکی کۆمەلایەتی و دەروون‌پاک و دڵساف بووە. لەگەڵ شێخ عوسمانی سیراجەدیندا ـکە لە دوایی تەمەنی شێخ عەبدوڵلادا لە بیارەدا بووە ـ دۆستایەتی‌یەکی گەرمیان بووە و شێخ عوسمان دوو کچی خۆی داوە بە دوو کوڕی شێخ عەبدوڵلا، کچێکیان بە شێخ محەمەد و ـ وا بزانم ـ ئەوی دیکەیان بە شێخ عەبدوڕەحمان.

تا بە یاسای پادشای بێباک خودای تەنیا و تاک لە رۆژی بیستی مانگی رەجەبی ساڵی ١٢٥٤ی کۆچیدا لە دێی خەرپانی گیانی پیرۆزی بە پەروەردگاری خۆی سپاردووە و، لە بەهەشتی بەرزدا شادمان بووە و لە گۆڕستانی خەرپانیدا بە خاک سپێرراوە.

ئەم زاتە بەڕێزە پێنج کوڕی زانای سەربەرزی بووە: شێخ عەبدولکەریم و شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ مەعرووف و شێخ محەمەد و شێخ مەحموود.

جا شێخ عەبدولکەریم، کە کوڕی گەورەی بووە، لە سەردەمی ژیانی باوکیدا کۆچی دوایی کردووە و کوڕەکانی دیکەی کەوتوونەتە دوای خۆی وەکوو باسیان دێ:

### شێخ عەبدولکەریم

ئەم زاتە کوڕی گەورەی شێخ عەبدوڵلا بووە و پاش تێگەیشتن و خۆناسین، دەستی کردووە بە خوێندن و ماوەیەک لە خوێندنگاکەی خۆیانا بووە، پاش ئەوە لەوێ دەرچووە و بو خوێندن بە زۆر لە شارەکانی عێراقدا گەڕاوە و لە شاری کەرکووکدا زۆر

ماوەتەوە و ئەنجام هاتووەتـەوە بـۆ «خـەرپانی» و لـە خزمـەتی باوکیـدا ماوەتـەوە تـا خوێندنی تەواو کردووە و ژنی هێناوە، جـا لـە ساڵـی ١٢٣٣دا لـە ژیـانی باوکیـدا لـە خەرپانی کۆچی دوایی کردووە.

## شێخ عەبدوڕەحمان

ئەم زاتەیش خوێندەوار و زانا بووە، بەڵام نووسراوێ نییە ئەندازەی زانیاریی و ڕێزی روون بکاتەوە. هەر لە دێی خەرپانیدا ماوەتـەوە و کچـی حـەزرەتی شـێخ عوسمـانی هێناوە، بەڵام منداڵی نەبووە.

ئەم زاتە لە بـەهاری ساڵـی ١٢٦٦دا رۆژی سـێ‌شـەمەی مـانگی «جمـادی الاخـرة» کۆچی دوایی کردووە.

## شێخ مەعرووف

ئەم کوڕەی شێخ عەبدوللا زانا بووە و لە خوێندنگای خۆیانـا لـە خزمـەتی باوکیـدا خوێندوویەتی و دوایی بۆ خوێندن بە شارانا گەڕاوە و، لە شاری سلێمانیدا لە خزمـەتی خوالـێ‌خـۆش‌بـوو شـێخ مـەعرووفی نـۆدێهی‌دا خوێندوویـەتی و بـە خـەتی خـۆی نووسیویەتی ئەم کتێبەم لە خزمەتی دانەرەکەیدا ـ کە شـێخ مـەعرووفی نـۆدێی‌یـە ـ خوێندووە.

وە وەکوو لە دەریای بێ‌کەرانەی زانیاری مامۆستای سوودی وەرگرتووە، لە هونەر و بەهرەی شیعریشی بێ‌بەش نەبووە و مامۆستای هەستی شیعری لە ناخیدا بزواندووە و هانی داوە بۆ ئەم بارەیش و[1] شیعری وتووە.

زیاد لەوانەیش هەر لە مامۆستایەوە ـکە خۆشنووسێکی بالادەست بـووە ـ هونـەری خەت‌خۆشیشی دەست کەوتووە و خەتێکی جوانی هەبووە.

پـاش ماوەیـەک لـەوێوە چـووە بـۆ کـەرکووک و لـە خزمـەت زانایـانی ئەوێیشـدا خوێندوویە. جا هاتووەتەوە بۆ هەورامان و خەرپانی و لەوێ ماوەتەوە هـەتا لـە ساڵـی ١٢٨٢ی کۆچیدا جیهانی بەجێ‌هێشتووە.

---

١ ـ لە ناو دەسخەتەکانی کتێبخانەی شێخ عەبدوللادا شیعری یەکێ لە کوڕەکانی شێخ عەبدوللام دیوە بە نازناوی «عاسی»یەوە نووسراوە، دەبێ شیعری ئەم شێخ مەعرووفە بێت. م، ع، ق.

## شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدوڵڵا

ئەم زاتەیش پاش خۆناسین لە خوێندنگای خۆیانا دەستی کردووە بە خوێندن و پاش خۆ گرتن و تواناپەیداکردن لە خزمەتی باوکیدا خوێندوویە، دوایی بەوە تینوێتی نەشکاوە و بۆ زیادە ئاگاداری و سوودوەرگرتنی زۆرتر شوێنەکانی دیکە بۆ خوێندن گەڕاوە و لە ژیانی باوکیدا زانیاری‌یە باوەکانی بۆ تەواو نەکراوە، بۆیە پاش کۆچی دوایی باوکی چووە بۆ کەرکووک و بەغدا و، پاش ماوەیێ گەڕاوەتەوە بۆ سنە و سابلاغ و لە ئەنجامدا لە خزمەتی زانای بەرزی بەڕێز «مەلا محەمەدی بانەیی»دا ئیجازەی وەرگرتووە و، من خۆم ئیجازەنامەکەیم دیوە و خوێندوومەتەوە.

پاش ئیجازە وەرگرتن هاتووەتەوە بۆ خەرپانی و لەسەر ماڵ و موڵکی خۆیدا ـ وەکوو براکانی دیکەی ـ دانیشتووە و خەریکی دەرس‌وتنەوە بووە و لەبەر ئەوەی زانایەکی بەرز بووە قوتابی‌یەکی زۆری لێ کۆبووەتەوە. وە کچی حەزرەتی شێخ عوسمانی سیراجەدینی مارە کردووە و، لەو کچە کوڕێکی بووە، کە ناوی ناوە شێخ قادر. لە شێخ قادر شێخ محەمەد و شێخ ئەحمەد و کچێ بووە. شێخ محەمەد نەتەوەی نییە. شێخ ئەحمەد سێ کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: ئەنوەر و عەبدولقادر و عەلی.

شێخ محەمەد لە ساڵی ١٢٨٣ی کۆچیدا لە خەرپانی کۆچی دوایی کردووە و لە مێژووی کۆچەکەیدا نووسراوە:

توفی الشیخ محمد ابن الشیخ عبدالله الخرپانی فی یوم الخمیس من سادس او سابع شعبان من العشر السابع، من المائة الثالثة من الالف الثانی من الهجرة. غفرالله له و لابویه، و لنا و لسائر المسلمین اجمعین. آمین والحمد لله رب العالمین.

شێخ محەمەد زۆر کۆششی کردووە و گەلێ کتێبی دەسنووسی بووە و لە پاش نووسینەوەیان وەقفی کردوون لەسەر خۆی و نەوەکانی.

لەوانە: «تقریب‌المرام» شەرحی «تهذیب‌الکلام» دانراوی شێخ عەبدولقادری موهاجیر، کە خۆی نووسیوی‌یەتی‌یەوە و لە کۆتاییدا نووسیوە:

تمت کتابته یوم السبت التاسع عشر من شهر شعبان، فی سنة خمسین و مائتنین و الف بقریة «البجة» علی ید اقل الانام محمد المحتاج الی شفاعة الانبیاء و الرسل الکرام، یوم حشر الارواح والاجسام. و هو ابن الشیخ عبدالله، ابن الشیخ اسماعیل، ابن الشیخ محمد الکوسج الخرپانی.

وە ئەم کتێبەی چوار ساڵ پێش کۆچی دوایی باوکی نووسیوەتەوە، بەڵام نازانین چۆن و بە چ شێوەیێ لە هەڵەبجەدا نووسیویەتی‌یەوە؟ ئایا لە لای یەکێ لە زانایانی هەڵەبجە بووە؟ یا لە خانووی خۆیدا بووە؟ یا لە خانووی باوکیدا؟ دەبێ ئەوەیش بزانین پاش ئەوە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە، واتە چوار ساڵ پاش کۆچی دوایی باوکی هێشتا پێویستی بە خوێندن بووە، بۆیە چووە بۆ کەرکووک و سلێمانی و بەغدا و سنە و... شوێنانی دیکە. ئێمە چاوەڕوانی زانیارین لە داهاتوودا.

شێخ محەمەد بە چەن شیعرێ بە شێوەی هەورامی باوکی لاواندووەتەوە و شینی بۆ کردووە. بۆ یادگار لێرەدا تۆماریان دەکەم:

بێ‌شەریک و زات، واحیدی موتڵەق
نییەن کەسێ تر مەعبوود بۆ بە حەق
حەیوان و نەبات چەنی جەمادات
«تحت الامر» تەن تا هەفت تەبەقات
بەڵ ئەرز و سەما، مەلایک و جین
گرد مەخلووقتەن مەعلوومەن یەقین
وەلێ واجبەن گرد ببان تەمام
بەویش فەرماوان خودای «لاینام»
جە هەنگام چاشت جە ڕۆژ بیستەم
ماه رەجەب بی شێخ «معظم»
عیزرائیل تەشریف ئاوەرد بە باڵین
قەبز ڕۆحش کەرد بە ئەمر موبین
تەئریخ جە هەزار دووسەد و پەنجا
هەم چار ساڵ وی‌یەرد شێخ کەردش وەفا
جە «دارالمحنة» بە «دارالرحمة»
ڕۆحش کیانا بە ماوای «جنة»

عـــیلم و عەمـــەل و ســـیادەتش گـــرد
نـــەدەرۆ زایـــع، هـــەر ســـەعیۆش کـــرد
چەن جە راگەی دین مەسئەلەی تـەحقیق
چەن وەجهـ عیلمـان کـەردەنش تـەحقیق
بە شوغڵ تەدریس چل سـاڵ، بـەل فێشـتر
رۆبـــــەڕۆ شـــــەوقش مـــــبی زیـــــاتر
خـــەیاڵ مکـــەردن عـــومرش بـــە هـــەفتاد
چـــەنی دوو ســـاڵ بی بـــێ کـــەم و زیـــاد
یـا شـێخ جـەو سـاوە تەشـریفت بـەردەن
جـە سـنە و بەغـداد تەحسـیلم کـەردەن
هەم جە سابلاغ، جە شـەهر کـەرکووک...
پـەرێ کەسـب عـیلم بییـەنان مـەهتووک
هیچ کەسـم نەدیـەن چـون تـۆ موفیـد بـۆ
وێنەی تۆ شەوقش جە سـەر تـەدریس بـۆ
هەرچـــەن مگێڵـــوو پێســـەو تـــۆ کەســـێ
بگنـــۆ بـــە دەســـتم نییـــەن هـــیچ کەســـێ!
تـــــۆ خـــــۆ ئیمـــــان و عەمـــــەل لازم بی
پـــــەرێ قیامـــــەت هەرچـــــەن کـــــافی بی
عیللەتش چێش بی عیلمەکەت هەم بەرد؟
پـــەی حـــاڵ ئێمـــە تـــۆ خاســـت نەکـــەرد
کوتوبخانەکـــــەت هـــــا چاگـــــە کەوتـــــەن
یـــە شـــوومی منـــەن بەدبـــەختی بەختـــەن
پەی وێشـان جـارێ کەڵەکشـان بەسـتەن

پــەرێ تــۆ دایم دڵشــا شکســـتەن (!)
تــو خــودا قــەدرێ بــا راحــەت بوســان
بییــەن جــە داخــان رۆحــم هەراســان
لوتفـــت بــۆ پـــەرێم عیلمـــت کیانـــە
تـــا کوتوبخانـــەت نـــەگنۆ جـــە یانـــە
تـا چەنـدێ بـە بـەحر عیلمەکـەی تـۆوە
شــێونۆ کەڵەکشــان دیســان جــە نــۆوە
هەرچەن جەی سەردەم ئارامشان گەرتـەن
بــەروون رەنجشــان مــن داخــم بــەردەن
خــودا شــادکەرۆ رۆحــت بــە جەننــەت
ئێمــەیش سـا کـەمێ هـەم مبـۆ قسـمەت
خاســـە تـــا ئـــەو رۆ ئیزرائیـــل میـــۆ
قافڵـــەی دۆعـــای خـــەیرت پـــەی بـــەیۆ
بەڵـــکە تـــا ئـــەو رۆ رۆحـــت میـــۆ دەر
وانی «فاتحــــــە» پــــــەی رۆح «پــــــدەر»

لەم هۆنراوانەی شێخ محەمەدەوە دەردەکەوێ کـە شـێخ محەمـەد لـە سـەردەمی ژیانی باوکیدا ئیجازەی وەرنەگرتووە، بەڵکو خوێندنی ماوە و پێویستی بەوە بـووە کـە شارەوشار بکا و لای زانای بـاش بچـێ بـۆ ئـەوە سـوودێکی بـاش وەربگـرێ و چـاک بخوێنێ.

هەروا ئەوەیش دەردەکەوێ کە لە نزیکی کۆچی دوایی باوکیدا خاوەن فـام بـووە و جیاوازی نێوانی زاناکان و توانای دەرسوتنەوەیانی زانیوە، بۆیـە ئەڵـێ: کەسـی وەک تۆم دەست نەکەوتووە و کەس نیە وەک تۆ دەرس بڵێتەوە و سوود بگەیەنێ.

بەلام لەوەدا کە فەرموویەتی: شێخ عەعبدوڵلا تەمەنی ٧٢ سـاڵ بـووە بـە هەڵـەدا چووە، چونکە لە سەر دەسنووسـەکانی شـێخ عەبدولـلا دەردەکـەوێ کـە لـە ساڵـی

١١٨٤دا شێخ عەبدوڵلا خەریکی لێکۆڵینەوە بووە و بەراوردی کتێبی کردووە. وە یەکێ ئاوابێ ئەبێ زانا و بەتوانا بێ و ئەوەیش لە ٢٢ تا ٢٥ ساڵ کەمتر نابێ.

زیاد لەمەیش شێخ عەبدوڵلا لە خزمەتی شێخ خزری حەیدەریی ئامۆزای «صبغة الله»ی حەیدەریدا ئیجازەی وەرگرتووە کە لە نزیکی ١١٨٠دا مودەڕیس بووە و لە ژیاندا بووە، ئەگەر بۆ مەلایەک کە ئیجازە وەربگرێ بیست و چوار ساڵ دابنێی و ئەمە لەگەڵ مێژووی کۆچی دوایی شێخ عەبدوڵلادا کە ١٢٥٤ی کۆچییە بدرێتە دەم یەک نزیکی ٩٩ ئەکا، کە وابێ هەر قسە باوەکە راستە کە شێخ عەبدوڵلا لە سنووری ١١٥٥دا لە دایک بووە و تەمەنی ٩١ ساڵ بووە.[١]

## شێخ مەحموودی کوڕی شێخ عەبدوڵلا

ئەم زاتە بچووکترینی کوڕەکانی شێخ عەبدوڵلا بووە و لە ساڵی ١٢٥٠ی کۆچیدا لەدایک بووە.

باوکی بە خەتی خۆی نووسیویەتی:

من منه على الفقير الراجي الى رحمة الله عبدالله الخرپاني ولادة ابني المسمى بمحمود، اصلح الله سيرته، واطال عمره! سنة الف و مائتين و خمسين في عشر من شوال يوم الجمعة.

---

١ ـ دەبێ ئەوە بڵێم: کاتێ وتارەکەی «الشيخ عبدالله الخرپاني من خلال مخطوطات مكتبة»م نووسی و ـ ئەوەیش یەکەم بابەتی نووسینم بوو ـ هەمان گومانم لەم پارچە شیعرە کرد و لەوێدا تەنها بەشی دیاریکردنی ساڵی کۆچی دوایی شێخ عەبدوڵلام لێ گواستەوە و وتم:

لەبەر ئەوەی قەڵەمێکی تر، بێجگە لە قەڵەمی پێشوو، لە شیعرەکان وەردراوە لێرەدا هەموو شیعرەکان نانووسم.

بێگومان شێخ محەمەد دوای کۆچی دوایی باوکی خوێندنی زۆر ماوە و بە دووری ناگرم کە باوکی مردووە منداڵ بووبێ چونکە دەبینین بە دەمی خۆی چەن شاری دوور و نزیکمان بۆ هەڵدەدا، کە بۆ خوێندن بۆیان چووە. هەروەها بە نزیکی دەزانم کە هێشتا خوێندنی زۆر مابێ کاتێ ئەم شینەی بۆ باوکی کردووە، چونکە پلەی شیعرەکان لە پلەی شیعری مەلایەکی بە توانای وەک شێخ محەممەد ـ لە کاتی مەلایەتیدا ـ ناکات. دەمێنێتەوە ئەوەی کە چۆن زانیویەتی باوکی ئەو مەلا چاکە بووە، ئەمەیش لە کاتی هۆشکردنەوە و گەورەییشدا دەزانرێ، چونکە شێخ محەممەد هەر شوێنێک چووبێ لە پێش خۆیەوە ناو و شۆرەتی خوێندەواری باوکی ئەو ناوەی پڕ کردووە. م، ع، ق.

وا دەرکەوت کە ئەم کورە چوار ساڵان بووە کاتێ باوکی کوچی دوایی کردووە، چونکە باوکی ١٢٥٤ لە جیهان دەرچووە.

جا پاش خۆناسین لە خوێندنگای خۆیانا لە لای براکانی خوێندوویەتی، وە کاتێ گەورە بووە بۆ خوێندن گەلێ شوێن گەڕاوە، بە تایبەتی لە شاری کەرکووکدا، بەڵام دیار نییە کە لە خزمەتی کام زانادا بووە.

وە پاش ئەوە کە خوێندنی تەواو کردووە ماوەیێ لە شاری کەرکووکدا بە مودەڕیسی دانیشتووە و زۆر چاک دەرسی گوتووەتەوە، بەڵام کەلکەڵەی نیشتمان و دووریی برا و خزمان و بیری هەوای خۆشی چەمی بیارە و هاوینەهەواری هۆبە ئاسایشیان لە دڵی بڕیوە و هەرچۆن بووە ماوەیێ بەو شێوە لە کەرکووکدا هەڵی کردووە، بەڵام ئەنجام ئۆقرەی لەبەر بڕاوە و خۆی پێ نەگیراوە و هاتووەتەوە لە خوێندنگای مزگەوتی جامیعەی هەڵەبجەدا دامەزراوە و لەبەر ئەوە کە زانایەکی بەرز بووە لە هەموو شوێنێکەوە قوتابیی لێی گردبوونەتەوە و تەدریسێکی چاکی کردووە و لەگەڵ ئەوەیشدا پێشنوێژی و خوتبەخوێندنەوەی مزگەوتەکەی لە ئەستۆی خۆی گرتووە.

لە هەمان کاتدا خانەدانێکی زۆر بەسوود بووە و خەڵک لە نان و ئاوی تێریان خواردووە و، لە سێبەری دیوەخانیدا حەساونەتەوە و، بووە بە داڵدە و بارەگا بۆ پرسیاری موسوڵمانان و کۆڕی کۆبوونەوە و دانیشتنی زانایان و لە لای حوکوومەتیشەوە زۆر بەڕێز بووە و فەرمانی «افتا»ی لە «آستانە»وە بۆ هاتووە و زیاد لە کارەکانی پێشووی بوویشە بە موفتی ناوچەکە.

لە خواڵێخۆشبووان: شێخ عەلادینی بیارە و مەلا قادری سۆفیم بیستووە: کە ماڵی شێخ مەحموودی موفتی لە تەنیشتی مزگەوتی جامیعەوە بووە و لە شانی مزگەوتەکەوە ـ لە موڵکی خۆیدا ـ باخچەیەکی دروست کردووە، گەلێ داری: قەیسی و قۆخ و هەنجیر و ترێی تێدا بووە، هەروەها وردە سەوزەی تێدا کردووە. لەو زاتانەم بیستووە گەلێ کات کە بە میوانی لەوێ بوون میوەی ئەو باخچەیانە بۆ هێناون خواردوویانە.

وە بە تایبەتی سەیید عەبدوڕەحیمی مەولەوی کە کاتی خۆی فەقێی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی بووە و ئەویش لە خزمەتی شێخ عەبدوڵلادا خوێندوویەتی لەگەڵ

شێخ مەحموودا برادەری‌یان بووە و ئەو دۆسایەتی و برادەری‌یە ماوەتەوە تا کاتی پلەی تەدریس و «افتا»ی شێخ مەحموود و هەر کاتێ مەولەوی ویستوویەتی بچێ بۆ تەوێڵە بۆ لای شێخی سیراجەدین، یا پاش ئەو بۆ لای شێخی بەهائەدین ـ لە ئەمسەرەوسەردا ـ هەر لە ماڵی شێخ مەحموود میوان بووە.

بیستوومە: جارێ کە لە ڕێگەوە هاتووە چووە بۆ ماڵی شێخ مەحموودی موفتی و هەر لە دوورەوە بانگی لە شێخ مەحموود کردووە: خولە! بێ گوێ بگرە بزانە ئەم قوڕمساقە چی وتووە و چ بیرێکی وردی بەکار بردووە کە ئەڵێ؟:

نازک تەدارەک فەسڵ بەهارەن
شیرین ئارایش هەردە و کۆسارەن
گوڵ چون ڕووی ئازیز نەزاکەت پۆشان
وەفراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان

مەبەستی لەو تەشبیهە مەقلووبەیە کە لە بەیتی دووهەمدا کردوویەتی.

من خۆم ئەم ڕووداوەم لە «کەریم زیرۆنی» بیست، کە زۆر ئاشنای شێخ مستەفای موفتی بوو، بە زۆری لە ماڵی ئەوانا بوو.

شێخ مەحموودی موفتی بەم شێوە تەمەنی ڕابوارد هەتا گەییشتە ساڵی ١٣١٩ی کۆچی. لەو ساڵەدا لە تەمەنی «٦٩» ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و بۆ یەکجاری چاوی لێکنا.

ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێ ما: کاک ئەمین و شێخ مستەفا.

شێخ مستەفا لە جێگەکەیدا دانیشت.

### شێخ مستەفای شێخ مەحموود

ساڵی لەدایکبوونیم بۆ ڕوون نەبووەتەوە، پاش فامکردنەوە لە خوێندنگای خۆیاندا خوێندوویەتی، بەڵام کاتێ کە شێخ مەحموودی باوکی کۆچی دوایی کردووە ئەم هێشتا لە خوێندندا بووە و پاش کۆچی دوایی باوکی لە خزمەتی مامۆستا مەلا عەبدولقادری کانی‌کەوەییدا خەریکی خوێندن بووە، ئەنجام بە ناچاریی دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە و بەو ئەندازە کە خوێندوویەتی ـ دیارە کە فەقێی مامۆستا مەلا

عەبدولقادر بووبێ ئەندازەیەکی کەم نەبووە ـ دەس‌بەردار ئەبێ و ئەگەڕێتەوە هەڵەبجە و، لە شوێنەکەی باوکیدا دائەنیشێ و کارەکانی ئەو بەڕێوە دەبات.

بیستوومە: لەو کاتەدا دەیانەوێ فەرمانی فەتوادانی بۆ دەربکەن داوای ئیجازەی عیلمی لێ دەکەن ئیشەکەی لەسەر ئەوە ئەوەستێ، جا پیاویان ناردووە بۆ بیارە بۆ خزمەتی مەولانا عەبدولقادری کانی‌کەوەیی و ئەویش بە شێخ حەیدەری کوڕی شێخ عەلی تەوێڵەیی خەلیفەی شێخی سیراجەدین ـ کە خۆشنووسێکی چاک بووەی فەرمووە ئیجازەنامەیەکی بۆ نووسیوە و جەنابی مودەڕیس مۆری کردووە و ناردوویانە بۆ «ئاستانە» تا فەرمانی فەتوادانەکە بۆ شێخ مستەفا دەربچێ.[١]

جا شێخ مستەفا لەو شوێنەدا دانیشتووە و زاناکانی ئەو ناوچەی خەڵکەکەی لەسەر یاسای پێشوو و لەسەر بناغەی ڕێزی ئەو خانەوادە زۆر خزمەتیان کردووە و دامەزراوە و وەکوو سەردەمی باوک و باپیرەی ئەو مزگەوت و حوجرە و ئەو هۆدەی دیوەخانە بە زۆری پڕ بووە لە زانا و، پیاوی گەورە و پرسیارکەر و، هاموشۆکەری جۆراوجۆر.

وە من خۆم کە لەساڵی ١٣٤٣ی کۆچیدا لە سلێمانی ئیجازەم لە خزمەت مامۆستا شێخ عومەری قەرەداغیدا وەرگرت و لە نەرگسەجاڕ بووم بە مودەڕیس... هەرچی ئەچووم بۆ بیارە بۆ خزمەتی شێخ، میوانی ماڵی موفتی یا ماڵی شێخ عەبدولەتیف ئەبووم، وە ئەو دیمەن و شێوە کۆمەڵایەتی‌یە کە لە هەڵەبجە و دەوروبەریدا دەمدی لە تەمەنی خۆمدا لە هیچ شوێنێکدا نەمدیوە.

کاتێ ئەڕۆییشتی بۆ مزگەوتی جامیعە ئەتوت: لەم شوێنە خۆشتر نییە!

وە کاتێ ئەچووی بۆ مزگەوتی پاشا دەتگوت: لەم مزگەوت و شوێنە بەرزتر نییە! پیاوی بێ‌زانیاریی ـ زانیاریی لێ وەردەگرتن و پیاوی بێ‌ڕەوشت، ڕەوشت و خووی بەرزیان لێ فێر دەبوو... لام وایە هۆی ئەمانە هەمووی ئەم شتانە بوو:

---

١ ــ دەقی ئیجازەنامەکەی مامۆستای کانی‌کەوەیی کە داوی‌یە بە شێخ مستەفای موفتی لە کتێبخانەکەیاندایە و، وێنەی لای من هەیە کە مێژووی «جمادی الاخرة»ی ١٣٢٠ی کۆچی و مۆری شێخ عومەری بیارە و ئیمزای مامۆستا مەلا عەبدولقادری پێوەیە.
هەروەها دەقی فەرمانی «افتا»کەم لە لایە، ئەمەیان بە زمانی تورکی و خەتێکی دیوانی نایاب نووسراوەتەوە و، مێژووی دووی موحەڕەمی ساڵی ١٣٣٦ی کۆچی پێوەیە.
بەڵام کاتێ ئەم دوو مێژووە دەبینین و دەزانین ١٦ ساڵیان لە نێواندایە دەزانین کە ئەو باسەی مامۆستا بیستوویە بێ گومان نابێ، چونکی بڕوا ناکرێ موعامەلەیەک شازدە ساڵی پێ‌بچێ. م، ع، ق.

یەکەم: هەموو لە ژێر پەروەردەکردنی مامۆستایەکی وەهادا گەورە بووبوون کە وەکوو لە زانیاریدا بەرز بوو وەها لە رەوشتیشدا بەرز بوو. بە زمان زانیاریی و بە کردەوە رەوشت پیشانی خەڵک دەدرا.

دووەم: کێبەرکێ بۆ دەستهێنانی دنیا و، شەڕە شوێن و وەزیفە لە گۆڕێدا نەبوو، هەر یەک بە جۆرێ لەگەڵ ژین و ژیواری خۆیدا ساچابوو.

سێهەم: پەیوەندی بە پیاوچاکان و شێخانی گەورەوە لە تەوێڵە و بیارەدا و هاوڕێتی ئەوان و ئەو زانایانە کە ئەهاتن بۆ دیدەنی ئەو شوێنانە و یا هەر لەو شوێنانەدا بوون و بە خواپەرستی‌یەوە ژیانیان بەسەردەبرد.

چوارەم: ئەمەبوو هەرچەن خانەدانی دین و زانیاری لەو قەزادا بوو لە ژوور و خواریەوە جگە لە باسی ئایین و دووری لە دنیا باسێکی دیکەیان لە لا نەبوو، جا ئینسان کە گوێی بە دنیا نەدا تووشی هەڵە و تاوان نابێ، چونکە خۆشەویستی دنیا سەری هەموو گوناهێکە.

وە هەر کەسێ ماوەیێ لە لای ئەو زانایانە بمایەتەوە حاڵی وای لێ ئەهات وەکوو یەکێ چەنێ خەریکی تەریقەت و سلووک‌کردن بێ.

شێخ مستەفای موفتی لە کۆتایی ژیانیدا تووشی گەلێ ئازار و مەینەتی بوو، ئەمەیش لەسەر ئەوە بووە کە بە ئاشکرا راستی ئەوت و شتی نەدەشاردەوە. جگە لەوەی کە بە ئاشکرا لە دژی داگیرکەرانی ئینگلیز دەدوا و سەری بۆ دانەدەنەواندن. بەڵام لەم ئازار و مەینەتەدا چەن شتێ پشتی شێخ مستەفایان گرت:

یەکەم: قنیات و خۆ گرتن کە پشتاوپشت بۆی مابووەوە.

دووەم: خزمەت‌کردنی دۆستانی هەڵەبجە کە بە راستی خۆشیان دەویست.

سێهەم: بوونی شیخ رەسووڵی تەکیەیی کە خاڵۆی منداڵەکانی بوو و لە دواییشدا بوو بە زاوای موفتی، بەوەی کچێکی بوو لە ژنی پێشووی بۆی مارەکرد. ئەم شێخ رەسووڵە ژیانی خۆی لە رێگەی خزمەتی ماڵی موفتیدا بەسەر برد.

وە من تا ئەمرم داخ ئەخۆم بۆ جیابوونەوەی ئەو دۆستانە کە مردن لە یەکی جیاکردینەوە، سا بەڵکو لە پاشەڕۆژدا یەک بکەوینەوە.

داخی داخانم ئەم چاڵی عەرزە
چۆن بوو بە ماوای ئەو گەلە بەرزە!

نـــازانم چلـــۆن بـــووە سەرپۆشـــیان
بۆ سینە و سەری پـڕ عـەقڵ و هۆشـیان
کـــێ بـــێ بزانـــێ خـــاکی نیشـــتمان
چەنـدێکی تیـا بـوو زانـای بـە ئیمـان!
چـۆن ئـەبێ نـاوی ئەوانـە گـوم بـێ
مەگەر لای دڵێ وەک کووپەی خوم بـێ
ئـــەنا لای دڵـــپاک ئەوانـــە دیـــارن
ئەڵـێی ئەسـتێرەی بـەرزی سـەییارن
لـــــە ئاسمانـــــا ئەدرەوشـــــێنەوە
بـــە وێنـــەی زوهـــرە ئەشـــنێنەوە
بـە وێنـەی هـەتاو دەرئەکـەن پرتـەو
بـە دەوری دائـیم هـەر سـاتێ لـە نـەو
«نـــامی» ژیـــواری یـــادی ئەوانـــە
هـــەتاکوو مـــاوە لـــەم رووی جیهانـــە

شێخ مستەفای موفتی لە ساڵی ١٣٥٧ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە. پێنج کـوڕی لێ بەجێما: شێخ ئەحمەد، شێخ جـەمیل و شـێخ خالیـد و شـێخ نـوورەدین و شـێخ سەعید.

لـە خودامـان ئـەوێ ئـەم رشـتەیە بپـارێزێ و بـە روونـاکی زانسـتی و رەوشـت بەهرەمەندیان بکات.

### شێخ رەسووڵی تەکیەیی

ئەم زاتە لە دەوری ساڵی ١٣٠١ی کۆچیدا لە دێی تەکیە لەدایک بووە و هەر لـەوێ قورئان و کتێبە وردەکانی خوێندووە و، دوای ئەوە چووە بۆ سلێمانی و لە مەدرەسـەی شێخ باباعەلی تەکیەیی دامەزراوە و خەریکی خوێندن بووە، تا بووە بە موسـتەعیدێکی

باش، دوای ئەوە چووە بۆ هەڵەبجە و لەوێوە چووە بۆ بیارە و ماوەیێ لای مامۆستا مەلا عەبدولقادری کانی‌کەوەیی ماوەتەوە، پاش ئەوە هاتووەتەوە بۆ هەڵەبجە و لەبەر ئەوە کە خێزانی شێخ مستەفای موفتی خوشکەزای شێخ رەسووڵ بووە لە ماڵی موفتیدا ماوەتەوە.

جا موفتی کچی خۆی ـ لە ژنێ تری ـ لە شێخ رەسووڵ مارە دەکا و ئەیکا بە وەکیلی خۆی لە مزگەوتی جامیعەدا بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئیش و کاری مزگەوت. شێخ رەسووڵ بەم شێوە مایەوە تا موفتی کۆچی دوایی کرد. پاش ئەوە لە هەڵەبجەدا مزگەوتی خانمی چاک کردەوە و بە ئیمامەت و مودەڕیسی لە سەری دانیشت، تا لە ساڵی هەزار و سێسەد و هەشتاو... کۆچی دوایی کرد. دوو کوڕی لێ بەجێ‌ما: شێخ محەمەد و شێخ ئەحمەد.

### شێخ ئیمام لە سەییدەکانی تەکیە

ئەم زاتە یەکێکە لە سەییدەکانی تەکیە و نەتەوەی ئیمام هەمزەیە، لە تەمەنی گەورەییدا لە ماڵی خۆی دەرچووە و لە دەرەوە خوێندوویەتی تا خوێندنی تەواو کردووە، ئەوسا گەڕاوەتەوە بو تەکیە.[1]

---

١ ـ لێرەدا بەسەرهاتێک هەیە گێڕانەوەی لە ناسکی و سوود بەدەر نییە:
دەڵێن: ئەم شێخ ئیمامە بە منداڵی دایکی مردووە و باوەژنی هەبووە، باوەژنەکەی لەگەڵی خراپ بووە و چەرمەسەریی داوە، بۆیە شێخ ئیمام سەری خۆی هەڵگرتووە و ڕۆیشتووە!
ماوەیەکی باش لە سەر یاسای فەقێتی ئەوسا گەڕاوە و خوێندوویە، تا خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە. پاش ئیجازەوەرگرتن بۆ یەکەمجار ـ دوای ڕۆیشتنەکەی ـ گەڕاوەتەوە بو تەکیە و، ئەو ماوە دوور و درێژە نە کەس هەواڵی لەوەوە بووە و نە ئەویش هەواڵی بە کەس داوە! دەڵێن: کە هاتووەتەوە خەڵکی دێ بە سەربانەوە بە کۆمەڵ وەستاون سەیری ڕێگەی خواری ئاواییان کردووە، کە دەبینن وا مەلایەکی مێزەرسپی بەرەو ئاوایی دێت.
ئەو کۆمەڵە ئەیانەوێ بزانن ئەم مەلا کێیە، هەر کەس قسەیەک ئەکات و ... نایناسن. بەلام یەکێکیان دەڵێ: بە خوا ئەگەر شێخ ئیمام لە دنیادا بوایە ئەمەوت ئەمە شێخ ئیمامە!
ئەمە لە لایەکی دیکەوە ئەوە دەگەیەنێ کە چەندێ خەڵکی تەکیە هۆگری خوێندن بوون و خوێندن چەند باو بووە لە ناویانا، چونکە ـ بە زۆری ـ کە یەکێک لە کەس و کاری تووڕە دەبێت چی لە لایان باو بێت پەنا بۆ ئەوە ئەبات. هەیە چەک هەڵدەگرێ، هەیە دەست بە دزی دەکات... هەیشە وەک شێخ ئیمام.م.ع، ق.

### شێخ عەلی مەلا

ئەم زاتە باپیری شێخ باباعەلیی بەناوبانگە، مەلایەکی زۆر چاک و زانا بە هەموو زانیارییەکانی ئەو سەردەمە بووە، لە تەکیەدا دەرسی گوتووەتەوە و فەقێی زۆری هەبووە.

بیستوومە کاتێ قوتابی لەو ناوچەوە چووبێ بۆ لای شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی، شێخ عەبدوڵڵا سەرزەنشتی کردووە و فەرمویەتی: کە لای خۆتان زانای وەکوو شێخ عەلی مەلا هەیە بۆچی لەوێ ناخوێنی و هاتووی بۆ ئێرە؟! ئەم زاتە هاوچەرخی شێخ عەبدوڵڵا بووە، لەوە بەولاوە شتێکی روونی دەربارە نازانم.

### شێخ عەبدوڕەحمانی شێخ ئەبوبەکر

ئەم زاتەیش لە سەیدەکانی تەکیەیە و هاوچەرخی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی بووە، پاش تەواوکردنی خوێندن چووەتە شاری سلێمانی و بووە بە مودەڕیسی مزگەوتی عەبدوڕەحمان پاشا، ئەو مزگەوتە کە ئێستە بە مزگەوتی باباعەلی ناسراوە. ئەم زاتە تا کۆچی دوایی کردووە لەو شوێنەدا خەریکی دەرس‌وتنەوە و خزمەتی دین و موسوڵمانان بووە.

گەلێ باس لە خوداترسی و دنیانەویستی ئەم شێخ عەبدوڕەحمانە دەگێڕنەوە بە جۆرێک ئەوەندە خۆی لە دنیا گرتووەتەوە و دەستی لە خۆشیی دنیا هەڵگرتووە گێڕانەوەی ئەو باسانە ماتەمی دەبەخشن.

هەروەها گەلێ کەرامەت و کاری لەعادەت‌بەدەری لێ دەگێڕنەوە.

دەگێڕنەوە: پاش مردنی لەو کاتەدا خەریکی شۆردنی بوون لەسەر تەختەیەک دایان نابوو چوارپێچکەی هەبوو لەو کاتەدا پێچکەیەکیان دەشکێ و لار دەبێتەوە بەڵام شێخ عەبدوڕەحمان خۆی دەست دەبا و پێچکە شکاوەکە دەگرێ تا چاکی ئەکەن!

### شێخ باباعەلی تەکیەیی

ئەم زاتە کوڕی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ عەلی مەلایە و، لە سنووری ساڵی ١٢٩٠ی کۆچیدا لە دایک بووە و پاش خۆناسینەوە دەستی کردووە بە خوێندنی قورئان و پاش تەواوکردنی قورئان و کتێبە وردەکان دەستی کردووە بە خوێندنی

نەحو و سەرف و تیایاندا سەرکەوتووە، پاش ئەوەی نەختێ خۆی گرتووە و کزر بووە چووە بۆ قەرەداغ و لەوێوە بۆ سلێمانی و ماوەیێ لە سلێمانی لە خزمەتی شێخ محەمەدی کاژاویدا لە مزگەوتی بارچاوەش خوێندوویەتی. ئەو مزگەوتە بەر جادە کەوت و لە بری ئەو لای گردی سەیوان مزگەوتێکی دیکەیان دروست کرد.

شێخ باباعەلی لەگەڵ ئەوەدا زۆر پیاوچاک و لەخوداترس بووە زۆر قسەخۆش و نوکتەزانیش بووە. جارێک لە پشتی مامۆستا شێخ محەمەدی کاژاویەوە خەریکی نوێژکردن دەبن، شێخ محەمەد ئەڵێ: «نويت سنة الوتر» بە ژێرــ کەسرەــی واوەکە، باباعەلیش ئەڵێ: «نويت سنة الوتر» بە سەری واوەکە. شێخ محەمەد لا ئەکاتەوە و ئەڵێ: باباعەلی ئەوە بۆ وا بە سەری واو ئەیڵێیت؟ ئەویش ئەڵێ: ئەی قوربان تۆ بۆ بە ژێری واو ئەیڵێیت؟ شێخ محەمەد ئەڵێ: وەڵلا! تۆ هەر لە عەکسی مندا وا ئەڵێیت. ئەویش ئەڵێ: یا شێخ تۆیش لە عەکسی مندا وا ئەڵێیت!

بەو شێوە بە خۆشی کات بەسەر دەبەن.

جارێکی دیکە لە پشتی شێخ محەمەدەوە نوێژی کردووە، شێخ محەمەد نییەتی بۆ نایێت و ناوبەناو لائەکاتەوە و هەندێ تف ئەکا.

باباعەلیش وەکوو ئەو لائەکاتەوە و تف ئەکا. شێخ محەمەد ئەڵێ: ئەرێ باباعەلی تۆ بۆ وا ئەکەی؟ ئەویش ئەڵێ: ئەی یا شێخ تۆ بۆ وا ئەکەی؟

ئەڵێ: من تف لە شەیتان ئەکەم. ئەویش ئەڵێ: منیش تف لە شەیتان ئەکەم. شێخ محەمەد ئەڵێ: نە، تۆ هەر لە رقی من وا ئەکەی. باباعەلیش دەڵێ: دەی تۆیش لە رقی من وا ئەکەیت!

بە کورتی باباعەلی پیاوێکی زۆر قۆشمە و، نوکتەزان و قسەتەڕ و، حازردەست بووە... باسی نوکتە و قسەی ناسکی ئەو کتێبێکی گەورەی ئەوێ.

جارێک ئەچێ نامەیەک لە جەنابی کاک ئەحمەدی شێخ وەرئەگرێ بۆ لای حاجی مەلا عومەر ئەفەندیی هەولێر کە باباعەلی وەربگرێ و دەرزی پێ بڵێ. لە نامەکەیدا بۆی دەنووسێ: ئەو کەسەی کە دوژمنی تۆیە و تۆ لە دەستی وەڕسی، ئەبێ بە دۆست و زیانی بۆت نابێ. بە تەقدیری خودا لەو کاتەدا کە باباعەلی نامەکەی پێشکەش ئەکا ئەو کابرا کە ناحەزی مەلا عومەر ئەفەندی ئەبێ دێتە خزمەتی بۆ دۆستی نواندن و پەشیمانی دەربڕین لە رابوردوو. جا حاجی مەلا عومەر لەم نامە و کەرامەتە ئەوەندە

شادمان ئەبێ لەوانە ئەبێ لە خۆشیدا ئاگای لە خۆی نەمێنێ، وە زۆر بـە میهرەبـانی و خۆشی‌یەوە جێگەی ئەکاتەوە و ئەڵێ:

مەدرەسەی خۆتانە و چیتان بوێ بۆتان ئەکەم.

ئەم سەفەری شێخ باباعەلییە لەگەڵ مەلا عەبدوڵلای خەڵکی «پەسوێ»دا دەبێ، کە لە دواییدا بووە بە یەکەم زانـا لـە وڵاتـدا و، حـەجی کـردووە. جـا ئـەم حـاجی مـەلا عەبدوڵلایە بە هۆی ئەوەوە کە کـاتی خـۆی موریـدی شـێخ عومـەری بیـارە بـوو لـە سەردەمی دەرس‌وتنەوەی مندا لە بیـارە ئـەو ئاموشـۆی بیـارەی ئـەکرد و ئـەو بـۆی گێڕامەوە فەرمووی: من لەگەڵ باباعەلیدا بە یەکەوە لە شاری سـلێمانی‌یـەوە چـووین بۆ لای حاجی مەلا عومەر بۆ شاری هەولێر و دامەزراین و دەستمان کرد بە خوێنـدنی «رسالەی حسابی بەهادینی عاملی». فەرمووی: کاتێ کە ئەچووین بۆ دەرزخوێندن لە خزمەتی ئەفەندیدا، باباعەلی ئەیوت: مەلا عەبدوڵلا! من تاقەتی بەڵـێ بەڵـێی حـاجی مەلا عومەرم نییە، ئەبێ تۆ زۆر چاک گوێی لێ بگری و دەرزەکـەت رەوان بکـەی، بـو ئەوە لە پاشان بۆ منی شەرح بکەیت، ئەگەرنا باوەڕم پێ بکە بە عاسـا هـەرچی گیانـت هەیە هەمووی ئەشکێنم! منیش ئەموت: بەڵێ باشە باباگیان ئەمر ئەکەیت.

فەرمووی: پاش ماوەیێ لە هەولێرەوە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی بە مەبەسـتی بیـارە و چـووین بـۆ بیـارە. فـەرمووی: لـە رێگـەدا بیسـتمان فەقێیـەکی باڵـەکی هەیـە لـە مەدرەسەی بیارەدا هەر کەسێ بچێ بۆ ئـەوێ سـوئالێکی پـێچ و پلـووچی لـێ ئـەکا. منیش وتم: باباعەلی! ئێمە چی بکەین؟ ئەترسم ئەو فەقێیە پرسـیارێکمان لـێ بکـا و وەڵامەکەی نەزانین.

باباعەلی وتی: ئەوە بۆ من چاری ئەکەم.

فەرمووی: کاتێ گەیشتینە بیارە و، گەیشتینە مەدرەسەکە کە لەو رۆژەدا هەر لـە مزگەوتی ناو دێدا بوو و خانەقای بیارە دروست نەکرابوو...

تەماشامان کرد فەقێیەک بەرەو ئێمە هات. باباعەلی نەیهێشت ئەو قسـە بکـا وتی: مەلا! پرسیارێکی فەرائیز لەو گەرمیانەدا بە دەمی خەڵکەوەیە و کـەس نازانـێ حـەلی بکا! ئەویش وتی: دە بڵێ، دە بڵێ، باباعەلی وتی: کابرایەک مردووە ژنێک و کچێـک و «کەر!» ێکی بەجێ‌هێشتووە، ئێستە نازانن ماڵەکە چۆن لە ناو مـیراتبەرەکانـدا بـەش بکەن.

فەقێکە وتی: ئەوا ژنەکە هەشتیەک ئەبا و، کچەکە نیوە ئەبات، بەڵام نازانم ئەو کەرە قەحبەبابە چی بەرئەکەوێ؟! کاتێ فەقێ ئەم قسەیەی کرد فەقێکان هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین و هەرا لەو ناوەدا و، ئیتر لە شەڕی فەقێ رزگار بووین.

فەرمووی: ماوەیەک لە بیارەدا ماینەوە. جا باباعەلی هاتەوە بۆ شاری سلێمانی و لە یەک بڕاین.

باباعەلی پاش ئیجازە وەرگرتن لەسەر ئەو مزگەوتە کە ئێستە بە ناوی خۆیەوەیە بە مودەڕیس و ئیمام دائەمەزرێ و دەست ئەکات بە خزمەتی زانیاری و ئایین و لە ماوەی ژیانیا خزمەتێکی زۆری جیهانی ئیسلامی کرد.

باباعەلی لە ژیانیا گەلێ قوتابیی پێگەیاند و، بە هۆی ئەوەوە بوون بە مەلای چاک و قوتابیی‌یەکانی ئەوەندە زۆرن ناژمێررێن. بۆ نموونە لەوانەیە: شێخ باباڕەسووڵی بێدەنی سۆڵەیی و شێخ عەبدولکەریمی ئەحمەدبرِەندەیی و شێخ رەسووڵی تەکیەیی و شێخ نووری کوڕی خۆی و... ئەم زاتانە ئەوەندە باوەڕی پیاوچاکی‌یان بە باباعەلی هەبوو بە یەکێ لە ئەولیاکانیان ئەژمارد.

وەکوو پێشتر باسم کرد، باباعەلی زۆر نوکتەزان و قسەخۆش بووە و ئەگەر بتەوێ قسە و کردەوەکانی کۆ بکەیتەوە دەفتەرێکی گەورەی ئەوێ و با لێرەدا لە مەبەست لانەدەین و بچینەوە سەر باسەکەمان.[١]

باباعەلی تا لە جیهان دەرچوو هەر لەسەر مزگەوتەکەی خۆی بوو تا لە ساڵی ١٣٥٩دا لە جیهان دەرچوو. شێخ نووری لێ بەجێ‌ما.

### شێخ نووری شێخ باباعەلی

ئەم زاتە تاقانەی باوک و دایکی بووە و زۆریان خۆش ویستووە، لە دەوروبەری ١٣٠٥ی کۆچیدا لە دایک بووە و هەر لە خوێندنگای خۆیاندا خوێندوویەتی تا ئیجازەی وەرگرتووە و زانایەکی بەرز و بەڕێز بووە و لە هەموو زانیاری‌یەکاندا دەستی باڵای هەبووە. خوێندنگاکەی باوکی چالاکانە و مەردانە بەڕێوەبرد بە شێوەیەک کە

---

١- مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە زۆر شوێنی «رشتەی مرواری»دا باسی قسە و نوکتە خۆشەکانی باباعەلی ئەکات. ن.ب

شیاوی خانەدانەکان بێ. بەڵام بـە داخـەوە ئـەو کەسـانە کـە وا دەروونیـان فراوانـە و تەبیعەتیان بەرز و باڵایە بە زۆری گیرۆدەی دەرد و بەڵان. ئەو زاتە ئەگەر لە وڵاتێکـی دیکە، یا لە چەرخێکی دیکەدا بوایە پلە و پایەیەکی دیکەی دەبوو.

بەهەرحاڵ ئەم زاتە لە دوازدەی مارتی ساڵی ١٩٥٦ی زایینیدا لە جیهان دەرچـووە و لە سلێمانیدا بە خاک سپێرراوە.

ئەم کەسە کە نووسـیمان لـە پیـاوانی سـەییدی تەکیەیـە کـە ئـەهلی زانیـاریی و ڕێزبوون لە پاش مێژووی هەزاری کۆچیدا بوون. بێ‌گومان لەو مێژووەوە تا سـەردەمی ئیمام هەمزە هیچ چەرخ و سەدەیەک لە چەن کەسی زانا و بەڕێز و هەڵکەوتوو خاڵـی نەبووە، چونکی هەتا بەرەوژوور ببینەوە بەرەو زەمانی برەوی زانیـاری و ڕێـز و خـوو و ڕەوشتی جوان ئەڕۆین. بەڵام باسی ئەو زانایانە لێکۆڵـینەوە و پشـکنینی سـەرچاوەی زۆری ئەوێ و گەلێکیان هەر باس و شوێنەواریشیان کوێر بووەتەوە. بەڵام کە بمانەوێ بۆ پیاوچاک و ئەهلی قەناعەت و خانەدان بگەڕێین بە بـێ باسـی زانیـاری ئـەوە هـەر زۆرزۆر بوون.

### شێخ عەبدوڵڵای مەلا

ڕشتەی نەسەبی ئەم زاتە بەم شێوەیە: شێخ عەبدوڵڵای، کـوڕی شـێخ ئەحمـەدی، کوڕی شێخ محەمەدی، کوڕی شێخ سلـێمانی، کـوڕی شـێخ حەسـەن، کـوڕی شـێخ نوورەدین، کوڕی شێخ مستەفا، کوڕی شێخ سـەلاحەدین، کـوڕی شـێخ عـەوەز... تـا دوایی شەجەرەی تەکیە...

لە دەوروبەری ساڵی ١٣٠٣ی کۆچیدا لە دێـی تەکیـە لـە دایـک بـووە. پـاش فـام کردنەوە هەر لە تەکیەدا و لە لای باوکی خۆی ـ کە مەلای دێی تەکیە بووە ـ دەستی کردووە بە خوێندن و قورئان و کتێبە سەرەتایی‌یەکانی خوێندووە. دوای ئەوە دێکـانی «ئەحمەدبرندە و، زەردەلیکاو و، عەبابەیلێ و سلێمانی و بیارە و...» بۆ خوێندن گـەڕاوە و، لای مامۆستا بەرزەکانی ئەو سەردەمە وەکوو: مامۆسـتا شـێخ باباعـەلی و مامۆسـتا مەلا قادری بیارە و چەند مەلای دیکە خوێندوویەتی، تا لە دواییدا لای مامۆسـتا مـەلا قادری بیارە لە ساڵی ١٣٣٠ی کۆچیدا ئیجازەی وەرگرتووە و، دوایـی گەڕاوەتـەوە بـۆ تەکیە و، لەوێ دەستی کردووە بە دەرس‌وتنـەوە و خزمـەتی موسوڵـمانان، ماوەیـەک

دوای ئەوە چووە بۆ سێوسێنان و ماوەیەکیش لەوێ مەلا بووە و فەقێی زۆری بووە و دوای چەند ساڵێک گەڕاوەتەوە بۆ تەکیە و بە مەلایەتی و مودەڕیسی دانیشتووە.

لە ماوەی دەرزوتنەوەیدا دەرزی بە گەلێ کەس وتووە و، زۆر کەسی پێگەیاندووە، لە هەمان کاتدا خەریکی نووسین و حاشیەکردن و کتێبدانان بووە و ئەم بەرهەمانەی بووە:

١ـ شەرحی تەسریفی مەلا عەلی.

٢ـ مەنزوومەی «ابن الشحنە»ی لە بەلاغەدا بە ناوی «زبدة المعانی فی البیان و البدیع والمعانی» وە شەرح کردووە.

٣ـ هەروەها گەلێ حاشیەی بە سەر «جمع الجوامع»ەوە هەیە. ئەم پیاوە لەگەڵ ئەم خزمەتە بەنرخەدا لەولایشەوە پیاوێکی لەخوداترس و دەستلەدنیاشۆردوو بووە و زۆر شتی وای لێ دەگێڕنەوە کە بەڵگەی ئەوپەڕی لە خوداترسین.

گەلێ جار لە خەودا بە خزمەت پێغەمەر ـ د ـ گەیشتووە و، چارەسەری تەنگ و چەڵەمەی بۆ کردووە. جارێک لە خەودا کتێبی گەلەنبەوی ئادابی لە خزمەتیدا خوێندووە. خۆی لەم بارەوە لە کۆتایی گەلەنبەوی‌یەکەیەوە نووسیویەتی:

«ان قد قرأت هذا الکتاب المسمی بگلنبوی فی الآداب فی المنام عند سیدنا محمد ـ ص ـ بدرس واحد بأن اخذ رؤوس أوراق الکتاب باصبعیه الکریمتین، و أرانی اوله، و قلب الاوراق، و أرانی آخره، و کأنی قرأت علیه ـ ص ـ تمام ما فیه، و لا یعلم کیفیة ذلک الا الله، فلله الحمد علی ذلک، و صلی الله علی سیدنا محمد و علی آله و صحبه و سلم».

وەک وتمان گەلێ کار و بەسەرهاتی وای لێ دەگێڕنەوە کە بەڵگەی لەخوداترسی و دنیانەویستین، بۆ نموونە:

ـ دەڵێن: باخێکی گەورەی مێوی داناوە، هەر چەوتەکێکی ناشتووە پێش ئەوە بیخاتە چاڵەکە سوورەتێ یاسینی بە سەردا خوێندووە.

ـ هەروەها هەندێک زەوی بەراوی هەبووە لە دێی بەردێ کە نیوسەعاتێک ڕێگە لە تەکیەوە دوورە، کاتێک لە تەکیەوە چووە بۆ لای زەوی و زارەکەی جووتێک کەوشی بووە ـ کە لە پارەی وەقفی مزگەوت بۆیان کڕیوە ـ کەوشەکانی دادەکەند. لێیان پرسیوە: مامۆستا بۆچی کەوشەکان ناکەیتە پێت؟ ئەویش فەرموویەتی: برا ئەم

کەوشەیان لە پارەی مزگەوت بۆ کڕیوم و بۆ ئەوەیان بۆ کڕیوم بۆ ڕێگەی نوێژ و مزگەوت لەپێی بکەم نەک بۆ ئیش و کار و تووتن‌کاریی خۆم!

ئەم پیاوە لە سەر ئەم ڕێبازە پیرۆزە ژیاوە تا لە ڕۆژی پێنجی «ربیع الاول»ی ساڵی ١٣٦٧ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و، لە نزیکی ئارامگای ئیمام هەمزەوە بە خاک سپێرراوە.

**شێخ ئیسماعیلی تەکیەیی**

یەکێک لەوانەی کە شوێنەواریان نەماوە و بە هەندێک بەڵگەدا وا دیارە زانا و بلیمەتی چەرخی خۆی بووە ئیسماعیل ناوێکە.

ئەم ئیسماعیلە کوڕی شێخ مەحموودی، کوڕی شێخ خزری، کوڕی شێخ وەیسە، لە خوێندنگای شێخ عەبدوسەمەددا لە دێی قەڵاچوالان لای مەولانا مەلا مستەفای کوڕەدێمی خوێندوویە. کتێبێکی حیسام‌کاتیی دەسنووسی لێ بەجێ‌ماوە کە لەو شوێنەدا نووسیویەتی‌یەوە.

دەڵێ لە ١١٤١دا لەو شوێنەدا خوێندوویە. چەند تاکە شیعرێک لەسەر ئەو کتێبە نووسراون، وەک:

ئەوەند نەمەردام وەرتەر جە مەردەن
حەلقەی زوڵف تۆم شیا نە گەردەن

دیارە ئەم ئیسماعیلە هاوچەرخی شێخ جامی بووە و لە یەک کاتدا هەردووکیان خەریکی خوێندن بوون، دیارە زەلامێک ئەو هەموو مزگەوت و خوێندنگا بەجێ بێڵێت و خۆی بگەیەنێتە قەڵاچوالانی پایتەختی بابانی‌یەکان شتێکی کەم نەبووە و ئەگەر لە شێخ جامی خوێندەوارتر نەبووبێ لەو کەمتر نەبووە، بەڵام نازانین دوای ئەم شوێنە چی کردووە و چی بەسەر هاتووە؟

ئێمە لە باسی ئەم بنەماڵەی سەییدانی تەکیەدا بەم ئەندازە دەس‌بەردار دەبین و با شارەزایان و زانایانی ئێستە و داهاتوومان هەوڵ بدەن و دەسەبارەی خۆیان بخەنە سەر ئەم باسە.

جا لەبەر ئەوە کە زانایانی «حەیدەری» لە رشتەی باوک و باپیردا دێنەوە سەر ئیمام حەمزە، چونکی ئەوانە ئەڕۆنەوە سەر ئەحمەدی ئەعرابیی کوڕی محەمەدی کوڕی ئیمام قاسمی کوڕی ئیمام هەمزەی کوڕی ئیمام مووسای کازم... ئێمە لەگەڵ باسی سەییدەکانی تەکیەدا باسی ئەوانیش ئەکەین، بەڵام ئەوانەیان کە لە کوردستاندا خزمەتی زانیاری و ئایینیان کردووە.

## بنەماڵەی حەیدەری‌یەکان

بە گوێرەی مێژوو کاتی خۆی باپیرەی ئـەم کۆمەڵـە لـە بەغـدا و بەسـرەدا ژیـان و بەشێکیان لە «خمس‌الخمس» وەرگرتـووە. وە پـاش ماوەیـێ لـە بـەر هەنـدێ هـۆی ئابووری یا شتێکی دیکە کۆچیان کردووە بۆ وڵاتی «ماوراءالنهر» و لـەوێ ماونەتـەوە تـا دەوری ساڵی نۆسەد و شتێ. لەو کاتـەدا بـە گـوێرەی پێویسـتی رۆژگـار و بـە هـۆی هەندێ باری سیاسی‌یـەوە کـە لـە نێـوان ئیسـماعیلی سـەفەوی و نەوەکانیـدا بـووە، باپیرەی ئەم حەیدەری‌یانە لە دەست ئەوانە هەڵهاتوون و کۆچیـان کـردووە بـۆ وڵاتی عوسمانی و لە هەولێردا دانیشتوون؛ وەکوو ـ پشت بەخودا ـ باسیان ئەکەین.

جا یەکەم کەسێ لەو بنەماڵە کە لە وڵاتی «ماوراءالنهر»ەوە هـاتووە بـۆ عێـراق و لـە هەولێر دانیشتووە شێخ محەمەدی کوڕی حەیدەر پیرەدین بووە.

### محەمەدی کوڕی حەیدەر پیرەدین

ئەم زاتە پاش ئەوە کە دامەزراوە ژنێکی لە گوندی «باشووری» هێنـاوە، کـە دەنـگ وایە لە نەوەی عەبدوڵلای کـوڕی عومـەرن. واتـە عەبدوڵـلای کـوڕی عومـەر لەگـەڵ خێزان و منداڵەکانیدا هاتووە بۆ ئەو شوێنە و هەندێ لە نەتەوەی لەوێ بەجێ‌ماوە، یـا خود لەو شوێنەدا ژنی هیناوە و نەتەوەی لێ کەوتووەتەوە.

جا با پێش هەموو شتێ یەکەیەکە رشتەی نەسەبی ئەم حەیدەری‌یانە لە ئیـبراهیم فەسیحی حەیدەری‌یەوە بنووسـین کـە لـە رشـتەی حەیـدەری‌یەکانـە و، لـە ساڵـی ١٢٨٦ەوە باوک و باپیرەکانی خۆی نووسیوە.

الشیخ ابراهیم فصیح، ابن الشیخ صبغةالله، ابن الشیخ اسعد، ابـن الشـیخ عبـدالله، ابـن الشیخ صبغةالله العلامة الکبیر مرجع اجازات العلماء، ابن الشیخ ابراهیم، ابن الشیخ حیـدر، ابن الشیخ احمد، ابن الشیخ حیدر، ابن الشیخ محمد، ابـن الشـیخ حیـدر پیرالـدین، ابـن

الشيخ ابراهيم برهان‌الدين، ابن الشيخ علی علاءالدين، ابن الشيخ صدرالدين، ابـن الشـيخ صفی‌الدين، ابن الشيخ امين‌الدين، ابن الشيخ صالح، ابن الشيخ قطـب‌الـدين، ابـن الشـيخ صلاح‌الدين، ابن الشيخ محمد الحافظ، ابن الشيخ عوض، ابن فيروز شاه، ابـن شـرف شـاه، ابن الشيخ محمد، ابن الشيخ حسن، ابن الشيخ محمد، ابن الشيخ ابراهيم الملقب بالادهم، ابن الشيخ جعفر، ابن الشيخ محمد، ابـن الشـيخ اسـماعيل، ابـن الشـيخ احمـد الاعرابـی المحدث الحافظ، ابن الشيخ محمد المحدث الحافظ، ابن الشيخ الامام ابی محمد القاسـم، ابن الامام ابی‌القاسم حمزه، ابن الامام موسی الکاظم، ابن الامام جعفر الصادق، ابـن الامـام محمد الباقر، ابن الامام علی زين‌العابدين، ابن الامام الحسين السـبط، ابـن الام علـی ابـن ابی‌طالب و فاطمة الزهراء، بنت حضرة الرسول المختار سيدنا محمد ـ ص ـ

ئیبراهیم فەسیح ئەڵێ: هەموو یەکەیەکەی ئەم رشتەیە زانیاریی لە باوکی خۆیـەوە وەرگرتووە و زانیاریی لای ئەو تەواو کـردووە ئەحمـەدی کـوڕی حەیـدەری خـاوەنی کتێبی «محاکمات» نەبێ، ئەو هەندێ زانیاری عەقڵی و نەقلی لە باوکی‌یەوە وەرگرتووە و هەندێکیشی لە زانایانی دیکە وەرگرتـووە. حەدیسـی لـە عەبدولمـەلیکی عیسـامی وەرگرتووە، ئەویش لە «ابن‌الحجری مکی» وەکوو لە ئیجازەنامەکەیانا نووسـراوە. وە لـە شێخ سەفی‌یەدین ئەویش وەکوو زانیاری لە باوکی وەرگرتـووە لـە قـوتبی سـەردەم و زانـای گـەورە شـێخ ئەحمـەدی بـرای «حجةالاسـلام» ئیمـام محەمـەدی غەزالیشـی وەرگرتووە.

وە ئیسماعیلی سەفەوی کە لە مێژووی ٩٦٠ی کۆچیدا شۆڕشی لە ئێرانـا بـەرپاکرد و، فەرمانداریی وەرگرت و بـە نـاوی دەوڵـەتی «سـەفەوی»یـەوە ناوبـانگی دەرکـرد... لەگەڵ ئەم رشتەی حەیدەری‌یانەدا لـە عـەلی عەلائەدینـدا ئـەبن بـە یـەک، چـونکی ئیسماعیلی کوڕی حەیـدەری، کـوڕی جونەیـدی، کـوڕی ئیـبراهیم، کـوڕی سوڵـتان خواجە، کوڕی شێخ عەلی عەلادین، کوڕی سەدرەدین، کوڕی سەفی‌یەدینە.

وە لە رشتەی حەیدەری‌یەکانیشـا محەمـەدی کـوڕی حەیـدەر پیرەدیـن، کـوڕی ئیبراهیم بورهانەدین، کوڕی شێخ عەلی عەلادین، کوڕی سەدرەدین، کـوڕی سـەفی-یەدین. وەک دەبینی بەم شێوە سەفەوی‌یەکان لەگەڵ حەیـدەری‌یەکانـدا ئـاوا یـەک دەگرنەوە.

جا محەمەدی کوڕی حەیدەر پیرەدین لەو ژنە باشووری‌یە کوڕێکی بوو ناوی نا حەیدەر.

### حەیدەری کوڕی محەمەد کوڕی حەیدەر پیرەدین

ئەم زاتە کە خۆی ناسیوە لە خزمەتی باوکیدا دەستی کردووە بە خوێندن و لە پاش ئەوە کە لە خوێندنگای خۆیانا پێگەییشت چوو بۆ خزمەتی زەینەدینی «بەڵات»[1]ی کە لە بەڵاتا بووە لە نزیکی ناوچەی پشدەردا، ماوەیێ لەوێ خوێندوویە تا ئیجازەی لێ وەرگرت. پاش ئەوە گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، لەوێدا دەستی کرد بە دەرس‌وتنەوە و خزمەتی دین و لەبەر زۆریی زانیاری‌یەکەی قوتابی زۆر لە هەموو لایەکەوە هاتن بۆ خزمەتی و سوودیان لێ وەرگرت.

وە لەسەر نووسینی ئیبراهیم فەسیح حەیدەری ئەم حەیدەری کوڕی محەمەدە پیاوێکی دەروون‌پاک و دڵڕووناک و بەئەدەب بووە و زۆر خاوەن بارە و کەرامەت بووە و زۆر لەخوداترس بووە و لە شەرعدا دەستێکی باڵای بووە و بە «محرر»ی مەزهەبی ئیمامی شافیعی دانراوە.

هاوچەرخی شێخ ئەحمەدی «ابن‌حجر» بووە و حاشیەیەکی لەسەر توحفەی ئیبنوحەجەر هەیە و، لە کۆتایی تەمەنیدا هاتووەتە شاری «هەولێر» و لە ساڵی ١٠٧٠ی کۆچیدا لەوێ کۆچی دوایی کردووە و، گۆڕەکەی لە نزیکی گۆڕی میری موسوڵمانێ هێژا «موزەفەر کوکە بوری»ی ـ داهێنەری مەولوودکردن لە کوردستاندا ـ یە.

### ئەحمەدی کوڕی حەیدەری یەکەم

ئەم ئەحمەدە لە خوێندنگای خۆیاندا خوێندوویەتی و ئیجازەی لە بابی وەرگرتووە. زانایەکی بەرز و خاوەن پایە بووە. تەدریسێکی باشی کردووە، گەلێ کتێبی داناوە، وەکوو:

١ــ حاشیەی لەسەر شەرحی عەقائیدی مەلا جەلالی دەووانی، کە ناوی «محاکمات»ە، چونکە ئەحمەد موحاکەمەی هەموو خاوەن حاشیەکانی سەر شەرحی

---

[1] ـ «بلات» کۆمەڵە دێهاتێکە لە ڕۆژاوای پشدەرایە.

عەقائیدی دەووانی کردووە، واتە هەندێکیانی داوەتە دواوە و، هەندێکیشیانی پەسەند کردووە.

ئەم موحاکەماتە کتێبێکی ئەوەندە بەبایەخ بووە کاتی خۆی لە قوتابخانەکانی عێراقدا خوێنراوە و، زانایان کە لە هیندەوە هاتوون وتوویانە: موحاکەمات لە هیندستانیشدا باوە و قوتابیان دەیخوێنن.

وە لە دانراوەکانی ئەم ئەحمەدەیە کتێبی:

٢ـ «رد الروافض».

٣ـ نامیلکەی «اثبات غسل الرجلین و ابطال المسح».

٤ـ نامیلکەی تەفسیری «الله نور السماوات و الارض».

٥ـ حاشیەیەکی گەورەی لە سەر «شفا»ی ئیبنوسینا هەیە.

ئیبراهیم فەسیح حەیدەری ئەڵێ: باپیرە گەورەمان ئەحمەدی کوڕی حەیدەر لە سەفەری حەجدا لە ناو کەشتیدا لەسەر دەریا لەگەڵ عەبدولحەکیمی هیندیدا بەیەک دەگەن و لەو ڕێگەدا ناسراویی و دۆستایەتی لە نێوان ئەواندا پەیدا بووە. پاش ئەوە باوکم هاتووەتەوە بۆ وڵاتی کوردستان و نوسخەیەکی لە موحاکەماتەکەی خۆی بە دیاری ناردووە بۆ عەبدولحەکیم، ئەویش نوسخەی «مطول»ی بە خەتی دانەر مەلاسەعدی تەفتازانی و بە حاشیەی عەبدولحەکیم خۆیەوە بۆ باپیرم ناردوە. ئەو «مطول»ە لە لای هەندێ لە ئامۆزاکانمە و، ئەو حاشیەی عەبدولحەکیمە لەسەر «مطول» یەکەم نوسخەیە کە گەییشتووەتە عێراق.

بە کورتی ئەم ئەحمەدی کوڕی حەیدەرە یەکێ بووە لە تاقانە و بێوێنەکانی سەردەمی خۆی و جیهان سوودی لە دانراوە بە نرخەکانی و دەرس‌وتنەوە وەستایانەکەی وەرگرتووە. ئەم زاتە بەم شێوە تەمەنی بەسەربردووە تا کۆچی دوایی کردووە.

### حەیدەری دوەمی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری یەکەم

لە سەر نووسینی ئیبراهیم فەسیح حەیدەری، ئەحمەدی کوڕی حەیدەر ٦ کوڕی لێ بەجێماوە: حەیدەر و حسەین و خالید و عەبباس و عومەر و محەمەد.

جا حەیدەر، کە بە حەیدەری دووەم ناسراوە، لە خوێندنگای خۆیاندا خوێندوویەتی و ئیجازەی وەرگرتووە و بووە بە زانایەکی بەرزی بەڕێز و تەدریسێکی چاکی کردووە و گەلێ کتێبی داناوە:

یەکەم: حاشیەی مودەووەنەی لە سەر شەرحی موختەسەری مونتەها لە ئوسوولی فیقهـدا.

دووەم: حاشیەی لە سەر شەرحی تەجرید لە عیلمی کەلامدا.

سێهەم: حاشیەی لە شەر شەرحی «حکمة العین» لە حیکمەتدا.

چوارەم: حاشیەی لە سەر عەقائیدی «عضدیة»ی مەلا جەلالی دەووانی.

پێنجەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی خەیالی لە سەر شەرحی عەقائیدی نەسەفیی مەلا سەعدی تەفتازانی.

شەشەم: حاشیەی لە سەر «اشکال التأسیس» لە عیلمی هەندەسەدا.

حەوتەم: حاشیەی لە سەر شەرحی عیسامەدین لە سەر ریسالەی «عضدیة».

هەشتەم: حاشیەی لە سەر ریسالەی «اثبات الواجب» و لە سەر حاشیەکانیشی.

بێجگە لەمانە نووسراوی تریشی زۆر هەیە.

ئیبراهیم فەسیح ئەڵێ: لە راستیدا ئەو کتێبانە بە بێ ئەم حاشییانە بە تەواوی نازانرێن و ئەم حاشییانە لە ناو زانا و قوتابی‌یانی عێراقدا باون.

هەروەها ئیبراهیم فەسیح لە کتێبی «عنوان المجد» ل ١٢٨دا دەڵێ:

وللعلامةالفهامة، الولیالشریف خالدالحیدری، والعلامةالشریف عمرالحیدری، والعلامة الشریف محمدالحیدری، والعلامه عباسالحیدری، والعلامة الشریف حسین الحیدری، اخوة جدنا حیدر بن احمد صاحب المحاکمات... حواش دقیقة علی کتب علم المنقول. ولحسین المذکور ایضا حواش دقیقة علی حاشیة میر ابیالفتح فی آدابالبحث.

جا حەیدەری دووەم بەم کردەوە جوانە تەمەنی خۆی بەسەر بردووە تا کۆچی دوایی کردووە. وە چەن کوڕی لێ بەجێماوە: ئیبراهیم و ئەحمەد و عەبدوڵلا. ئێستە باسی ئیبراهیم ئەکەین.

**ئیبراهیمی کوڕی حەیدەری کوڕی ئەحمەد**

کوڕی حەیدەری کوڕی مەحەمەد ـ یەکەم کەسیان کە هاتووەتەوە عێراق.

ئیبراهیم زانایەکی بەرز و بەڕێز بووە، لە خوێندنگای خۆیاندا خوێندوویە و، ئیجازەی وەرگرتووە و خەریکی دەرس‌وتنەوە و خزمەتی دین و موسوڵمانان بووە.
هەر وەکوو دەرسی گوتووەتەوە خەریکی کتێب دانانیش بووە و چەن دانراوی هەیە:

یەکەم: حاشیەی لە سەر توحفەی ئیبنوحەجەر لە شەرعدا.

دووەم: شەرحی «زوراء» دانراوی جەلالی دەووانی.

سێهەم: «الالهامات الربانية فی كل فن» ئەم کتێبە گەلێ نایاب و بەسوودە بۆ ئەو کەسەی بیەوێ سوودی لێ وەربگرێ.

چوارەم: تەفسیری قورئانی پیرۆز بە تەفسیرێکی وەها داگری «ئەحکامی زاهیرە و ئەسراری باتینە»یە. ئەم تەفسیرە دوو بەرگە، هێشتا چاپ نەکراوە.

پێنجەم: شەرحی «تشريح الافلاک» لە عیلمی هەیئەتا.

شەشەم: حاشیەیەکی جوان لەسەر حاشیەی «قول احمد» لە سەر فەنناری لە زانیاری مەنتیقدا.

حەوتەم: حاشیەیەکی وردە لە سەر حاشیەی «ئولغ بیگ» لە سەر شەرحی مەسعوودی لە «آداب البحث» دا.

هەشتەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی «میرزاجان» لە سەر حاشیەی سەیید شەریف لە سەر شەرحی مەتالیع لە مەنتیقدا.

نۆهەم: حاشیەی لە سەر «جمع الجوامع» لە ئوسوولی فیقهدا.

دەهەم: حاشیەی لە سەر شەرحی «عصام‌الدين» لە سەر ریسالەی بەیان.

یازدەهەم: حاشیەی لە سەر «الكواكب الدرية فی القواعد الجفرية»... وە کتێبی دیکەیش.

ئیبراهیم فەسیح ئەڵێ: لە زانای بەرز مەلا ئیسماعیلی «گەلاڵەیی»م بیستووە کە: ئیبراهیم حاشیەی لە سەر عەبدولحەکیمی شەرح شەمسی هەیە.

بە کورتی ئەم زانا بەرزەیش تاقانەی چەرخی خۆی و بێ‌وێنەی ئەو رۆژگارە بووە و تەمەنی خۆی لە رێگەی خزمەتی زانیاری و ئایینی ئیسلامدا بەخت کردووە.

ئەم ئیبراهیمە پێنج کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: سیبغەتوڵلا و، عاسیم و فەتحوڵلا و فەزلوڵلا و ئیسماعیل. بەڵام لە پێش ئەم زاتانەدا باسی براکانی ئیبراهیم ئەکەین کە ئەحمەد و عەبدوڵلان.

## ئەحمەدی کوڕی حەیدەری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری کوڕی مەحەمەد

ئەم ئەحمەدە پیاوێکی زانای تەوانا و خاوەن بەش و بارە بووە. دوای ئەوەی خوێندنی تەواو کردووە خەریکی دەرس‌وتنەوە و سوودگەیاندن بە قوتابی‌یان بووە. وە گەلێ حاشیەی بە نرخی لە سەر کتێبە زانیاری‌یە عەقلی و نەقلی‌یەکان وەکوو حاشیەی مودەووەنەی لە سەر «عصام الدینی استعارە» هەیە.

ئەم زاتە سێ کوڕی زانا و بەڕێزی بووە: عەبدوڵلا و، عەبدولعەزیز و خزر. هەر سێکیان حاشیەیان لە سەر کتێبی زانیاری‌یە عەقلی‌یەکان هەیە.

بە تایبەتی عەبدولعەزیز زۆر زیرەک بووە و بە «المعی» ناوبانگی دەرکردووە و حاشیەیەکی وردی لە سەر «قول احمد»ی فەنناری هەیە ـ وەکوو باسمان کرد ـ وە شێخ خزری برای حاشیەی لە سەر توحفەی ئیبنوحەجەر هەیە.

وە ئەم شێخ خزرە کوڕێکی بووە ناوی سەیید مەحەمەد «اخرس» بووە و پیاوێکی زانا بووە، وە حاشیەیەکی لە سەر کتێبی «خلاصة الحساب»ی بەهادینی عاملی هەیە. وە ئەم محەممەدە کوڕێکی بووە ناوی خزر بووە ـ لە سەر ناوی باپیری ـ و زانایەکی زۆر بەرز بووە و کتێبێکی گەورەی لە تەفسیری «الله نور السماوات والارض»دا داناوە و کتێبێکی زۆر بەنرخ و نایابە.

## عەبدوڵلای کوڕی حەیدەر

ئەم زاتە زانایەکی بەرز و بەڕێز و خاوەن بیر بووە و مامۆستایەکی خاوەن بارە بووە و گەلێ کتێبی نایاب و بەسوودی داناوە:

یەکەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی لاریی لە سەر هیدایە و شەرحی هیدایە لە عیلمی حیکمەتدا. ئەم حاشیە زۆر بەسوودە و خوێندنی پێویستە.

دوەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی «قول احمد» لە سەر فەنناری.

سێهەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی «میر ابوالفتح» لە عیلمی «آداب البحث»دا.

چوارەم: حاشیەی لە سەر شەرحی «عصام‌الدین» لە سەر ریسالەی «سمرقندی» کە بە « عصام‌الدینی استعارە» ناسراوە.

پێنجەم: حاشیەی لە سەر ریسالەی «وضع».

شەشەم: حاشیەی لە سەر شەرحی ریسالەی «آداب البحث»ی « عصام‌الدین».

حەوتەم: حاشیەی لە سەر کیتابی فەرائیز لە توحفەی ئیبنوحەجەردا.

هەشتەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی عەبدولغەفووری لاری لە سەر شەرحی مەولانای جامی بۆ کافیەی ئیبنولحاجیب.

نۆهەم: شەرحی ریسالەی «زوراء»ی جەلالی دەووانی.

بێجگە لە وردە حاشیە و تەعلیقات لە سەر گەلێ کتێب. ئەم زاتە تەمەنی خۆی لە رێگەی خزمەتی زانیاری و ئایینەدا بەسەر بردووە، تا کۆچی دوایی کردووە و کورێکی لێ بەجێماوە ناوی ساڵح بووە کە شوێنەواری کرداری چاک و رەفتاری جوانی زۆری لێ بەجێماوە.

## سیبغەتوڵڵای حەیدەریی

ئەم زاتە تاقانەی خانەدان و هەڵکەوتووی چەرخی خۆی بووە.

زانایانی ئیسلام دانیان بە زانیاریی و رێز و خزمەتیدا بۆ دین و زانیاری ناوە. وە زۆر کۆششی کردووە لە دەرس‌وتنەوە و قوتابی پێگەیاندندا. وە گەلێ کتێبی داناوە، بەڵام کتێبەکانی ورد و گرانن و بیری هەموو کەسیان پێ ناگا، وەکوو «الکتاب»ی «سیبویە» لە عیلمی نەحودا.

وە هۆی گرانیی عیبارەتی کتێب گەلێ شتە:

یەکەم: حاڵ و تەبیعەتی ئینسان، گەلێ کەس وتاری رەوان و گەوارایە و بە ئاسانی خەڵک لێی تێدەگا، وە هەندێ کەس وتاریان گران و وردە و بیری هەموو کەسێ پەیی پێ نابات.

دووەم: بەرزیی پایەی زانیاری خاوەن وتار و عیبارەتەکەیە، ئینسان کە پایەی زانیاری بەرز بوو وەکوو ئینسانێکی خاوەن‌دەستەڵات وایە لە سەر یاسا و کێش و پێوانەی خۆی قسە ئەکات بەڵام هەموو کەس لە قسەکانی ناگات.

سێهەم: گێڕاندنەوەی خەڵکە لە وتاری سووک و بێبایەخ، وە یا لە قسەی سادەی بێوردەکاری بۆ لای قسەی بەکێش و بایەخدار.

بەهەرحاڵ هەرچەن کە عیبارەتی ئاسان بۆ تێگەیشتنی خەڵک لەبارە بەڵام ئەم جۆرە عیبارەتە گرانانەیش لەناو کتێبەکانا زۆرن، وەکوو: توحفەی ئیبنوحەجەر و مەنهەجی قازی زەکەریای ئەنساری و زانایانی دیکە.

**دانراوەکانی سیبغەتوڵڵا**

یەکەم: حاشیەیەکی گەورەیە لە سەر تەفسیری بەیزاوی.

دووەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی «عصام الدین» لە سەر جامی.

سێهەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی موحاکەمات، کە دانراوی باپیرەتی لە سەر عەقائیدی دەووانی.

هەروا گەلێ حاشیەی هەیە لە سەر کتێبە عیلمی‌یە مەعقوولەکان و گەلێ «نظریات»ی بەرزی هەیە، وەکوو ئیبنوسینا لە حیکمەتدا.

ئەم زاتە کاتی خۆی لە پارێزگای هەولێردا پێگەیی، پاش تەواوکردنی خوێندن و ماوەیێ دەرس‌وتنەوە رۆییشت بۆ بەغدا و، زۆری پێ نەچوو گەڕایەوە بۆ «ماوەران» و دوای ماوەیێ بۆ جاری دووەم چووەوە بۆ بەغدا و، ئیتر لەوێ دامەزرا و بوو بە یەکێ لە زانا بەرزە ناسراوەکانی ئیسلام لە دەرس‌وتنەوە و فەتوادان و سوودگەیاندن بە موسوڵمانان و ئیجازەداندا بە زانایان پاش فێرکردن و پێگەیاندنیان، بە جۆرێ ئەگەر یەکێ بە وردی تەماشا بکا و زنجیرەی ئیجازەکان بخوێنێتەوە ئەبینێ کەم ئیجازە هەیە لە سەردەمی ئەودا و پاش ئەو درابێ لە عێراقدا نەچێتەوە سەر سیبغەتوڵلای حەیدەری. ئەم زاتە لە ژیانی خۆیدا وەکوو گوڵی هەمیشە بەهار و داری بەردار وابوو... تا لە بەغدادا لەساڵی هەزار و سەد و هەشتاو... کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.

ئەم زاتە پێنج کوڕی بەجێ هێشتووە: عەبدوڵلا و،عوبەیدیللا و غیاسەدین و حەیدەر و مەحەمەدئەمین.

جا ئێمە لە پێش باسی ئەم کوڕانەدا باسی براکانی سیبغەتوڵڵا خۆی ئەکەین.

یەکەم: سەیید عاسیمی برای سیبغەتوڵڵا

ئەم زاتە زانایەکی هەڵکەوتوو و سەرکەوتووی پایەدار بووە و مامۆستایەکی بەرز و بەسوود بووە. حاشیەیەکی لە سەر تەفسیری بەیزاوی و حاشیەیەکی لە سەر حاشیەی خەیاڵی لە سەر شەرحی عەقائیدی نەسەفی هەیە.

دووەم لە براکانی سیغەتوڵڵا ئیسماعیلی حەیدەری. سێهەم فەزلوڵلای حەیدەری. چوارەم فەتحوڵڵای حەیدەری. ئەم زاتە بەڕێزانە هەموو مامۆستای چاک و خاوەن خوێندنگا و دانەری کتێب بوون.

هەموویشیان حاشیەیان لەسەر تەفسیری بەیزاوی هەیە.

بە تایبەتی ئیسماعیل حاشیەی لە سەر وەزعی قەوشەجی و لە سەر قەرەباغی لە مەنتیقدا هەیە. شەرحێکی ناسکی جوانیشی لە سەر ریسالەی «استرلاب» هەیە. هەروەها حاشیەی لە سەر جەفری جامیعی شێخ محێدینی عەرەبی هەیە.

وە سەیید عاسیمی برای سیبغەتوڵلا چوار کوڕی بووە: سیبغەتوڵلای دوەم و ئیبراهیمی دوەم و عوسمان و نیعمەتوڵلا.

## ئیبراهیمی کوڕی سەیید عاسیم

زانایەکی بەرز بووە و کتێبی زۆرە:

یەکەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی عەبدولحەکیمی هیندی لە سەر خەیاڵی.

دوەم: شەرحێکی نایاب لە ریسالەی «خلق الاعمال»ی جەلالەدینی دەووانی.

## نیعمەتوڵلای حەیدەری و عوسمانی حەیدەری

کوڕانی عاسیمی حەیدەری. ئەمانە شوێنەواری جوانیان زۆرە لە دەرسوتنەوە و خزمەتکردنی موسوڵماناندا.

وە سیبغەتوڵلای کوڕی سەیید عاسیم کوڕێکی بووە ناوی ئیبراهیم بووە مامۆستایەکی چاک و زانایەکی بەرز بووە. حاشیەیەکی لە سەر عەبدولحەکیم لە سەر حاشیەی خەیاڵی هەیە.

وە ئیسماعیلی حەیدەریی برای سیبغەتوڵلای گەورە کوڕێکی بووە ناوی ساڵح بووە، ئەم ساڵحی حەیدەرییە زانایەکی زۆر بەرز و بەهیممەت بووە و بووە بە پەنا و داڵدە بۆ زانایانی عێراق و گەلێ لە ئیجازەی زاناکانی عێراق ئەچنەوە سەر ئەو و حاشیەیەکی بەسوودی هەیە لەسەر «خلاصة الحساب»ی بەهادینی عامیلی ـ خ ـ .

جا باسی کوڕەکانی سیبغەتوڵلای گەورە ئەکەین.

## عەبدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلا

ئەم زاتە زانایەکی بەرزبووە و نموونە بووە لە بلیمەتیی و بەرزیی رەوشتدا و، مامۆستایەکی بەسوود بووە بۆ قوتابییان و گەلێ دانراوی بەسوودی بو ئەهلی زانیاری بەجێ هێشتووە:

یەکەم: حاشیەی لە سەر چەغمینی لە زانیاری هەیئەتا.
دووەم: حاشیەی لە سەر ریسالەی «اثبات الواجب».
سێهەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی سەییدی موحەقیق لە سەر شەرحی شەمسی‌یە.
چوارەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی «داود خوافی» لە مەنتیقدا.
پێنجەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی «عصام الدین»ی جامی.
شەشەم: شەرحی بۆ «مسائل هندیة»، گەلێ سوودی تێدا گرد کردووەتەوە.

## غیاسەدینی کوڕی سیبغەتوڵلا

ئەم زاتە پیاوێکی زانا و بەتوانا بووە و گەلێ دانراوی هەیە:
یەکەم: حاشیەی لە سەر توحفەی ئیبنوحەجەر.
دووەم: حاشیەی لە سەر «جمع الجوامع».
سێهەم: حاشیەی لە سەر شەرحی موختەسەری مونتەها لە عیلمی ئوسوولی فیقهدا.
چوارەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی «لاری» لە حیکمەتا.
پێنجەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی عەبدولحەکیمی هیندی لە سەر حاشیەی عەبدولغەفووری لاری لە سەر شەرحی مەولانای جامی.
شەشەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی عیسامەدینی جامی.
حەوتەم: حاشیەی لە سەر «قول احمد» لە سەر فەنناری.
هەشتەم: حاشیەی لە سەر «محمد امین» لە جیهەتی وەحدەتا.
ئەم غیاسەدینە کوڕێکی بووە ناوی عەبدوڵلا بووە، زانایەکی گەلێ بەرز و بەڕێز بووە و حاشیەی لە سەر گەلێ لە کتێبە عەقلی‌یەکان هەیە.

## حەیدەری کوڕی سیبغەتوڵلا

ئەم زاتە بە حەیدەری موفتیی ناسراوە، زانایەکی باڵا بووە و حاشیەی لە سەر تەفسیری بەیزاوی و محەمەد ئەمینی جیهەتی وەحدەت هەیە.

## محەمەد ئەمینی کوڕی سیبغەتوڵلا

ئەم زاتە لەگەڵ ئەوەدا کە خەریکی تەسەووف بووە زانایەکی بەرز و بەڕێز و بەسوود بووە و گەلێ کەرامەتی لێ دەگێڕنەوە.

## عوبەیدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلا

ئەم زاتە زانایەکی بەرز و خاوەن پایەی باڵا بووە لە زانیاریدا، لەگەڵ ئەوەدا کە لە بەغدادا موفتی «حنیفة» بووە و ئیش و کاری زۆر بووە لە زانیاری‌یە عەقڵی و نەقڵی‌یەکاندا دەرسی گوتووەتەوە و گەلێ قوتابیی پێگەیاندوە. زەوقی ئەدەبیات ـ پەخشان و هۆنراوە ـی زۆر بووە.

خەلیفەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بووە. لە شاری بەغدادا تەمەنی خۆی لە خزمەتکردنی دیندا بەسەر بردووە.

ئەم زاتە دوو کوڕی بووە: عەبدولحەکیم و عەبدولحەلیم، هەردووکیان زۆر بەتوانا و شارەزا بوون لە زانیاری‌یەکاندا.

عەبدولحەلیم ریسالەی سەمەرقەندی کردووە بە شیعر. بە داخەوە ئەم دوو کوڕە لە تاعوونی بەغدادا کۆچی دوایی‌یان کردووە.

## ئەسعەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلا

عەبدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلا دوو کوڕی بووە: یەکەم ئەسعەد و دوەم عەبدوسسەلام.

ئەسعەد زانایەکی بەرز و بەڕێز بووە و مامۆستایەکی زانا و بەتوانا بووە و گەلێ دانراوی هەیە:

یەکەم: حاشیەی لە سەر توحفەی ئیبنوحەجەر. لەم حاشیەدا موحاکەمەی باقی حاشیەنووسەکانی سەر توحفەی کردووە و بە راستی ئەم حاشیە زۆر نایابە.

دوەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی عەبدولحەکیم لە سەر خەیاڵی.

سێهەم: حاشیەی لە سەر «لقاني مصري» لە سەر حاشیەی سەعدی تەفتازانی لە سەر «عیززی» کە بە «سعديني» ناسراوە، لە «صرف» دا.

چوارەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی قەرەباغی لە مەنتیقدا.

پێنجەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی تەحاوی.
شەشەم: کتێبە جوانەکەیەتی کە شەرحی «الغـاز»ە و گـەلێ زانسـتی جۆراوجـۆری تێدایە... چەند نووسراوی دیکەیش.

## عەبدوسسەلامی کوڕی عەبدوڵلا

کوڕی سیبغەتوڵلای گەورە کە برابچووکی ئەسعەد بـووە، زۆر زانـا و بـەڕێز بـووە و گەلێ شارەزای مێژوو و رشتەی نەسەب و هەواڵـی پێشـینان بـووە و خزمـان زۆریـان خۆشویستووە لەگەڵ سیبغەتوڵلای بچووکدا کە برازای بووە.
وە ئەم زاتانە: سەعدوڵلای حەیدەری و شـەهابەدینی حەیـدەری و عەبـدولوەهابی حەیدەری و ئەحمەدی حەیدەری و کە بە «الملا الکبیر» ناسراوە... دەستێکی باڵایـان لە زانیاری‌یە عەقلی‌یەکاندا بووە.
وە ئەسعەدی کوڕی عەبدوڵلای کـوڕی سیبغەتولـلای گـەورە سـێ کـوڕی بـووە: عەبدولقادر و عەبدولغەفوور و سیبغەتوڵلا.

## عەبدولقادری کوڕی ئەسعەد

ئەم زاتە زانایەکی گەورە و خەتخۆشێکی کـەموێنـە بـووە و لـە نووسـینی نامـە و چەک و فەرماندا، چ بە عەرەبی، یا تورکیی، یـا فارسـیی... دەسـتێکی بـاڵای بـووە و کتێبێکی بە نرخـی لـە باسـی «مکفـرات»دا هەیـە وەکـوو «قواطـع»ی ئیبنوحەجـەری هەیتەمی.
ئەم زاتە بە عەبدولقادر سیدقی حەیدەریی ناسراوە. بە تاعوون لە شاری بەسرەدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی یاری پێغەمـەر زوبـەیری کـوڕی عەوامـدا بـە خـاک سپێرراوە.

## عەبدولغەفووری حەیدەریی

کوڕی ئەسعەدی، کوڕی عەبدوڵلای، کوڕی سیبغەتوڵلا. ئـەم زاتـە پیـاوێکی زانـا و بەتوانا و پایەبەرز بووە. کوڕێکی لێ بەجێ‌ماوە ناوی محەمەدئەمین بووە.

**محەمەدئەمینی حەیدەری**

ئەم محەمەدئەمینە پیاوێکی زانا و ئەدیب بووە، موفتی مەزهەبی شافیعی بووە لە بەغدادا. تەعلیقاتێکی ناسکی جوانی هەیە لە سەر حاشیەی «ناصرالدینی لقانی» لە سەر شەرحی تەفتازانی لە سەر «عیززی».

هەروا لە سەر قەرەباغی لە مەنتیقدا. وە گەلێ هۆنراوەی ناسکی هەیە، بە داخەوە لە گەنجیدا کۆچی دوایی کردووە.

**سیبغەتوڵلای کوڕی ئەسعەدی کوڕی عەبدوڵلا**

ئەم زاتە زانایەکی بالا و بەرز و بەڕێز بووە و گەلێ دانراوی هەیە:

یەکەم: حاشیەی لە سەر شەرحی شەمسی‌یە.

دووەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی داود.

سێهەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی قەرەباغی.

ئەمانە هەموویان لە مەنتیقدان.

چوارەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی عەبدولحەکیمی هیندی لە سەر موتەووەل لە بەغدا.

پێنجەم: حاشیەی لە سەر شەرحی عیسامەدینی ئیستیعارە لە بەیاندا.

ئەم سیبغەتوڵلای دووەمە چەند کوڕی بووە، زانای بەناوبانگیان ئیبراهیم فەسیحی حەیدەری‌یە کە باسی دەکەین.

**ئیبراهیم فەسیحی حەیدەری**

ئەم زاتە زانایەکی بەرز و بەڕێز بووە، گەلێ دانراوی هەیە:

یەکەم: تەفسیرێکی قورئان بە ناوی «فصیح البیان فی تفسیر القرآن» لەم تەفسیرەدا گەلێ موحاکەمەی خاوەن تەفسیرەکانی دیکەی کردووە.

دووەم: حاشیەی لە سەر عەبدولحەکیمی شەرح شەمسی‌یە لە مەنتیقدا.

سێهەم: «اعلی الرتبة فی شرح نظم النخبة» لە ئوسوولی حەدیس‌دا.

چوارەم: حاشیەی لە سەر «اشباه نظائر»ی سیووتی.

پێنجەم: حاشیەی لە سەر جوزئی یەکەم لە توحفەی ئیبنوحەجەر.

شەشەم: حاشیەی لە سەر «الدر المنتقی فی شرح الملتقی» لە فیقهی حەنەفیدا.
حەوتەم: شەرحی مەقاماتی حەریری.
هەشتەم: حاشیەی لە سەر «الکتاب»ی «سیبویه».
نۆهەم: شەرحی لە سەر «المقامة اللطیفة»ی سیووتی.
دەهەم: شەرحی دیوانی «ابوالعلای معرّی».
یازدەهەم: شەرحی دیوانی «ابو تمام».
دوازدەهەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی عەبدولحەکیمی هیندی لە سەر حاشیەی عەبدولغەفووری جامی.
سیازدەهەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی عەبدولحەکیمی هیندی لە سەر «مطول».
چواردەهەم: حاشیەی لە سەر حاشیەی باپیرەی لە سەر «مطول».
پانزدەهەم: حاشیەی لە سەر موحاکەمات لە سەر شەرحی عەقائید.
شازدەهەم: «فک الاشتباک» شەرحی «تشریح الافلاک» لە هەیئەتا.
حەڤدە: «راحة الارواح شرح الاقتراح» لە ئوسوولی عیلمی نەحودا، کە «الاقتراح»ەکە دانراوی سیووتی‌یە.
هەژدە: شەرحی مەنزوومەی «آداب البحث».
نۆزدە: «سنوحات» لە تەسەووفدا.
بیست: شەرحی ریسالەی «خلق الاعمال» دانراوی مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە عەقائیددا.

بیست‌ویەک: حاشیەی لە سەر حاشیەی محەمەدی کوڕی حسەینی کچەزای ئەحمەدی کوڕی حەیدەر لە سەر حاشیەی «میر ابوالفتح» لە سەر شەرحی ریسالەی حەنەفی‌یە لە «آداب البحث»دا.

بیست‌ودوو: حاشیەی لە سەر حاشیەی قەرەباغی لە سەر شەرحی ئیساغۆجی لە مەنتیقدا.

بیست‌وسێ: کیتابی «الحسب فی النسب»، ئەم کتێبە داگری شوێنەوار و رشتە و شانازی‌یەکانی عەرەبە، هەروەها باسی رەسەنیی و ناڕەسەنیی ماین و ئەسپ و وشتری بە چاکی و خراپی تێدایە.

بیست‌وچوار: کتێبی «الصراط المستقیم» لە بەرپەرچی تەسارادا.

بیست‌وپێنج: «کامل التوقیع فی فن البدیع».

بیست‌وشەش: «امعان الالباب فی الاسطرلاب».

بیست‌وحەوت: حاشیەی لەسەر شەرحی «شافیعة»ی چارەپەردی لە سەرفدا.

بیست‌وهەشت: حاشیەی لە سەر شەرحی جەلالەدینی سیووتی لە «الفیهـ»ی ابن مالک.

بیست‌ونۆ: تەعلیقاتی لە سەر «مغنی اللبیب».

سیهەم: تەعلیقاتی لە سەر «حکمة العین».

سی‌ویەک: تەعلیقاتی لەسەر حاشیەی لاری لە سەر شەرحی هیدایە لە عیلمی حیکمەتدا.

سی‌ودوو: تەعلیقاتی لە سەر موختەسەری مونتەها لە ئوسوولی فیقهدا.

سی‌وسێ: تەعلیقاتی لە سەر حاشیەی «الغ بیگ» لە سەر شەرحی مەسعوودی لە ئادابی بەحسدا.

سی‌وچوار: تەعلیقاتی لە سەر حاشیەی میسری لە سەر شەرحی تەسریف.

سی‌وپێنج: تەعلیقاتی لە سەر حاشیەی «میر ابوالفتح» لە سەر شەرحی جەلالی دەووانی لە «تهذیب المنطق».

سی‌وشەش: حاشیەی لە سەر «فاکهی».

سی‌وحەوت: حاشیەی لە سەر «قول احمد».

سی‌وهەشت: حاشیەی لە سەر شەرحی سیراجییەی سەیید شەریف لە فەرائیزدا.

هەروەها تەعلیقاتی لە سەر زۆربەی کتێبە وردەکان هەیە.

زیاد لەمانیش گەلێ دانراوی لە «رسائل» و «الغاز» و «انشائات»دا هەیە.

ئەم هەموو دانراو و حاشیە و تەعلیقاتەی بۆ خزمەتی ئیسلام و پەرەسەندنی ئایینی ئیسلامە.

**باسی هەندێ لەو زانا خاوەنپایانەی کە ئیبراهیم فەسیحی حەیدەری بە خزمەتیان گەییشتووە یا زانستی لێ وەرگرتوون:**

لەبەر پیرۆزیی ئەم کتێبی «بنەماڵەی زانیاران»ە هەندێکیان لە بەر ئـەو وەرئـەگرم و نایان گۆڕم. ئەڵێ:

و قد اخذت العلوم عن عدة اعلام، سيأتي ان شاء الله تعالى بيانهم، و ارجع الى ما نحـن بصدده من بيان علماء العراق الذين ادركت عصرهم، واخذت عنهم.

فأجل من ادركت عصره و انا صغير: شـيخنا و مقتـدانا، قطـب دائـرة الارشـاد، المرشـد العارف بالله، الكامل الاسناد، مجدد العصر والاوان، شمس الحقيقة والعرفـان، علامـة الـدنيا على‌الاطلاق، المشهور فی جميع الآفـاق، صـاحب الولايـة الكبـری، والانفـاس القدسـية و الالهامات الذوقية الربانية، قدوة العارفين، و سـند الواصـلين، جـامع المنقـول و المعقـول، حاوی الفروع والاصول، حجة‌الاسلام، و شيخ الخاص والعـام، الراكـع السـاجد، ضـياءالدين، مولانا خالد النقشبندی المجددی العثمانی الشافعی ـ قدس سره ـ و اعاد علينا بـره. فـانی قد ادركت عصره، و جلست فی ختمـة الخواجگـان بجنبـه، و دعـا لـی، ولله الحمـد. فـان خليفته عمی العلامة الشريف عبيدالله الحيدری المفتی هو الـذی اجلسـنی بجنبـه حـين قراءة الختم الشريف و انا مريض. و كان شفائی ببركة جلوسی بجنبه و بدعائه.

ثم اخذت الطريقة العلية النقشبندية الخالدية من خليفته ولی‌الله بلا نزاع، والمسـتغرق فی فكر مولاه، قدوة العارفين، و مرشد الكاملين، الولی النبـوی، والسـيد الشـريف العلـوی، فقيه عصره، مولانا و مقتدانا السيد عبدالغفور المشاهدی الشافعی ـ قدس سره! ـ و كـان محبوبا لحضرة مولانا خالد قدس سره! و من اعظم خلفائه العارفين الكاملين المرشدين.

و لهذا السيد شيخنا المشار اليه كرامات ظاهرة، شـاهدت منهـا كثيـرا، و كـان محبوبـا مقبولا معظما لدی الخواص والعوام و له من مكارم الاخلاق ما يتحير منه الناظر، و هو قـد سلک اولا علی يدی عمنا العلامة الشريف عبيدالله الحيدری المشار اليه، ثم خلفـه حضـرة مولانا خالد قدس سره!

واقاض علينا بركاته و بره.

و من جملة خلفاء حضرة مولانا خالد، العالم الولی الكامل، العارف المرشد الـذی أُجْمِـعَ علی حبه والاعتقاد به: مولانا الشـيخ موسـی الجبـوری الشـافعی، والـولی العـارف الكامـل المرشد الشيخ محمد الجديد الحنفی البغدادی، و قد ادركتهما و فزت بدعائهما و نظرهمـا

الاكسيری، و هما ايضا قد سلكا اولا علی يدی عمنا الشريف عبيدالله الحيدری المشار اليه، ثم خلفهما حضرة مولانا خالد، و صار كشيخنا السيد المشاهدی و من اعظم خلفاء حضـرة مولانا خالد و كان هؤلاء المشايخ الثلاثة العظام مع عمنا المشار اليه كأنهم روح واحـدة، و عليهم مدار الارشاد فی بغداد بعد توجه حضرة مولانا خالد الی الشام.

و عمی المشار اليه توجه بخدمته الیالشام، ثم امر بالعود الـی بغـداد، و خلفـاء حضـرة مولانا كلهم علماء اعلام، و لا يحصی عددهم لكثرتهم فیالبلاد.

ثم ان علوم حضرة مولانا خالد و خوارقه و كراماته و كرمـه، و مكـارم اخلاقـه، و اتباعـه للسنة، و جلالة قدره، و علوّ شأنه، وانقيـاد الفحـول العلمـاء لـه، و مناقبـه... لا يسـعه هـذا المقام، بل يحتاج الی مجلد ضخم.

فانه لما كمل العلوم و درسها مدة... ترک اهله و مدرسته و ذهب الی «دلهی» مـن بـلاد الهند، وسلک علی يدی قطب العارفين، الولی الاكبر، مولانا شاه عبدالله، فخلفه مع العـارف الولی الشيخ ابی سعيد الهندی فی يوم واحد.

فأمر حضرة مولانا خالد بالتوجه الی بغداد للارشاد، فعاد و صار له مـن الشـأن مـا صـار كالشمس فی رابعة النهار، وانتفع به من الامم ما لا يحصی عددهم الا الله تعالی.

و كان ـ قدس سره! كثيرالمحبة لجدی «اسعد الحيدری» و جدی من اعظم المخلصـين له، و نحن ـ معاشر الحيدرية ـ الذين روجنا امر حضرة مولانا خالـد فـی بغـداد، و خـدمناه ابتغاء لمرضاة الله تعالی. و قد اخذ حضرة مولانا العلم عن عدة علماء مـنهم العلامـة صـالح «الترە ماری»، عن العلامة الشريف الولی عمنا صالح الحيدری ـ رحمة الله ـ

قلت: و منهم الشيخ قسيم السنندجی، و قد اخذ الاجازة العلميـة عنـه، و كـذلک عنـد الملا صبغةالله الزياری، و كان فی هذه الدراسة عبدالرحمن الروزبهانی زميلا لـه. و كـذلک عند السيد عبدالكريم البرزنجی المدرس بالسـليمانية، لكـن اجازتـه العلميـة كانـت عنـد المرحوم الشيخ قسيم السنندجی، فی ما علمنا والله اعلم.

پاش ئەوە کە بـە عیبـارەتی عـەرەبی دەقـی قسـەکانی ئیـبراهیم فەسـیحمان بـۆ نووسین، ئەمجار لە سەر تەرجومەی عیبارەت باسی ئەو کەسانە ئەکـەم کـە ئیـبراهیم فەسیح لە مێژووی هەزار و دووسەد و شتێکدا بە خزمـەتیان گەیشـتووە. بـۆ پـیرۆزی وەرگرتن لە یاد کردنەوەیاندا.

جا ئیبراهیم فەسیح ئەڵێ: لەو بەڕێزانەی کە هاوچەرخیان بووم مەولانا شێخ مەلا یەحیای مزووریی عیمادیی بوو، کە چەند کتێبم لە کتێبە بەبایەخەکان لە خزمەتیا خوێندووە، وەکوو: سەحیحی بوخاری و شەرحی نوخبە لە ئوسوولی حەدیسدا ، «اشباه و نظائر»ی سیووتی و ئیجازەی پێدام بۆ ریوایەتی بوخاری و کتێبە سەحیحەکانی‌تر و زانیاری‌یە ئیسلامی‌یەکان. ئەم مەولانا یەحیای مزوورییە لای گەلێ زانای بەرزی وەکوو عەللامەی شەریف «عاصم الحیدری»ی برای «صبغةالله»ی کوڕی ئیبراهیمی حەیدەریی خوێندوویە.

ئەم مەولانا یەحیا گەلێ دانراوی بە نرخی هەیە:

یەکەم: حاشیەی لە سەر توحفەی ئیبنوحەجەر، لەم حاشیەدا بەرپەرچی رەخنەکانی ئیبنوقاسمی عوببادی لە ئیبنوحەجەر داوەتەوە.

دووەم: حاشیەی لە سەر شەرحی عیسامەدین لە سەر ریسالەی وەزعی‌یە.

سێهەم: شەرحی لە سەر «مسائل حسابیه» لە کۆتایی «خلاصة الحساب»ی «بهاءالدین عاملی»یەوە کە گەلێ کەس تیایا سەرگەردان بووە.

وە بێجگە لەمانەیش گەلێ نووسراوی بەسوودی هەیە و ئەم زاتە بە شێخی شێخەکانی عێراق لە سەردەمی خۆیدا ناوبراوە و وەک ئیبنوحەجەر تەماشای کراوە.

وا باوە ئەم زاتە لە سی جار پتر توحفەی ئیبنوحەجەری بە دەرس گوتووەتەوە و تەفسیری بەیزاویی و حاشیەکانی بە دەرس وتووەتەوە و شەش کتێبە حەدیسە سەحیحەکە «صحاح ستة»ی بە دەرس وتووەتەوە تەریقەتی لە مەولانا خالید وەرگرتووە و نزیکەی ١٠٠ ساڵ ژیاوە.

من ئەڵێم: ئەم زاتە لە بەغدادا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا بە خاک سپێرراوە.

وە ئیبراهیم فەسیح ئەڵێ: لەو پیاوە بەرزانەیە کە بە خزمەتیان گەیشتووم: عەبدوڕەحمانی رۆژبەیانی. ئەم زاتە لای گەلێ لە مامۆستا گەورەکان خوێندوویە، لەوانە: عەللامەی ناسراو سیبغەتوڵلای زیاریی گەڕاوی، کە ئەویش ئیجازەی لە ساڵح حەیدەریی کوڕی ئیسماعیل حەیدەریی برای سیبغەتوڵلا وەرگرتووە.

من ئەڵێم: ئەم زاتە لە کاتی خوێندندا هاوڕێی مەولانا خالید بووە لەو رۆژەدا کە لە خزمەتی سیبغەتوڵلای زیارەتیدا خوێندوویانە. وە پاش ئەوە کە مەولانا بووە بە

مورشید و هاتووەتە شاری بەغدا تەمەسسوکی بە مەولانا خالید کـردووە، وە لـە پـاش ڕۆیبیشتنی مەولانا بۆ شام لە تەکیەی خالیدی‌یـەدا ماوەیـێ ماوەتـەوە و جـا بـووە بـە مامۆستای مزگـەوتی ئەحمـەدیی لـە لای وەزارەتی دیفاعـدا و، چـەن سـاڵ دەرسـی وتووەتەوە.

وە ئیبراهیم فەسیح ئەڵێ: حەزرەتی مەولانا خالید و باپیرم ئەسعەدی حەیدەریی و عەللامە شێخ یەحیای مزووریی و عەللامە شێخ عەبدوڕەحمانی ڕۆژبەیانی وەکوو برای باوک و دایکی بە یەکەوە رایان ئەبوارد، ئەوەندە بووم کە ئەمانە موریدی مەولانا خالید بوون.

وە ئەڵێ: گەلێ پرسیارم لە شوێنە گرانـەکانی توحفـەی ئیبنوحەجـەر لـە مـەولانا عەبدوڕەحمانی ڕۆژبەیانی ئەکرد ئەویش بە ئاسانی وەڵامی ئەدامەوە و شوێنەکانی بـۆ لێک ئەدامەوە. وە لەگـەڵ مـەلا ئەحمـەدی کـوڕی مـەولانا عەبدوڕەحمانـدا زۆرمـان پێکەوە خوێند و، باوکی لە عیلمی ئوسوول و کەلام و حیکمەت و مـەنتیق و ریازیاتـدا زۆر باڵادەست بوو، وە مەلا ئەحمەدیش لە ریازیاتدا خاوەن پایە بوو.

وە مەولانا عەبدوڕەحمان لەگەڵ مـەولانا یـەحیای مزووریـدا لـە پـاش ڕۆییشـتنی مەولانا خالید بۆ شام پێکەوە ئەژیان، جا مزووریی کۆچی دوایـی کـرد و، ماوەیـەکیش دوای ئەو مەولانا عەبدوڕەحمان لە جیهان دەرچوو.

ئیبراهیم فەسیح ئەڵێ: لەو زانا بەرزانەیە کە بە خزمەتیان گەیشتووم: مەولانا مەلا ئەحمەدی گەلاڵەیی کوڕی عەلی باڵەکی. ئەم زاتە لە خزمەت مەلا محەمەدی خـەتێ و مەلا ئەبوبەکری میرڕۆستەمی و مەلا عەلی ڕۆستی و... خوێندوویـە و لـە لای مـەلا عەبدوڕەحمانی ڕۆژبەیانی ئیجازەی وەرگرتووە.

ئیبراهیم فەسیح ئەڵێ: من لە خزمەتی ئەم مامۆستا بەرزەدا چەند سـاڵ مامـەوە و ئەم کتێبانەم لە خزمەتدا خوێند:

«مغنی اللبیب». «الکتاب»ی سـیبەوەیهی، «خلاصـة الحسـاب»ی عـامیلی، توحفـەی ئیبنوحەجەر. دوادوایی ئەشباه و نەزائیری سیووتی و «حکمة العین» لەگـەڵ حاشـیەی سەییددا، هەندێ لە فەننی مـەعانی و هـەموو بـەیان لـە «مطـول» لەگـەڵ حاشـیەی عەبدولحـەکیمی هینديـدا. «اشـکال‌التاسـیس» و «جمـع‌الجوامـع» لەگـەڵ حاشـیەی ئیبنوئەبی‌شەریف و «شـیخ الاسـلام» زەکـەریای ئەنسـاریی و شـەرحی موختەسـەری

مونتەها لەگەڵ حاشیەی سەییددا و، خەیاڵی لەگەڵ حاشیەی عەبدولحەکیمدا ـ سەرەتاکەی نەبێ ـ و «اثبات الواجب» و تەفسیری بەیزاوی و شەرحی عەقائیدی عەزودی‌یەی دەووانی لەگەڵ حاشیەکەی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری باپیرەمدا کە بە «محاکمات» ناسراوە و شەرحی مەتالیع لەگەڵ حاشیەی سەییددا ـ هەندێ لە سەرەتاکەی نەبێ و ـ شەرحی دەووانی لە سەر «تهذیب المنطق» لەگەڵ حاشیەی میر ئەبولفەتحدا ـ هەندێ لە سەرەتاکەی نەبێ ـ وە شەرحی «اندلسیە» لە عەرووزا و، شەرحی ئیساغۆجی لەگەڵ حاشیەی محێدین و شەرحی «الفیە»ی سیووتی و هەندێ لە جامی شەرحی کافیە و شەرحی تەسریفی زنجانی و غەیری ئەمانەیش لەو کتێبە وردانە کە لە سەرەتای خوێندن و رۆژانی لاویدا بە دەرس لە خزمەتیدا خوێندم. وە لە پاش نوێژی بەیانی تا نوێژی مەغریب لە خزمەتیدا ئەبووم.

ئەم زاتە بە درێژایی ساڵ بەڕۆژوو ئەبوو و تەمەنی خۆی لە خوداناسیدا بە سەر ئەبرد.

وە ئیبراهیم فەسیح ئەڵێ: لەو زانا بەرزانە کە بە خزمەتیان گەییشتم: مەولانا ئیبراهیمی کوڕی حسەینی رەمەکی‌یە، ئەم زاتە خۆی لە دنیا کەنار گرتبوو و قسەی دنیایی نەدەکرد و هەمیشە خەریکی زانیاریی و خوداپەرستی بوو. وە ئەم زاتە لای مەولانا مەلا محەممەدی خەتێ و مەلا عەلی رۆستی خوێندوویەتی و ئیجازەی لە مەلا عەبدوڕەحمانی رۆژبەیانی وەرگرتووە. چەند ساڵ لە خزمەتی ئەم مەلا ئیبراهیمەدا خوێندوومە و گەلێ کتێبم لە خزمەتیا خوێند، وەکوو فەنناری و قەول ئەحمەد لەگەڵ حاشیەکانی عەبدوڵلای کوڕی حەیدەر و «برهان الدین» و ریسالەی جیهەتی وەحدەت لەگەڵ حاشیەکانی شەریف غیاسەدینی حەیدەری، هەروا شەرحی «تهذیب المنطق»ی عەبدولـلا یەزدی لەگەڵ حاشیەی عەبدوللەتیف و شەرحی ریسالەی بەیانی عیسامەدین لەگەڵ حاشیەکانی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر و عەبدولـلای کوڕی حەیدەر و حەسەنی زێباریی و شەرانشی و شەرحی ریسالەی وەزعی دانراوی عیسامەدین لەگەڵ حاشیەکانی حەیدەری باپیرەم و خوشکەزای محەممەدی کوڕی حسەین و شەرانشی. هەروەها حاشیەی میر «ابوالفتح» لە «آداب البحث»دام لەگەڵ حاشیەکانی عەبدوڵلای کوڕی حەیدەر و محەممەدی کوڕی حسەین لە خزمەتدا خوێند.

وە شەرحی مەسعوودی لەگەڵ حاشیەی «ابن الغ بیگ» و حاشیەی عەبدوللەتیف لە «آداب البحث»دا و، شەرحی شەمسی‌یە لەگەڵ حاشیەی سەیید و داودی خەوافی و هەندێ لە «مطول» لەگەڵ حاشیەی عەبدولحەکیمی هیندی و هەندێ لە «جمع الجوامع» و حاشیەکانی و هەندێ لە «اشباه»ی «فقهیە»ی سیووتی و هەندێ لە شەرحی مەنهەجی دانراوی قازی زەکەریای ئەنساریی و شەرحی «مقدمە»ی «حضرمیە»ی دانراوی ئیبنوحەجەر و هەندێ لە توحفەی ئیبنوحەجەر و هەندێ لە «فوائد مدنیە»ی دانراوی محەممەدی کوڕی سولەیمانی مەدەنی و حاشیەی میسری لقانی لە سەر شەرحی تەسریفی زنجانی، لەگەڵ حاشیەکانی ئیبنوقاسمی عوببادی و ، ئەحمەدی کوردی و حسەینی ئەلمەعی بەرزنجی. هەروا حاشیەکانی عەبدولغەفوور و عەبدولحەکیم لە سەر جامی و حاشیەی عیسامەدینی جامی و شەرحی شافیە «چارەپەردی» لەگەڵ حاشیەی ئیبنوجەماعەدام لە خزمەتیا خوێند.

ئەم زاتە چووە بۆ ماڵی خودا و بۆ مەدینەی مونەووەرە، جا چووە بۆ میسر و، هاتووەتەوە بۆ شام و لە شاری حەلەبدا لە جیهان دەرچووە.

وە لەو زاتە بەرزانەیە کە بە خزمەتیان گەیيشتم: عەللامە مەلا ئەحمەدی کوڕی رەسووڵی گەڕاوی بە واعیز ناسراو. ئەم زاتە یاسای وابوو لە خوێندنگاکەی خۆیدا لەسەر زەوی دەنوست و شەوانی جومعە نەبێ نەدەچووەوە بۆ ماڵی خۆی. ئەم زاتە زۆر لەخوداترس بوو و ماڵی دنیای لە میران و پیاوانی دنیایی وەرنەدەگرت. وە نیوەی شەرحی مەتالیع لەگەڵ حاشیەکانی سەییدا و حاشیەی میرزاجان و نیوەی شەرحی «تهذیب المنطق»ی دەووانی لەگەڵ حاشیەی میر «ابوالفتح»دام لە خزمەتیا خوێند.

ئەم زاتە لە خزمەتی گەلێ لە زانا بەرزەکاندا خوێندوویەتی بە تایبەتی لە خزمەتی باوکی خۆی و مەلا عەبدوڵڵای کوردیی و شەریف سیبغەتوڵڵای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عاسیمی حەیدەریی‌دا.

وە لەو پیاوە بەرزانە کە بە خزمەتیان گەیيشتم: جەنابی مەولانا ئەبوبەکری ناسراو بە «گچک» مەلای ئەربیلی‌یە. ئەم زاتە لە زانا بەرزە بەکردەوەکان بوو. ئەم زاتە لای گەلێ لە زانا بەرزەکان خوێندبووی، بە تایبەتی لای زانای باڵادەست مەلا عوسمانی باوکی خۆی، کە ئەویش لای مامۆستای بەڕێز ساڵحی حەیدەریی و مەلا عەبدوڕەحیمی زیارەتی و زانای گەورە داودپاشای موشیری بەغدادیی والی بەغدای

پێشوو خوێنـدبووی، وە لـە ئـەنجاما ئیجـازەی لای مـەلا عەبـدوڕەحمانی ڕۆژبـەیانی وەرگرت.

وە لـە خزمـەتی ئـەم مـەلا ئەبوبـەکرەدا حاشـیەی قـەرەباغی لـە سـەر شـەرحی ئیساغۆجی لە مەنتیقدا و هەندێ لە حاشـیەی داود لـە سـەر شـەرحی شەمسـیـیـەم خوێند.

هەروا لەو گەورە پیاوانەن کە چاوم پێیان کەوتووە: زانای بەرز و خاوەن‌دەسـت لـە زانیاری عەقڵـی و نەقڵـیدا جـەنابی محەمـەد فـەیزی سـلمانەیی کـوردی، ئـەم زاتـە ئیجازەی لە زانای گەورە محەمەدی کوڕی ڕەسووڵی سابڵاغی وەرگرتووە، ئـەویش لـە عەللامەی چەرخ مەلا یەحیای مزووریـی، ئـەویش لـە زانایـان عـاسمی حەیـدەریی و سالحی حەیدەریی.

وە لـەو پیـاوە گەورانەیـە کـە بـە خزمـەتیان گەییشـتووم: زانـای پایەبـەرز مـەلا مەحموودی عومەر گونبەدیی، ئەم زاتە لە زانیاری ریازیاتدا دەستی باڵای بوو و ریـازی چاک ئەزانی، من «تشريح الافلاک»م لە خزمەتیدا خوێند. هەروەها سەرەتای خەیاڵـی لەگەڵ عەبدولحەکیمدا. ئەم زاتە ئیجازەی لە «محمد عرب»ی باوکی خۆی وەرگرتبوو، ئەویش لە ئەحمەدی تەبەقچەلی ئەویش لە عەبدوڕەحمانی ڕۆژبەیانی.

وە لەو پیاوە زانا بەرزانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتم: زانای بەڕێز مەلا محەمـەدی خەتێ. ئەم زاتە لە زانا گەورەکانی عێراق بوو، گـەلێ زانـای گـەورە لـە سەردەسـتیدا پێگەییشتوون، وەکوو مەولانا مەلا ئەحمەدی گەلالەیی و مەولانا ئیبراهیمی ڕەمـەکی و چەند زانای دیکە.

مـەلای خـەتێ لای گـەلێ زانـای بـەرز خوێندوویـە لەوانـە: مـەولانا ئەبوبـەکری میررۆستەمی و مەولانا محەمەدی ئیبنوئادەم... تـا دوایـی لای مـەلا عەبـدوڕەحمانی ڕۆژبەیانی ئیجازەی وەرگرت.

ئەم زاتە گەلێ شوێنەوار و حاشیەی وردی لە سەر هەندێ کتێبی عەقڵـی هەیـە و، نامیلکەیەکی نایابی لە مەسئەلەی «علم»ی عیلمی کەلامدا هەیە.

وە لەو زانا بەرزانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم: زانای بـەرز و تاقانـەی عێـراق و خاوەنی دەیان دانراوی نایاب مەولانا محەمەدی ئیبنوئـادەم. ئـەم زاتـە پتـر لـە ١٠٠

کتێبی لە زانیاری‌یە عەقلی و نەقلی‌یەکاندا هەیە و، لە پلەی ئیمام فەخری رازیدا بووە و شەرحی لە «اثبات الواجب» کردووە کە ناسکترین مەسەلەی عیلمی کەلامە.

وە لەو زانا بەرزانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم: مەلا ئەحمەدی میرەکی کوردیی، کە دەستێکی باڵای لە زانیاری ئادابی بەحس و مونازەرەدا بووە. گەلێ زانای ناودار لای ئەم زاتە ئیجازەیان وەرگرتووە. ئەمیش خۆی ئیجازەی لە مەولانا ساڵحی حەیدەریی و ئیبراهیمی کوڕی عاسمی حەیدەریی وەرگرتووە.

وە لەو پیاوە بەرزانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم مەولانا مەلا عەبدوڵلای گەلالەیی، کە گەلێ زانای گەورەی وەکوو مەلا ئەحمەدی گەلالەیی و مەلا ئیبراهیمی رەمەکی و... لای خوێندوویانە. ئەم ئیجازەی لە تاقانەی چەرخی خۆی ئیبنوئادەم وەرگرتووە، ئەویش لە عەللامە محەمەدی کوڕی عەبدوڵلای بایەزیدیی وەرگرتووە، ئەویش لە مەولانا سیبغەتوڵلای حەیدەری.

وە لە پیاوە بەرزانەیە کە من بە خزمەتیان گەییشتووم: مەولانا مەلا عەلیٚ وەسانی کوردیی، کە ئەویش ئیجازەی لە ئیبنوئادەم وەرگرتووە.

وە ئەم مەلا عەلی‌یە لە خەلیفەکانی حەزرەتی مەولانا خالید بووە و حاشیەیەکی جوانی لە سەر حاشیەی قەرەباغی لە مەنتیقدا هەیە.

وە لەو پیاوە بەرزانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم عەللامە عەبدولقادری سیدقی حەیدەریی بەغدادی. «تەرجەمەی ژیانی رابورد» ئەم زاتە ئیجازەی لە ئەسعەدی حەیدەری وەرگرتووە، ئەمیش لە زانای بەرز رەسوولی شەوەکی، ئەمیش لە عوبەیدوڵلای حەیدەریی.

وە لەو زانایانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم: زانای پایەبەرز و باڵادەست لە مەعقوول و مەنقوولدا مامم شێخ عەبدوڵلای حەیدەریی بەغدادیی نەقشبەندیی موفتی لە بەغدادا. ئەم زاتە لای ئەسعەد حەیدەریی باپیرم و شێخ عەبدوڕەحمانی رۆژبەیانی و سەیید ئیبراهیمی بەرزنجی... خوێندوویە، ئەویش لای عوبەیدیللای حەیدەریی باپیرە گەورەم خوێندوویە، هەروەها لای گەلێ زانای دیکەی وەکوو حسەینی کوڕی سەلloومی چەلەبی و عیسای بەندەنیجی و... خوێندوویانە.

وە لە گەورەی ئەوانەی بە خزمەتیان گەییشتووم و من منداڵ بووم: عەللامەی بەناوبانگ بە ئەحمەدی گەورەی کوڕی عەبدوڵلای حەیدەریی ماوەرانی، ئەمیش لای

عوبەیدیللای حەیدەریی ئامۆزای خۆی و باپیری من خوێندوویە. وە باوکم و گەلێ زانایش لای ئەم خوێندوویانە.

وە لەو پیاوە گەورانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم: زانای پایەبەرز سیبغەتوڵڵای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عاسیمی حەیدەریی ماوەرانی، کە لای عەللامە سالحی حەیدەریی خوێندوویە، بەلام لای عەللامە ئەسعەدی حەیدەریی باپیرەم تەواوی کردووە.

وە لەو زانا گەورانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم: زانای بەڕێز محەمەد ئەمینی کوڕی عەبدوڵلای حەیدەریی موفتی شافیعی لە بەغدا.

هەروەها لەو زانا گەورانەیە کە بە خزمەتیان گەیشتووم: سەیید ئیبراهیمی، کوڕی سیبغەتوڵلای، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عاسیمی حەیدەریی ماوەرانی.

وە لەوانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم: زانای پایەبەرز محەمەدی کوڕی خزری حەیدەریی ماوەرانی. هەروەها عەبدولعەزیزی حەیدەریی ماوەرانی و عەبدوسسەلامی حەیدەریی بەغدادیی.

وە لەو زانا گەورانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم: زانای گەورە عەبدولغەفووری حەیدەریی بەغدادیی موفتی شافیعی لە بەغدا، هەروەها کوڕە بەڕێزەکەی سەیید محەمەد ئەمین کە بە گەنجی لە جیهان دەرچوو.

وە لەو قوتابییانەی کە من چاوم پێیان کەوتووە لە نەوەی حەیدەرییەکان پەنجا کەس زیاتر ئەبن، وە لە غەیری ئەوانیش چەند کەسی دیکە وەکوو محەمەدی شەوەکی کوردیی و حسەینی ئاکۆیی کوردیی و محەمەدی قازی ماوەرانی و محەمەدی ئەربیلی و محەمەدی کەرکووکی و عومەری عەسکەریی کوردیی و عومەری خەیالی کوردیی و داودی کوردیی.

وە لەو زانا گەورانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم: شێخ هیدایەتی ئەربیلی نەقشبەندیی خەلیفەی مەولانا خالید، ئەم زاتە لە زانا گەورەکانی سەردەمی خۆی بوو و گەلێ قوتابی لە خزمەتیدا خوێندوویانە و خۆیشی لای مەولانا خالید خوێندوویە.

هەروەها لەو زانا بەرزانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم: شێخ عەبدوللەتیفی بەرزنجی و شێخ ئیسماعیلی بەرزنجی ئامۆزای، ئەمانە لای حەیدەرییەکان خوێندوویانە.

وە لـەو زانـا بەڕێزانەیـە کـە بـە خزمـەتیان گەییشـتووم: زانـای پایەبـەرز عـەلی[1] عەلائەدینی موسڵی کە لای زانای گەورە شێخ یوسفی باوکی خوێندوویەتی و ئـەمیش لای عەللامە مەلا جەرجیسی ئەربیلی خوێندوویە، ئەمیش لای سیبغەتوللای گەورەی باپیرمان خوێندوویە.

وە لەو پیاوانەیە کە بە خزمەتیان گەییشتووم دەروێش بـەگ کـە لای عەبدوڵـلای حەیدەریی موفتی شافیعی کوڕی غەیاسەدینی حەیدەریی خوێندوویە.

وە لەو زانا گەورانەیە کە بە خزمەتیان گەییشـتووم: زانـای بـەڕێز مـەلا حسـەینی پشدەریی کوردیی کە لای مەلای خەتێ و موفتی زەهاویی خوێندوویە.

هەروەها لەوانەیە کـە بـە خزمـەتیان گەییشـتووم: مـەلا مـەحموودی «دیمـلانی» کوردی کە لای ئەبوبەکری ئەربیلی باپیری مەلا ئەفەندی خوێندوویە.

هەروەها مەلا ئەحمەدی عومەر گونبەدی لەو زانایانەیە.

هەروەها لەوانەیە زانای مەزنی بێتواتی کوردی کە لە لای مەلای خـەتێ و غـەیری ئەویش خوێندوویە.

هـەروەها مـەلا محەمەدئـەمینی شـێخانی و شـێخ تاهـای سوورسـووری و مـەلا محەمەدی هەرشەمی و شێخ ئەسعەدی جـەلی کـوردیی و شـێخ عەبدوڵـلای کـوڕی شێخ مەحموودی کوردیی و شێخ محەمەدی باڵەکی و... لـەو زانـا بەرزانـەن کـە بـە خزمەتیان گەییشتووم.

وە ئیجازەی ئەم زانـا بەرزانـە هـەموویان، لـە خۆیانـەوە یـا لـە مامۆسـتاکانیانەوە، ئەگاتەوە بە باپیرەکانی ئێمە لە سەییدەکانی بنەماڵەی حەیدەریی.

---

١ ـ مامۆستای خوێندنگای سەییدە عاتیکەی گەیلانی و مامۆستای مەحمود شەهابەدینی ئالووسی.

## سەییدەکانی بەرزنجە لە نەتەوەی سەیید ئیسماعیلی «محدث»ی کوڕی ئیمام مووسای کازم

لەمەوبەر باسی سەییدەکانی تەکیە و سەییدەکانی حەیدەریمان کرد کە ئەڕۆنەوە سەر ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام مووسای کازم. ئێستەیش باسی سەییدەکانی بەرزنجە ئەکەین کە ئەڕۆنەوە سەر سەیید ئیسماعیلی «محدث»ی کوڕی ئیمام مووسای کازم.

وا باوە کە ئیمام مووسا نزیکەی ٣٧ کوڕ و کچی بووە و کوڕەکانی لە دەوری ٢٠ کەس‌دان و ناسراو و ناوداری ناو کوڕەکانی:

ئیمام حەمزە و ئیسماعیلی «محدث» و ئیمام عەلی‌ڕەزای خۆراسان و... چەن کەسی ترن.

جا ئێستە باسی نەتەوەی ئیسماعیل و ئیسماعیل خۆی ئەکەین.

ئیسماعیل کوڕی مووسای، کوڕی جەعفەری، کوڕی محەمەد باقری، کوڕی زەینەل‌عابیدینی، کوڕی ئیمام حسەینی، کوڕی ئیمام عەلی، کوڕی ئەبی تالیبە.

ئەم ئیسماعیلە ساڵی ١٦٢ی کۆچی لە بەغدا لە دایک بووە و لە خزمەتی ئیمام مووسای باوکیدا بە ریوایەت و دیرایەت خوێندوویە و لە عیلمی حەدیسدا شارەزا بووە و گەلێ جار کاتی خۆی لە خزمەتی شێخ مەعرووفی کەرخیدا رابواردووە و پاش ئەوەی ماوەیێ لە بەغدادا تەمەنی بەسەر بردووە بە تەمای زیارەت و دیدەنی رۆییشتووە بۆ خۆراسان بۆ لای «امام عەلی رەزا»ی برایی و دوای ماوەیێ لە خۆراسانەوە گەڕاوەتەوە بو بەغدا و، لەوێ خەریکی خوداپەرستی بووە تا لە ساڵی ٢٣٠ی کۆچیدا لە تەمەنی ٦٨ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

جا هەندێ لە مێژوونووسەکان ئەڵێن هەر لە بەغدادا لە جیهان دەرچووە و لە لای ئیمام مووسای باوکیدا بە خاک سپێرراوە. وە هەندێ ئەڵێن: گەڕاوەتەوە بەرەو

خۆراسان و کاتێ گەییشتووەتە دێی «ئەسپەرێز» لە هەورامانی عەجەم لەوێ کۆچی دوایی کردووە و ئێستەیش لای ئەو دێدا نەزرگە و گۆڕستانێ بە ناوی ئەم ئیسماعیلەوە هەیە.

بەهەرحاڵ ئەم زاتە کوڕێکی بووە ناوی عەبدوڵڵا بووە و لە سەر وەسیەتی باوکی جێگەنوشینی باوکی بووە.

## عەبدوڵڵای کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیمام مووسا

ئەم سەیید عەبدوڵڵایە لە گەورەی سادات و شێخی زەمان بووە و خوێندەوار بووە و لە سەر خوو و ڕەوشتی باوک و باپیرەی بووە، واتە پیاوێکی زانا و لەخوداترس و بەڕێز بووە و لە سەرەتای گەنجیدا لە خزمەتی باوکیدا ئادابی زیکر و فیکری بەجێ‌هێناوە و گەلێ کاتی لە خزمەتی «سید الطائفتین» جونەیدی بەغدادیدا بە سەر بردوە و لەسەر ڕێبازی ئەو خەریکی خوداناسی و زیکری خودا بووە.

گەلێ کەرامەت و کاری لە یاسا بەدەری لێ دەگێڕنەوە و زۆر دۆعاگیرا بووە و بەم جۆرە تەمەنی بەسەر بردووە تا لە ساڵی ٣٠٢ی کۆچیدا لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە کوڕێکی بەتوانا و لێهاتووی لێ بەجێ‌ماوە ناوی عەبدولعەزیز بووە لە جێگەکەیدا دانیشتووە.

## عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئیسماعیل

ئەم زاتە لە پاش کۆچی باوکی چووە بۆ خۆراسان و لەوێ خەریکی خزمەتی ئایینی ئیسلام بووە و ئەوەندە خوداپەرست و لەخوداترس بووە لە ناو خەڵکدا ناوبانگی دەرکردووە و بەم شێوە ماوەتەوە هەتا لە ساڵی ٤١٠ی کۆچیدا لە خۆراسان لە جیهان دەرچووە و پاش خۆی محەمەدمەنسووری کوڕی، کە پیاوێکی چاک بووە، لە جێگەیدا دانیشتووە.

## محەمەد مەنسوور

کوڕی سەیید عەبدولعەزیزی، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیمام مووسا.

ئەم زاتە هەر لە منداڵی‌یەوە لە بەغدادا خەریکی خوێندن بووە و گەلێ کۆششی کردووە هەتا لە زانیاری‌یە ئیسلامی‌یەکاندا شارەزا بووە و بووە بە زانای شەرع و حەدیس و تەفسیری قورئانی پیرۆز و بووە بە زانایەک لە زانا بەناوبانگەکانی جیهان و بێجگە لە باوکی لە خزمەتی گەلێ لە زانایانی بەغدادا خوێندوویە و هەر لای ئەوان خەریکی تەسەووفیش بووە.

ئەم زاتە شەوی کردووە بە سێ بەشەوە: بەشێ بۆ نووستن و بەشێ بۆ نوێژ و بەشێ بۆ قورئان خوێندن و بە ناچاری نەبووبێ هاتوچۆی بارەگای نەبووە. فەرموویەتی: باپیرم فەرموویە: «بئس الفقیر علی باب الامیر»، وە پێویستە مرۆڤ لەگەڵ گەدا و هەژاراندا بێ و هۆگریان بێ، چونکە هەژارانی خوداناس لە پایەی سەییدەکاندان.

بە گەرمی پەیڕەویی رەفتاری حەزرەتی پێغەمەری کردووە، قسەی کەم بووە، ئەوەندە هەناسەی بەکوڵ و داخاویی هەڵکێشاوە پێیان وتوە:

«منصور اواه» واتە زۆر هەناسەهەڵکێش.

پاش ئەوەی ماوەیێ لە بەغدادا دانیشتووە رووی کردووەتە وڵاتی عەجەم و چووە لە شاری «مرو» دانیشتووە، دوای ماوەیێ لەوێوە چووە بۆ هەمەدان و لەوێ نیشتەجێ بووە و خەریکی خزمەتی ئایین و فێرکردنی موسوڵمانان بووە و گەلێ کەس بە هۆی هاوڕێتی ئەوەوە دڵ و دەروونیان رووناک بووەتەوە. لە سەر ئەم شێوە ژیاوە تا کۆچی دوایی کردووە. دوو کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: سەیید یوسف و سەیید عەبدوڵلا.

جا سەیید عەبدوڵلا لە هەمەدانەوە گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا و، لە بەغدادا خەریکی خوێندنی شەرع و حەدیس و تەفسیری قورئانی پیرۆز بووە و لە هەمان کاتدا لای پیاوچاکەکانی ئەوێ خەریکی تەسەووف بووە هەتا پایەیەکی بەرزی دەستکەوتووە. جا لە بەغداوە چووە بۆ «جبل حمرین» و خەریکی ئیرشاد بووە هەتا کۆچی دوایی کردووە و، نەوەکانی لەو رشتەکێوەدا بڵاوەیان کردووە و تا ئێستە بە «بنی منصور» ناسراون و ئەم بەنی مەنسوورانە جگە لە ساداتی نەعیمن.

### سەیید یوسف

کوڕی سەیید مەنسووری کوڕی سەیید عەبدولعەزیز.

ئەم زاتە لە خزمەتی باوکیدا پێگەییشتووە و پاش کۆچی دوایی باوکی خەریکی ئیرشاد و ڕێنومایی خەڵک بووە و بە «شهاب‌الدین» ناوبانگی دەرکردووە.

وەکوو لە کتێبی باوەڕپێکراوی «الحدائق الندیە»دا ئەڵێ ئەم زاتە لە ساڵی ٤٤٠ی کۆچیدا لە دایک بووە و هەر بە منداڵی نیشانە و شوێنەواری ڕێز و گەورەیی لە ناوچاویدا دیار بووە و پیاوێکی چاک و لەخوداترس بووە و پەیڕەو و شوێن‌کەوتووی زۆر بووە و گەلێ خزمەتی ئایینی کردووە و زۆر کەرامەتی لێ دەگێڕنەوە. وە لە هەمەدانەوە هاتووە بۆ شاری بەغدا و لە خزمەتی عەللامەی دنیا ئەبووئیسحاقی شیرازیدا زانیاریی تەفسیر و شەرع و حەدیسی خوێندووە و لە زانیاری‌یەکانی دیکەدا پایەی بەرز بووە و ناوبانگی دەرکردووە و لە ناو هاوچەرخەکانی خۆیدا شوێنی دیاریی هەبووە.

وە پاش تەواوکردنی خوێندن لە بەغداوە چووە بۆ ئەسفەهان و لەوێ لە خزمەتی شێخ ئەبوعەلی «فارمدی» نەقشبەندیدا تەریقەتی وەرگرتووە و سلووکی کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە و بووە بە یەکێ لە پیاوچاکەکانی جیهانی ئیسلام و خۆی بۆ ئیرشاد و خزمەتی ئایینی ئیسلام تەرخان کردووە و هاوڕێتی شێخ حەسەنی سەمنانی و شێخ عەبدوڵلای «جوینی» هەڵبژارد.

پاش ماوەیێ گەڕایەوە بۆ شاری هەمەدان و لەوێ دامەزرا و، لە هەموو لایەکەوە موسوڵمانان بۆ سلووک لە تەسەووفدا ڕوویان تێ کرد و پیرۆزی‌یان لێ وەرگرت.

دەڵێن: لەو کاتەدا کە لە هەمەداندا ئیرشادی دەکرد ڕۆژێ چوو بۆ دەرەوەی شار و لە کەناری جۆگەیەکدا دانیشتبوو، لەوێدا فەرمووی: فەرمانم پێدراوە بڕۆم بۆ میسر بۆ ئیرشاد. جا کەوتە ڕێ و چوو بۆ میسر و لەوێ دامەزرا و، حەوت ساڵ لە میسردا ئیرشادی کرد و، گەلێ کەس لە هاوڕێتی ئەوەوە بەهرەمەند بوون. جا لە میسرەوە چوو بۆ «حرمین» و حەجی کرد و زیارەتی پێغەمەری کرد و، ماوەی سێ ساڵ لە مەککەدا مایەوە و گەلێ خزمەتی موسوڵمانانی کرد.

دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ شاری بەغدا و ماوەیەکیش لەوێ مایەوە و ئیرشادی کرد.

ئەگێڕنەوە لەو کاتەدا کە سەیید یوسف «ابو یعقوب» تەشریفی لە بەغدادا بوو شێخ عەبدولقادری گەیلانی خەریکی خوێندن بوو و زانای بەناوبانگ «ابن‌السقاء» و

«ابوسعیدی تمیمی» هەم لە بەغدادا بوون، ئەم سێ کەسە کەوتنـە یـەک بـۆ زیـارەتی سەیید یوسف، «ابن السقاء» وتی:

من پرسیارێ لەم سەیید یوسفە ئەکەم کە وەڵامەکەی پێ نەدرێتەوە.

ئەبوسەعید وتی: من زۆر دڵم لەسەر دارایی و ماڵی دنیایە، داوای دۆعای لێ ئەکەم بـۆ ئـەوە کـە دەوڵـەمەند بم. وە شـێخ عەبـدولقادر فـەرمووی: مـن مەبەسـتم لـە زیارەتەکەی تەنیا دۆعای خێرە کە بۆم بکا.

کاتێ ئەم زاتانە گەیشتنە خزمەتی سەیید یوسف بە «ابـن السـقاء»ی فـەرموو: ئـەو پرسیارە کە لە دڵتایە ئەوەیە و، وەڵامەکەیشی وایە، بەڵام من وا تێدەگـەم کـە تـۆ بـە کافریی دەمری!

وە بە ئەبوسەعیدیشی فەرموو: تۆیش بە ئارەزووی خۆت دنیات دەست دەکەوێ.

وە بە شێخ عەبدولقادریشی فەرموو: تۆ بـێ بـۆ نـزیکم. کاتـێ لێـی نزیـک بـووەوە ناوچاوانی ماچ کرد و فەرمووی: موژدەت لێ بێ کە تۆ ئەبی بـە «سـاحیب»ی زەمـانی خۆت و پایەت بەسەر ئەولیای چەرخی خۆتدا بەرز دەبێتەوە و گەلێ لـە موسوڵـمانان سوودت لێ وەردەگرن.

جا لە ئەنجامدا «ابن السقاء» لە لایەنی خەلیفەی عەباسی‌یەوە بۆ مەبەسـتێک نێـررا بۆ ئەستەمووڵ، کاتێ گەیشتە لای قەراڵی گاورەکان لە ئەستەمووڵا و چاوی کەوت بە کچی قەراڵ دڵی لێی چوو، داوای کرد و کچەکەیش قایل بوو بە مەرجێ «ابن السـقاء» ببێ بە گاور. ئەویش مەرجەکەی بەجێ هێنا و کچەکەیان دایێ و ماوەیەک لەگەڵـیدا بوو، لە پاش ماوەیەک تووشی نەخۆشی گولیی بوو! لە شوێنێکی بێ‌نرخدا دایـان‌نـا تـا لەسەر ئەو شێوە نابارە مرد!

وە ئەبوسەعیدی تەمیمی بوو بە ئەمینداری ئەوقافی شام و تا بینـەقاقای لـە ماڵـی دنیادا چەقی.

وە حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانیش لە زانستی زاهیر و باتیندا پێگەییشت و جیهانی بە رووناکیی ئیرشاد و رێنومایی دین رووناک کردەوە.

پاش ئەوە کە سەیید یوسف ماوەیەک لە شاری بەغدادا مایـەوە رووی کـردە وڵاتی عەجەم و گەیشتە «مەرو» کە شۆێنی پێشووی خۆی بـوو. دوای ماوەیـەکیش لـەوێوە چوو بۆ شاری «هەرات» و لەوێ خەریکی ئیرشاد بوو. دوای ماوەیەکیش لـە هەراتـەوە

گەڕایەوە بو مەرو و، لە پێش ئەوەدا بگاتە مەرو لە ڕێگـەدا لـە ساڵـی ٥٥٢ی کۆچیـدا کۆچی دوایی کرد.[١]

هەر کەس دەیەوێت بە درێژی بەسەرهاتی سەیید یوسف بزانێ با تەماشای کتـێبی «رشحات» و «نفحات»ی «جامی» بکات.

سەیید یوسف چوار خەلیفەی بووە: یەکەم: خواجـە عەبـدولخالیقی غەجـدەوانیی، دوەم: خواجە ئەحمەدی فەسەویی. سێهەم: خواجـە عەبدوڵـلای بـەرقیی. چـوارەم: خواجە حەسەن.

هەروەها ٣ کوڕیشی لێ بەجێما: یەکەم: بابـا عـەلی هەمـەدانیی کـە لـە جێگـەی باوکیدا دانیشتووە.

**بابا عەلی هەمەدانیی**

کوڕی سەیید یوسف، کوڕی سەیید مەنسوور... تاد. سەیید محەمەد نووربەخش لە نامیلکەی «سیر و سلوک»دا ئەڵێ: کـاتی خـۆی حـەزرەتی سـەیید یوسـف باباعـەلیی کوڕی خۆی داوەتە دەستی شێخ مەحموودی «بەرزەقانی» بۆ ئەوە کـە سـولووکی پـێ بکات، ئەویش ماوەیەک سولووکی پێ کردووە، پـاش ئـەوە داویەتیـە دەسـتی شـێخ «تقي‌الدين» عەلی دۆستی و لە لای ئەو سـولووکی کـردووە. بـەڵام لـەو کاتـەدا شـێخ تەقی‌یەدین لە جیهـان دەرچـووە و باباعـەلی گەڕاوەتـەوە بـۆ لای شـێخ مـەحمودی بەرزەقانی و لای ئەو سـولووکی کـردووە هـەتا گەییوەتـە پلـەی ئیرشـاد و ئیجـازەی ئیرشادی وەرگرت.

ئەم زاتە وەکـوو لـە تەسـەووفدا شـارەزا و سـەرامەد بـووە و ئیجـازەی هـەبووە... هەروەها لە عیلمی زاهیریشدا سەرامەد و بەدەستەڵات بووە و گەلێ دانراوی بە نرخـی هەیە وەکوو: «ذخيرة الملوک» نامیلکەی «اسرار النقطة» و شەرحی «اسماء الله الحسـنى» و شەرحی «فصوص الحكم» و شەرحی قەسیدەی هومەزی‌یـە و، ویـردی فـەتحی‌یـە و، قەسیدەی «کنارمیان». وە چەن شیعرێ لەم قەسیدە بۆ نموونە و یادگار دەنووسـم، تـا لە لای دۆستان بمێنێتەوە:

---

١ ـ بە گویرەی ئەوەی کە لە ٤٤٠ی کۆچیدا لە دایک بووبێ دەبێ تەمەنی ١١٢ ساڵ بووبێـت. بـەڵام لـە «الحدائق الندية»دا ئەڵی: لە ٥٣٥دا کۆچی دوایی کردووە، بەم پێیە تەمەنی ٩٥ ساڵی بووە.

از کنـــار یـــار مـــی‌یـــابم دمـــادم بـــوی یـــار
زان همـی گیـرم دمـادم خویشـتن را در کنـار
چون میانش را کنـاری نیسـت، زان در حیـرتم
کان چنان بار یک‌میـان اینسـت دائـم در کنـار
نـه میـانش را کنـاری، نـه کنـارش را میـان
در میـــان آتـــش عشـــقش نمـــی‌یـــابم کنـــار
از کنارش گـر «علـی» بـوی میـانش یـا «فتـی»
در میان این خیـال از خویشـتن گشـتی کنـار

وە ئەمەی خوارەوەیش لە ئەدەبیاتی بابا عەلی‌یە:

قرنهـــا بایـــد کـــه از تقـــدیر حـــق پیـــدا شـــود
بایزیـــدی در خوراســـان، یـــا اویســـی در قـــرن
عمرها بایـد کـه تـا یـک سـنگ اصلی ز آفتـاب
لعل گـردد در «بدخشـان»، یـا عقیقـی در «یمـن»
سـالها بایـد کـه تـا یـک کـودکی از درس علـم
عـالمی گـردد نیکـو، یـا شـاعری شـیرین سـخن
ماهها بایـد کـه تـا یـک پمبـه دانـه ز آب گـل
حـــوریی را حلـــه گـــردد، یـــا شـــهیدی را کفـــن
روزها باید که تا یک مشت پشـم از پشـت مـیش
صوفی [ای] را خرقه گردد، یـا حمـاری را رسـن!

بابا عەلی لە پاش تەواوکردنی عیلمی زاهـیر و بـاتین بـە فـەرمانی مورشـیدەکەی گەشتێکی چاکی بە جیهانی ئیسلامدا کردووە. پێی فەرموو:
ئاو هەتا بە رووبارا ڕەوان نەبێ ساف نابێ.

در سـفرها «شاە» «کیخسـرو» شـود
بی سفرها «شاە» کی «خسرو» شود؟

وە لەو گەشتەیدا بۆ یەکەم جار تەشریفی برد بۆ زیارەتی «حرمین» و دوای ماوەیەک لەوێوە چوو بۆ میسر و ماوەیێ لەوێ هاوڕێتی شێخ عەلیی کوڕی شێخ محەمەدوەفای شازلیی کرد.

وە لەم گەشتەیدا بە خزمەتی گەلێ لە پیاوچاکە خاوەن پایە و پلەکانی «مەغریب» و «میسر» و «یەمەن» و «عیراق»... گەییشت و لە وڵاتی عەجەمیشدا دیدەنی پیاوچاکانی «خۆراسان» و «بوخارا»ی کرد و، سوودی لە دیدەنیان وەرگرت.

جا بابا عەلی پاش ئەو گەشت و گەرد و گێلی جیهانە گەڕایەوە بۆ شاری هەمەدان و لەوێ دانیشت و خەریکی خزمەت و دین بوو و گەلێ لە موریدان بە هۆی پیرۆزیی هاوڕێتی ئەوەوە پێگەییشتن، لەوانە: خواجە ئیسحاقی خەتلانی و شێخ مەحموودی شەبەستەریی شەرحکەری کتێبی «گوڵشەنی راز»...

جا رۆژێ لە رۆژان بە هیوای دیدەنی برادەرانی کەوتە رێ بۆ خەتلان و لە رێگەدا نەخۆش کەوت و کۆچی دوایی کرد. موریدەکانی تەرمەکەیان بردووەوە بۆ خەتلان و لەوێ بە خاکیان سپارد.

بابا عەلی لە ساڵی ٦٧٣ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

دوای خۆی سێ کوڕی لێ بەجێماوە: سەیید مووسا و سەیید عیسا و سەیید محەمەدی نووربەخشی. ئەم کوڕانە هەرسێکیان لە خزمەتی خواجە ئیسحاقی خەتلانیی خەلیفەی باوکیاندا سلووکیان کردووە هەتا ئیجازەیان وەرگرتووە و گەییونەتە پایەی ئیرشادکردنی موسوڵمانان.

سەیید محەمەدی نووربەخشی لە هەمەدانەوە چوو بۆ هەرات و لەوێ خەریکی ئیرشاد بوو، تا کۆچی دوایی کرد. دوای خۆی سێ کوڕی لێ بەجێما: سەیید جەعفەر و سەیید محەمەد و شاه قاسم.

لە قاسم بەهائەدین و شەمسەدین بەجێماوە و لە جەعفەر قیوامەدین بەجێماوە و لەو رۆژەوە نەتەوەیان لە شاری هەرات و وڵاتی ئەفغاندا لە زیادەدان.

سەیید مووسا و سەیید عیسایش پاش کۆچی باباعەلی بە هیوای حەج و زیارەتی پێغەمەر ـ د ـ رێگەی حیجازیان گرتەبەر و، بە یارمەتی خودا گەییشتنە ئەوێ و مەناسیکی حەجیان بەجێ هێنا و، زیارەتی پێغەمەریان کرد و، پاش ماوەیەک گەڕانەوە بو وڵاتی خۆیان و لە گەڕانەوەدا بە کوردستاندا گەڕانەوە، کاتێک گەییشتنە

ناحیەی بەرزنجەی ئێستە کە جێگایەکی فێنک و کوێستانی‌یە ماوەیەک لەوێ بۆ وچان‌دان دادەنیشن، ئەمەیش لە رێکەوتی ٦٨٦ی کۆچیدا بووە کە حسابی ئەبجەدەکەی پیتەکانی «خوف»...

وا دەگێڕنەوە شێخ مووسا کە براگەورە بووە لە خەودا بە خزمەتی پێغەمەر گەییشتووە و فەرمانی پێداوە کە لەو شوێنەدا بمێننەوە و نەگەڕێنەوە بۆ هەمەدان، دەڵێن: هەر لە خەودا جێگەی مزگەوتیان بۆ دیاری دەکات و کانی و ئاوێکی کوێراو لەو شوێنەدا دەبێت و پێغەمەر ـ د ـ پێی موبارەکی دەخاتە ناو ئاوەکە بۆ زۆربوونی ئاوەکەی. جا لە بەیانیی ئەو شەوەدا بە ناونیشان شوێنی مزگەوتەکە ئەدۆزنەوە و بڕیار ئەدەن لەو شوێنەدا مزگەوت بکەنەوە و لەوێدا بمێننەوە و لە بەر ئەوەی پیاوچاک و دۆعاگیرا و دڵ‌ڕووناک ئەبن... رۆژ بە رۆژ موسوڵمانان لێیان گرد ئەبنەوە و مزگەوتەکە دروست دەکەن و خەریکی خزمەتی موسوڵمانان دەبن.

شێخ مارفی رێشەڵانی ئەم شیعرانەی خوارەوەی نووسیوە لێرەدا بۆ یادگار تۆماریان دەکەین:

شەو کەردەن غورووب خورشید و قەمەر
یاوان وە حوزوور زات پەیەمبەر
وە لەفز شیرین ئەمرش فەرماوا:
بکەردێ ئینە وە زێد و ماوا
بکەردێ بینای مزگی و جەماعەت
پاسەش ئەمر کەرد ساحیب شەفاعەت
خەت کێشا یاگە مزگی وە عەسا
سەیید بۆسە کەرد پێشانی عیسا
چون هەردوو برا حەزرەت «شیخین»
کەرد بەی تەورە ئەمر شاە حەرەمەین
تەشریفش ئاوەرد قەدەم کەرد رەنجە
کەردشان پەی دین چەن یانە «زنجە»

یەک ڕوێ نەبێ ئەو هەردوو حاڵزان
گێران ڕاحەتێ تا مەغریب بە ئان[1]

وە لەو سەردەمەدا حاجی شێخ خالیدی کاژاوی کە لە نەتەوەی شێخ محەمەد «تاج العارفین» بووە ئاموشۆی زۆر ئەکردن و ڕێزی ئەگرتن بەو یاسای کە لە وڵاتی کوردستاندا باوە بەرابەر بە غەریبان و دڵنەوایی کردنیان.

وە هەر لەم ڕووەوە بووە کە فاتمەی کچی خۆی لە شێخ مووسا مارەبڕیوە، کە براگەورە بووە و تا لەم ڕێگەوە زیاتر دڵنەوایی‌یان بکات.

سەیید محەمەدی مەدەنیی موفتی مەدینەی مونەووەرە، کوڕی شێخ بابارەسووڵی بەرزنجی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: لە کاتی دروست‌کردنی مزگەوتی بەرزنجەدا یەکێ لە رایەڵەکان کورت بوو، جا شێخ عیسا و شێخ مووسا یەکی سەرێکی ئەو رایەڵەیان گرتووە و رایان کێشاوە و بە میهرەبانی خودا رایەڵەکە ئەوەندە درێژ بووە لە هەردوو سەرەوە لە ئەندازەی خۆی زیادی کردووە. جا سەیید محەمەدی مەدەنی بە شیعر نووسیویە:

جذعان فخري يشهدان بمجدي:
جذع هنا قد كان قبل لجدي،
ثان ب«برزنجة» بمسجدها الذى
موسى و عيسى اسساه بجدّ
جدّي و عمي امتد في ايديهما
اعظم بخارق جذعنا الممتد
من لم يصدقنا ليسأل من هنا
من اهل بلدتنا ليكسب ودّي

وە مەبەستی لە «جذع هنا قد كان» ئەو کۆڵەکە بووە کە لە مزگەوتی حەزرەتدا بووە لە مەدینە و، لە کاتی خوتبەداندا پاڵی پێوە داوە و پاش‌ئەوەی کە مینبەر دروست

---

[1] ـ ئەم شاعیرە نازناوی «سزائی»یە و، مەبەستی لە دواشیعر ئەوەیە کە ئەم دووانە هەموو کاتی خۆیان لە خزمەتی دیندا بەسەر بردووە و کاتیان بە خۆڕایی ڕانەبواردووە.

کراوە و ئیتر حەزرەت پاڵی پێوە نەداوە ئەو دارە دوو سێ جار بە ئاگاداری هەموو دانیشتووانی ئەو جێگە دەنگی لێوە هاتووە! جا حەزرەت لە مینبەرەکە هاتووەتە خوارەوە و باوەشی کردووە بەو دارەدا و ئەویش بێدەنگ بووە.

دیارە ئەمە موعجیزەیەکی گەورەیە ئەگەر لە موعجیزەدا «تحدی» مەرج نەبێ، وە ئەگەر مەرج بێ ئەوە کەرامەتێکی گەورەیە هەروەها درێژبوونی ئەو دارەیش کە کردوویانە بە رایەڵ و بە کەرامەتی ئەو دوو زاتە درێژ بووە.

وە هۆی ناوبردنی ئەو دێ بە بەرزنجە ئەمەیە کە لە کاتی دروستکردنی مزگەوتەکەدا لەو شوێنەدا چەن هۆدە و نیشتمانێ لە پشتی مزگەوتەکەوە بووە کە بە قامیش دروست کراون خانووی لەقامیش دروستکراویش بە «زنج» ناو ئەبرێت. وە ئەو مزگەوت و ئاواییە کەوتوونەتە بەردەمی زنجەکان، واتە خانووەکانی بەردەمی زنجەکان.

ئەبوسعوودی موفتیی ئەستەمووڵ لە نامیلکەی «روضة الجنان»دا نووسیویەتی: کاتێ شۆرەتی پیرۆزیی و هیمەتی شێخ مووسا و شێخ عیسا لە وڵاتەکەدا بڵاو بووە وە گەلێ لە موسوڵمانان هاتن تەریقەتیان لە خزمەتدا وەرگرتن، هەروەها گەلێ لە شیعە نەسیرییەکانیش هاتنە خزمەتیان و ڕێبازی سونەتیان وەرگرت، چونکە لەو سەردەمەدا نەسیری، یانی شیعەی «علي‌الله»ی، لە شارەزووردا زۆر بوون.

هەروا لەو سەردەمەدا مستەفاخانی نەسیری بە فەرمانی دەوڵەت فەرمانداری ناوچەی شارەزوور بووە و، ئاژاوەچی‌یان و ئەوانەی پیشەیان دووزمانی بووە هەواڵیان داوە بە خان کە دوو نەفەر لە سادات هاتوون وان لە ناوچەی شارباژێڕا و خەڵکێکی زۆریان لێ گردبووەتەوە و لەوانەیە ئەگەر بەم جۆرە بڕۆن پەرە بستێنن و ناوچەکە بگرنە دەستی خۆیان. جا ئەویش کەوتە مەترسییەوە و چوار پیاوی نارد کە لە پەنامەکیدا ئەو سەییدە بکوژن. وە لەو شەوانەیشدا سەیید مووسا لە خەودا بە خزمەت پێغەمەر گەییشتووە و پێی فەرمووە: کوڕم نزیکە شەهیدت بکەن و بێیت بۆ لام. وە لە سبەینێدا ئەم خەوەی بۆ سەیید عیسای برای گێڕاوەتەوە.

جا سەیید مووسا لە سەر پیشەی خۆی شوێنێکی تایبەتی بووە چووە لەوێدا بەندەیی خودای کردووە. ڕۆژێک ئەچێ بۆ ئەو شوێنە و ئەو پیاوە ناپیاوانە هەلیان چنگ دەکەوێت و لەوێدا سەیید مووسا شەهید ئەکەن.[1]

کاتێ خەڵکی بەرزنجە ئەمەیان بیست چوون تەرمەکەیان هێنایەوە و لەو گۆڕستانەدا کە ئێستە هەیە بە خاکیان سپارد. ئەم ڕووداوە لە ساڵی ٦٩٦ی کۆچیدا بووە.

وە بە ماوەی مانگێ دوای ئەم ڕووداوە سوپای دوژمن هات بە سەر مستەفاخانی نەسیریدا و تەفر و توونایان کردن.

جا لە پاش ئەم ڕووداوە سەیید عیسا بە تەنیا مایەوە و خەریکی خزمەتی دین و ئیرشادی موسوڵمانان بوو. وە تەریقەتەکەی بە «نوربخشیە» ناوبانگی دەرکرد، چونکە وەک تەریقەتی لە خواجە ئیسحاقی خەتلانی وەرگرتبوو... لە سەیید محەمەدی نووربەخشی براگەورەی خۆیشی وەرگرتبوو.

دوای ماوەیەک سەیید عیسا فاتمەخانی براژنی خۆی مارە کرد و، بە میهرەبانی خودا چەند کوڕی خاوەنبارەی لێ بوو، وەکوو لەمەولا باسیان ئەکەین.

جا دەور بوو بە دەوری شێخ عیسا و گەلێ پیاوی بە توانا و خاوەن پایە هاتنە خزمەتی و تەمەسوکیان پێ کرد. ئەڵێن: ئەمانەی ناویان دەبەین لە موریدەکانی شێخ عیسا بوون: شێخ ئەبووسوعوودی بەغدادی و شێخ مەحموودی شەبەستەریی شەرحکەری «گوڵشەنی ڕاز» و شێخ داودی دانەری نامیلکەی هۆنراوەی «بیا داود» کە تیایدا دەڵێ:

بیا داود بە گورستان گذر کن
مقامی خود ببین عزم سفر کن

ئەم شێخ داودە گێڕاویەتییەوە ئەڵێ: ۷ ساڵ لە خزمەتی شێخ عیسادا بووم، گەلێ جار ئەمبینی کە شێخ عیسا پاش نوێژی عیشا هەتا بەرەبەیان خەریکی خوداپەرستی دەبوو و نوێژی سبەینێی بە دەسنوێژی عیشاوە کردووە و زۆر لەخوداترس و

---

۱ ـ لە کتێبی «ترجمة الاشراف»دا ئەڵێ: سەیید مووسا بە دەستی تیرەی «نیل خاس» کە لە ناوچەی «ئاغجەلەر»دا بوون شەهید کراوە و سەیید عیسای برای هاتووە تەرمەکەی بردووەتەوە لە بەرزنجە بە خاکی سپاردووە.

دنیانەویست بووە و هەموو کاتێ هانی داون بۆ داوای لێخۆشبوون لە خودا و ئەیفەرموو: لەگەڵ ئەوەدا کە خودا بە پێغەمەری فەرمووە: «لیغفر لک الله ما تقدم من ذنبک و ما تأخر» پێغەمەر رۆژی ٧٠ جار داوای لێ خۆشبوونی لە خودا کردووە.

وە ئەیفەرموو: هەموو گوناهێ بە گەورە بزانن هەرچەن بچووک دیار بێ. وە چاکەتان بە کەم بزانن هەرچەن زۆر بێت. وە ئەیفەرموو: ساڵێکی تەواو لەسەر کێوی «کورەکاژاو» مامەوە بۆ بەندەیی کردن بۆ خودا و، دوورکەوتنەوە لە قەرەباڵغی و لەوێدا بە خزمەتی حەزرەتی خدر گەییشتم فەرمووی:

«یا ابا عبدالکریم! احبک الله و عاملک باللطف الجمیل، و کان لک صاحبا فی‌المقام و الرحیل».

وە ئەیفەرموو رۆژێ بانگ‌کەرێ دای بە گوێچکەما: ئەگەر ئارەزووی ئێمەت هەیە ئەبێ هەموو تەمەنت بە بەندەیی بۆ ئێمە تەواو بکەیت و واز لە غەیری ئێمە بێنی. وە ئەیفەرموو ئیمام ئەو کەسە نییە لە سنووری خودا لابدا هەرچەن شوێن‌کەوتووی زۆر بن، بەڵکو ئەوە ستەمگەرە و ستەمگەر نابێ بە ئیمام و پێشەوا. وە هەر کەسێ خۆی لە تاوان لابدا و، لە نافەرمانیی خودا دوور بکەوێتەوە و خۆی بگرێت لەسەر ئەو دەرد و بەلایەی کە دوچاریان دەبێت... ئەوە پێشڕەوە هەرچەند شوێن‌کەوتوویشی کەم بێت.

وە ئەیفەرموو: ئەو کەسەی هەمیشە خەریکی داواکردنی دنیا بێت گیرۆدەی کزی و داماوی و بێڕێزی دەبێت، وە کەسێ خۆی بە شتی پووچ جوان بکات ئەوە بایی دەبێت. وە ئەیفەرموو: بە سوودترینی زانست زانیاری بەندەیی خودا و خوداپەرستی‌یە. وە ئەیفەرموو: یەکەم شتێ ئادەمیزاد پێی بەرز ببێتەوە زانیاری‌یە و دەسکەوتەکەی کردەوەی باشە.

ئەبووسعوودی خەلیفەی رۆژێ لێی ئەپرسێت: هۆی جوانی ناوچاوانی تۆ چییە؟ ئەویش ئەفەرموێت: بە خزمەتی حەزرەت گەییشتم و ناوچاوی ماچ کردم و ئەو رووناکی‌یە نیشانەی پیرۆزی لێوی ئەوە.

مەلا داودی خەلیفەی ئەڵێ: رۆژێک لە خزمەتیدا بووم بە سەفەر چووین بۆ شارەزوور، چووینە دێیەک لەو کاتەدا خەڵکەکە خەریکی زەماوند بوون و بە «رەش بەڵەک» هەڵدەپەڕین عەرزم کرد دۆعایەک بکە لەم کۆمەڵە پەستە هەواپەرستە تا خودا لە ناویان بەرێ. فەرمووی: نە، بەشکو خودا باشیان بکات و رەفتاریان بگۆڕێت.

لە پیرۆزیی دۆعاکەی شێخەوە ئەو خەڵکە حاڵیان گۆڕا و، روویـان کـردە شـێخ هـاتن تۆبەیان کرد و، تەریقەتیان لێ وەرگرت و گەڕانەوە بۆ سەر دینداریی و خوداپەرستیی.

ئەم زاتە بە هاوڕێتی پیاوی دنیا زۆر وەڕس و پەست دەبوو و بـە هـاوڕێتی هـەژاران شادمان دەبوو.

شێخ هیدایەتی حەسەنئاوایی ـ خ ـ فەرموویەتی: گەلێ جار بە چاوی خۆم دیومـە کە شێخ عیسا بە کۆڵی خۆی ئاردی بردووە بۆ ماڵی هەتیو و، داماو و، هەژاران و گەلێ جاریش چیلکەی بە شانی خۆی هەڵئەگرت و ئەیدا بە هەتیوباران و پیرەژنان.

شێخ عیسا زانا بووە بە زانیاری ئایینی و یاسـای وا بـووە هـەموو رۆژێـک لـە پـاش نیوەڕۆدا دەرسی گوتووەتەوە و ئامۆژگاریی موسوڵمانانی کـردووە و پـاش عەسـرانیش قورئـانی خوێنـدووە و لـە شـەوەکانا لـە گۆشـەی تایبـەتی خۆیـدا خـەریکی زیکـر و ویردخوێندن و بەندەییکردن بۆ خودا بووە و تەمەنی بەمجۆرە بەسەر بـردووە و هـیچ کات لە خودا بێئاگا نەبووە.

شێخ عیسا لەگەڵ ئەمانەیشدا کە باس کران حەزی لە ئـەدەب کـردووە و هەسـتی شیعری بووە. ئەم شیعرانەی خوارەوە لە شیعری ئەون:

| | |
|---|---|
| کائنـات اسـت جسـم مـا جـانیم | واصــلان را دلیـل و برهــانیم |
| خـــاتمی اولیـــای دور قمـــر | وارث فقـــر شـــاه مـــردانیم |
| گرچـــه مرغـــان عشـــق بســیارند | همچـــو عنقـا امیــر ایشــانیم |
| میهـــر جـــامعیم جملـــه کـــون | هرچه بوداست هسـت مـا آنـیم |
| گر چه در ملـک عشـق عـالم فقـر | بـــر ســـریر شـــهود ســلطانیم |
| نـــور بخشـــیم بـــر همـــه عـــالم | بـــر ســـپهر کمـــال تابـــانیم |
| هر که بینا است دیده است که من | عیســـی مـــریم آل عمـــرانیم |

وە حەزرەتی شێخ مەعرووفی نۆدێیی ـ خ ـ چەند شیعرێکی بە عەرەبی لە سـتایش و رەوشتی شێخ عیسادا داناوە لێرەدا بۆ یادگار دەیاننووسین:

| | |
|---|---|
| الشیخ عیسی قطب اهـل عصره | و واحـــدی وقتـــه و دهـــره |
| اول مـــن أقـــام فـــی «برزنجـــه» | یرشـــد بالحجـــة للمحجـــة |

لمـا بنـی مسـجدها اذ قـد أمـر　　بذاک فـی المنـام سـید البشـر
قصـر عـن جـانبی الجـدار[ی]　　جـذع فمـده بـأذن البـاری
علـی یدیـه ظهـرت خـوارق　　جلیلـة تشـهده الخلائـق

کان من مشـایخ الاکـراد، و کـان سـیدا کبیـرا، عالمـا، صـالحا، زاهـدا، وارعـا، صـاحب المکاشفات و خوارق العادات، له لسان فی التوکل، حسن الکلام و العبارات، و هـو اول مـن تکلم فی علم الاحوال بکردستان، یقصده الناس بالزیارات من اقصی الاقطـار، و صـحب ابـا اسحاق الختلانی، والشیخ محمود البرزقانی و السید محمد النوربخشی، و دخل الی‌العـراق والحجاز، و حج مرات، وزار المدینة المنورة. علی صاحبها الصلاة والسلام.

**نەوەکانی شێخ عیسا**

حەزرەتی شێخ عیسا لە «بەرزنجە»دا لەسەر بەرماڵی ئیرشـاد دانیشـت و ئیرشـادی موسوڵمانانی کرد و دڵی موریدەکانی رووناک کردەوە، تا لە ساڵی ٧٥٤ی کۆچیـدا لـە دێی بەرزنجەدا کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێ بە خاک سپێرراوە.

ئەم زاتە ـ وەک مەشهوورە ـ ١٢ کوڕی لە فاتمەخانی خێزانی بووە، کە هەر یـەکێ لەوانە وەکوو چرایەک وابوون بۆ موسوڵمانان:

یەکەم: سەیید عەبدولکەریم کە یـەکێ بـووە لـە پیاوچاکـە گـەورەکانی چـەرخی خۆی.

دووەم: سەیید محەمەدسادق، کە لەسەر شوێنێکی دیاریی و ناسراو بە ناوی خۆیەوە لە شارەزوور نێژراوە.

سێهەم: سەیید محەمەدی رۆخانە کە لە دێیەک لە گوێ چەمی سیروان لە کۆتایی خاکی «نەورۆڵی پارچە» لە جەنووبی رۆژاوای هەڵەبجەدا بوو دانیشتووە. ئەم زاتـە لـەو شوێنەدا جیهانی بەجێ هێشتووە و لە گۆڕستانی ئەو دێـدا بـە خـاک سـپێرراوە و لـە ساڵی ١٣٨٠ی کۆچیدا لە ترسی بەژێرەوە بوونی بـە ئـاوی دەریاچـەی دەربەنـدیخان تەرمەکەی گوێزرایەوە بۆ گۆڕستانی دێی «گوندە» کە یەکێکـە لـە دێکـانی «نەورۆڵـی پارچە» و لەوێدا دووبارە بە خاک سپێررایەوە.

چوارەم: سەیید ئیسحاق کە لە گوندی شێخانی گوێ چەمی سیروان لە خۆرهەلاتی دێی «نەوسوود» لە خاکی «لهۆن»دا نێژراوە. ئەو زاتە ئێستە بە سولتان ئیسحاق ناسراوە.

ئەم زاتە لە سەردەمی خۆیدا کەراماتی زۆر بووە، بەلام هەندێ لە مەنسووبە نەزان و نەفامەکانی گەلێ خەرافات و شتی پڕ و پووچ و بیر و باوەڕی نارەوا و نادروستیان خستە سەر ڕێباز و یاسای تەریقەتەکەی سەیید ئیسحاق کە ئەو زۆر لەو شتانە دوور بووە و پیاوچاک و موسوڵمانی ڕاست بووە.

پێنجەم شێخ ویسال و شەشەم شیخ جەمال و حەوتەم شیخ کەمال و هەشتەم شێخ عەباس. ئەم شێخ عەباسە لە گوندی «ولووبە»ی جەنووبی شاری سلێمانیدا کۆچی دوایی کردووە. هەندێ دەڵێن: ئەو سێ کوڕە لە دێی «ئالیاوا»ی شارباژێڕدا بە خاک سپێرراون. وە هەندێکی دیکە دەڵێن: لە خواری دێی «گلەزەردە»وە نێژراون.

نۆهەم و دەهەم: سەیید حەسەن و سەیید حسەین، ئەم دوو زاتە هەر لە دێی بەرزنجەدا لە ساڵی ٩٠٠ی کۆچیدا کۆچی دوایی‌یان کردووە و هەر لەوێیش بە خاک سپێرراون.

ناوی ئەو دوو کوڕەکەی تری سەیید عیساـ یانی یازدەهەم و دوازدەهەم لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە دەست نەکەوتووە تا لێرەدا تۆماریان بکەم.

وە گەلێ جێگەی داخە کە نووسەرەکانی «بحرالانساب»ی بەرزنجەیی‌یەکان ـ ئەوەی لە بەردەستدان ـ جگە لە ناوی ڕشتە کوڕەکانی سەیید عیسا ئەوانەیان کە جێگەدار بوون بە هیچ جۆرێ ناوی کوڕەکانی دیکەیان نەنووسیوە. بۆ نموونە ناوی نەوەکانی سەیید سادق و سەیید محەمەدی ڕۆخانە و سەیید ئیسحاقی سیروان و ویسال و جەمال و کەمال و عەباسیان نەنووسیوە، وەکوو ئەوە کە هەر بە تەنیا کوڕانی ڕشتەی جێگەدارەکانیان شیاوی نووسین بن و بەس!

وەکوو موتەواتەر وەهایە کە سەیید ئیبراهیمی مودەڕیسی ئەمیر حەمزەی بابان لەبەر قەلای مەریواندا کە بە «کابل» واتە کورتکراوەی کاکەبلە ناسراوە... ئەڵێن: ئەم سەیید ئیبراهیمە لە نەوەی سەیید مەحموودی کوڕی سەیید عەبدولکەریمی کوڕی سەیید عیسایە و کەسیان ناویان نەنووسراوە.

هەروەها گەلێ لە سەیدەکانی پشت کێوی بەرزنجە و دەوری سووورداش و شینکایەتیی لە نەوەی سەیید عیسان و بە بۆنەی ئەوەوە کە باپیرەکانیان نەنووسراون رشتەی نەسەبیان ون بووە.

**سەیید عەبدولکەریمی کوڕی سەیید عیسا**

ئەم زاتە چاکترینی کوڕانی سەیید عیسا بووە لە بارەی زانیاری و ڕێز و گەورەیی‌یەوە و، لە جێگەی باوکیدا دانیشتووە.

دەگێڕنەوە: کە ئەم سەیید عەبدولکەریمە خاوەن تەسەڕوفی ڕۆحیی بووە و هەموو مورید و خەلیفەکانی باوکی دانیان بەمەدا ناوە. وە شێخ عیسا خەریکی خزمەتی دین و ڕێنومایی موسوڵمانان بووە و موسوڵمانان گەلێ سوودیان لە ئامۆژگاری و پیرۆزیی ئەم زاتە وەرگرتووە.

ئەبوسعوود ئەڵێ: ڕۆژێک بە بەردەمی گۆشەکەی سەیید عەبدولکەریمدا ڕابوردم، ئارەزووی گۆشتی برژاوم کرد، تەماشام کرد کە سەیید عەبدولکەریم لە گۆشەکەی خۆی هاتە دەرەوە و مووچەیەک ـ پارووپەکـی بە دەستەوە بوو، دایە دەستم و فەرمووی: ها ئەبوسعوود فەرموو بیخۆ! کە کردمەوە تەماشام کرد گۆشتی برژاوە و شوێنەواری ئاگر و دووکەڵیشم لەوێدا نەبینی، تێگەییشتم کە هەر بە کەرامەت ئەو گۆشتەی دەستکەوتووە و دای بە من.

دەڵێن: سەیید عەبدولکەریم لە زستاندا میوەی هاوینە و لە هاویندا شتی زستانەی لە لا دەست کەوتووە.

ئەم زاتە لە ساڵی ٨٤٥ی کۆچیدا لە بەرزنجە کۆچی دوایی کردووە و بایەزید کە چاکترینی کوڕەکانی بووە لە جێگەکەیدا دانیشتووە.

**سەیید بایەزید**

ئەم زاتە پیاوێکی زانا و بەڕێز و لەخوداترس و دنیانەویست... بووە.

مەولانا فەخرەدینی تەبرێزی گێڕاویەتی‌یەوە دەڵێ: ڕۆژێک لە خزمەتی سەیید بایەزیددا بووم، پیاوێکی بەرزنجەیی هات ئیزنی خواست بڕوا بۆ سەفەرێک. ئەویش فەرمووی: ئەمڕۆ مەڕۆ نەکا یەکێک لەم کاتی ساردی‌یەدا بمرێت و بۆمان نەشارێتەوە،

کابرا نەڕۆیشت و لەوێدا مایەوە، پاش ئەوە لە ناکاوا لەرزی و کەوت و مرد! ئێمە هەموومان کەوتینە زەحمەتەوە تا شاردمانەوە.

سەیید بایەزید زۆر دڵی ناسک بووە، کاتێک ئامۆژگاری‌یەکی ئایینی لە زانایەکەوە دەبیست دەستی دەکرد بە گریان و هەندێ جار ئەوەندە تێک ئەچوو وەکوو بێهۆشی لێ ئەهات، جا پاش ماوەیەک ئەهاتەوە سەرخۆی.

سەیید بایەزید تەمەنی خۆی لە خزمەتی دیندا بەسەر برد، تا لە ساڵی ۹۲۲ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و سەیید حسەینی کوڕی چاکترینی کوڕانی بووە.

لە سەر گومانی ئەوەی کە سەیید ئیبراهیمی بە «کابل» ناسراو لە نەوەی شێخ مەحموودی کوڕی سەیید عەبدولکەریم و ئامۆزای سەیید حسەینی کوڕی سەیید عەبدولکەریمی کوڕی سەیید عیسایە و من خۆیشم باوەڕم لە سەر ئەوەیە کە ئەمە راستە وا لێرەدا باسی «کابل» دەنووسم:

### کابل

یانی کاکە بلە واتە کاکە ئیبراهیم، وا مەشهوورە کوڕی سەیید مەحموودی کوڕی سەیید عەبدولکەریمی کوڕی سەیید عیسایە. ئەم زاتە زانا و بەڕێز بووە و گەشتچی و گەڕیدە بووە. لە سەردەمی خوێندندا بە وڵاتی ئیسلامدا گەڕاوە و بیستوومانە کە سەیید ئیبراهیم چووە بۆ میسر و گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی خۆمان و لە ناوچەی «مەریوان»دا دامەزراوە و بووە بە مودەڕیسی ئەمیر حەمزەی بابان.

ئەم بابانانە لە پێش بابانی عیراقدا بوون و لە مێژووی شەشسەدی کۆچی بەرەوژوور ناویان هەیە و، زۆربەیان لە وڵاتی عەجەمدا فەرمانڕەوا بوون و ناوی میرعەبدولکەریم و میر ئەحمەدخان و میر سەعدوڵلا و، ئەمیر حەمزەی بابان بە موناسەبە لە ناو باسی سەییدەکان و زانایانی وڵاتدا دێن.

وە ئەم ئەمیر حەمزە زۆر خاوەن هێز و دەستەڵات بووە و کتێبی «تذكرة الاجناد، فی محاربة الاتراک والاکراد» ئەم ناوانە باش دەردەبڕێت. میرحەمزە لە مێژووی ۸۰۰ی کۆچیدا شەڕی لەگەڵ تورکی «جلایری»دا بووە و گەلێ وڵاتی داگیر کردووە.

ئەم میرحەمزە سوپاکەی خۆی لە شانی کێوی «بەرقەڵا»ی مەریواندا گرد کردووەتەوە و شوورایەکی بە دەوردا کێشاون و لە تەنیشتی شووراکەوە مزگەوت و

خوێندنگایەکی زۆر چاک و لە باری دروست کردووە و سەیید ئیبراهیمی بە «کابل» ناسراوی کردووە بە ماممۆستای ئەو خوێندنگا و، شێخ ئەحمەدی نەعێمیی ناسراو بە «ابن الانبار» پێش‌نوێژی مزگەوتەکە بووە و مزگەوتەکە بە «مسجد السور» ناسراوە.

وە میرحەمزە سوپایەکی باش پێکەوە دەنێت و لەگەڵ تورکەکاندا بەشەڕ دێت و لە ئەنجاما لە شاری بەعقووبەدا بە دەرمانخواردکراویی کۆچی دوایی دەکات.

بەهەرحاڵ «کابل» لەو سەردەمەدا مودەڕیسی ئەمیر حەمزە بووە و زۆر بەڕێز و پایە بووە و چەن پارچە زەویی دەست کەوتووە، وەکوو: دێی «نەوڵو» لە نێوان «دەرەتفێ» و «کانی سانان» و «نەی» دا.

وە ئەم زەوییانەی وەقف کردووە و موڵکەکانی کردووە بە ٦ بەشەوە: بەشێ وەقفی مزگەوت و بەشێ بۆ میوان و بەشێ بۆ قوتابی عیلم و سێ بەشەکەی دیکەی بۆ نەوەی نێرینەی خۆی.

وە بەم شێوە ژیانی بەسەر بردووە و خەریکی دەرس‌وتنەوە و خزمەتی دین بووە و گەلێ موریدی باشی بووە و گەلێ زانا لە لای ئەو خوێندوویانە و لە سەر دەستیدا پێگەییشتوون. یەکێ لە موریدەکانی پیر مستەفا بووە کە ئێستە بە پیرسەفا ناسراوە و گۆڕەکەی لە نزیکی گوندێکدایە بەو ناوە. وە لەو زانایانەیە کە لە سەردەستیدا خوێندنیان تەواو کردووە: «عەللامەی کازرونی» کە لە لاواندنەوەی مامۆستاکەیدا دەڵێت: مامۆستام ئەگەرچی شافیعی مەزهەب بوو بەڵام لە شەرعی حەنەفیدا ئەبویوسفی دوەم بوو.

دەڵێن: کابل لە مێژووی ٨٢٣ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە. جا ئەگەر ئەو قسە راست بێ کە «کابل» کوڕی سەیید مەحموودی کوڕی سەیید عەبدولکەریمە ئەبێ لە پاش ئەو مێژووە کۆچی دوایی کردبێت.

### سەیید حسەینی کوڕی سەیید بایەزید

ئەم زاتە کە چاکترینی نەوەی سەیید بایەزید بووە لە جێگەی باوکیدا دانیشتووە و دەستی کردووە بە خزمەت‌کردنی موسوڵمانان و لەبەر ئەوە کە زانای زاهیر و باتین بووە خزمەتێکی راست و باشی کردووە.

ئەم زاتە زۆر لەخوداترس و گـوێبەدنیانـەدەر بـووە و بـە زۆری لـە سـەر حەسـیر دانیشتووە و شەربەتی هەندێ دانەوێڵەی لە لای خۆیدا دائەنا و بەوە دائەکەوت. ئەمـە لە قسەی ئەوە: «حەرام لە یەک شوێندا ئەهوەن‌ترە لە حەلالا [لە] چەند شوێندا» واتە ئەگەر مرۆ لە یەک شوێندا خواردەمەنی حەرام بخـوات و دەسـتبـەردار ببێـت لـەوە چاکترە بڕوات بۆ گەلێ شوێن بە هیوای حەلاڵ پەیداکردن و ماڵـوماڵ بسـووڕێتەوە، چونکە ئەم کارە گەلێ شتی ناڕەوای لێ پەیدا ئەبێت.

وە هەندێک جار بە موریدەکانی ئەفەرموو: زەخیرەی زۆر لە ماڵـی خۆتانـدا راگـیر مەکەن، ئەوەندە نەبێ کە بەشی کاروانێک بۆ ماوەی رۆییشتن و هاتنەوەی.

ئەم زاتە خاوەن‌پایە بە مەردانە خزمەتی دینی کرد هەتا لە ساڵی ٩٣٢ی کۆچیدا لە بەرزنجەدا کۆچی دوایی کردووە.

باشترینی نەوەی ئەم زاتە سەیید عیسای بە عیسای «احدب» ناسراو بووە.

### سەیید عیسای ئەحدەب

ئەم زاتە پیاوێکی زانا و لەخوداترس بووە و زۆر لـە ترسـی خـودا ئـەگریا و، عیلمـی زاهیر و باتینی دەزانی.

لە منداڵی‌یەوە خەریکی خوێندن بووە و پاش تێگەییشتن و پێگەییشتن بـۆ زیـادە خوێندن شاران و ولاتان گەڕاوە و چووەتە حیجاز و بە خزمەتی گـەلێ لـە پیاوچاکـان گەییشتووە و لە خزمەتی سەیید حەسـەنی باوکیـدا تەمەسـوکی کـردووە و بـە پایـە گەییشتووە.

وە یاسای وابووە لە سبەینێوە تا نیوەڕۆ هـەر دەرسـی گوتووەتـەوە و پـاش نیـوەڕۆ قورئانی خوێندووە و پاش عەسریش خەریکی حاڵی خۆی بووە و لە شەوەکانیشـدا لـە هۆدەی تایبەتیی خۆیدا کاتی بەسەر بردووە.

وە هەندێ جاریش شەو تا بـەیانی نەخـەوتووە و خـەریکی خوداپەرسـتیی بـووە و فەرموویەتی: «هر شب شب قدر است اگر قدر بدانی» وە لە پـاش نـوێژی چاشـتە نـوێژ ئەندازێک نوستووە و گەلێ دوور بووە لە دنیا و ئەهلی دنیا.

پرسیاریان لێ کردووە: کێ ئەگا بە خودا؟ ئەویش لە وەلامدا فەرموویەتی: «هر کس طمع از خود بریده بحق رسیده».

دەگێڕنــەوە: ڕۆژێــک لــە کۆمەڵــی دانیشــتنی ســەیید عیســادا یــەکێک قورئــان ئەخوێنێت، کاتێک ئەگاتە ئەم ئایەتە: «انا عرضنا الامانة علی السماوات والارض و الجبــال فأبین أن یحملنها و أشفقن منها، و حملها الانسان انه کان ظلوما جهـولا» ســەیید عیســا هاوارێکی کردووە و ئەم شیعرەی حافیزی شیرازیی خوێندووەتەوە کە دەڵێ:

آسمان بار امانت نتوانست کشید قرعه فال بنام من دیوانه زدند

دوای ئەوە حاڵی تێکچووە و سەری دانەواندووە و پشتی کووڕ کردووەتـەوە، ئیتـر دوای ئەوە پشتی نەچووەتەوە سەر حاڵی خۆی و هـەروا بـە کـووڕیی ماوەتـەوە و بـە سەیید عیسای ئەحدەب ـ واتە پشت کووڕ ـ ناوبانگی دەرکردووە.

دەگێڕنەوە: کە شـێخ عیسـا فەرموویـەتی: جارێـک بـە خزمـەتی حـەزرەتی خـزر گەییشــتم دەســتی بەســەر چاوەکانمــدا هێنــا و فــەرمووی: ســوودی ئــەم دەســت پێداهێنانی منە بەسەر چاوتا چییـە؟ فـەرمووی: سـوودەکەی ئەوەیـە لەمـەولا شـتی حەڵاڵ لە شتی حەرام جیا ئەکەیتەوە.

لەو کاتەوە هەر خۆراکێ بێتە بەردەمم ئەگەر حـەرام بـێ دووکەڵـێک بەسـەریەوە ئەبینم و ئەزانم ئەو شتە حەرامە.

شێخ عیسا وەکوو لە خزمەتی شێخ حسەینی باوکیـدا سـلووکی کـردووە هـەروەها چووەتە بەغدا و لە لای شێخ عەبدولفەتاحی تەرسووسـی تەریقـەتی وەرگرتـووە و لـە خزمەتی ئەویشدا بـووە بـە خەلیفـە و خەرقـەی کراوەتـە بـەر و ئیجـازەی ئیرشـادی دراوەتێ، جا دوای ئەمانە گەڕاوەتەوە بەرزنجە و ئیرشـادی کـردووە، هـەتا لـە ساڵـی ٩٤١ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

شێخ عیسـا دوو کـوڕی لـێ بـەجێماوە: یەکـەم سـەیید محەمـەدی ناسـراو بـە «میرەسوور». دووەم: سەیید عەبدوسسەیید. جا سەیید محەمەدی میرەسوورە چووە بۆ شارەزوور لە نزیکی سەرچاوەی «شەلم» لە بناری کێوی هەوراماندا نیشـتەجێ بـووە و ئاوایییەکە بە ناوی خۆیەوە بە «میری سوور» ناسراوە. وە لەو جێگەدا خەریکی ئیرشاد بووە و کەرامەتی زۆر بووە و بە زۆری هەر شێتێکیان بردووە بۆ خزمەتی بە میهرەبـانی خودا شیفای بۆ هاتووە. وە ئێستەیش هەر شێت و نەخۆش ئەبەن بۆ سەر ئارامگاکـەی و بە زۆری شیفایان بۆ دێت.

**سەیید عەبدوسسەیید**

ئەم زاتە پیاوێکی بەڕێز بووە و لە دێی بەرزنجەدا لە شوێنی باوکیدا سەقامگیر بووە و گەلێ خاوەن پایەی رۆحیی بووە و، لە وتارەکانیەتی: هەر کەسێ خۆشەویستیی دنیا لە دڵیدا دابمەزرێ ئەو دنیای لەکیس ئەچێت. وە فەرموویەتی: پێویستە بۆ سالیک کە بەرگی دەرەوە و ناوەوەی وەکوو یەک بن. وە فەرموویەتی: ئەگەر هەموو ئەهلی دنیا دوژمنی تۆ بن بە قەد نەفسی خۆت زیانت لێ نادەن. وە فەرموویەتی: سەفەر کردن بۆ سالیک هۆی پەرێشانی‌یە و، بۆ کامڵ ئەبێ بە هۆی جەمعییەت. ئەم زاتە تەریقەتی خەڵوەتی‌یەی بە کار هێناوە و لە مێژووی ٩٤٦دا لە بەرزنجە کۆچی دوایی کردووە و سەیید قەلەندەر باشترینی کوڕانی بووە و لە جێگەکەیدا دانیشتووە.

**سەیید قەلەندەری کوڕی عەبدوسسەیید**

ئەم زاتە لە پیاوچاکە گەورەکانی کورد بووە و تاقانەی سەردەمی خۆی بووە و گەلێ شوێنەواری باشی بووە. زیاد لەوە کە لە خزمەتی باوکیدا سلووکی کردووە... لە خزمەتی شێخ محەمەد قاسمیشدا لە بەغدا سلووکی کردووە و ئیجازەی ئیرشادی لێ وەرگرتووە و زیارەتی گەلێک لە پیاوچاکانی کردووە. لە ئەنجامدا لە دێی بەرزنجە لە سەر سەجادەی ئیرشاد دانیشتووە و لەوێ نیشتەجێ بووە. گەلێ واتەی بەسوودی لێ ئەگێڕنەوە لەوانە: وەلیی ئەوەیە ناو و شۆرەتی نەوێت. سابیر و خۆگر ئەوەیە شکات لە بەلا و ئازار نەکات.

مەلا رەحیمی جوانرۆیی کە لە خەلیفەکانی ئەو بووە دەڵێت رۆژێک سەیید قەلەندەر لە شوێنێکی سارادا دانیشتبوو گەلێ حەیوانە کێویی بە دەوریەوە بوون، کاتێک کە من لێی نزیک بوومەوە هەموو بڵاوەیان لێ کرد. منیش لێم پرسی: هۆی چییە ئەو حەیوانانە بە ئارامیی لە دەوری تۆدا دەلەوەڕان کە من نزیک بوومەوە رایان کرد؟ فەرمووی: هەتا سیفەتی خودبینی لە لای ئینسان بمێنێ هەموو حەیوانێ سڵی لێ ئەکات. وە فەرموویەتی: سیفەتی «زوهد» لە «وەرع» گەورەترە، چونکە وەرع نزیکە لە عەلاقەی دنیاوە، بەڵام زوهد بریتییە لە بێ‌عەلاقەیی لەگەڵ دنیادا.

دەگێڕنەوە: کە سەیید قەلەندەر زۆر جوان‌خاس بووە، هەروا میری «قەلای سرووچک» لە دۆڵی «گەلال» ئەویش زۆر جوان و لاوچاک بووە و میر ژنێ زۆر جوانی

بووە. جا ڕۆژێک میر لە ژنەکەی دەپرسێت: کەسـت لـە مـن جـوانتر دیـوە؟ ئـەویش ئەڵێت: بەڵێ سەیید قەلەندەر لە تۆ جوانترە جا میر غـیرەت ئـەیگرێت و ئەڵـێت: بـە خوا ئەبێ سبەینێ سەری سەیید قەلەندەر فڕەبدەمە بەردەمت!

سبەینێ میر لەگەڵ چەند سوارێکدا سوار دەبێت و بەرەو دێی بەرزنجـە دەکەوێتـە ڕێ بە هیوای سەری سەیید قەلەندەر. کاتێ نزیکی بەرزنجە دەبنەوە سوارێک بە غـار دێت و پێیان ئەگات، ئەڵێت: وا سوپای دوژمن لـە شـارەزوورەوە هاتووەتـە سـەرمان. ئەویش کە ئەم هەواڵە ئەبیسێت ئەگەڕێتەوە بۆ قەڵ و لەگەڵ دوژمندا بەجەنگ دێـت، بەڵام بە قەزا و قەدەری خودا دوژمنەکان بەسەریدا زاڵ دەبن و سەری ئەبڕن.

کاتێ ئەم هەواڵە ئەگات بە سەیید قەلەندەر ئەویش بە دەستەی خۆیەوە ئـەڕوا بـو یارمـەتیی مـیری سـرووچک و زاڵ ئـەبێت بەسـەر دوژمنەکانـدا و، تالانەکـەیان لـێ وەردەگرێتەوە. کاتێ تەماشا ئەکات میر کوژراوە و سەرەکەی لە مەیداندا کـەوتووە... سەیید قەلەندەر فەرمان ئەدا تەرمەکەی میر هەڵئەگرن و ئەیبەنەوە بۆ ماڵـی خـۆی و سەری میر لە بەردەمی خێزانەکەیدا دادەنێن! جا ژنەکەی هەناسەیەک هەڵدەکێشێت و زەردەخەنەیەک دەیگرێت. ئەڵێن: ئەو زەردەخەنەت لەبەر چی بوو؟

ئەویش ئەڵێت: لەبەر ئەوە بوو دوێنێ میر سوێندی خوارد کە ئەمڕۆ سەری سـەیید قەلەندەر بێنێ بیخاتە بەر پێم، کەچی بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەمـڕۆ سـەیید قەلەنـدەر سەری میری خستە بەرپێم. وە بە تەقدیری خـودا پـاش مـاوەی «عـدە»ی شـەرعیی سەیید قەلەندەر داوای ئەو ژنە دەکات و دەیدەنێ و مـارەی دەکـات و کـوڕێکی لێـی دەبێت ناوی دەنێن: «عبدالرسول».

پاش ئەم ڕووداوە سەیید قەلەندەر ماوەیەکی باش لە سەر ڕێبازی پێشووانی خـۆی لە خزمەتکردنی دین و موسوڵماناندا دەوام ئەکات. تا لـە سالـی ٩٥١ی کۆچیـدا لـە بەرزنجـە کـۆچی دوایـی دەکـات و لـە پشـتی ئارامگـای شـێخ عیسـاوە بـە خـاک دەسپێررێت.

ئەم زاتە دوو کوڕی لـێ بـەجێماوە: سـەیید یاسـین لـە ژنی یەکـەمی و سـەیید عەبدوڕەسووڵ لە ژنـە دوایـی‌یەکـەی و سـەیید عەبدوڕەسوول لـە جێگـەی باوکیـدا دانیشتووە.

جا بۆ ئاگاداری لێرەدا دەنووسم: شـێخ مـارفی ریشـەلانیی لـە کتێبەکـەی خۆیـدا دەڵێت: «وتمان لە پاش کوچی دوایی سەیید قەلەندەر دوو کوڕ بـەجێ‌مـاون: سـەیید عەبدوڕەسووڵ و سەیید یاسین.

سەییدەکانی دێی قەلاتەبزانی گـەرمیان و بـەرەی شـێخ عەبـدوڕەحمان لـە دێـی سەرکو و سەییدەکانی نوربـاب شـەجەرەی مۆرکراویـان هەیـە کـە لـە نـەوەی شـێخ یاسینی کوڕی سەیید قەلەندەرن. بەلام سەییدەکانی سۆڵەی قەرەداغ لە نەوەی شێخ مەعرووفی نەرکسەجارن و لە نەتەوەی سەیید عەبدوڕەسووڵ و سەیید یاسین نین».

منیش کە دانەری ئەم کتێبەم دەڵێم: خوالێ‌خۆش‌بوو شێخ مـەعرووفی ریشـەلانی گەلێ باوەڕی بە شێخ مەعرووفی نـۆدێیی بـاوکی کـاک ئەحمـەدی شـێخ لـە بابـەتی زانیاریی و راستی و لەخوداترسییەوە... بەتینە و شێخ مەعرووفی نۆدێیش شـەجەرەی سەییدەکانی سۆڵەی قەرەداغی لە شێخ رەسوولی دەوڵەت‌ئاواوە هۆنیوەتـەوە، کـە بـە شێخ رەسوولی سۆڵەیی ناسراوە، تا ئەگاتە حەزرەت ـ دروودی خودای لە سەر بـێ و ـ دانی بە سیادەتیاندا ناوە و بە نەوەی شێخ یاسینی کـوڕی شـێخ قەلەنـدەری دانـاون، وەکـــوو ســـەییدەکانی قەلاتـــەبزان و ســـەییدەکانی شـــاکەل و شـــەجەرەی شاکەلی‌یەکانیشی کردووە بە شیعر و مـن لێـرەدا ئـەو شـەجەرانە بـە شـیعری شـێخ مەعرووف بۆ بەڵگە دەنووسم، لە باسی سەییدەکانی سۆڵەدا دەڵێت:

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمـــد لله الملیـــک البـــررة ‌‌ ‌ علـی هــدایتی لــنظم الشــجرة
ثـــم مـــن الصـــلاة والســـلامِ ‌ اترعهـا علــی النبــی التهـامی
والآل و العتـــرة و الاصـــحاب ‌ هـم لسـماء الـدین کالاقطـاب
و بعـد: مـن عـذاب نـار نرتجـی ‌ آمنـا بشـیخنا رسـول السـولجی
و بابیـــه الســـید المقبـــول ‌ المصـطفی ابـن السـید رسـول
ابـــن ســـمیّ لشـــهید کـــربلاء ‌ ارجو بهم حفظا من اقسام الـبلاء
ابـوه موسـی السـید ابـن السـید ‌ حسـین التـالی بالاسـم الامجـد

سادسهم بالعد، و اسم السابع　　سيد سليمان بذى الاصابع

الستة بينهم اشتهرا　　وللانام الفيض منه بهرا

هو ابن السيد رسول الثالث　　طهره الله من الخبائث

ولد سيد يوسف ابن السيد　　ياسين ابن السيد المؤيد

قلندر ابن السيد المؤدب　　عبدالسيد، بن عيسى الاحدب

لقب فى الورى لفرط الشفقه　　منه على اصحابه والرفقه

اذ وضعوا للحنو والتواضع　　لفظة «حدب» و هو وضع الواضع

والده السيد حسين السامى　　ابن سمى العارف البسطامى

اعنى أبا يزيد البرزنجى　　شهر فى الاسلام والافرنج

اذ هو فى زمانه للعالم　　قطب، و أى قطب! قطب اعظم

والده السيد ذوالمكارم　　عبدالكريم ابن مغيث العالم

السيد المعروف سيد عيسى　　كان اخاثقة سيد موسى

أعنى ابنى صدق لسيد بابا　　على الهمدانى، فطوبى

لمن تشبث بأذيالهم　　حيا و ميتا، و أهنا لهم

من التحيات، و من سلام　　عليهم اذكاه بالدوام

ثم لسيد يوسف قدير تقى　　نسبهم و هو ابن المتقى

السيد المنصور، ابن السيد　　عبدالعزيز ذى التقى و الرشد

خلف صدق السيد النبيل　　عبدالله ابن السيد اسماعيل

من مفخر الكبار والاعاظم　　امامنا المحق موسى الكاظم

يا ربنا بحق ذا الامام　　أعط بنا الغنى عن الانام

و أبه المشهور فى المشارق　　و فى المغارب المحق الصادق

أعنى الأمام جعفر بن الباقر　　بن زين عباد الطهور الطاهر

نرجو بزهد زين العابدين　　تشبثا بالعروة المتين

و بشهادة الحسين نرجو أن　　يحفظنا الله من انواع المحن

و بعلـــــی حیـــــدر الکـــــرار نرجـو النجـاة مـن عـذاب النـار
وبـــالنبی المصــــطفی التهـــامی اســــأل غفرانــــا مــــن الاثــــام
رب! بحرمـــــة النبـــــی العربـــــی و کل من ذکـرتهم فـی النسـب
اعددنی من خـدام نسـل فاطمـة و اخـتم أمورنـا بحسـن الخاتمـة

***

وە لە هۆنینەوەی شەجەرەی شێخ سەعیدی شاکەلیدا فەرموویەتی:

ســـــعید العــــارف ذوالنـــــوال مــن حــاز کـل الفخـر والکمـال
نجل شهابالـدین عـالی الجـاه نجـــل علـــی، نجـــل عبـــدالله
ولـــد ابــــراهیم بـــادی الشــــرف نجل رسول، و هـو نجـل یوسـف
و هــو الـی یاسـین ینمـی، ولـد قلنـــــدر، ســـلیل عبدالســـــید
ابــوه عیســی الاحــدب الاجــل والــــده الحســـین، و هـــو نجـــل
الشـــیخ بایزیـــد و هـــو ولـــد عبـــدالکریم، مــن ابــوه المرشــد
الشیخ عیسی قطب اهل عصره و احــــــد اوانــــــه و دهـــــــره
علـــی یدیـــه ظهـــرت خــــوارق جلیلـــــة شــــاهدها الخلایــــق
نجل علی ذی العـلا و المکرمـة الهمـــــذانی بـــــذال معجمـــــة
یوســـــف مـــــن منصـــــور الأواه عبـــــدالعزیز نجـــــل عبـــــدالله
والـــــده الامـــــام اســـــماعیل ابـــوه موســـی الکـــاظم النبیـــل
والـــده الحبـــر الامـــام الســـید جعفـــر الصـــادق، و هـــو ولـــد
محمد الباقر ذی الفضل الجلـی سـلیل زیـن العابـدین، ای علـی
ابـــن شـــهید کـــربلاء: حســـین ســـبط النبـــی ســـید الکـــونین
دامـــت لـــه صـــلاة ذی الجـــلال والآل و الصـــحب ذوی الکمـــال

وە شەجەرەکەیشیان کە بە مۆری گەلێ لە زانایان و ناوداران مۆر کراوە ئەمەیە کە لە خوارەوە دەینووسین:

الشيخ احمد، ابن الشيخ محمد، ابن الشيخ سعيد، والشيخ محمد، ابن الشيخ سليمان، ابن الشيخ محمود، ابن الشيخ سعيد، ابن الشيخ شهاب‌الدين، ابن الشيخ على، ابن الشيخ عبدالله، ابن السيد ابراهيم البرزنجى، ابن السيد رسول البرزنجى، ابن السيد قلندر البرزنجى، ابن السيد عيسى[1] البرزنجى، ابن السيد الشيخ عيسى الاحدب البرزنجى، ابن السيد حسين البرزنجى، ابن السيد بايزيد البرزنجى، ابن السيد عبدالكريم البرزنجى، ابن السيد الاعظم السيد عيسى البرزنجى الگورانى، و هو اول من توطن فى قرية «برزنجة» من أعمال شهرزور، ابن السيد بابا على الهمدانى، ابن السيد يوسف، ابن السيد منصور، ابن السيد عبدالعزيز، ابن السيد عبدالله، ابن السيد اسماعيل المحدث، ابن السيد الامام موسى الكاظم، ابن السيد الامام جعفر الصادق، ابن السيد الامام محمد الباقر، ابن السيد الامام على زين‌العابدين، ابن السيد الامام حسين الشهيد، ابن السيد الامام على بن ابى‌طالب، والسيدة فاطمة الزهراء ـ رض ـ بنت سيد الاولين والآخرين محمد صلى الله عليه و على آله و صحبه وسلم تسليما.

**وە ئەمەیش دەقی شەجەرەی سەییدەکانی دێی «قەڵاتەبزانە».**

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على خير خلقه محمد و آله و صحبه اجمعين.

اما بعد: فهذه شجرة مباركة منسوبة الى عباد الملك القديم السادة: الشيخ محمد، والشيخ محمود، والشيخ حسن ابناء الشيخ عبدالقادر الشاكلى البرزنجى، و هو ابن الشيخ عبدالله البرزنجى، و هو ابن الشيخ حسن البرزنجى، و هو ابن الشيخ نظامى البرزنجى، ابن الشيخ يوسف البرزنجى، ابن السيد مصطفى البرزنجى، ابن السيد عبدالله البرزنجى، ابن السيد على «قەلاتەبزانى» البرزنجى، ابن السيد عبدالله البرزنجى ابن السيد ابراهيم البرزنجى، ابن السيد رسول البرزنجى، ابن السيد يوسف البرزنجى، ابن السيد ياسين البرزنجى، ابن السيد قلندر البرزنجى، ابن السيد عيسى[2] البرزنجى، ابن السيد عيسى الاحدب، ابن السيد حسين البرزنجى، ابن السيد بايزيد البرزنجى، ابن السيد عبدالكريم

---

١- بە وتەی چەن لاپەڕەی پێشوو سەیید قەڵەندەر کوڕی سەیید عەبدوسسەیید کوڕی سەیید عیسای ئەحدەبە. کەواتە ئەبێ ئەمە «ابن السيد عبدالسيد البرزنجى» بێت. «ن.ب»

٢- بە پێی ئەو بورهانەی لاپەڕەی پێشوو لێرەشدا ئەبێ «ابن السيد عبدالسيد البرزنجى» بێت. «ن.ب»

البرزنجی، ابن السید الاعظم السید عیسی البرزنجی الگورانی، و هو اول من توطن من اجدادنا فی قریة «برزنجه» من اعمال شهروز، ابن السید بابا علی الهمدانی، ابن السید یوسف، ابن السید منصور، ابن السید عبدالعزیز، ابن السید عبدالله، ابن السید اسماعیل المحدث، ابن السید الامام موسی الکاظم، ابن السید الامام جعفر الصادق، ابن السید الامام محمد الباقر، ابن السید الامام حسین الشهید، ابن السید الامام علی بن ابی‌طالب و السیدة الرضیة المرضیة فاطمة الزهراء النبویة. رضی الله تعالی عنهم اجمعین.

## سەییدەکانی سۆڵە

بۆ رووناککردنەوەی باسی سەییدەکانی سۆڵە بزانن! ئەمانە لە نەوەی سەیید یاسینی، کوڕی سەیید قەڵەندەری، [کوڕی سەیید عەبدوسسەیدی] کوڕی سەیید عیسای ئەحدەبی بەرزنجین و بەشی زۆریان لە سۆڵەی قەرەداغدا بووە و ئەم سەییدانە لقی زۆریان لێ بووەتەوە وەکوو سەییدەکانی دێی زەردەلیکاو و پاکان و باوەخۆشێن و بێدەن و دەوڵەت ئاوا و... غەیری ئەمانیش.

سەییدەکانی سۆڵە لە نەوەی خوالێخۆشبوو شێخ حسەینن.

شێخ تاهیر و شێخ باهیر کوڕی شێخ قادری کوڕی شێخ حسەین.

شێخ حەسەن کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ حسەین.

شێخ سەدیق کوڕی شێخ غەفوور کوڕی شێخ حسەین.

شێخ هادی کوڕی شێخ نووری کوڕی شێخ حسەین.

شێخ محەمەد، کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ رەزا، کوڕی شێخ حسەین.

شێخ رەئووف کوڕی شێخ رەزا کوڕی شێخ حسەین.

وە شێخ حسەین کوڕی شێخ حەسەنی کوڕی حاجی شێخ قادرە.

وە لقی زەردەلیکاو شێخ تاهیری، کوڕی حاجی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ ئەحمەدی، کوڕی حاجی شێخ قادرە.

وە لقی پاکان شێخ نەسرەدینی کوڕی شێخ محەمەد سالحی کوڕی شێخ عەزیزی کوڕی حاجی شێخ قادرە.

وە لقی بێدەن شێخ محەمەدی کوڕی شێخ بابارەسوولی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەبدوسەمەد...

وە حاجی شێخ قادری باپیری ئەم زاتانە کوڕی شێخ حسەینی کوڕی شێخ سلێمانی، کوڕی شێخ حسەینی «بێهەور»ە.

وە لقی دەوڵەتئاوا: شێخ تاهیر، کوڕی سەیید قەیدەری، کوڕی شێخ قادری، کوڕی شێخ رەسووڵی، کوڕی شێخ مستەفای، کوڕی شێخ رەسووڵە، کە لەگەڵ شێخ سلێماندا کوڕی شێخ حسەینی «بێ‌هەور»ن. [کە گوندێکە لە نێوان «کرماشان» و «سنە»دا] کوڕی سەیید مووسای، کوڕی شێخ حسەینی، کوڕی شێخ سولەیمانی شەش ئەنگوس، کوڕی شێخ رەسووڵی[۱] کوڕی سەیید یوسفی، کوڕی سەیید یاسینی، کوڕی سەیید قەلەندەری، [کوڕی سەیید عەبدوسسەید]، کوڕی سەیید عیسای ئەحدەب، کوڕی سەیید حسەینی، کوڕی سەیید بایەزیدی، کوڕی سەیید عەبدولکەریمی، کوڕی سەیید عیسای بەرزنجی... تا کۆتایی شەجەرەکە وەک لە پێشەوە نووسیمان.

ئەوەی پێشەوە لە سەر قسەی شێخ مەعرووفی نۆدێیی نووسرا و، ئاشکرایشە کە شێخ مەعرووف زانا و مورشید بووە و عیبارەتی ئەو لەم جۆرە باسانەدا جێگەی متمانەیە.

لقێکی دیکەی سەییدەکانی سۆڵە سەییدەکانی ئەزگڵەیە کە رشتەکەیان ئاوایە: سەیید حسەینی، کوڕی سەیید عەبدوڕەحمانی، کوڕی سەیید عەبدولغەفووری، کوڕی سەیید عەبدوڕەحمانی، کوڕی سەیید عەبدوڕەزاقی، کوڕی سەیید مستەفای، کوڕی شێخ رەسووڵی سۆڵەی قەرەداغ...

---

۱ ـ ئەم زاتە خەلیفەی شەهابەدینی کاکۆزەکەریای شازلیی حەسەنی‌یە و، بە شێخ رەسووڵی قەرەداغی ناسراوە و لە دەوروبەری ساڵی ۱۰٤۰دا لە دایک بووە.

## سەیید عەبدورەسووڵی کوڕی سەیید قەلەندەر

ئەم زاتە لە جێگەی باوکیدا دانیشت و لەبەر ئەوەی دارای زانست و تەریقەت بوو دەستی کرد بە خزمەتی دین و موسوڵمانان.

ئەمانە لە فەرموودەکانین:

مورشید ئەوەیە کە ئەوەندە کار بکاتە سەر دڵی موریدی خۆی خۆشەویستیی دنیای لە دڵدا نەمێنێ.

هەرچی موریدم هەیە شێوەیانم نیشان دراوە و زانیومە کێ ئەبێ بە موریدم.

ئەم زاتە هەمیشە بەڕۆژ ـ ئەو ڕۆژانە نەبێت کە ڕۆژوو تیایاندا حەرامە ـ بەڕۆژوو بووە و بە شەو شەونوێژی کردووە.

شێخ ئەبو سەعیدی موریدی ئەڵێت: ڕۆژێک لە خزمەتیدا بووم لە سەفەرێکدا لە ڕێگەدا گەییشتین بە ئاوێک ویستی دەسنوێژ بگرێ، کاتێ لەو ئاوەی کردە مشتی فەرمووی: ئەم ئاوە نیشانەی گوناهی گەورەی تێدایە. منیش بەو چەمەدا سەرکەوتم پیاوێک و ژنێکم پێکەوە بینی.

پاش لێکۆڵینەوە لەو دوو کەسە تێگەییشتم کە ئەوانە بەدکردەوەن.

سەیید عەبدورەسووڵا لە ساڵی ٩٦٤ی کۆچیدا لە گوندی بەرزنجە کۆچی دوایی کردووە. دوو کوڕی لێ بەجێ ما: سەیید عەبدوسەمەد و، سەیید عەبدوسەیید. ئەم کوڕەی دوایی لە جێگەکەیدا دانیشت.

### سەیید عەبدوسەییدی کوڕی عەبدورەسوول

ئەم زاتە پیاوێکی زانا و خاوەن تەریقەت و کەرامەت بووە. ئەم پیاوە گەلێ فەرموودەی جوانی بووە، لەوانە:

ئیسراحەتی دنیا و قیامەت لە کەنارەگیریدایە.

زاهید ئەو کەسەیە ستایش و زەم لە لایا وەکوو یەک وابن.

مەلا عەزیز ناوی بەرزنجەیی گێڕاویەتی‌یەوە ئەڵێت: ڕۆژێک لە خزمەتیدا بووم کەوێکی کێوی هات لە نزیکی‌یەوە نیشتەوە و دەستی کرد بە خوێندن. جا سەیید عەبدوسەیید پێی فەرمووم: بڕۆ فلانم بۆ بانگ بکە. چووم بانگم کرد و هات بۆ خزمەتی. سەیید فەرمووی: ئەو کەوە ئەڵێ: ئەمڕۆ ئەو کابرا هاتووە هەموو کەوبارەکانی گرتووم و بردوونی! کابرا عەرزی کرد: ڕاستە. جا سەیید عەبدوسەیید فەرمووی: بڕۆ کەوبارەکانی لە شوێنەکەی خۆیاندا بەرەڵا بکە، ئەویش بەقسەی کرد.

ئەم زاتە لەساڵی ۹۹۵دا لە دێی بەرزنجە کۆچی دوایی کردووە و دوو کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: سەیید ئیسماعیل و بابا ڕەسووڵ. ئەم بابا ڕەسووڵە لە جێگەکەیدا دانیشت.

**بابا رەسووڵی کوڕی عەبدوسەیید**

ئەم زاتە لە زانا هەڵکەوتووەکان بووە و گەلێ ڕەنجی داوە بۆ خوێندن و لە خزمەتی شێخ شوکروڵلای کوڕی شێخ نیعمەتولڵای خالیدیدا کتێبی «مصابیح» و «شرحی معالم»ی خوێندووە و لە خزمەتی مەولانا ئەبوبەکری موسەننیفیشدا کتێبی «وضوح»ی «شرح محرر»ی لە شەرعدا و، «جمع الجوامع»ی لە ئوسوولی فیقهدا خوێندووە و مەلا ئەبوبەکری موسەننیف گەلێ ستاییشی سەیید بابا ڕەسووڵی کردووە و فەرموویەتی:

انتهی الیه الاحوال و کشف موارد الصادرین بشهرزور، و تلمذ علیه خلایق من العلماء والفقهاء و الصلحاء، و قصدوه بالزیارات، وانتهی الیه الریاسة فی الطریق و شرح احوال القوم، و کشف مشکلات منازلهم، و به عرف تربیة المریدین، و انعقد علیه اجماع المشایخ بالاحترام والتعظیم.

و له کلام عال فی التصوف والاشارات فی لسان القوم و قال: المراقبة تقتضی حال القرب، و حال القرب تقتضی حال المحبة.

و یقول: المراقبة لعبد یراقب الحق بالحق، و یتبع المصطفی ـ ص ـ فی افعاله و اقواله و آدابه.

و یقول: انفع العلوم العلم باحکام العبودیة، و ارفع العلوم علم التوحید.

وە ئەیفەرموو: هەرکەسێ بە دنیاوە خەریک بێت هەمیشە داماو و کزە.

وە «فەقر» رووتبوونە لە پەیوەندی و خەریکبوونە بە خوداوە و خۆخاڵی‌کردنە لە غەیری خودا. وە نیشانەی ئەم حاڵە ئەوەیە کە حاڵی ئینسان بە بوون و نەبوونی ئەسباب نەگۆڕێ.

وە ئەیفەرموو: هەڵەیە کەسێ دەعوای زانست بکا و ترس و وەرعی نەبێ.

ئەم بابا رەسووڵە لە فەقر و زوهد و موجاهەدەدا گەیشتبووە پلەیەک کەس نەیگەیشتووەتێ و ئارەزووی دنیا و خەڵکی دنیای نەبوو.

وە ئەیفەرموو: تەمەن لە هەموو شتێ خوشەویست‌ترە و، دنیا لە هەموو شتێک بێ‌بایەخترە، جا زیانێکی گەورەیە کە ئادەمیزاد خۆشەویست‌ترین شت لە بێ-بایەخترین شتدا خەرج بکات.

سەیید محەمەدی مەدەنیی کوڕی بابا رەسووڵ ئەڵێ: رۆژێک بە باوکم وت: مامۆستای تۆ کێیە؟ فەرمووی: بە زاهیر سەنەدی من مەولانا ئیلیاسە، ئەویش عەهدی لە باوکی خاوەن‌پایەم وەرگرتووە، بەڵام لە راستیدا مامۆستای من خزری زیندەیە، چونکی من لەمەوپێش سێ مانگ چاوم کوێر بووە و شتی نەبینیوە و منیش بە نییەتی زیارەت و پاڕانەوە لە مەردان چووم بۆ زیارەتی ئیمام حسەین. کاتێ گەیشتمە بەر ئارامگاکەی و راوەستابووم و بە دڵ داوای شیفام ئەکرد، لەو کاتەدا یەکێ هات دەستی گرتم و بردمی بۆ نزیکی شوێنەکەی و لەوێدا دەستی بە چاوەکانمدا هێنا وە لە سوپاسی خوداوە ـ چاوەکانم رووناک بوونەوە، کە تەماشام کرد رووناکی و نوور لە سەر ئارامگای ئیمام حسەینەوە بەرز ئەبووەوە بۆ ئاسمان و دنیا بەو نوورە رووناک ئەبووەوە و دنیام بۆ دەرئەکەوت.

جا لەو کەسەم پرسی: تۆ کێیت؟ فەرمووی: من خزرم و لەو شوێنەدا دەرسی پێ-گوتم و فێری کردم.

بابا رەسووڵ لە سەرەتای ژیانیەوە خەریکی خوێندن بووە و بۆ خوێندن سەفەری بەغدا و حیجاز و میسری کردووە و لەگەڵ خوێندنیشدا هاوڕێتی گەلی لە پیاوچاکانی کردووە و سەحیحی بوخاریی بە دەرز خوێندووە و لە ئەنجامدا هاتووەتە بەرزنجە و خەریکی دەرس‌وتنەوە و رێنومایی موسوڵمانان و خزمەتی ئایین بووە.

وە من ئەڵێم: «جمع الجوامع» و «وضوح»ی لە خزمەتی مەلا ئەبوبەکردا خوێندووە و «مصابیح» و «شرحی معالم»ی لە خزمەتی شێخ شوکروڵڵای خالیدیدا خوێندووە. هەروا بیستوومە لە خزمەتی مەلا مووسای تەوەکەڵیدا خوێندوویەتی.

حاجی عەبدوڵڵای شارەزووریی کە ئێستە کۆچی دوایی کردووە و لە بەر جادەی لای کێوی سەیید سادقدا نێژراوە... ئەڵێ: من کاتی خۆی خزمەتکاری هەندێک ئەهلی دنیا بووم و لە ناو کردەوەی نابار و ناشەرعیدا دەژیام و رۆژێک مەڕێکم لە هەژارێک داگیر کرد و سەرم بڕی و دەستم کرد بە گۆشت برژاندن. لەو کاتەدا ژنێک هات هەندێک ئاگری برد و ئەوەندەی پێ نەچوو هاتەوە ئاگری برد، جاری سێهەم هاتەوە ئاگری برد، تێگەییشتم ئارەزووی لە گۆشتە، جا هەندێک گۆشتم دایێ بردی، ئیتر رۆیشت و نەهاتەوە.

پاش ماوەیەکی کەم لە خۆمەوە حاڵم گۆڕا و، هەندێک شت هاتە بەرچاوم و شەو خەوم لێکەوت و لەخەودا یەکێک هاتەسەرم وتی:

من خدری زیندەم و فەرمانت پێئەدەم کە بچیت بۆ لای باباڕەسووڵی بەرزنجە. کە رۆژم لێبووەوە هەستام رێکەوتم بۆ بەرزنجە و لە خزمەتی بابا رەسووڵدا تەوبەم کرد و، ئەوەی لە توانامدا بوو لە دانەوەی ماڵی خەڵک و گێڕانەوەی ستەم جێبەجێم کرد.

پاش ئەوە بە ئیجازەی شێخ بابارەسووڵ چووم بۆ حەج و گەڕامەوە و لە خزمەتی شێخ بابارەسووڵدا مامەوە و خەریکی بەندەییکردن بووم و دەستبەرداری حەرامخواردن و کردنیی کردەوەی نابار بووم.

شێخ بابارەسووڵ لە ساڵی ٩٨٣دا لە بەرزنجە لە دایک بووە و لە ساڵی ١٠٥٦ی کۆچیدا لە بەرزنجە کۆچی دوایی کردووە.

شێخ بابارەسووڵ پیاوێکی جوان و پێکەوتوو و سالار و سوارچاک و تیرەنداز و ئازا بووە و گەلێ ژنی هێناوە و کوڕ و کچی زۆر بوون.

ژنی یەکەمی: عایشەی کچی مەلا محەمەدی نائیب بووە. لەم ژنە تاقە کچێکی بووە ناوی مریەم بووە، لە پێش کۆچی دوایی باوکیدا لەگەڵ دایکیدا مردوون.

دوەم: فاتیمەی کچی شێخ عێزەدین کوڕی شێخ شەمسەدینی شۆشیی عەبباسییە کە خەلیفەی شێخ ئەحمەدی «قصیران»ی بووە، لەم ژنە کوڕێکی بووە

ناوی عەبدوسەمەد بووە کە باپیری سەیدەکانی سەرگەڵووە و کوڕی گەورەی بابارەسووڵ بووە و هەروەها سەیید عەبدولکەریم و عەبدوسسەیید و سەیید عەلی «وەندەرێنە» و سەیید ئیسماعیل و سەیید ئیسحاق کە لەگەڵ سارای خوشکیدا بە سکێ پەیدابوون و عایشە و ئاسیە... بەرەی ئەم ژنەن.

سێهەم: فاتیمەی کچی شێخ شوکروڵڵای کوڕی شێخ نووروڵڵای خالدی بووە. لەم ژنە حەسەن و حسەین و یوسف و ئەحمەد و محەمەد و ئیبراهیم بووە. هەروەها لەم ژنە پێنج کچیشی بووە: زلێخا و بەلقیس و هاجەرە و رابیعە و حەفسە.

چوارەم: ناوی زێڕین بووە. لەم ژنە تەنها حەیدەری بووە کە باپیرەی سەییدەکانی عەبابەیلێ و تاوێرە و ئەو دەور و بەرەیە.

پێنجەم: ناوی ئینساف بووە، لەم ژنە «ذوالنون» و عەبدوڕەسووڵ و بایەزید و زەینەلعابیدین بووە.

ئەم شێخ بابا رەسوولە حەڤدە کوڕی بووە: عەبدوسەمەد و عەبدولکەریم و عەبدوسسەیید و عەلی و ئیسماعیل و ئیسحاق و حەسەن و حسەین و یوسف و ئەحمەد و محەمەد و ئیبراهیم و حەیدەر و زوننوون و عەبدوڕەسووڵ و بایەزید و زینەلعابدین. وە هەندێک کەس دەڵێن: کوڕێکی سوڵتان ناویشی بووە.

جا یەکەم کوڕی کە شێخ عەبدوسەمەدە باپیرەی سەییدەکانی سەرگەڵووە و چوار کوڕی بووە: شەمسەدین و مستەفا و عەبدوڵڵا و محەمەد. لە شەمسەدین یوسف و لە یوسف شێخ عەلی حاجی و لە شێخ عەلی حاجی یوسف و ئیبراهیم بووە. لە یوسف سلێمان و ئەحمەد بووە، کە دوایی بووە بە حاجی شێخ ئەحمەد و بووە بە خەلیفەی مەولانا خالید و ئەنجام لە دێی سەرگەلوودا بە چاوەقوولە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێ بە خاک سپێرراوە.

لە حاجی شێخ ئەحمەد چوار کوڕ بەجێماوە: عەبدولقادر و ئیبراهیم و عەبدوڕەحمان و سەلیم.

شێخ عەبدولقادر چووەتە رێبازی تەسەووفەوە و بووە بە خەلیفەی باوکی و لە کاتی خۆیدا پارێزەری کەرکووک لە نزیکی سەرای حوکوومەتدا خانەقای بۆ دروست کردووە و شێخ عەبدولقادر لەو خانەقادا ئیرشادی کردووە و کاتێک لە جیهان دەرچووە لە هۆدەیەک لە هۆدەکانی خانەقاکەیدا بە خاک سپێرراوە.

شێخ عەبدولقادر محەمــەد جــەواد و عــەلی و حســەین و محەمــەد و مــەعرووف و تەیفووری لێ بەجێماوە. لە شێخ حسەین ـ کە لە ساڵی ١٣٠٧ی کۆچیدا لـە جیهـان دەرچووە ـ سەیید ئەحمەدی خانەقا و سەیید عومەر بەجێماون.

کوڕی دوەمی شێخ بابا ڕەسووڵ شێخ عەبدولکەریمە: ئەم زاتە تـەنها یـەک کـوڕی بووە بە ناوی خۆیەوە ناوی ناوە. واتـە عەبدولکـەریم، وە عەبدولکـەریم کـوڕێکی بـووە ناوی عەبدوللا بووە و عەبدوللایش نەوەی نەبووە.

کوڕی سێهەمی بابا ڕەسووڵ عەبدوسسەییدە: ئەمیش سێ کوڕی لـێ بـەجێمـاوە: مەحموود و ئەحمەد و محەمەد.

کوڕی چوارەمی شێخ بابا ڕەسووڵ شێخ عەلی‌یە: کە بـە شـێخ عـەلیی وەندەرێنـە ناسراوە کە دێیەکە لە نزیکی بەرزنجەدایە. ئەم زاتەیش ٤ کوڕی لێ بەجێماوە: شـێخ محەمەدی نۆدێ کە بە «الکبریت الاحمر» ناسراوە و شێخ عیسا و، شێخ بایەزید و شێخ حسەین.

شێخ عەلی وەندەرێنە لە ساڵی ١٠١٨ی کۆچیدا لەدایک بووە و لـە ساڵـی ١٠٨٠دا کۆچی دوایی کردووە و ئارامگای پیرۆزی لە وەندەرێنەدایە.

وە نەتەوەی ئەم شێخ عەلی‌یە لە گوندی قـەلاگای ناوچـەی سـەنگاودا نیشـتەجێ بوون.

وە نەتەوەی شێخ بایەزید و شێخ حسەین، کوڕانی شێخ عەلیی وەندەرێنە لـە دێـی «لۆتەر» و «نەیلووجە»ی سەر بە ناحیەی «مەرگە»دا نیشـتەجێ بـوون و هەندێکیشـیان هەر لە بەرزنجەدا ماونەتەوە.

کـوڕی پێنجـەمی شـێخ بابـا ڕەسـووڵ کـە شـێخ ئیسـماعیلە بـاپیرەی گـەلێ لـە سەییدەکانی بەرزنجەیە، لە شێخ ئیسماعیل شێخ بایەزیـد و لـە شـێخ بایەزیـد شـێخ عیسا و شێخ ئیمام و شێخ حسەینی بە «المعی» ناسراو و شێخ حەسەنی «کونە کۆتری» و شێخ عەبدوسسەلام و شێخ محەمەدئەمین بەجێماون.

جا لە شێخ عیسای کوڕی شێخ بایەزید پێنج کـوڕ بـەجێمـاون: شـێخ محەمـەد و شێخ حەسەن و شێخ حسەین و شێخ ئیسماعیل و شێخ ئیمام.

شێخ ئیمام باپیری سەییدەکانی «میل ناسر»ی ناوچەی گەرمیانە و خـۆی لـە دێـی «ژاڵەی گوم»دا کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێ بە خاک سپێرراوە. وە لـە نەتـەوەی

ئەوە شێخ عەبدوڵلا و، شێخ ڕەسووڵی باوکی شێخ تاها و شێخ یاسین و شێخ محەمەد و شێخ عەبدولقادر و بایەزید، زۆربەی نەتەوەی ئەمانە وان لە دێی «بەرزنجە»دا.

وە شێخ حسەینی بە «المعی» ناسراو باپیرەی سەیدەکانی «خێوەتـە»ی نزیکی قەلاچوالانە و لەم شێخ حسەینە دوو کوڕ بەجێ‌ماون: شێخ موحسین و شیخ غەنی کە باپیری سەیدەکانی خێوەتە و «پەلکانە»ن لە شارباژێر.

وە لە شێخ حەسەنی کوڕی بایەزیدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی شێخ بابا ڕەسووڵ... شیخ مەحموود و شێخ قاسم بەجێ‌ماون و لە شێخ مەحموود بەرەی شێخ عەبدوسەمەدی قازیی سلێمانی و سەییدەکانی کونەکۆتر بەجێ‌ماون.

وە لە شێخ قاسمی کوڕی شێخ حەسەنی کوڕی شێخ بایەزیدی کوڕی شێخ ئیسماعیلی کوڕی شێخ بابا ڕەسووڵ... شێخ عەبدولکەریم و شێخ عەبدوڕەحیم و شێخ عەبدولەتیف بەجێ‌ماون، کە لە زانا بەرزەکانی شاری سلێمانی بوون.

ئەم شێخ عەبدولکەریمە مامۆستای گەلێ لە زانایانی سلێمانی بووە وەکوو مەلا برایمی بیارە و مەولانا خالیدی نەقشبەندی. ئەم شێخ عەبدولکەریمە لە ساڵی ١٢١٣ی کۆچیدا بە تاعوون لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

وە کوڕانی شەشەم و حەوتەم و هەشتەم و نۆهەم و دەهەم و یازدەهەم و دوازدەهەم کە بریتین لە ئیسحاق و حسەین و یوسف و ئەحمەد و ئیبراهیم و زونوون و زەینەلعابیدین ئەمانە نەتەوەیان نەبووە.

هەروا سوڵتان ناویش، ئەگەر ڕاست بێ کوڕی شێخ بابا ڕەسووڵ بووبێت.

وە کوڕانی سیازدەهەم و چواردەهەمی شێخ بابا ڕەسووڵ کە شێخ عەبدوڕەسووڵ و شێخ بایەزیدن... زۆربەی نەوەیان لە دێی بەرزنجەدا ماونەتەوە.

وە کوڕی پانزدەهەمی بابا ڕەسووڵ کە سەیید محەمەدە، کە لە ١٠٤٠دا لە دایک بووە، چووەتە مەدینەی مونەووەرە و لەوێ بووە بە قازی و مودەڕیس و پاش ماوەیەکیش بووە بە موفتیی مەدینە تا لە ساڵی ١١٠٣دا کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە گەلێ نەتەوەی زانای لێ بەجێ‌ماوە وەکوو: سەیید جەعفەری بەرزنجیی کە لە مەدینەی مونەووەرەدا ناوبانگی دەرکردووە و زانایەکی گەورە بووە و نەتەوەی لە مەدینەدا ماون وەکوو سەیید ئیبراهیمی «محدث».

ئەم سەیید ئیبراهیمە، بە گوێرەی ئیجازەی هەندێ «محدثین» زانایەکی بەرزی حەدیس بووە. پاش ماوەیەک کە لە مەدینەدا بووە هاتووەتەوە بۆ خاکی نیشتمان و پاشاکانی بابان ڕێزیان گرتووە و لە دێی «بەردەزەرد»ی نزیکی قەلاچوالاندا بە مودەڕیسی دامەزراوە و گەلێ خزمەتی زانست و ئایینی کردووە و ئەنجام هەر لەو دێدا کۆچی دوایی کردووە و سەییدەکانی بەردەزەرد لە نەتەوەی ئەم سەیید ئیبراهیمەن.

بەم گوێرە کە لە سەیید ئیبراهیمی بەردەزەرد پێنج کوڕ بەجێماون:

سەیید محەمەد و سەیید ئەبوبەکر و سەیید عومەر و سەیید عوسمان و سەیید عەلی و دوو کچ: فاتیمە و بەلـقیس... سەیید محەمەد کوڕی گەورەی سەیید ئیبراهیم لە دێی «قەلاتە»دا کۆچی دوایی کردووە و...

هاتنەوەی سەیید ئیبراهیمی کوڕی سەیید محەمەدی مەدەنی لە مەدینەوە بۆ خاکی بابان و دامەزراندنی لە دێی بەردەزەردا... موتەواتەرە و جێگەی گومان نییە...

قسەی شێخ مارفی ڕیشەلانیش لە کتێبی «انساب»ەکەیدا کە ئەڵێ: سەیید ئیبراهیمی کوڕی شێخ بابا ڕەسووڵ نەتەوەی نەبووە... زیان لەم مەبەستی ئێمە نادا، چونکی ئەو ئیبراهیم ناوە کە شێخ مارف باسی ئەکات شێخ ئیبراهیمی کوڕی شێخ بابا ڕەسووڵە و ئەم سەیید ئیبراهیمی بەردەزەردە کوڕی سەیید محەمەدی مەدەنی و کوڕەزای بابا ڕەسوڵە.

باش ئاگاداری ئەم مەبەستە بن.

ئەمەیش دەقی شەجەرەی نەسەبی سەیید تاهیری کوڕی سەیید ڕەشیدە کە لە نەتەوەی سەیید ئیبراهیمی بەردەزەردە:

السید طاهر ابن السید رشید، ابن السید احمد، ابن السید عباس، ابن السید عبدالله، ابن السید معروف، ابن السید اسماعیل، ابن السید محمد، ابن السید ابراهیم، ابن السید محمد المدنی، ابن السید بابا رسول، ابن السید عبدالسید، ابن السید عبدالرسول، ابن السید قلندر، ابن السید عبدالسید، ابن السید عیسی الاحدب، ابن السید حسین، ابن السید بایزید، ابن السید عبدالکریم، ابن السید عیسی البرزنجی، ابن السید بابا علی الهمدانی، ابن السید یوسف، ابن السید منصور، ابن السید عبدالعزیز، ابن السید عبدالله، ابن السید اسماعیل المحدث، ابن الامام موسی الکاظم.

وە کوڕی شازدەهەمی شێخ بابا ڕەسووڵ، کە شێخ حەیدەرە، چوار کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ عەبدوڵلا و، شێخ قاسم و شێخ عەبدولکەریم و شێخ عەبدوڕەحیم.

شێخ عەبدوڕەحیم پێش ژن‌هێنانی کۆچی دوایی کردووە. نەتەوەی شێخ قاسم و شێخ عەبدولکەریمیش لە دێهاتی شارەزووردا و لە شاری هەڵەبجەدا بڵاوبوونەتەوە.

وە لە شێخ عەبدوڵلای کوڕی شێخ حەیدەری کوڕی شێخ بابا ڕەسووڵ... شێخ حەیدەر بەجێ‌ماوە کە لە دێی ناسراو بە «عەبابەیلێ» نیشتەجێ بووە و [1]، نەتەوەیەکی زۆری لێ کەوتووەتەوە.

ئەم شێخ حەیدەرە جارێک بە سەفەر ئەچێت بۆ دێی «قەیتوول» لە ناحیەی «زەنگەنە» لەو دیوی قەرەداغەوە و بە خواستی خودا لەوێ نەخۆش دەکەوێت و کۆچی دوایی ئەکات و ئارامگاکەی لە دێی «قەیتوول» دایە.

وە کوڕی حەڤدەهەمی شێخ بابا ڕەسووڵ کە شێخ حەسەنە تەنها کوڕێکی لێ بەجێ‌ماوە کە ناوی سەیید ئەحمەد بووە و بە «کاکە سوور» ناسراوە. سەییدەکانی «پیر حەسەنی» نەتەوەی «شێخ مەولان» و سەییدەکانی «هەزار مێرد» و سەییدەکانی «سیتەک»ی ژوورروو لە نەتەوەی کاکە سوورن.

وە سەییدەکانی دەروێشانی ئیددیعای ئەوە ئەکەن کە لە سەییدەکانی سیتەکن و شەجەرەی مۆرکراویشیان هەیە. شێخ مارفی ریشەلانی ئەڵێ: بە دەستخەتی باوکم، شێخ ئەحمەدی ئیمام، نووسراوە کە شەجەرەی سەییدەکانی پیرحەسەنی هەرچی لە سەیید مەولانە ئەوە شێخ حەسەنی گڵەزەردە مۆری کردووە و لە نەوەی سەیید ئەحمەدی ناسراو بە کاکە سوورن.

وە من کە دانەری ئەم کتێبەم ئەڵێم: حاجی سەیید حەسەن، کوڕی سەیید مەعرووف، کوڕی سەیید شەمسەدین وە حاجی شێخ عەبدوڵلای واژەیی کوڕی سەیید عەزیزی، کوڕی سەیید شەمسەدین ئەمانە داوای ئەوە ئەکەن کە لە نەوەی شێخ حەسەنی کوڕی شێخ بابا ڕەسووڵن و وێنەی شەجەرەکەیان ئاوایە:

السید عبدالله، ابن السید عزیز، ابن السید شمس‌الدین، ابن السید محی‌الدین، ابن السید عثمان، ابن السید حسین، ابن السید اسماعیل، ابن السید ذوالنون، ابن السید

---

١ ـ ئەم شێخ حەیدەرە لە پێشدا لە دێی تاوێرەدا بووە و دوایی لەوێوە هاتووە بۆ عەبایەیلێ ـ ابا عبیدە.

صادق، ابن السید عبدالعزیز، ابن السید حسن، ابن السید بابا رسول، ابن السید عبدالسید، ابن السید عبدالرسول، ابن السید قلندر، ابن السید عبدالسید، ابن الشیخ عیسی الاحدب...

تا دوایی شەجەرەی بەرزنجەییەکان.

وە ئەم شەجەرەیەم دیوە کە بە مۆری گەلێ لە گەورە زاناکانی وەکوو شێخ مەحموودی نەقیب و کاک ئەحمەدی سلێمانی و شێخ مستەفای موفتی و سەیید عەلیی کوڕی بابارەسووڵی بەرزنجی و... غەیری ئەوانیش مۆر کراوە. مێژووی نووسینەکەی ١٢٧٤ی کۆچییە.

جا لەبەر ئەوە کە دیاریترینی کوڕی شێخ بابا رەسووڵ شێخ عەلی وەندەرێنە بووە لێرەدا دەنووسین:

## شێخ عەلی

ئەم زاتە پیاوێکی زانا و بەڕێز و خاوەن پایە و مایە بووە و لە تەریقەتدا خاوەن کەرامەت بووە. وە زیاد لەوەیش کە لە خزمەتی باوکیدا تەمەسوکی کردووە و تەریقەتی وەرگرتووە... چووە بۆ شاری بەغدا و لە خزمەتی شێخ محەمەد قاسمی بەغدادیدا تەریقەتی وەرگرتووە و سلووکی کردووە تا ئیجازەی پێداوە بۆ ئیرشادی موسوڵمانان.

وە لە فەرموودەکانیەتی:

هەر کەسێ تەربییە نەکرابێت تەربییەی کەسی پێ ناکرێت.

پاش ئەوە لە بەغدا گەڕایەوە چوو لە دێی «لۆتەر»ی سەر بە ناحیەی «مەرگە» دانیشت و گەلێ مورید و مەنسووبی لێ کۆبووەوە و گەلێ کەس لە خزمەتیدا گەییشتن بە پایە. وە گەلێ فەرموودەی بەنرخی بووە و گەلێ ئامۆژگاریی موریدەکانی کردووە بۆ ئەوە خۆیان لە خۆشویستنی دنیا و ئەهلی دنیا دوور بخەنەوە.

شێخ عەلی ساڵێک پێش لە دنیا دەرچوونی «لوتەر»ی بەجێهێشتووە هاتووەتەوە وەندەرێنەی کۆنە شوێنی خۆیان لە نزیکی بەرزنجەدا، تا لە ساڵی ١٠٨٠دا لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

**شێخ محەمەدی نۆدێی کوڕی شێخ عەلی**

ئەم زاتە دیاریترینی کوڕی شـێخ عـەلی بـووە و لـە سـەرەتای ژیانیـەوە خـەریکی زانیاری و تەسەووف و لەخوداترسی بووە و لەگەڵ گەورەزاناکانی چەرخی خۆیـدا رای بواردووە. وە زیاد لەوە کە لە خزمەتی باوکیدا سلووکی کردووە و بـووە بـە خەلیفـەی چووە بۆ بەغدا و لە خزمەتی شیخ محەمەد سادقدا سلووکی کـردووە و ئیجـازەی لـێ وەرگرتووە.

جا هاتووەتەوە بۆ وڵاتی خۆی و خەریکی ئیرشادی موسوڵمانان بووە. وە چەند جار حەجی ماڵی خودا و زیارەتی پێغەمەری کردووە. وە گەلێ پیاوی باشی پێگەیانـدوە و بوون بە خەلیفەی و موسوڵمانان سوودیان لێ وەرگرتوون.

وە لە فەرمووده بەنرخەکانیەتی:

زانا ئەوەیە رەفتار بە زانستەکەی بکا و پەیڕەویی رێبازی حەزرەت بکات.

وە: بەرزیی ئادەمیزاد بە جوانیی خوویـەتی. پێغەمـەر ـ د ـ فەرموویـەتی: «اقـربکم منی مجلسا یوم القیامه احسنکم اخلاقا».

وە: دنیا دەریایە و کەناری دەریا قیامەتە و، کردەوەی باش کەشتی‌یە، بـە کەشـتی نەبێ زەحمەتە ئادەمیزاد لە دەریا رزگار بێت و بگا بەو قیامەتە باش بێت.

وە: دوور بکەونەوە لە هەر کەسێ کە بـۆ خێـری دنیـا ستایشـتان ئـەکات. وە لـەو کەسانەیش کە بەندەیی کردنی خوداتان لەبیر ئەبەنەوە.

وە: هەمیشە موراقەبەی خودا بکەن و ئاگاتان لە خۆتان بێـت، چـونکی موراقەبـەی خودا کلیلی دەرگای پـیرۆزی‌یـە و ئاسـانترینی رێگـەی حەقـە و هـۆی پـاکیی دڵ و ئولفەت لەگەڵ حەق و ئازاری نەفسدایە.

وە: بینای سلووک لە سەر سێ شتە:

یەکەم: خەریکبوون بە زیکری خوداوە لەگەڵ حوزووری دڵدا.

دووەم: موراقەبەی حەق.

سێهەم: موخالەفەی نەفس.

وە: پارووی حەڵاڵ وەکوو ئیکسیر وایە بۆ دڵ. واتە دڵی خـراپ چـاک ئەکاتـەوە و دڵی تاریک رووناک ئەکاتەوە.

ئەم زاتە گەلێ کەسی پێگەیاندووە، وەکوو: شێخ عەبدوڵلای سوێدیی و شێخ حەسەنی مەولاناوا... وە دۆستی شێخ ئیسماعیلی عەودالانی بووە.

بە کورتی ئەم زاتە تەمەنێکی پیرۆزی لە خزمەتی ئایینی ئیسلامدا رابوارد، تا لە ساڵی ١١٢٦ی کۆچیدا لە دێی نۆدێ کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە پێنج کوڕی بەڕێز و بەتوانای بەجێهێشت: شێخ ئیسماعیل و شێخ حەسەن و شێخ عەلی و شێخ ئەحمەد و شێخ محەمەدە سوورە.

ئەم کوڕانە هەموو لەو خانەدانەدا تەربییە کراون و خوێندوویانە و هەر یەکەو بە گوێرەی بەشی خۆی سوودی وەرگرتووە.

شێخ ئیسماعیل و شێخ حەسەن بە فەرمانی باوکیان لە خزمەتی شێخ عەبدوڵلای سوێدیدا ـ کە خەلیفەی باوکیان بووە ـ سلووکیان کردووە و پێگەییشتوون و خەریکی خزمەتی ئایین بوون.

شێخ ئەحمەدی غەزائی لەگەڵ شێخ محەمەدە سوورەی برایدا لە نۆدێ لە جێگەکەی باوکیدا دانیشت. وە شێخ ئیسماعیل و شێخ حەسەن چوون بۆ قەرەداغ و لە دێی «ولیان» دانیشتن و شێخ عەلی چوو بۆ «دۆڵپەموو» لە خۆرهەڵاتی بەرزنجەدا و لەوێ نیشتەجێ بوو، وە هەر کەسێ بە گوێرەی توانای خۆی خزمەتی ئایینی کرد.

بەڵام شێخ ئیسماعیل لە ئیرشاددا دەرکەوت و ناوبانگی دەرکرد و رۆژ بە رۆژ پلەی بەرز ئەبووەوە، هەتا بە بڕیاری خودا کەوتە رێ بۆ زیارەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و سوود وەرگرتن لە ئیرشادی شێخ ئەحمەدی ئەحسائی[1] کە لەو چەرخەدا هاتبوو بۆ بەغدا و لە تەکیەی خالیدی‌یەی ئێستەدا دانیشتبوو خەریکی ئیرشاد بوو، جا شێخ ئیسماعیل بە خزمەتی گەییشت و تەمەسوکی پێ کرد و سلووکی کرد لە خزمەتیدا، وە لە ماوەیەکی کەمدا ئیجازەی خەلافەتی لە تەریقەی قادری‌یەدا لێ وەرگرت، کە شێخ ئەحمەد ئەو تەریقەتەی بەڕێوە دەبرد.

---

١ ـ ئەم زاتە تەریقەتی لە شێخ حسەینی بەسری وەرگرتووە ئەویش لە شێخ محەمەد سادق، ئەویش لە شێخ محەمەد قاسم، ئەویش لە شێخ عەبدولفەتاح، ئەویش لە شێخ محەمەد «غریب الله» ئەویش لە شێخ «عبدالرؤوف» ئەویش لە «سلطان الاولیاء» عەبدولقادری گەیلانی.

وە لە بەغداوە گەڕاوە بۆ شارەزوور و دەستی کرد بە ئیرشاد، بەڵام ئەوەندە بە توانا بوو ئیرشادی باشی کرد بوو بە شێخێکی باڵادەستی بێوێنە و، ناو و شۆرەتی بڵاو بووەوە بە وڵاتدا.

لەو سەردەمەدا ئەحمەد بەگی زەنگەنە لە لایەنی عوسمانی‌یەکانەوە فەرمانڕەوای قەرەداغ و سەنگاو بوو، هات بۆ ولیان بۆ دیدەنی شێخ ئیسماعیل و شێخ حەسەن و، لەو دیدەنیە گەڕایەوە کارێکی وای کرد کە دەوڵەت دێی «قازان قایە»ی دا بە شێخ ئیسماعیل و دێی گڵەزەردە بە شێخ حەسەن. جا هەردوو برا بە دڵگەرمیی خەریکی ئیرشاد و خزمەتی موسوڵمانان بوون.

بەڵام لەبەر ئەوە کە تەسەڕوفاتی رۆحیی شێخ ئیسماعیل گەلێ دیاری دا لە جیهاندا... شێخ حەسەنی برای لەگەڵ ئەوەدا کە خۆی شێخی ئیرشاد بوو چوو تەمەسوکی پێ کرد و دەستی کرد بە خەڵوەت و بەندەیی کردن بۆ خودا هەتا ئیجازەی ئیرشادی لێ وەرگرت، هەروەها شێخ عەلی دۆڵپەموویش هات تەمەسوکی کرد بە شێخ ئیسماعیل، ئەویش دایە دەستی شێخ حەسەن کە تەربییەتی بکات.

وە لە هەمان کاتدا شێخ ئیسماعیل سلووکی ئەکرد بە شێخ عەبدوڕەزاقی کوڕی کە بە شێخ رەزای دێلێژە ناسراوە. هەروەها شێخ محێدینی کوڕی شێخ حەسەن ئەویش هەر تەمەسوکی پێ کرد و دەستی کرد بە سلووک و بەندەیی کردن، هەتا بە میهرەبانی خودا پێگەییشتن.

وە بێجگە لە کۆمەڵی خۆیشیان گەلێ کەسی پێگەیاند، وەکوو شێخ موئمینی سازانی و حاجی ئەبوبەکری «کەیمنە» و مەولانا عەلی شۆشی و مەولانا ئیسماعیلی تەبریزی و... گەلێ پیاوی گەورەی دیکەیش کە هەموو لە خزمەتیدا پێگەییشتن، وەکوو شێخ حەسەنی مەولاناوا هەرچەند لە خزمەتی شێخ محەمەدی باوکیدا تەمەسوکی کردبوو و خەلیفەی ئەو بوو... لە خزمەتی شێخ ئیسماعیلیشدا سلووکی کردووە و بە پایە گەییشتوون.

شێخ ئیسماعیل زۆر خاوەن تەسەڕوفی رۆحی بووە. مەلا عەلیی شۆشیی خەلیفەی گێڕاویەتییەوە دەڵێت: لە ناحیەی خۆشناودا لەگەڵ سەیید محەمەد زەکی ناوێکدا خەریکی خوێندن بووم، شەوێک لە خەودا چاوم کەوت بە رووناکییەک لە لایەنی خۆرهەڵاتەوە جیهانی رووناک کردەوە، وە چاوم بە ئادەمیزادێک کەوت لە ئاسمانەوە

هاتە خوارەوە و لە حەوشەی مزگەوت و خوێندنگاکەماندا ڕاوەستا، وە ئەو ناوەی پڕ کرد لە ڕووناکیی. منیش نزیکی بوومەوە، جا بانگی کردم و وشاردمی بە خۆیەوە و وتی: تۆ بێ بۆ لام. وتم: تۆ کێیت و لە کوێیت؟ وتی: من ئیسماعیلم و وام لە «قازان قایە»، ئەم قسەیە فەرموو و لەبەر چاوم ون بوو.

کاتێک لە خەو هەستام حاڵێکم بەسەردا هات لە چاوپێکەوتنی شێخ ئیسماعیل بەولاوە هیچ لە دڵمدا نەما. جا کەوتمە ڕێ بۆ لای و گەیشتمە کەرکووک. لەوێ هەواڵی ڕێگەوبانم پرسی و هاوڕێیەکم پەیدا کرد، تا گەیشتمە دەربەندی باسەڕە.

جا شێخ عەبدوڕەزاقی کوڕی شێخ ئیسماعیل ئەڵێ: باوکم لە ڕۆژی هاتنی مەلا عەلیدا فەرمووی: میوانێک بەڕێوەیە دێت بۆ لامان، زۆر خۆشەویست و بەڕێزە. ئەڵێ: کاتێ هاتنە بەرەوە باوکم بانگی کرد فەرمووی: عەلی! هەتا بانگم نەکردی نەهاتی؟! ئەویش عەرزی کرد: قوربان! وا هاتم و تا ئێستە داماوی دەستی نەفس و ئارەزوو بووم و بێئەدەب بووم. فەرموی: نە، نە. «من كان ربه مؤدبه لا يغلبه احد».

جا گورج تەمەسوک بە شێخ دەکات و تەریقەتی لێ وەردەگرێت و ماوەی ساڵێک لە خزمەتی شێخدا مایەوە و لە هەر ڕۆژێکدا هەندێک کەرامەت و شتی لە یاسابەدەری شێخی بۆ ئەگێڕاینەوە و سوودمان لێ وەردەگرت.

لە شێخ محێدینی «قوولە»ی کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: ڕۆژێک بە مامە شێخ ئیسماعیلم وت: گەورەم قوتبی ئیرشادم نیشان بدە! ئەویش ئیشارەی بۆ خۆی کرد. واتە خۆم قوتبی ئیرشادم. وە ئەم ڕووداومە بۆ شێخ حەسەنی باوکم گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ڕاستە پلەی «قوطب»یەتی هەیە. «يختص برحمته من يشاء، والله ذوالفضل العظيم».

من کە دانەری ئەم کتێبەم لە خودالێخۆشبوو شێخ عەلادینم بیست فەرمووی: حەبیبوڵلا خانی قوبادیی لە دەست حوکوومەتی خۆیان ڕای کردبوو، هاتبوو لە پشت قەڵای شەمێرانەوە دانیشتبوو نامەی نووسیبوو بۆ خزمەتی باوکم کە دۆعای بۆ بکات خودا لەو تەنگانە ڕزگاری بکات، باوکم پاش ماوەیەک لە ماڵ هاتە دەرەوە و فەرمووی: عەلادین وەڵامی نامەکەی حەبیبوڵلا خان بنووسەرەوە و بۆی بنووسە کە سبەینێ و دوو سبەی خۆ بگرێت ڕۆژی سێهەم لە نزیکی خۆرئاوادا نامەی پێ ئەگات و ئەگەڕێتەوە بۆ جێگەی خۆی. منیش ـواتە شێخ عەلادین ـ عەرزم کرد: قوربان بۆچی

وەها وادەی بۆ دیاری بکەین؟ با بنووسم: «ان شاء الله» لەم نزیکەدا خودا رزگارتان ئەکا. فەرمووی: رۆڵە من بە هەوا قسە ناکەم، ئێستە لە ماڵەوە خەریکی کاری حەبیبوڵلاخان بووم، رۆحانییەتی گەلێ لە پیاوچاکان حازر بوون، رۆحانییەتی شێخ ئیسماعیلی ولیانی حارز بوو، فەرمووی: خەریکی چین؟ عەرزمان کرد: خەریکی کاری حەبیبوڵلا خانین، فەرموی: کاری لە کوێیە؟ وتمان: لە ئێران. فەرمووی: ئێستە ئەرۆم سەرۆک تێ ئەگەیەنم. ئەوەندەی پێ نەچوو رۆحانییەتەکەی هاتەوە فەرمووی: سێ رۆژی تر ئەمری بۆ دێ و رزگار ئەبێت. وە من لە سەر ئەوە ئەڵێم: وا بنووسە. جا چۆنی فەرموو وەها نووسیمان و دوای ئەو ماوە نامەی بۆ هات و گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی.

ئەم شێخ ئیسماعیلە لە دوادوایی ژیانیدا قازانقایەی بەجێهێشت و چوو بۆ ناوچەی بادینان و لە دێی ناسراو بە «گرد رێوی» دانیشت و خەریکی ئیرشاد بوو و خەڵکێکی زۆری لە دەور کۆبووەوە. ماوەیەک ئیرشادی کرد. دوایی بۆ رێکخستنەوەی کۆمەڵێک لە مەنسووبەکانی چوو بۆ شام، کاتێ لە شام گەڕایەوە و گەیشتە «موصل» چەند رۆژێک لە لای موریدەکانی مایەوە، جا نەخۆش کەوت و لەوێ کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەیان بردەوە بۆ دێکەی خۆی و لەوێ بە خاک سپێررا.

شێخ ئیسماعیل لە ساڵی ۱۰۸۱ی کۆچیدا لە نۆدێ لە دایک بووە و[1]، لە ۱۱۵۸دا لە «موصل» کۆچی دوایی کردووە. یەکێ لە مەنسووبەکانی ئەڵێت:

و نور بانوار الشریعة قد رقی
و بحر باسرار الطریقة قد طما
سمی ذبیح الله أرخت مادحا:
«لفقدک اسماعیل قد بکت السما»

بە یاسای «ئەبجەد» لە «میم»ی «مادح»ەوە تا دوایی نیوە بەیتی دوەم مێژووی کۆچی دوایی شێخ ئیسماعیلە کە ئەکاتە ۱۱۵۸.

---

۱ ـ لە دەفتەری سەییدەکانی «رێوی» یەدا ئەڵێ: لە ساڵی ۱۰۹٦دا لە دایک بووە.

خوالێخۆشبوو شێخ ئیسماعیل لەسەر نووسراوی «رسالەی منجیە»ی شێخ مارفی ریشەڵانی حەوت کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ عەبدوڕەزاق و شێخ عەبدوسەلام و شێخ عەبدولکەریم و شێخ مەحموود و شێخ مەعرووف و شێخ عەبدوللا. بەلام بە گوێرەی نامیلکەی «سراج السالکین»ی کتێبی شێخ حسەینی قازی: عەبدوللا ناوی نەبووە. بەلام شێخ مستەفا و ئاغا محەمەد و قەلەندەر و عەبدوڕەحمان و شێخ عەبدولقادر و کاک یەحیا، کە بە شێخ یەحیای «دێوانە» ناسراوە... هەن.

هەرچەند هەڵدەگرێ مەبەستی خاوەنی «سراج السالکین» هەموو کوڕەکانی بێ چ ئەوانەیان لە ژیانی باوکیاندا مردوون و چ ئەوانەیان کەوتوونەتە دوای باوکیان. لەگەڵ ئەوەیشدا کاک یەحیا بوێرراوە کەچی ماوەیەکیش پاش کۆچی دوایی باوکی ژیاوە.

**شێخ عەبدوڕەزاقی کوڕی شێخ ئیسماعیل**

ئەم زاتە لە «دێلێژە» دانیشتووە و خەریکی ئیرشادی موسوڵمانان بووە، تا لە ساڵی ١١٨٤دا کۆچی دوایی کردووە و لە دێلێژە بە خاک سپێرراوە. شێخ مەعرۆفی نۆدێیی مادەی تەئریخی بە رستەی «رضی الحی عنه» نووسیوە کە ئەکاتە ١١٨٤.

ئەم زاتە تاقە کوڕێکی بووە ناوی شێخ محەمەد بووە بەلام لەم تەنیا کوڕە نەتەوەیەکی زۆر کەوتووەتەوە.

**شێخ رەسووڵی کوڕی شێخ ئیسماعیل**

ئەم زاتەیش تەنیا کوڕێکی بووە ناوی عەبدولغەفوور بووە، بەلام لەم کوڕەیش نەتەوەیەکی زۆر کەوتووەتەوە.

**شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ ئیسماعیل**

ئەم زاتە، بە پێی ئەوەی لە «رسالەی منجیە»دا نووسراوە بە بێ نەوە سەری ناوەتەوە.

**شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی شێخ ئیسماعیل**

ئەم زاتە چووە بۆ سەفەر و بێ سەرو شوێن بووە.

بەلام من ئەڵێم: لە کاتێکدا خەریکی نووسینی ئەم کتێبە بووم کوڕێکی «معلم» هاتە لام، وتی: خەڵکی ناوچەی ئاغجەلەرم و لە نەوەی شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی

شێخ ئیسماعیلی ولیانیم، بەڵام لەو ڕۆژەوە کە باپیرە شێخ عەبدوڕەحمان هاتووەتە ئەو ناوە ناوی خۆی بە مەلا بردووە و وەسیەتی بۆ نەوەکانی کردووە کە خۆیان بە ناوی مەلا بناسێنن و ناوی سەیید بۆ خۆیان دانەنێن بۆ ئەوە لە خوێندن دورر نەکەونەوە.

هەر ئەو کوڕە بەم شێوە ڕشتەی ئەو شێخانەی نووسی: شێخ ئەحمەد ئیمام و شێخ محەمەد ـ کە بە کاکە حەمە ناسراوە ـ کوڕانی حاجی شێخ حەسەنی ئیمام، کوڕی شێخ حسەینە سوور، کوڕی شێخ حسەینی، کوڕی شێخ مووسای، کوڕی شێخ عومەری، کوڕی شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی شێخ ئیسماعیلی ولیانی.

دوای ئەوەیش بۆی نووسیبووین: کە شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ عومەر و شێخ مووسا لە «بلووکێن»دا بە خاک سپێرراون. وە شێخ حسەینە سوور و شێخ حسەین و حاجی شێخ حەسەنی ئیمام و شێخ ئەحمەدی ئیمام و شێخ محەمەدیش لە ئاغجەلەردا بە خاک سپێرراون.

### شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ ئیسماعیل

کە بە شێخ عەبدولکەریمی «خاویێ» ناسراوە لە بەر ئەوە کە لە خاوییەدا نیشتەجێ بووە. پیاوێکی خاوەن ڕێز و زانایەکی بەرزی «علومی زاهیرە» بووە و لە خزمەتی باوکیشیدا سلووکی کردووە تا بووە بە خەلیفەیی و ئیرشادی کردووە هەتا کاتێ کە بە تاعوون لە جیهان دەرچووە.

ئەم زاتە یەک کوڕی بووە ناوی حەسەن بووە لە خزمەتی باوکیدا سلووکی کردووە تا بووە بە خەلیفەی ئەو، ئەم حەسەنە خودا حەوت کوڕی پێ بەخشیوە کە ئەمانەن: عەبدولکەریم و مستەفا و عەبدوللا و حسەین و عەبدولعەزیز و عەبدولقادر و عەبدوڕەحمان. ئەم کوڕانەیش نەتەوەیەکی زۆریان لێ کەوتووەتەوە.

### شێخ حسەینی کوڕی شێخ حەسەن

ئەم زاتە زانایەکی بەرز بووە و خەریکی خزمەتی زانیاریی بووە و خۆی بە ئیرشادەوە خەریک کردووە تا کۆچی دوایی کردووە. لەم شێخ حسەین ناوە شێخ

عەبدولکەریم و شێخ محیەدین و شێخ عەلی و شێخ محەمەد و شێخ حەسەن بەجێماون.

### شێخ عەبدولکەریم

کوڕی شێخ حسەینی کوڕی شێخ حەسەنی کوڕی شێخ عەبدولکەریمی خاوێ. ئەم زاتە یەکەمجار لە خزمەتی کاک ئەحمەدی شێخدا سلووکی کردووە، بەڵام لای ئەو نەماوەتەوە و چووە بۆ خزمەتی شێخ عەبدولقادری قازانقایە و لای ئەو سلووکی کردووە هەتا ئیجازەی پێداوە.

ئەم شێخ عەبدولقادرە خۆی لای شێخ عەبدوسەمەدی کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردە سلووکی کردووە.

بە کورتی شێخ عەبدولکەریم ـ شێخ کەریمی کەسنەزان ـ لە سەر ئیرشاد دەوام ئەکا هەتا لە ساڵی ۱۳۱۷ی کۆچیدا لە جیهان دەردەچێت.

ئەم زاتە شەش کوڕی لێ بەجێماوە: عەبدولقادر و ئەحمەد و محەمەد و عەبدولفەتاح و مەعرووف و مەحموود. عەبدولقادریان لە شوێنی باوکیدا دانیشتووە، پاش ئەوەی کە ئیجازەی ئیرشادی لە باوکی خۆی وەرگرتووە. دوای ئەوە لە سەر ئیرشادکردن ماوەتەوە تا لە ساڵی ۱۳٤۱ی کۆچیدا لە دێی «پیران» کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەیان هێناوەتەوە بۆ دێی «کربچنە» لە ناحیەی «سەنگاو».

ئەم شێخ عەبدولقادرە چوار کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ حسەین و شێخ کاکە حەمە و شێخ عەبدولکەریم و شێخ حەمە ساڵح.

### شێخ حسەین

دوای کۆچی دوایی شێخ قادر شێخ حسەین لە جێگەکەیدا دانیشتووە.

ئەم زاتە موریدی باوکی بووە و خۆی حەزی لە خوداپەرستی و بەندەییکردن بووە. بە داخەوە تەمەنی زۆر نەبووە. بەڵام نازانم لە چ ساڵێکدا کۆچی دوایی کردووە.

### شێخ عەبدولکەریم

برای خوالێخۆشبوو شێخ حسەین و کوڕی شێخ قادرە، لە جێگەی کاک شێخ حسەیندا دانیشت و لە سەر یاسای ئیرشاد ڕۆیشت هەتا لە ساڵی ۱۳۹۸ی کۆچیدا لە

کەرکووک کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەیان لەوێوە بردەوە بۆ کربچنە و لەگەڵ باوک و باپیریدا بە خاک سپێررا.
ئەم زاتە چەن کوڕی هەیە، گەورەیان ناوی [شێخ محەمەدە].

## شێخ محەمەد

ئەم شێخ محەمەدە ئێستە لە جێگەی باوکیدا دانیشتووە و خەریکی ڕێبازی خۆیەتی و گەلێ کەس بە ڕەوشتی ئیدراک و شوعوور و پەیڕەویی ئەحکامی شەرعی شەریف تاریفی ئەکەن. خودا یارمەتیی بدات بۆ پەیڕەوی کردنی شەریعەتی پیرۆز.

## شێخ کاکە حەمەی کوڕی شێخ عەبدولکەریم

ئەم پیاوە لە سەر ڕێبازی باو و باپیری خۆی دەڕوات و ئێستە لە سلێمانیدا دادەنیشێ و تەکیە و شوێنی خۆی هەیە و خزمەتی ئایین دەکات و چەند کوری پیاوانە و بەدین و دارای خوو و ڕەوشتی جوانی هەیە، وەک: شێخ قادر و شێخ حسەین و شێخ موعتەسەم.

## شێخ عەبدوسەلام کوڕی شێخ ئیسماعیل

ئەم زاتە لە دێی «دەربەندسووتاو»دا نیشتەجێ بووە، هەتا لەوێ کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی براوەتەوە بۆ «دێلێژە» و لەوێشدا بە خاک سپێرراوە.
وە پێنج [؟][1] کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ حەسەن و شێخ عەلی و شێخ ئیسماعیل و شێخ عەبدوسەمەد، ئەم زاتانە گەلێ نەتەوەیان لێ کەوتوەتەوە.

## شێخ مەعرووفە کۆستە

کوڕی شێخ ئیسماعیلی، خەلیفەی شێخ محێدینی کەرکووک بووە، کە کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردەیە. ئەم شێخ مەعرووفە خاوەنی کەشف و کەرامەت بووە و لەقەبی سیراجەدینی بووە و لە ساڵی ١٢٣٦ لە دێی «کانی کەوە»دا کۆچی دوایی کردووە و نەوەی نەبووە.

---

١- مامۆستا ئەڵێ پێنج کوڕ کەچی لێرەدا ناوی چوار کەس ئەنووسێ. ن.ب

### شێخ عەبدوڵڵا

کوڕی شێخ ئیمساعیل لە دێی «کانی خاکیی» دانیشتووە و لە دێی خۆرنەوەزان بە خاک سپێرراوە، تەنها کوڕێکی بووە ناوی شێخ مستەفا بووە، بەلام لە شێخ مستەفا نەتەوەیەکی زۆر کەوتووەتەوە.

### شێخ مەحموود

کوڕی شێخ ئیسماعیل، ئەم زاتە پێنج کوڕی بووە: عەبدوسەمەد و ئاغا محەمەد و ئەحمەد و حەسەن و حسەین. سیانە پێشووەکان بێ نەوە سەریان ناوەتەوە. شێخ حەسەنیش کە بە شێخ حەسەنی «هەشەزین» ناوبانگی دەرکردووە لە ساڵی ١٢٣٤دا کۆچی دوایی کردووە و ٤ کوڕی لێ بەجێماوە: عەبدولقادر و محەمەد و ئەحمەد و عەبدولعەزیز. جا عەبدولقادر جێگەنشینی باوکی بووە و دوو کوڕی لێ بەجێماوە: مەعرووف و کاکە حەمە. لە مەعرووف عەبدولقادر و لە عەبدولقادریش عارف و محەمەد عەلی و لە کاکە حەمە میرەسوورە بووە.

### شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ حەسەن

کوڕی شێخ مەحموود ٤ کوڕی بووە: باباعەلی و عەبدولعەزیز و مستەفا و مەحموود. باباعەلی و عەبدولعەزیز بێ نەوە سەریان ناوەتەوە. لە شێخ مستەفا عەبدولکەریم و باباعەلی بووە.

وە لە شێخ مەحموود محێدین و محەمەدفەرەج و محەمەدرەشید و بابا رەسووڵ بووە.

وە لە شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ مستەفا... کاکە مستەفا و ئیسماعیل و مەعرووف و ئەحمەد و محەمەد و محەمەدئەمین و سەعید بوون.

وە لە باباعەلیی کوڕی شێخ مستەفا عەزیز و عەبدوڵلا و محێدین و نەسرەدین بوون.

### شێخ حسەینی کوڕی شێخ مەحموودی «کلیسە»

ئەم زاتە لە دێی قازانقایەدا بووە و بە شێخ حسەینی قازانقایە ناسراوە، پێنج کوڕی بووە: محەمەدئەمین و عەبدولقادر و ئەحمەد و مستەفا و عەلی. ئەم کوڕانە هەموو

نەتەوەیان لێ کەوتووەتەوە. بە تایبەتی لە شێخ عەبدولقادری قازانقایە کە پیاوێکی باش و ئەهلی ئیرشاد بووە پێنج کوڕ بەجێماوە: عەبدولکەریم و محەمەدساڵح و ئەحمەد و محەمەد و مستەفا.

### شێخ عەبدولکەریم

کوڕی شێخ عەبدولقادری قازانقایە. ئەم زاتە پیاوێکی چاک و بەتوانا و خاوەن تەریقەت و زانا بووە و لە سەر تەکیەی پێشووی شێخ ئیسماعیل لە شاری کەرکووک دانیشتووە و خەریکی زانست و دین بووە و لە ساڵی ١٢٨٢ی کۆچیدا لە نێوان نوێژی مەغریب و عیشادا بە دەردی تاعوون کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە ٣ کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ حەسەن و شێخ حسەین و شێخ محێدین.

### شێخ حەسەنی کوڕی شێخ عەبدولکەریم

پیاوێکی چاک و زانا و لەخوداترس و خاوەن ڕەوشت و خووی بەرز بووە: لە خزمەتی کاک ئەحمەدی شێخدا سلووکی کردووە و بووە بە خەلیفەی ئەو، لە سەرەتاوە لە قەرەچیواردا بووە، دوایی هاتووە بۆ «قادرکەرەم» و بە گوێرەی توانا خزمەتی دینی کردووە و لەگەڵ ڕێبازی شەرعدا بووە، بە جۆرێک کە ئەڵێن کەم کەس وا پەیڕەوی ڕێبازی پێغەمەری کردووە. وە گەلێ کەسی پێگەیاندووە و ناردوونی بۆ ئەملاولا بۆ پەرەپێدانی دین و خۆیشی بۆ هەمان مەبەست گەلێ هاتوچۆی کردووە.

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٦٤ی کۆچیدا لەدایک بووە و لە ساڵی ١٣٢٤دا کۆچی دوایی کردووە و لە قادر کەرەم بە خاک سپێرراوە.

### شێخ محێدینی برای شێخ حەسەن

لەبەر ئەوە شێخ حەسەن نەوەی نێرینەی نەبووە و شێخ حسەین کە برای بووە و زووتر کۆچی دوایی کردووە شێخ محێدینی برای بڕیاری داوە کە لە سەر تەکیەکەیان دابنیشێ بۆ سەرپەرشتی ئیش و کاری ئایینی.

جا لەسەر تەکیەکە دانیشتووە و بە یاسـای خانـەدان سەرپەرشـتی ئـیش و کـاری کردووە و تەریقەی بەجێ هێناوە تا لە ساڵی ١٣٣٥دا کۆچی دوایی کردووە.

## شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ حسەین

پاش کۆچی دوایی شێخ محیدین... شێخ عەبدولکەریم لە جێگەکەیا دانیشتووە کە پیاوێکی زانا و ئەدیب و چاک بووە، ئەم زاتە لە «ئامینەخان»ێک بـووە کـە لـە نـەوەی شـێخ عەبـدوڕەحمانی، کـوڕی شـێخ عوسمـانی، کـوڕی شـێخ عەبدوڵلـەتیفی زانـای پایەبەرزی گەورەی قەرەداغە.

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٩٧ی کۆچیدا لـە دایـک بـووە و لـە ساڵـی ١٣٧٤ی کۆچیـدا کۆچی دوایی کردووە.

شێخ عەبدولکەریم گەلێ ژنی هێناوە و گەلێ نەوەی نێر و مێی بووە.

کوڕەکانی ئەمانەن: شێخ محەمەد و شـێخ ئیسـماعیل و شـێخ مـەعرووف و شـێخ جەعفەر و شێخ عەبدولوەهاب و شێخ سەعید و شـێخ ڕەئـووف و شـێخ موعتەسـەم و شێخ حسەین.

لە پاش کۆچی دوایـی شـێخ عەبدولکـەریم شـێخ محەمـەدی کـوڕی لـە جێگـەیا دانیشت. ئەم زاتە لە ساڵی ١٣١٥ی کۆچیدا لە دایک بووە، لە ساڵی ١٣٧٤ی کۆچیـدا لە جیهان دەرچووە.

ئەم زاتە چەند کوڕی بووە دیاریترینی کوڕەکانی شێخ ئیـبراهیم بـوو کـە لـە سـەر جێگـە و شـوێنی پۆسـتنوشـینی دانیشـت و بـە گـوێرەی توانـا خزمـەتی دیـن و موسوڵمانانی کرد و مزگەوت و تەکیەی کردەوە کە تـا ئێسـتە بەردەوامـە کـە ساڵـی ١٤٠٤ی کۆچی‌یە.

## شێخ حەمە ساڵح

کوڕی شێخ عەبدلقادری قازانقایە، کوڕی شێخ حسەین...

ئەم پیاوە زاتێکی بە دیانەت و خـاوەن ڕەوشـت و خـووی بـەرز بـووە و ئیرشـادی کردووە تا لە ساڵی ١٣٠٢ی کۆچیدا لە قازانقایە کۆچی دوایی کردووە. چـوار کـوڕی

لێ بەجێماوە: شێخ عەبدولقادری بە «گولە نەبڕ» ناسراو، شێخ مەحموود، شێخ حەسەن، شێخ سەعید.

شێخ مەحموود لەسەر ڕێبازی باوکی ڕۆییشت و ئیرشادی کرد.

ئەمیش گەلێ نەوەی لێ بەجێماوە لەوانە: شێخ تاها و شێخ ئەمین و شێخ سەفائەدین و شێخ فازیل...

دایکی ئەم شێخ فازیلە کچی حەبیبوللاخانی قوبادی‌یە و، پیاوێکی سەروشێوە جوان و ڕەوشت پاک و خۆش‌نووس و دەنگ‌خۆش بووە.

بۆ خوێندن هاتە بیارە و ماوەیەک لەوێ مایەوە و گەلێ هەوڵی دا و کۆششی کرد لە خوێندندا و، «تهذیب الکلام»ی خویند و، کاتێ گەییشتە ئەوە ئیجازە وەربگرێت و دەرس بڵێتەوە... مێشکی تێکچوو و حاڵی گۆڕا و یەکێک ئەیوت: شێت بووە و یەکێکی تر ئەیوت: مەجزووبە و پلەی ویلایەتی هەیە. بەو شێوەیە چوو بۆ شاری کفری و لەوێ مایەوە و ڕێزی لێ دەگیرا، تا لە ساڵی ١٣٨٥دا کۆچی دوایی کرد.

## شێخ یەحیای کوڕی شێخ ئیسماعیلی ولیانی

کە بە شێخ یەحیای دێوانە ناسراوە. ئەم زاتە پیاوێکی دەروێش دیمەن بووە و گوێی بە دنیا نەداوە و گەلێ کەشف و کەرامەتی لێ دەگێڕنەوە.

لە پاش کۆچی دوایی باوکی لە گوندی «گردە ڕێوی» کە بە «ڕێویە» ناسراوە دانیشتووە و ماوەی بیست ساڵ بەو شێوە ماوەتەوە، دوایی لە جیهان دەرچووە و تاقە کوڕێکی لێ بەجێماوە ناوی شێخ محەمەد بووە.

لەم شێخ محەمەدەیش ٢ کوڕ بەجێماوە: یەحیا و عەبدولقادر. لە عەبدولقادریش محەمەد و فاتیمە بەجێماون.

پاش کۆچی دوایی شێخ یەحیای دێوانە خەلیفە مەلا مستەفا لە سەر تەکیەی شێخ ئیسماعیلی ولیانی لە «ڕێویە» دانیشتووە و ماوەی چل ساڵ ماوەتەوە. پاش کۆچی دوایی ئەمیش محەمەدی کوڕی چل ساڵ ماوەتەوە.

دوای کۆچی دوایی ئەم محەمەدی کوڕی خەلیفە مەلا مستەفا تەکیەکە چۆڵ بووە. جا شێخ محیەدینی هەشەزینی خەلیفەی خوالێخۆش‌بوو شێخ حەسەنی قەرەچیوار هاتووە ماوەی حەفتا ساڵێ لە سەر تەکیەکە دانیشتووە.

دوای کۆچی دوایی شـێخ محیـدین فاتمـەخانی خێـزانی کـە ئـافرەتێکی چـاک و لەخوداترس بووە لە شوێنەکەدا ماوەتەوە تا پانزدە ساڵێک. دوای ئەمیش حاجی شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی شێخ بابـا رەسووڵـی، کـوڕی شـێخ مـەحموودی، کـوڕی شـێخ ئەحمەدی، کوڕی شێخ حەسەنی هەشەزینی، کوڕی شێخ مەحموودی کلیسـە کـوڕی شێخ ئیسماعیلی ولیانی... لەو شوێنەدا بووە.

ئەم حاجی عەبدولعەزیزە پیاوێکی چـاک و لـەخوداترس و بەئـەدەب و خوێنـدەوار بووە و پەیڕەویی شەریعەتی کردووە و زۆر بەشەرم و راگری یاسای ڕێبازی خۆی بووە.

لە ٢٦ی سەفەری ساڵی ١٣٩٧ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و سەعید و ئەحمـەد و کاک یەحیا و رەزای لێ بەجێ‌ماون و لەو شوێنەدا لە سەر یاسـای شـێخ ئیسـماعیل خزمەتی تەکیەکە ئەکەن و ئێستە هەر چەنـد شـێخ فـاتیحی بـرای عەبدولعـەزیز لـە ژیاندایە شێخ سەعید خەریکی خزمەتی تەکیەکەیە.

ئەوانەی کە نەتەوەیان بووە لە نەوەی شێخ ئیسـماعیلی ولیـانی ئەمانـە بـوون کـە باسی نەوەکانیانمان کرد. وە بە گوێرەی نامیلکەی «رسالەی منجیـە»ی شـێخ مـارفی ریشەلانی نەوەی شێخ سەلامی کوڕی شـێخ ئیسـماعیل لـە هـۆزی شـێخ محەمـەدە غەوسەن و هەندێکیان لە «دەربەند سووتاو»ن و هەروەها نەوەی شێخ رەسووڵـیش وان لە هەمان دێدا و نەوەی شێخ مەحموودی «کلیسە»یش لـە دێکـانی: «قـازانقایـە» و ـ گۆپتەپە ـ و «هەشەزین» و «قەرەچیوار» و ـ قادرەکەرەم ـ دان.

وە نەوەی شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ ئیسماعیل وان لـە «خـاوێ» و «کـەس- نەزان»دا و، نەوەی شێخ عەبدوڵلا وان لە دێی «کانی خاکی»دا.

## شێخ حەسەنی کوڕی شێخ محەمەدی نۆدێ

ئەم زاتە لە ساڵی ١٠٨٦ی کۆچیدا لە گوندی «نۆدێ» لە دایک بووە و لە ساڵی ١١٨٥ی کۆچیدا لە دێی «گڵەزەردە» لە سنووری قەرەداغدا کۆچی دوایی کردووە.

پیاوێکی زانا و عاقڵ و هۆشیار و پیرۆز بووە. شارەزایی لە زانیاری‌یە باوەکاندا وەکوو: «نەحو» و «سەرف» و ـ بەلاغە ـ و «مەنتیق» و «فیقهـ» و ئوسولی فیقهـ و ئوسوولی دین و تەفسیری قورئانی پیرۆز...دا بووە.

هەروا زانا بووە بە «علومی باتن» کە بریتی‌یە لە تەسەووف بە یاسای شەریعەتی ئیسلام و گەلێ کەرامەتی لێ دەرکەوتووە و لە تەسەڕوفاتی دەروونیشدا خاوەن پایە بووە.

وە ئەوەندە خاوەنی رەوشتی بەرز بووە کراوە بە نموونە بۆ بەرەوشتان. وە لە سەردەمی شێخ محەمەدی نۆدێی باوکیدا و بە فەرمانی باوکی لای شێخ عەبدوللای «سویری» ـ کە گوندێکە لە شارباژێر لە نزیکی چنگیاندا ـ کە ئەو شێخ عەبدوللایش خەلیفەی شێخ محەمەدی نۆدێ بووە... سلووکی کردووە و ئیجازە دراوە بۆ ئیرشاد و لە بەغدایشا بە خزمەتی شێخ ئەحمەدی ئەحسائی گەییشتووە و تەمەسوکی پێ کردووە و لە خزمەتی شێخ ئیسماعیلی براگەورەیدا سلووکی کردووە و شێخ ئیسماعیل خەرقەی ئیجازەی بۆ ئیرشاد کردن کردووەتە بەری.

خوالێخۆش‌بوو شێخ حەسەن وەکوو لە رێگەی تەریقەتەوە گەلێ خزمەتی ئایینی کردووە، لە رێگەی زانیاری‌یە ئایینی‌یەکانیشەوە زۆر تێکۆشاوە و هەوڵی داوە و لە خزمەتی زانا گەورەکانی وڵاتدا وەکوو شێخ محەمەد وەسیمی کوڕی شێخ ئەحمەدی، کوڕی شێخ مستەفای تەختەیی و مەلا جامی چوڕی و مەلا عەبدولکەریمی کوڕی مەلا ئەبەبەکری موسەنیف و... زانایانی دیکەی ئەو چەرخە خوێندوویە و ئەوەندە پایەی لە زانیاریی ئاییندا بەرز بووە لە هەموو لایەکەوە باسی کراوە و پەنجەی بۆ درێژ

کراوە. شێخ حسەینی ئەلمەعیی بەرزنجی کە لەو رۆژەدا زانای گەورەی وڵات بـووە و خەڵک لە هەموو لایەکەوە بۆ خوێندن هاتوون بۆ خزمەتی... شێخ حەسەنی بە زانـای بەرز ناوبردووە.

شێخ حەسەن زۆر جار هەر لە بەرگی مەلایانەدا ژیاوە و قوتابی لە هەموو لایەکـەوە هاتوون بۆ خزمەتی و ئەمیش دەرسی پێ وتون و لەگەڵ ئەو هەموو ئیش و کارەیشیدا قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە، بۆیە پێیان وتوە: شێخ حەسەنی «حافظ».

شێخ حەسەن سەفەری حیجاز و زیارەتی پێغەمەر و حەجی ماڵی خـودای کـردووە و لەم سەفەرەدا شێخ محێدینی کوڕی خۆی لە خزمەتیدا بووە و لە رێگـەدا هـاوڕێتی گەلێ پیاوچاکی کردووە و پیرۆزیی لێ وەرگرتوون. بە تایبـەتی لـە شـاری شـامدا بـە خزمـەتی شـێخ مسـتەفای شـامیی گەییشـتووە و گـەلێ سـوودی لـە هـاوڕێتی ئـەو وەرگرتووە.

وا باو و نووسراوە کە شێخ حەسەن ئەوەندە پایـەی ئیرشـادی بـەرز بـووە زۆربـەی مورید و خەلیفەکانی لە گەورەزاناکانی جیهان بوون وەکوو:

شێخ مستەفای کوڕی شێخ ئەحمەدی غەزائی باپیری شـێخ مـەعرووفی نـودێیی و شێخ جەعفەری مەجزووب و شێخ محێـدینی کـوڕی خـۆی و شـێخ عەبدولجـەبباری کوڕی خۆی و شێخ موئمینی سازانی و شێخ عەبدوڵلای هـەراتی و... وە لـە مـەلاکان وەکوو: مەلا جەلالی خورماڵی ـکە گەورە مەلای چەرخی خـۆی بـووە و ـ گـەلێ لـە مەلاکانی قەڵاچوالان، وەکوو مەلا ئەحمەدی غەزائی مودەڕیس لە قەڵاچوالاندا.

شێخ عەبدوڵلای هەراتی ئەڵێ: لە خزمەتی خواڵێخۆشبوو شـێخ حەسـەندا بـووم، رۆژێک بەو شوێنەدا رابورد کە ئێستە ئارامگاکەی لەوێدایە فەرمووی: ئـەی زەوی مـن ئەمەوێ لە خاکی «بطحا» یا «یثرب»دا بنێژرێم و تـۆیش بـانگم ئەکـەی ئەڵـێیت: مـن جێگەی تۆم! منیش پێم گوت: قوربان! خودا فەرموویەتی: «و ما تدری نفس بـای ارض تموت» چلۆن تۆ ئەفەرمووی ئەمە جێگەی منە؟ ئەویش فەرمووی: خودا فەرموویـەتی: «بأی ارض تموت» و نەیفەرمووە: «بأی ارض تدفن». ئەم شوێنە جێگەی داپۆشینی منـە نەک شوێنی گیان دەرچوونم.

شـێخ حەسـەن لـە ساڵـی مردنیـدا نـەخۆش کـەوت و تـا مـاوەی ٤٠ رۆژ ئـەو نەخۆشییەی پێوە بوو، بەڵام ئەو هەر نوێژەکانی بـە جەماعـەت ئـەکرد، تـا لـە ساڵـی

١١٨٥ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لەو شوێنەدا کە ئێستە هەیە بە خاک سپێرراوە.

**نەوەکانی شێخ حەسەن**

ئەم زاتە هەشت کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ محێدین و شێخ عەبدولجەبار و شێخ مەعرووف و شێخ عەبدوسەمەد و شێخ عیسا و، شێخ عەبدورەحیم و شێخ محەمەد عارف و شێخ عەبدولکەریم.

**شێخ محێدین**

ئەم زاتە کە لە سەرەتاوە لە دێی گڵەزەردە دەرچوو، چوو بۆ دێی قوولە و لەوێدا دانیشت، تا پاش ماوەیەک چوو بۆ شاری کەرکووک و لەوێ نیشتەجێ بوو و خەریکی ئیرشادی موسوڵمانان و زیکری خودا بوو، وە گەلێک بە زانیاری و ئیرشاد و ئامۆژگاری خزمەتی جیهانی ئیسلامی کرد و زەخیرەی خۆی خست.

شێخ محێدین لە بنەڕەتی پێگەییشتنیا زۆر بە گەرمیی کۆششی کردووە و بە پایە گەییشتووە. لە خانەدانی خۆیاندا سەرەتای زانستی خوێندووە، ئەمجار لە خزمەتی زانا گەورەکانی وڵاتی کوردستاندا خوێندوویە. پاش تەواو کردنی خوێندن لە خزمەتی باوکیدا چووە بۆ حیجاز و گەلێ پیاوی چاک و زانای بەرزی دیوە و سوودی لێ وەرگرتوون.

وە لە بارەی تەسەووفەوە سالیکێکی سالار و پیاوێکی دامەزراو و هۆشیار بووە و لە ڕێبازی تەریقەتیشدا زۆر بایەخی بە ڕێبازەکەی داوە و لە خزمەتی مامی خاوەن پلە و پایەی خۆی شێخ ئیسماعیلی ولیانیدا تەریقەتی وەرگرتووە و پلە و پایەی بەرزی دەست کەوتووە و خەرقەی ئیرشادی لێ وەرگرتووە. کاتێ گەییوەتە پلەی ئیرشاد تەربییەتی گەلێ کەسی کردووە.

شێخ عەبدوسەمەدی برای و شێخ مارفەکۆستەی ئامۆزای لە بەردەستی ئەم شێخ محێدینەدا پێگەییشتوون.

وە زانای گەورە ئیبنولحاجی جێشانەیی و شێخ عەبدوڕەزاقی «دێلێژە» گەلێ تاریفی شێخ محێدینیان کردووە، هەروەها شێخ مەعرووفی نۆدێیی ـ هەرچەند پاش ئەو بووە ـ زۆر تاریفی کردووە.

شێخ عەبدوڕەزاق ئەڵێ: لە کۆساری گڵەزەردەدا کەم تەختە بەرد هەیە کە شێخ محێدین نوێژی لە سەر نەکردبێ و سوجدەی بۆ خودا لە سەر نەبرد بێ.

لە زمانی شێخ یاسینی بەرزنجەیی‌یەوە دەگێڕنەوە ئەڵێ: لەگەڵ شێخ محێدیندا کەوتینە ڕێگە بو بەرزنجە، کاتێ لە دێی گڵەزەردە دەرچووین باوکم کە شێخ ڕەسووڵی بەرزنجەیی و خاڵۆی شێخ محێدین بوو فەرمووی: ئێوە ئیمڕۆ مەدەن لە ئاوی تانجەرۆ، ئاوەکەی زۆرە، من سوارم دەرئەچم ئێوە ڕاوەستن تا ئاوەکەی ئەنیشێتەوە، باوکم بە سواریی ڕۆیشت.

ئەو ڕۆیشت و ئێمە ماینەوە، زۆری پێ نەچوو شێخ محێدین هات دەستی گرتم و فەرمووی: بێن بە شوێنما، ڕۆیشتە ناو چەم و ئێمەیش بە دوایا لە چەم پەڕینەوە، کە تەماشام کرد دەبینم لەشمان تەڕ نەبووبوو!

کاتێ گەیشتین بە باوکم، فەرمووی: ئەمە کاری محێدینە، ئەگەرنا ئێوە ئەو پیاوە نەبوون وا لەو ئاوە دەربچن.

وە ئەڵێ هەر لەو ڕێگەدا حەیوانێکی کێویمان دی، باوکم فەرمووی: محێدین! بانگ بکە لەو حەیوانە بەلکو بگەڕێتەوە بۆ لامان. شێخ محێدین بانگی لێ کرد گەڕایەوە بۆ لای شێخ و چووە باوەشی بەلام بەرەلای کرد و ڕۆیشت.

لە شێخ ئەحمەدی تیماریی دەگێڕنەوە کە لە سارادا پەلەوەر دائەبارین بە دەوری شێخ محێدیندا و سڵیان لێ نەدەکرد و، ئەویش میهرەبانیی لەگەڵ دەکردن.

کەرامەتەکانی شێخ محێدین زۆر بوون و دەفتەرێکی تایبەتییان دەوێت.

شێخ محێدین پاش کۆچی دوایی شێخ حەسەنی باوکی لە گڵەزەردەوە گواستییەوە بۆ دێی «قوولە» لە «بازیان» و یەک دوو ساڵ لەو دێدا مایەوە، دوایی چوو بۆ ناحیەی قەرەحەسەن و لە دێی «تەیمەز ئاوا» دانیشت و سێ ساڵی تێدا مایەوە، پاش ئەوە چوو بۆ شاری کەرکووک و بە تەواوی لەوێ نیشتەجێ بوو.

شێخ محێدین قازانجێکی زۆری بۆ موسوڵمانان بوو گەلێ ڕێنومایی کردن و لە هەمان کاتدا گەلێ کتێبیشی داناوە وەکوو:

١ـ السیف القاطع فی الدعوات و برء الآلام.

٢ـ مجمع الجواهر.

٣ـ ابدال الاعمال.

٤ـ معادن اللآلی فی فضایل الآل.

٥ـ جلب الراحة.

٦ـ الافاقة فی رفع الفاقة.

٧ـ وە نامیلکەیەک لە زانیاری «اوفاق» دا.

ئەمانە هەموو دەسخەتن و چاپ نەکراون.

ئەم زاتە لە دێی گڵەزەردەدا لە ساڵی ١١٢٣دا لە دایک بووە و لە ساڵی ١١٩٣دا کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە سێ کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ عەبدولعەزیز و شێخ محەمەد. ئەم دووانە لە ناحیەی قەرەحەسەندا ماونەتەوە و لە شێخ عەبدولعەزیز شێخ مەحموود بەجێماوە کە بە شێخ مەحموودی قوتب و شێخ مەحموودی شۆڕیجە ناسراوە.

کوڕی سێهەمی شێخ حەسەن کە نەتەوەی لە دێی قوولەی بازیاندا ماوەتەوە [سەیید عەبدولجەببارە].

## سەیید عەبدولجەبباری کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردە

ئەم زاتە یەکێ بووە لە زانا گەورەکانی رۆژگار و یەکێ بووە لە پیاوچاکەکانی چەرخی خۆی و عیلمی زاهیر و باتینی زانیوە. لە خزمەتی زانای پایەبەرز ئیبنولحاجی جێشانەدا خوێندوویە.

سەیید عەبدولجەببار لە خزمەتی ئەم مامۆستا مەزنەدا دەرزی زانیارییەکانی خوێندووە تا سەرامەد بووە.

تەریقەتیشی لە شێخ حەسەنی باوکی خۆی وەرگرتووە، باوکی لەقەبی «مصلح الدین»ی داوە پێی.

بەداخەوە تەمەنی کورت بووە و ساڵێک دوای کۆچی دوایی باوکی ئەمیش لە جیهان دەرچووە. ئەم زاتە لە ساڵی ١١٣١ی کۆچیدا لە «ولیان» لە دایک بووە و ساڵی ١١٨٦ لە گڵەزەردە کۆچی دوایی کردووە. لە لای باوکیدا بە خاک سپێرراوە.

ئەم زاتە سێ کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ ئەحمەدی تیمار کە بە «امین الدولة» ناسراوە و سەیید محەمەد کە بە سەیید محەمەدی عوکاشە ناوبانگی دەرکردووە و سەیید مستەفا.

**شێخ ئەحمەدی تیمار کوڕی سەیید عەبدولجەببار**

ئەم زاتە هەر لە منداڵیدا باوکی ڕێبازی تەریقەتی پیشان داوە و لە «ریاضە» و «سلوک»دا تاقانەی چەرخی خۆی بووە و کەشف و کەراماتی زۆری بووە.

پاش کۆچی شێخ عەبدولجەبباری باوکی لە تیمارەوە گوێزاویەتی‌یەوە بۆ «ئالیاوا» و لە ساڵی ۱۲۱۹دا کۆچی دوایی کردووە و نەتەوەی لە دێکانی تیمار و ئالیاوا و گڵەزەردە و... شوێنانی دیکەیشدا بڵاوبوونەتەوە. لەوانە بەرەی شێخ عەزیزی «عەلی-پەکان» کە دێنەوە سەر شێخ ئەحمەدی تیمار و لە شەجەرەکەیاندا ئاوا نووسراوە:

السید عبدالله، ابن السید عبدالعزیز، ابن السید محمد، ابن السید بابا علی، ابن السید رضا، ابن السید علی، ابن السید احمد، ابن السید عبدالجبار، ابن السید حسن گڵەزەردە، ابن السید محمد النودهی، ابن السید علی، ابن السید بابا رسول، ابن السید عبدالسید الثانی، ابن السید عبدالرسول، ابن السید قلندر، ابن السید عبدالسید، ابن السید عیسی الاحدب، ابن السید حسین، ابن السید بایزید، ابن السید عبدالکریم، ابن السید عیسی النوربخشی البرزنجی، ابن السید بابا علی الهمدانی...

تا کۆتایی شەجەرەی بەرزنجە.

**سەیید عەبدوسەمەدی کوڕی شێخ حەسەن**

ئەم زاتە نازناوی «فضل الدین» بووە، هەر لە منداڵی‌یەوە خەریکی بەندەیی کردن بۆ خودا بووە و خەریکی خوێندنیش بووە، پاش ئەوە کە توانای پەیداکردووە و لە شت تێگەییشتووە چووەتە خزمەتی مەلا محەمەدی جێشانە و، لای ئەو خوێندوویە تا لە زانیاری‌یەکاندا سەرامەد بووە.

دوای ئەوەیش لای شێخ محێدینی برای خەریکی تەریقەت بووە تا وای لێ هاتووە ئیجازەی داوە پێی.

شێخ مەعرووفی نۆدێیی گەلێ ستایشی ئەم سەیید عەبدوسەمەدەی کردووە.

ئەم سەیید عەبدوسەمەدە گەلێ کەسی لە تەریقەتدا پێگەیاندوە.

لەوانە: شێخ حسەینی قازانقایە و شێخ عەبدوڕەحمانی قەرەحەسەن و شێخ ئەحمەدی ئیمام... هەموو لە خزمەتیدا خەریکی تەریقەت بوون و ئیجازەیان لێ وەرگرتووە.

یاسای شێخ عەبدوسەمەد وا بووە لە پێش نوێژی نیوەڕۆدا دەرسی گوتووەتەوە و پاش نوێژی عەسر خەریکی ئادابی تەریقەت بووە و شەوان لە ماڵی خۆیاندا خەریکی خوداپەرستی بووە. بە کورتی: کاتی بەزایە نەچووە.

گەلێ زمانی خۆی پاراستووە، دەڵێن: قسەی نارەوای بە دەمدا نەهاتووە و فەرموویەتی: زمانێ کە یادی خودای پێ ئەکرێ و ئەوترێ حەیفە شتی نارێکی پێدا بێت.

بە گوێرەی توانا پەیڕەوی سونەتی پێغەمەری کردووە. ئەگێڕنەوە: کەمێک لە پێش کۆچی دواییدا دەسنوێژی گرتووە و سیواکی کردووە، جا لە ساڵی ١٢٢٠دا لە گوندی «گڵەزەردە» لە جیهان دەرچووە.

نەوەکانی شێخ عەبدوسەمەد لە دێی گڵەزەردە و «داراغا»دا دانیشتوون و نەتەوەیان لەو دێهاتەدا هەیە.

نەتەوەکانی شێخ عەبدوڕەحیمی کوڕی شێخ حەسەن لە دێی گڵەزەردەدا ماونەتەوە.

### شێخ مەعرووفی کوڕی شێخ حەسەن

ئەم پیاوە نەوەی لە گوندەکانی ریشەڵان و سەرزەل و کانی سپیکە و شێخ ویسال و گڵەزەردەدا هەیە، هەروەها نەوەی لە شاری سلێمانیدا، وەکوو نەقیب و نەتەوەکانی، هەیە.

### شێخ محەمەد عارفی کوڕی شێخ حەسەن

نەوەی ئەم زاتە لە دێی «مزگەوتە»ی شارباژێڕدا هەیە.

### شێخ عیسای کوڕی شێخ حەسەن

ئەم زاتە وەجاخکوێر بووە و کەسی لێ بەجێ نەماوە.

### شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ حەسەن

نەوەی ئەم زاتەیش لە شاری «کۆی سنجەق»دا هەیە و، یەکێ لەوانە شێخ ئەحمەد بووە لە نەتەوەی شێخ عەبدولکەریم، کە شێخ مەعرووفی نۆدێ شەجەرەکەی بەم شێوەی خوارەوە کردووە بە شیعر:

ان ينتسب احمد راجي ذي‌المنن … فهو فتى عبدالكريم بن حسن
والده محمد كان ولىّ … مربيا للثقلين، ابن على
بابا رسول نجل عبدالسيد … فهو فتى عبدالرسول ولد
وحيد اهل العصر عبدالسيد … قلندر، سليل عبدالسيد
ابوه عيسى الأحدب الاجل … والده الحسين و هو نجل
الشيخ بايزيد، و هو ولد … عبدالكريم، و ابوه المرشد
الشيخ عيسى قطب اهل عصره … و أوحدىّ وقته و دهره
اول من اقام فى برزنجه … يرشد بالحجة للمحجة
لما بنى مسجدها اذ امره … بذاک فى المنام خير البرره
قصر عن جانبى الجدار … جذع فمده بأذن البارى
على يديه ظهرت خوارق … جليلة شاهدها خلايق
نجل على ذى العلا والمكرمة … الهمذانى بذال معجمة
يوسف من منصور الاواه … عبدالعزيز نجل عبدالله
والده الامام اسماعيل … ابوه موسى الكاظم النبيل
والده الامام و هو السيد … جعفر الصادق، و هو ولد
محمد الباقر ذى الفضل الجلىّ … سليل زين العابدين اى علىّ
نجل شهيد كربلا حسين … سبط النبىّ سيد الكونين
دامت له صلاة ذى الجلال … والآل والصحب ذوى الكمال

### شێخ عەلی کوڕی شێخ محەمەدی نۆدێ

ئەم زاتە بە شێخ عەلی‌یە کۆسە ناسراوە و لە «نۆدێ»دا لە دایک بووە و لە خانەدانی خۆیاندا خوێندوویەتی و لە خزمەتی شێخ ئیسماعیلی ولیانیی براگەورەیدا سلووکی

کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە بۆ ئیرشادی موسوڵمانان و چووە بۆ دێی دۆڵپەموو لە نزیکی بەرزنجەدا و لەوێ دانیشتووە و خەریکی ئیرشادکردن بووە و شێخ مەعرووفی نۆدێ کە کچەزای خۆیشی بووە، یەکێ لە خەلیفەکانی بووە. شێخ مەعرووف نامیلکەیەکی لە باس و ستایشی شێخ عەلی باپیریدا نووسیوە.

ئەم شێخ عەلی‌یە لە سەر ئیرشادکردن ماوەتەوە لە جێگەکەی خۆیدا هەتا کۆچی دوایی کردووە. وە هەشت کوڕی لێ بەجێ‌ماوە کە ئەمانەن: شێخ عەبدە، شێخ محەمەدی تەڕاتەوەن، شێخ ئەحمەد، شێخ مستەفا، شێخ موحسین، شێخ عەزیز، شێخ حسەین، شێخ مەحموود.

## شێخ عەبدەی کوڕی شێخ عەلی

ئەم زاتە هەر لە دۆڵپەموودا لە خزمەتی باوکیدا ماوە و پاش کۆچی دوایی باوکیشی هەر لەوێدا ماوەتەوە تا لە جیهان دەرچوو، چوار کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: حەسەن، مەحموود، محەمەد، عەبدولجەلیل. جا لە شێخ حەسەن شێخ ڕەسووڵ بووە و لە شێخ ڕەسووڵ عەبدوڕەحمان و محەمەد و مەعرووف و عەبدولقادر بەجێ‌ماوە.

وە محەمەد و عەبدولجەلیلی کوڕانی شێخ عەبدە لە دێی دۆڵپەموودا بە تاعوون لە جیهان دەرچوون و نەوەیان نەبووە. وە شێخ محەمەدی کوڕی شێخ ڕەسووڵ لە دۆڵپەموودا ماوەتەوە و نەتەوەی لێ بووەتەوە.

## شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەلی

ئەم زاتە پیاوێکی چاک و خاوەن پایە و مایەی تەریقەت بووە، لە خزمەتی باوکیدا ئیجازەی وەرگرتووە، دوایی لە دۆڵپەمووەوە گوێزاویەتی‌یەوە بۆ دێی تەڕاتەوەن و لەو دێدا تەمەنی خۆی بە ئیرشاد و خزمەتی موسوڵمانان بەسەر بردووە، تا کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە هەشت کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ سلێمان و شێخ ئیسماعیل و شێخ عەبدولجەبار و شێخ عەبدولغەفوور و شێخ عەبدوسسەلام و شێخ یەحیا و شێخ شەمسەدین و شێخ عەلی.

### شێخ سلێمانی کوڕی شێخ محەمەد

ئەم پیاوە لە دێی تەڕاتەوەنەوە گواستوویەتی‌یەوە بۆ دێی «ئێلان پێ»ی نزیکی ناحیەی خورماڵ و لەوێ ماوەتەوە و خەریکی خزمەتی دین بووە، تا لە ساڵی ١٢٥١دا کۆچی دوایی کردووە و شێخ عەبدولکەریمی کوڕی بەپێی حورووفی ئەبجەد ئەم شیعرەی بۆ مێژووی کۆچی دوایی باوکی نووسیوە:

الف و نون و را و غین خوش دلی

سوی جنت شد سلیمان بن محمد علی

### شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ سلێمان

ئەم زاتە دوای کۆچی دوایی باوکی لە «ئێلان پێ»وە گواستوویەتی‌یەوە بۆ چەمی «شامیان» و لە دێی «سەوڵ ئاوا»دا دانیشتووە.

وە لەبەر ئەوە کە لە سەردەمی ژیانی باوکیدا خوێندوویەتی و لە لای زاناکانی ئەو چەرخە خوێندنی تەواو کردووە و پێگەییشتووە کاتێ کە لە دێی «سەوڵ ئاوا»دا نیشتەجێ بووە دەستی کردووە بە ئیرشاد و دەوامی کردووە تا لە ساڵی ١٢٨٣ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

ئەم زاتە گەلێ کوڕی بووە کە چوون بۆ ناحیەی مەریوان لە دێی ـ نژمار ـ و ـ باڵەک ـ و ـ کالی خواروو ـ و ـ ئەسکۆڵ ـدا دانیشتوون.

وە دیاریترین کوڕی شێخ عەبدولجەلیل بووە کە لە «سەوڵ ئاوا» لە جێگەی باوکیدا دانیشتووە.

### شێخ عەبدولجەلیلی کوڕی شێخ عەبدولکەریم

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٤٩دا لە دایک بووە و لە خزمەتی شێخ عەبدولکەریمی باوکیدا خوێندوویە. پاش کۆچی دوایی باوکی خەریکی ئیرشاد بووە و خۆیشی پەیوەندی موریدێتی بە حەزرەتی کاک ئەحمەدی شێخەوە بووە. لە سەر ئەو ڕێبازە ماوەتەوە تا لە ساڵی ١٣٢٠ی کۆچیدا لە سەوڵ ئاوا لە جیهان دەرچووە. لەم زاتە شێخ عەبدولفەتاح ناوێک بەجێ‌ماوە.

### شێخ عەبدولفەتاحی کوڕی شێخ عەبدولجەلیل

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٨٥دا لە دایک بووە و لە خزمەتی باوکیدا کتێبە وردەکان و سەرەتای زانیارییەکانی خوێندووە، دوای ئەوە بە یاسای ئەو ڕۆژە ڕۆییشتووە لە لای زاناکانی وڵات خوێندوویە تا پێگەییشتووە و ئیجازەی وەرگرتوە، ئەوسا هاتووەتەوە بۆ دێی سەوڵ ئاوا و لە جێگە و ماڵی خۆیدا دانیشتووە و دەستی کردووە بە خزمەتی دین.

ئەم پیاوە موریدی کاک ئەحمەدی شێخ بووە و پیاوچاک و لەخوداترس بووە و بە ڕاستی پەیڕەوی شەرعی کردووە و پیاوی وەها پاک و خاوێن کەم بووە. بەم جۆرە ماوەتەوە تا لە ساڵی ١٣٥٣ی کۆچیدا ماڵئاوایی لە جیهان کردووە. ئەم زاتە کوڕێکی لێ بەجێماوە ناوی محەمەد بووە.

### شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدولفەتاح

ئەم زاتە قورئانی پیرۆزی خوێندووە و هەندێ سەرەتای زانیاری دین ئەزانێ و ئێش و کاری ماڵی خۆی ئەکات و خزمەتی موسوڵمانانیش ئەکات. ئەمیش کوڕێکی هەیە ناوی شێخ عەبدولقادرە کە خوێندەوار و بە توانایە.

### شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەلییە کۆسە

ئەم شێخ ئەحمەدە لە دۆڵپەموو لە دایک بووە و خوێندوویە و بووە بە زانایەکی بەرزی بەڕێز، هەروا لە خزمەتی باوکیشیدا خەریکی تەریقەت بووە هەتا پێگەییشتووە، جا لە دۆڵپەمووەوە چووە بۆ دێی «بێلو»ی سەر بە مەریوان و لەوێ دانیشتووە.

لەم شێخ ئەحمەدە شێخ عەبدوڵلا و، شێخ ڕەزا بووە. شێخ عەبدوڵلا هەر لە بێلو ماوەتەوە و دوو کوڕی لێ بەجێماوە، شێخ محەمەد و شێخ مەحموود کە هەر لەوێ ماونەتەوە.

بەڵام شێخ ڕەزای کوڕی شێخ ئەحمەد چووە بۆ دێی «هەنگەژاڵ»ی سەر بە «بانە» و لەوێ دانیشتووە و لەم شێخ ڕەزا: شێخ عەلی و شێخ محەمەد و شێخ محیدین و شێخ عەبدولقادر بەجێماون.

### شێخ عەلی کوڕی شێخ ڕەزا

ئەم زاتە موریدی حەزرەتی کاک ئەحمەد بووە و ڕۆیشتووە بۆ ناوچەی موکریان و لە دێی «قەباغلوجە» دانیشتووە و خەریکی ئیرشاد بووە تا کۆچی دوایی کردووە. دوو کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ فەرەج و شێخ حەسەن.

وە لە شێخ محەمەدئەمینی، کوڕی سەیید عەلیی، کوڕی شێخ ڕەزای، کوڕی شێخ ئەحمەدی بێلو تاقە کوڕێ بەجێماوە ناوی شێخ عەلی بووە.

وە لە شێخ ڕەزای، کوڕی سەیید عەلیی، کوڕی شێخ ڕەزا کە لە دێی «سووریێن»ی سەر بە بانەدا دانیشتووە سێ کوڕ بەجێماون: کاکە حەمە و، بابا عەلی و شێخ حسەین.

### شێخ مستەفای کوڕی شێخ عەلی‌یە کۆسە

ئەم زاتە تاقە کوڕێکی بووە ناوی شێخ حەسەن بووە.

### شێخ موحسینی کوڕی شێخ عەلی‌یە کۆسە

ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ ئیسماعیل و شێخ عەلی، وە لەمانە نەتەوە کەوتووەتەوە.

### شێخ عەزیزی کوڕی شێخ عەلی‌یە کۆسە

لەم زاتە دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ عەلی و شێخ محەمەد. ئەم دوو کوڕەیش گەلێ نەتەوەیان لێ کەوتووەتەوە.

### شێخ حسەینی کوڕی شێخ عەلی‌یە کۆسە

ئەم زاتە لە دۆڵپەمووەوە گواستوویەتی‌یەوە بۆ خاکی ئێران و چووەتە دێی «دادانە» کە لە نزیکی شاری سنەدایە، پاش ماوەیەک لە دادانەوە گواستوویەتی‌یەوە بۆ دێی «داسێران» لە پشتی قەڵای مەریوانەوە.

جا لەم شێخ حسەینی داسێرانە پێنج کوڕ بەجێماوە: محێدین و سەلام و مەعرووف و محەمەد و حەسەن. جا لە شێخ محێدین شێخ عەلی و لە شێخ عەلی محێدین و لە محێدین باباعەلی بەجێماوە.

وە لە شێخ سەلام عەتار و موختار و جەببار و سەنعان و ڕەزا بەجێماون.

وە لە شێخ مەعرووف عەلی و عەبدوڕەحمان و محەمەد ئەمین بەجێماون.

وە لە شێخ محەمەد، حسەین و عەلی و مەحموود بەجێماون.

وە لە شێخ محەمەدحسەنی کوڕی شێخ حسەینی داسێران کە بە شێخ حەسەنی «کەڵوڕان» ناسراوە: شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ عەلی و شێخ حسەین بوون. جا لە شێخ عەبدوڕەحمان شێخ حەسەن و قادر و شەمسەدین بوون.

وە لە شێخ عەلی ـ کە بە شێخ عەلیـیە گردە ناسراوە ـ عەبدولقادر و ڕەزا بەجێماوە.

وە لە شێخ حسەین شێخ محەمەد بەجێماوە. وە لە شێخ عەبدولقادر ـ کە بە شێخ قادر ناسراوە ـ شێخ بابا ڕەسووڵ لەگەڵ چەند کوڕی دیکە بەجێماون.

## شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ محەمەدی نۆدێ

ئەم زاتە پیاوێکی چاک و لەخوداترس بووە و بە شێخ ئەحمەدی غەزائی ناوبانگی دەرکردووە.

لەم پیاوە دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ عیسا و شێخ مستەفا. لە شێخ عیسایش سێ کوڕ بە جێماوە: شێخ عەبدوڵلا و، شێخ عەلی و شێخ ئیسماعیل. ئەم ئیسماعیلە بێ نەوە سەری ناوەتەوە. لە شێخ عەبدوڵلایش شێخ حەسەن بەجێماوە. لە شێخ عەلیش شێخ مەحموود و شێخ محەمەد بەجێماون.

وە لە شێخ مستەفای کوڕی شێخ ئەحمەدی غەزائی... شێخ محەمەد و شێخ مەعرووف بەجێماوە، جا لەم شێخ محەمەدە کوڕێک بەجێماوە ناوی حەسەن بووە و بە تاعوون لە جیهان دەرچووە.

## شێخ مەعرووفی نۆدێ

شێخ مەعرووفی، کوڕی شێخ مستەفای، کوڕی شێخ ئەحمەدی، کوڕی شێخ محەمەدی نۆدێ لە ساڵی ١١٦٦دا لە دێی «نۆدێ» لە دایک بووە. ئەم زاتە لە

خانەدانی خۆیاندا خوێندوویەتی و پاش گەورەبوون لە خزمەتی زانا گەورەکانی «قەڵاچوالان»دا ـ کە لەو سەردەمەدا بنکەی زانیاریی ئایینی بووە ـ خوێندنی تەواو کردووە و گەییشتووەتە پلە و پایەیەکی بەرز و لە خزمەتی شێخ عەلی‌یە کۆسەی دۆڵپەموودا ـ کە باپیری بووە لە دایکیەوە ـ تەریقەتی وەرگرتووە و سلووکی کردووە هەتا ئیجازەی پێدراوە.

وە پاش ئەوە کە برایم پاشای بابان شاری قەڵاچوالانی بەجێهێشتووە و هاتووەتە سلێمانی لە ساڵی ١٢٠٠ی کۆچیدا و مزگەوتی گەورەی دروست کردووە شێخ مەعرووفی نۆدێیی بووە بە مامۆستای ئەو مزگەوتە لەگەڵ مەلا مەحموودی دێلێژەیی باوکی مەلا ئەحمەدی چاوماردا و لە مزگەوتدا خەریکی بڵاوکردنەوەی زانیاریی بووە و سوودی بە موسوڵمانان گەیاندووە و ئیرشادی کردوون بە گوێرەی توانا. وە کاتێ کە کاک ئەحمەدی کوری ـ کە کورە گەورەی بووە ـ پێگەییشتووە، هێزی دڵ و دەروونی زیاتر بووە و بەشتر خزمەتی زانیاری و دینی کردووە و لە سەر ئەو شێوە ماوەتەوە هەتا ساڵی ١٢٥٤ی کۆچی لە جیهان دەرچووە. وە وەسیەتی کردووە کە لە «گردی سەیوان»دا بینێژن، وە وەسیەتەکەی جێبەجێ کراوە.

ئەم زاتە بەرێزە لە زانا بەرزەکانی کوردستان بووە و زانای دیاری و گەورەی بنەماڵەی بەرزنجە بووە و خاوەنی دەستی باڵا بووە لە شیعر و ئەدەبدا و سوار چاکی مەیدانی زانستی عەرووز و هۆنینەوەی شیعر بووە بە زمانەکانی: کوردی و فارسی و عەرەبی. گەلێ دانراوی بە نرخی لە زانیاری‌یە جۆراوجۆرەکاندا هەیە. لێرەدا دەیان‌نووسین بۆ برادەران، تا ئاگاداری پایەی زانیاریی شێخ مەعرووفی نۆدێ بن.

١ـ «ای شده» نامیلکەیەکە بریتی‌یە لە چەند چامە بە ژمارەی «حروفی هجاء» لە ستایشی حەزرەتدا.

٢ـ «احمدیه» فەرهەنگێکی عەرەبی ـ کوردی‌یە.

٣ـ الجوهر النضید، لە قەواعیدی تەجویدا.

٤ـ فتح المجید، لە تەجویدا.

٥ـ التعریف بابواب التصریف.

٦ـ تصریف المبانی فی نظم تصریف الزنجانی.

٧ـ الشامل للعوامل.

٨ـ الاغراب فی نظم قواعد الاعراب.
٩ـ القطوف الدوانی فی حروف المعانی.
١٠ـ كفاية الطالب نظم كافية ابن الحاجب.
١١ـ فتح الموفق فی نظم علم المنطق.
١٢ـ نظم آداب البحث.
١٣ـ نظم العروض.
١٤ـ تنقيح العبارات فی توضيح الاستعارات.
١٥ـ نظم الرسالة العضدية فی علم الوضع.
١٦ـ شرح نظم الاستعارة.
١٧ـ عمل الصياغة فی علم البلاغة.
١٨ـ فتح الرحمان فی علم المعانی والبيان.
١٩ـ غيث الربيع فی علم البديع.
٢٠ـ الفريدة فی العقيدة.
٢١ـ الفرائد من العقائد.
٢٢ـ زاد المعاد فی مسائل الاعتقاد.
٢٣ـ سلم الوصول فی علم الاصول.
٢٤ـ عقد الدرر فی مصطلح اهل الاثر.
٢٥ـ تنوير البصائر فی التحذير عن الكبائر.
٢٦ـ كشف الباساء باذكار الصباح والمساء.
٢٧ـ فتح الرزاق فی اذكار رفع الاملاق.
٢٨ـ قطر العارض فی علم الفرائض.
٢٩ـ روض الزهر فی مناقب آل سيد البشر.
٣٠ـ البرهان الجلی فی مناقب سيدنا علی.
٣١ـ السراج الوهاج فی مديح صاحب المعراج.
٣٢ـ اوثق العری فی الصلاة والسلام علی خير الوری.
٣٣ـ الروضة الغناء فی الدعاء بالاسماء الحسنی.
٣٤ـ تنوير العقول فی احاديث مولد الرسول.

۳۵ـ تنویر القلوب فی مدیح جبیب علام الغیوب.
۳۶ـ الجوهر الاسنی فی الصلوات المشتملة علی الأسماء الحسنی.
۳۷ـ تنویر الضمیر فی الصلوات المشتملة علی اسماء البشیر النذیر.
۳۸ـ ازهار الخمایل فی الصلوات المشتملة علی الشمائل.
۳۹ـ راحة الارواح فی الصلوات المشتملة علی خصائص حبیب الملک الفتاح.
۴۰ـ کشف الاسف فی الصلاة والسلام علی سید اهل الشرف.
۴۱ـ تخمیس البردة.
۴۲ـ تخمیس بانت سعاد.
۴۳ـ تخمیس الهمزیة البوصیریة.
۴۴ـ تخمیس المضریة.
۴۵ـ تخمیس یا من یری ما فی الضمیر و یسمع.
۴۶ـ تخمیس لامیة العجم.
۴۷ـ شرح الصدر بذکر اسماء اصحاب البدر.
۴۸ـ عقد الجوهر فی الصلاة والسلام علی الشفیع المشفع یوم المحشر.

**کاکە ئەحمەدی شێخ**

ئەگێڕنەوە کە خواڵێخۆشبوو شێخ مەعرووفی نۆدێ تەمەنی گەییشتووەتە نزیکی شەست ساڵ و دایکی کاک ئەحمەدیش تەمەنی بووە بە پەنجا ساڵ و منداڵیان نەبووە. جا رۆژێک پێی ئەڵێت: قوربان تۆ وەکوو خۆت دۆعا بۆ ژنان ئەنووسی و منداڵیان ئەبێ دۆعایەکیش بۆ خۆمان بنووسە بەڵکوو خودا منداڵێکمان پێ ببەخشێ!

جا شێخ مەعرووف داواکەی پەسەند دەکات و دەست ئەکات بە نووسینی دۆعاکە بۆ خۆی و خێزانی و نامەیەکی «عریضە»یش دەنووسێ بۆ لای شێخ عەبدولقادری گەیلانی. پاش ماوەیەک دایکی کاک ئەحمەد لە خەودا ئەگات بە خزمەتی پێغەمەرد ـ و دوڕێکی زۆر سپی و جوان ئەدا بە دایکی کاک ئەحمەد و ئەفەرموێت: ئەمە دیارییێکە لە باپیرەتەوە بۆ کوڕێکی پیرۆز و ناوم نا بە کاک ئەحمەد.

پاش ئەمە بە یاسای خۆی کاک ئەحمەد لە ساڵی ۱۲۰۸ی کۆچیدا لە دایک ئەبێ.

ئەم زاتە پاش خۆناسینەوە لە خزمەتی باوکیدا و لـە خوێنـدنگای خۆیانـدا قورئـانی پیرۆز و کتێبە وردەکانی خوێندووە و دوایی دەستی کردووە بە زانیاری‌یەکانی نەحو و سەرف و بە شێوەی خوێندنی قوتابیانی کوردستان خوێندوویە تا لە پلەکانی زانیاریـدا باش سەرکەوتووە و بووە بە زانایەکی باش و ئیجازەی وەرگرتووە.

هەروەها لە خزمەتی باوکیدا تەمەسوک ئەکات و تەریقـەت وەرئـەگرێ و سـلووک ئەکات هەتا ئەگاتە پلەی ئیرشاد و ئیجازەی ئەدرێتێ، جا پـاش ئیجـازە وەرگـرتن لـە هەردوو عیلمەکەدا دەس ئـەکا بـە تـەدریس و سـوودگەیاندن بـە خەڵـک لـە هـەمو دەرزەکاندا. هەروا تەریقەت ئەدا بە داخـوازان چەنـدی بـۆ بکـرێ تـا بـاوکی بـەڕێزی کۆچی دوایی ئەکات.

پاش کۆچی باوکی ئیتر گیانی خـۆی وەقفـی خزمـەتی موسوڵـمانان ئـەکات و بـە هەموو جۆرێ خەریکی دەرس‌وتنەوە و ئیرشاد ئەبێ بە جۆرێ کە وێنەی لـە چـەرخی خۆیدا نـەبووە. وە کـاک ئەحمـەد وەکـوو زانیـاریی شـەریعەت و رێبـازی تەریقـەتی وەرگرتوە، لە زانیـاریی حـورووف و «ویفقـەکان»دا، بـە هـەموو جـۆر و بەشـەکانیەوە، شارەزایی باشی هەبووە.

خزمەتەکانی کاک ئەحمەدی شێخ بـۆ موسوڵـمانان بـە کـورتی بـریتین لەمانـەی خوارەوە:

یەکەم: دەرزوتنەوە لە زانیاری‌یەکاندا بە گوێرەی توانای خۆی و یارمەتی خودا.

دوەم: تەربییەتی موریدان و پیاوانی رێگەی تەریقەت بە زیکر و فیکـر و تەهلیلـە و خەڵوە و ریازەی دەروونی بە یاسای ئەهلی تەریقەت.

سێهەم: وەڵامدانەوەی پرسیار و فەتوای زانایان و موسوڵمانان بە گشتی بە گوێرەی توانا.

چوارەم: میوانداری کردنی بۆ ئەوانەی هاتوونەتە خزمەتی و نان‌دان بە موسوڵـمانان و داماوان.

پێنجەم: یارمەتیدانی داماوان بە هات‌وچۆی لای فەرمانبەران بۆ جێبـەجێ‌کـردنی ئیش و کاریان و لابردنی تەنگ و چەڵەمەیان.

شەشەم: ئاشت‌کردنەوەی ناکۆکـان و چـارکردنی گـیر و گرفتـەکانی نـاو خەڵـکی وڵات، چ لـە سـەییدەکانی بەرزنجـە و چ لـە غـەیری ئـەوان. وە جـاری وا هـەبووە

هاتوچۆی بۆ ڕێکخستنەوەی نێوانی ژن و مێرد و کاری دیکەی وەهای کـردووە کـە جێگەی سەرسوڕمانە چۆن ئەو هەموو کارەی لە دەست هاتووە!

حەوتەم: خەریکبوون بە کار و باری ژین و ژیواری خێزان و ماڵـی خۆیـەوە، وەک یاسای خەڵک.

هەشتەم: نووسینی «مکتوبات» بۆ ڕێنومایی خەڵک و پیشاندانی ڕێگـەی چـاک بـۆ لایەنی بیر و باوەڕ و، فێربوونی عیبادەت و لابـردنی نـاڕەوایی و... هـەر مـەکتووبێک لەوانەی ئەوەندەی نامیلکەیەکی باش دەبێت و ژمارەیان دەگاتە سەد نامە[1].

نۆهەم: خزمەتی تەجویدی قورئانی پیرۆز و خزمەتی ئەوانە کە ویسـتوویانە قورئـان بخوێنن و قورئان لە بەر بکەن لە چاوسـاغان و کوێرەکـان و دامەزرانـدنیان لـە شـار و دەرەوەی شـاردا، بـە جـۆرێ کـە لـە سـەردەمی ئـەودا کـەم مـاڵ بـووە «حـافز» و قورئانخوێنی تایبەتی خۆیانیان نەبووبێ و قورئانیان بۆ نەخوێندرابێ.

دەهەم: نووسینی دۆعای چاک و بەنرخ بـۆ گـەلێ ئـیش و کـاری گـەورە، وەکـوو: گوللەبەند و، تێغبەند و چاری پەرکەم و شێت و هار و... بە جۆرێ ئەگەر ئادەمیزاد بـە ویژدانەوە تەماشا بکات ئەزانێ کاک ئەحمەد تازەکەرەوەی ئـایینی ئیسـلام بـووە، بـە کردەوە و ڕەوشت و زانیاری.

ئەگەر بمانەوێ بە تەواوی مێژووی ژیانی کاک ئەحمەد بنووسین بـە لای کەمـەوە کتێبێکی باشی دەوێت. بەڵام ئێمە لێرەدا بەم ئەندازە دەست هەڵدەگرین.

کاک ئەحمەدی شێخ چووە بۆ حەج و ماوەی چوار ساڵ لە مەدینەدا ماوەتەوە و لـە هەردوو مزگەوتی مەککە و مەدینەدا گەلێ سوودی بـە موسوڵـمانان گەیانـدووە و لـە مەککەدا میوانخانەیەکی دروست کردووە بۆ ئەوانەی کە بێخەرج و دەرامەت بوون تا لە ماوەی حەجدا تیا دابنشین و ڕاببوێرن.

پاش ئەو ماوە هاتووەتەوە بۆ کوردستان و لە جێگەی خۆیا کە شاری سلێمانی بووە دانیشتووە هەتا لە ساڵی ۱۳۰۵ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە شوێنی خۆیـدا لـە مزگەوتی گەورەدا بە خاک سپێرراوە.

---

۱ـ دانەر ئەم مەکتووباتەی کردووە بە کوردی و ئێستە شان بە شانی ئەم کتێبە لە ژێر چاپدایە. م، ع، ق.

**نەوەکانی کاک ئەحمەد**

کاک ئەحمد دوو کوڕی بووە، یەکەم: بابا عەلی کە بە جـوانی لـە کـاتی خوێندنـدا کۆچی دوایی کردووە.

دوەم: شێخ محەمەد، ئەم زاتە پیاوێکی زانا و هەڵکەوتوو بووە، بەڵام بەداخەوە هـەر لە ژیانی باوکیدا بیست ساڵ پێش کۆچی دوایی باوکی لە جیهان دەرچووە.

**نەوەکانی شێخ محەمەدی کوڕی کاک ئەحمەد**

شێخ محەمەد هەشت کوڕی لێ بەجێماوە: ئەحمەد، محەمەد، سەعید، مەعرووف، مستەفا، ئەم پێنج کوڕە لە کچی شێخ محەمەد ئەمینی «قازانقایە»یین.

حەسەن، عومەر، ئەم دوو کوڕەیش لە کچی «باباجان» بوون کە پیـاوێکی شـەریف و پیاوانە بووە لە سلێمانیدا.

عیسا، ئەم کوڕە لە ژنێکی مەسیحی بووە کە موسوڵمان بووە بۆ شـێخ محەمـەد تـا شووی پێ بکا.

**کوڕەزاکانی شێخ محەمەد**

لە سەیید ئەحمەد کوڕێکی هاوناوی باوکی بەجێماوە یانی ناوی ئەحمەد بووە. لەم شێخ ئەحمەدە دوو کوڕ بوون، شێخ محەمەد و شێخ تاهـا. شـێخ محەمـەد بـە شـێخ محەمەدە بچکۆلە ناسراوە. دوو کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ مستەفا و سەیید ئەحمەد.

وە لە شێخ محەمەدی، کوڕی شێخ محەمەدی، کوڕی کـاک ئەحمـەد... دوو کـوڕ بوون: محەمەدئەمین و عەبدوڵلا. لە عەبدوڵلا عەبدوڕەحمان و عەلی بەجێمـاون. وە لە شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی کاک ئەحمەد... محەمەد و ئەحمـەد و مەحموود و قادر و ئیبراهیم بوون.

هەروەها شێخ سەعید پێنج کچی بووە: حەبیبە، فاتمە، حەفسە، خەدیجە، حەلاوە. ئەمانە هەموو خاوەن دین و داوێنپاک و بە شەرافەت بوون.

جا لە شێخ محەمەدی کوڕی شێخ سەعید دوو کوڕ و سێ کچ بوون: عەبدولکـەریم و محەمەدسالح و فاتیمە و عایشە[١].

---

١- مامۆستا وتوویەتی سێ کچ، بەڵام ناوی دووی نووسیوە.

وە لە شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ سەعید ـ کە لە ساڵی ١٣٢٦دا لە موسڵ شەهید کراوە ـ جەلال بووە. ئەم کوڕە لە عایشەخانی کچی شێخ مارفی نەقیب بووە.

وە لە شێخ جەلال شێخ تاهیر و دارا و ئازاد و نەوزاد و دوو کچ: پاکیزە و درەخشان بووە.

وە لە شێخ مەحموودی کوڕی شێخ سەعید شێخ لەتیف بووە کە لە عایشەخانی کچی شێخ مارفی نەقیب بووە، کە پاش کۆچی دوایی شێخ ئەحمەد مارەی کردووە. وە باباعەلی و رەئووفیشی لە بەهیەخانی کچی ئەمینی عەتار بووە.

وە لە شێخ قادری کوڕی شێخ سەعید کوڕێ بەجێماوە، کە ناوی بەختیارە و دایکی لە سەییدەکانی «سەرزەل» لە نەتەوەی شێخ حەسەنی گڵەزەردەیە. وە لە شێخ ئیبراهیمی کوڕی شێخ سەعید تاقە کوڕێ «نەوڕەس» و پێنج کچ: نوخشە و نەوبەش و نەخشین و ئامین و سۆلان بووە.

وە لە شێخ مارفی، کوڕی شێخ محەمەدی، کوڕی کاک ئەحمەد تاقە کوڕێک بووە کە بە جوانی لە جیهان دەرچووە و دوو کچیش عایشەخان و حەفسەخان بووە. عایشەخان یەکەم جار شووی کردووە بە شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ سەعید و پاش ئەویش شووی کردووە بە شێخ مەحموود. وە حەفسەخان شووی کردووە بە شێخ قادری کوڕی شێخ سەعید، ئەم ژنە لە بەخشندەیی و خزمەتگوزاریی خەڵکدا بەناوبانگ بووە.

وە لە شێخ مستەفای کوڕی شێخ محەمەد تاقە کوڕێک بووە ناوی محەمەد بووە، کە بە منداڵی کۆچی دوایی کردووە.

لە حاجی سەیید حەسەنی کوڕی شێخ محەمەدیش دوو کوڕ بووە سەیید عەبدوڵلا کە پیاوێکی زانا و لەخوداترس بووە. وە سەیید محەمەد و سێ کچ: فاتیمە و عایشە و رەحمە.

وە لە سەیید عومەری کوڕی شێخ محەمەد دوو کوڕ بوون عەبدولقادر و عەبدولکەریم و دوو کچ: ئامینە و حەلاوە.

ئەمانەی کە نووسیمانن کوڕ و کچی نەتەوەی خانەدانی کاک ئەحمەدی شێخ بوون.

کاک ئەحمەد وەکوو ئەو خزمەتە گەورە و پیرۆزانەی هەبووە کە باسمان کردن و ئەو هەموو «مکتوبات»ەیشی نووسیوە دانراوی دیکەیشی هەیە لەوانە:

یەکەم: شەرحی مەنزوومەی «سلم الوصول الی علم الاصول» کە دانراوی شێخ مەعرووفی باوکی بووە.

دووەم: حاشیەی لە سەر شەرحی «کمال الدین» فەسەوی، لە سەر «شافیە»ی «ابن الحاجب» لە زانیاریی سەرفدا.

سێهەم: حاشیەی لە سەر «جمع الجوامع» لە ئوسوولی فیقهدا، کە من خۆم نوسخەیەکی دەسخەتی ئەو کتێبەم لە لایە.

کاک ئەحمەد گەلێ مورید و مەنسووبی تێگەییشتوو و پێگەییشتووی هەبووە، کە هەموویان پیاوچاک و لەخوداترس و پەیڕەوی‌کەری شەرع بوون. وەکوو: خەلیفە پیرۆتی باوکی مەلا حسەینی پەسکەندی و سەیید عەلیی «دۆزەخدەرە» و مەلا سەدباری بانەیی و شێخ حەسەنی قەرەچێوار، کە بە باوەڕی من سەد خەلیفەی بەرز ئەژی و ئێستە باسی دێت.

### وردبوونەوەیەک لە تاکەکانی ئەم خانەدانی بەرزنجە

یەکە یەکە پیاوانی ئەم رشتەی شێخ عیسای بەرزنجە لە سەرەتاوە تا ئێستە ئەوانەیان کە ئیرشادیان کردووە زانا بوون. وە چەند کەسێکیان هەڵکەوتووە دەستی بالایان لە زانیاریدا بووە... وەکوو «کابل» ـ کاکە بلە ـ سەیید ئیبراهیمی کوڕی شێخ مەحموودر کوڕەزای شێخ عیسای بەرزنجە. بە گوێرەی ئەوەی کە دەم بە دەم لە ناو رشتەی ئەو بنەماڵەدا زانراوە ئەم زاتە زیاد لە عیلمی تەسەووف لە هەموو زانیاری‌یە ئایینی‌یەکاندا زۆر بەرز و بالادەست بووە و «فازلی کازرونی» کە شاگردی بووە ئەڵێ: مامۆستام هەر چەند شافیعی مەزهەب بوو بەڵام لە فیقهی حەنەفیدا ئەبو یوسفی دووەم بووە و تاقانەی چەرخ و رۆژی خۆی بووە. وە لە مێژووی کۆچیدا نووسیویەتی:

١- توفی ـ رحمة الله ـ لیلة الجمعة غرة ذی الحجة الحرام عام ثلاث و عشرین و ثمان مائة من هجرة خیر الانام.

٢ـ سەیید محەمەدی مەدەنی کوڕی بابا رەسووڵ ئەم زاتە موفتی مەدینەی مونەووەرە بووە و گەلێ دانراوی هەیە، وەکوو «الاشاعة فی اشراط الساعة».

٣ـ شێخ حەسەنی گلەزەردە کە یەکێ لە گـەورە و پیاوچاکـانی سـەردەمی خـۆی بووە و لە گەورە زاناکانی چەرخی خۆیشی بووە.

٤ـ شێخ محێدینی کوڕی شێخ حەسەنی گلەزەردە.

٥ـ شێخ حسەینی ئەلمەعیی کوڕی شێخ بایەزیدی کوڕی شێخ ئیسماعیلی کـوڕی شیخ بابا رەسووڵ.

شەشەم و حەوتەم و هەشتەم: شـێخ عەبدولکـەریم و شـێخ عەبـدوڕەحیم و شـێخ عەبدوللەتیف. کوڕانی شێخ قاسمی، کوڕی شێخ حەسەنی، کـوڕی بایەزیـدی، کـوڕی ئیسماعیلی، کوڕی بابا رەسووڵ.

٩ـ نۆهەم: شێخ تاهای گەورە، کوڕی شێخ رەسوولی، کوڕی شێخ بایەزیدی، کوڕی شێخ ئیسماعیلی، کوڕی شێخ بابا رەسووڵ.

١٠ـ دەهەم: شێخ حەسەنی، کوڕی شێخ مارفی، کوڕی شیخ حەسەنی گلـەزەردە. کە بە شێخ حەسەنی دوەم بەناوبانگ بووە، خاوەنی دانراوی «بحر الانساب»ی کۆنە.

١١ـ یازدەهەم: شێخ عەبدوسەمەدی کوڕی شـێخ مـەحموودی کـوڕی بایەزیـدی، کوڕی ئیسماعیلی، کوڕی شێخ مـەحموودی، کـوڕی شـێخ مـەعرووفی، کـوڕی شـێخ حەسەنی گلەزەردە.

سیازدەهەم و چواردەهەم: شێخ مەعرووفی نۆدێیی و کاک ئەحمـەدی کـوڕی، کـە مانگ و رۆژی ئاسمانی زانیاری و ئایین بوون.

١٥ـ پازدەهەم: شێخ مستەفای موفتی سلێمانی، کوڕی شێخ محەمـەدی «متـولی» بەرزنجـە، کـوڕی شـێخ تاهـای کـوڕی شـێخ رەسوولـی، کـوڕی بایەزیـدی، کـوڕی ئیمساعیلی، کوڕی بابا رەسووڵ.

١٦ـ شازدەهەم: شێخ ئەحمەد فائیز خاوەنی «السحر الحلال».

١٧ـ حەڤدەهەم: شێخ ئەحمەدی بێلو کوڕی شێخ عەلی‌یە کۆسە.

١٨ـ هەژدە: شێخ محەمەدی بەرزنجی کوڕی شێخ عەبدوڕەحیم.

ئەمانە و پیاوانی دیکەیش لە هەلکەوتووانی زانیاری و خوێندەواری کە مـن ئێسـتە لە بیرم نین هەموو لە کەلەپیاوەکانی ئـەم رشـتە و لـە گـەورە زانایـانی بەرزنجـەن و هەلکەوتوو و تاقانەی چەرخ و سەردەمی خۆیان بوون.

هەزار ئافەرین لە زانیاریی — یەکەم ئەساسە بۆ بەختیاریی
لە بۆ سەربەرزیی ئینسان لە ژینا — لە بۆ پیرۆزیی لە پایەی دینا
ئینسان زانا بێ دڵی رووناکە — دڵ و دەروون و کردەوەی پاکە
چاوی ئەبینێ بڕوا بە رێدا — قەت پاش ناکەوێ لە تەختی جێدا
ئەو کارە ئەیکا هەر لە سەر شەرعە — عەقیدە و عەمەل، ئەسڵە، یا فەرعە
لە بەر پەیڕەویی لە بۆ مستەفا — ئەبێ بە مەرکەز بۆ دەوری سەفا
زانا دەروونی عەینی چرایە — عالەم لە بۆ ئەو وەکوو برایە
یاسای قورئان و حەدیسی پیرۆز — ئەکا بە دەرمان بۆ دڵی ئاڵۆز
بەرگی ناشەرعی نابێ بە بەرگی — لوقمەی ناهەموار ناچێتە قوڕگی
لە رووی دنیادا بێ ژان و ژارە — لە قیامەتدا وێنەی سالارە
ئەو خانەدانەیش بێ عیلم و فامە — نازانێ مەعنای سەعادەت کامە
کە زانا نەما دێتە دەر نەزان — بێ قیاسی شەرع بێ حوکمی قورئان
زینهار زانا بن! زانا سەربەرزە! — چرای رووناکیی تەختی سەر عەرزە
«نامی» هەر عیلمە چرا بەرقی ئەو — بۆیە بە دەوام وەرئەگرێ پڕتەو

## بنەماڵەی زانای گەورە مەلا جەلالی خورماڵی

لە سەر دەسنووسی مەلا محەمەدی، کوڕی مەلا مستەفای، کوڕی مەلا جەلال لە رشتەی نەسەبی خۆیاندا و بە گوێرەی «الناس مأمونون على انسابهم» ئەم شەجەرەیە ئەنووسمەوە:

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله و الصلاة والسلام على رسول الله، و على آله و اصحابه اجمعين.

و بعد: فيقول[1] العبد الفقير الى ربه القدير، محمد بن الملا مصطفى الگلعنبرى، ابن جلال‌الدين، ابن السيد على الشهرزورى البلباسى، ابن السيد عمر، ابن السيد ابراهيم، ابن السيد وسيم، ابن الامير خسرو، ابن سبحان آغا، ابن الامير سليمان، ابن سوار ئاغا، ابن پير دانيال، ابن پير غيب، ابن باباأويس، ابن امير بكر، ابن پير سبحان، ابن پير منصور، ابن السيد صادق، ابن السيد الحاج بلال، ابن السيد ابراهيم البلباسى، ابن السيد عباس، ابن السيد عبدالله أبى العباس الثانى، ابن السطان محمد منصور، ابن السلطان عبدالعزيز، ابن السيد عبدالله، ابن اسماعيل المحدث، ابن الامام موسى الكاظم المكنى بأبى العباس تارة، و بأبىٰ عبدالله تارة اخرى ـ ابن الامام جعفر الصادق ... الخ.

---

١ـ ليس خفيا بان الداخل والخارج ـ فى و من ـ النسب سويان فى الاثم و خوفا من هذا الاثم و الوقوع فيه كتبت هذه السلسلة النسبية التى حافظ عليها الاباء و الاجداد، و اخذها اللاحق من السابق، دون تحيز و تبديل مع ذكر الامكنة التى عاش عليها سلفنا الصالحون.

و لن اقصد وراء كتابة هذه السلسلة سوى الامتثال لوصية السابقين الصاحين، والمحافظة على السلاسل النسبية الصالحة، و اخذ العبرة منهم بالسير على ما ساروا عليه من الدين الاسلامى الحنيف فى السعى لاعلاء الحق والعلم، والعلماء ورثة الانبياء والمرسلين، عليهم الصلاة والسلام. والله على ما اقوله شهيد. و «ان اكرمكم عند الله اتقاكم».

كتب فى ضحوة يوم الاثنين السابع من محرم الحرام، سنة الف و مائتين و واحد و تسعين، بعد الهجرة النبوية الشريفة، على صاحبها آلاف الصلاة والسلام «محمد البلباسى الحسينى».

وە لە پاش ئەم رشتەی نەسەبە «وەسیەت نامە»ی نووسیوە بۆ مەلا عەبـدورەحمانی کوڕی، بەڵام من ئەوەم کرد بە کوردی. جا ئەڵێ:

نووری چاوم عەبدوڕەحمان! من ئەم بەسەرهاتە نەبیسراوە بۆ تۆ دەنووسم بەس بـۆ وەسیەت تا ببێ بە هۆی پەندوەرگرتن لە رەوشتی پێشینان، نەک بۆ بایی بوون و خـۆ بە گەورە تەماشاکردن، چونکی رێز و پلەی بەندە لای خودا بە تەقوایە و تـەقوایش لـە دڵدایە و شایەت لە سەر شتی پەنامەکیی کردەوە و رەفتاری ئاشـکرایە. جـا بزانـە تـۆ کوڕی منی و تۆ لە لای من لە خۆم خۆشەویستتری و هەر شتێکیان بە مـن گوتـووە ئەیدەم بە تۆ، لە هەموو شتێ زیـاتر خـۆت لـە رق و قـاری خـودا بپـارێزە. بـە هـۆی گوناهەوە خۆت نەکەی بە نیشانە بۆ سزای خودای تەعالا و، خودا و پێغەمەری خودات لە هەموو شتێ زیاتر خۆش بوێت و فەرمانی «فاستقم کمـا امـرت» لـە گـوێ بگـرە و، دەرمانی «کما امرت» بە داری ئیستیقامەت بساوە بە هەموو لەشی خۆتا، ئەمر و نـەهی خودا ـ هەر کام لە جێگەی خۆیدا ـ تەماشا و چاودێری بکە، چونکی نـەکردنی کـارێ کە پێویست بێ بکرێ، وە یا خود کردنی کارێ کـە پێویسـت بـێ نـەکرێ لادانـە لـە سنووری شەریعەت.

عەبدوڕەحمان! گیانی باوکت! هەرکاتێ ئەم وەسـیەتی منـەت وەرگـرت و لـە نـاو کۆمەڵی موسوڵماناندا پێشەوای باش بوویـت و تـەفرە و تەگـەرەت نەخسـتە رێبـازی دینەوە ... ئەوە ئەو کاتە ئەتوانی رێنومایی موسوڵمانان بکەیت.

بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی خودا و، پێغەمەر و موسوڵمانانەوە، دەر و ناوی خـۆت بە حیکمەتی باوی ئەهلی ئوسوول «الحسن ما حسنه الشرع، والقبیح ما قبحه الشرع» ... جوان بکە و بڕازێنەوە. وە رستەی «الدین النصـیحة» فـەرامۆش نەکـەیت، وە هـەتا تـۆ لەگەڵ موسوڵمانانا بی خودایش لەگەڵ تۆدا ئەبێ. «والله یوفق لما فیه الخیر انـه سـمیع مجیب».

کوڕی خۆم عەبدوڕەحمان! وەکوو زانیومە لە پاش شەهادەتی ئیمام حسەین تـەنیا کوڕێکی رزگار بووە، ناوی ئیمام «علـی زیـن‌العابـدین» بـووە ئـەویش لـە سـاڵـی ٩٥ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و نەوەی نێرینـەی ئـەو بـریتی بـووە لـە محەمـەدبـاقر و عەبدوڵلا و زەید و عومەر و حەسەن و حسەین و عەلی. لە ناو ئەم کوڕانـەدا محەمـەد باقر جێگەدار بووە و لە ساڵی ١١٤دا کۆچی دوایی کردووە. لەم زاتە جەعفەری سـادق

و ئیسماعیل و عوبەیدیللا و ئیبراهیم بەجێماون. لە ناو ئەم کوڕانەدا جەعفەری سادق جێگەدار بووە کە لە ساڵی ۸۰ی کۆچیدا لـە دایـک بـووە و لـە ساڵـی ۱٤۸دا کـۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتەیش حەوت کوڕی لێ بە جێماوە: «موسی الکاظم»، ئیسماعیل، ئیسحاق، عەبدوڵلا، محەمەد، عەبباس، عەلی. لە ناو ئەمانەدا مووسای کـازم جێگـەدار بووە. کە لە ساڵی ۱۲۸ی کۆچیدا لە مەدینەی مونەووەرەدا هاتووەتە دنیا و، لە ساڵـی ۱۸۳دا لە جیهان دەرچووە و، ئارامگای پیرۆزی لە شاری بەغدادایە، لە بەری کەرخ.

ئیمام مووسای کازم بیست و یەک کوڕی بـووە: ئیمسـاعیل، عـەبباس، عـەلیڕەزا، ئیبراهیم، زەید، عەقیل، فەزل، هارون، عەون، حەسـەن، حسـەین، حـەمزە، جەعفـەر، عەبدوڵلا، یەحیا، ئیسحاق، ئەحمەد، محەمەد، قاسم، سولەیمان، عوبەیدیللا.

جا گیانی باوکت عەبدوڕەحمان! ئێمە لەم شوێنەدا بە ئەندازەی پەیوەندی نەسەبی خۆمان بە ئیسماعیلی «محدث»ەوە باسی نەوەی ئیسماعیل «محدث» ئەکەین و ئەڵـێم: کوڕی ئیمام مووسای کازمە و کونیەی «ابوالعباس» بووە و لە ساڵی ۱٦۳ هاتووەتە دنیـا و لە ساڵی ۲۰۲ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و ئارامگای لە شاری بەغـداد لـە بـەری کەرخدایە. وە هەندێ دەڵـێن: ئارامگـای لـە خـواری دێـی ئەسـپەرێزی هـەورامانی ئێراندایە.

وە لە پاش کۆچی دوایی ئەو سەیید عەبدوڵلای کوڕی لە سەر وەسیەتی بـاوکی لـە جێگەیدا دانیشتووە و پاش ماوەیەک چووە بۆ خۆراسان و لەوێ کۆچی دوایی کردووە. وە پاش کۆچی دوایی سەیید عەبدوڵـلا سـەیید عەبدولعـەزیزی کـوڕی لـە جێگەیـدا دانیشت. وە لە پاش کۆچی دوایی ئـەمیش سـەیید محەمـەد مەنسـووری کـوڕی لـە جێگەیدا دانیشت و لە خۆراسانەوە چـووە بـۆ شـاری هەمـەدان و لەوێـدا لـە جیهـان دەرچووە. وە لە پاش ئەمیش ۲ کوڕ بەجێماوە: محەمەدیوسف و عەبدوڵلا.

محەمەدیوسف لە هەمەدان دانیشتووە و عەبدوڵلا گەڕاوەتـەوە بـۆ شـاری بەغـدا و پاش ماوەیەک لە بەغدادەوە چووە بۆ «شارەبان». لە شارەباندا شێخێک بووە ناوی بابـا یەحیا بووە، کچێکی «لوئلوئە» نـاوی بـووە داویـە بـەم سـەیید عەبدوڵـلا و لێـی مـارە کردووە.

جا خودا بە میهرەبانی خۆی لەم ژنە دوو کـوڕی پێـداوە: عـەبباس و مەنسـوور. وە پاش کۆچی دوایی سەیید عەبدوڵـلا کـە کونیـەی ئەبولعەباسـی دوەم بـووە، سـەیید

عەباسی کوڕی لە شارەبان نەماوە و لەوێوە چووە بۆ «خدر آباد». وە لەوێ ڕۆستەم ناوێ بووە کچێکی بووە بە ناوی یاسەمین مارەی کردووە لە سەیید عەبدوڵلا و، خودا کوڕێکی پێ بەخشیون ناویان ناوە ئیبراهیم. جا مەنسووریش لە شارەباندا ماوەتەوە و نەتەوەی ئەو لەو وڵاتەدا بە «بنی منصور» ناوبانگیان دەرکردووە.

وە سەیید ئیبراهیم پاش مردنی باوک و دایکی ڕێگەی کوردستانی گرتووەتە بەر و بە چەن دەردیسەر هاتوون هەتا گەییشتوونەتە شارەزوور و لە خۆرهەڵاتی شارەزووردا لە دێیەکدا کە ناوی «جبراوا» بووە نیشتەجێ بووە. ئەم دێ ئێستە وێرانە و شوێنەواری لە نزیکی «سەرگەت» دایە، لە نێوان گۆڕستانی باوەیس و دێی سەرگەتا.

وە پاش ماوەیەک سەیید ئیبراهیم ناوبانگی سەیید مستەفای عورەیزی ئەبیسێ کە زاتێکی خاوەن پیرۆزیی بووە لە هەورامانی تەختدا بە «پیر شهریار» ناسراوە. وە ئەچێ بۆ زیارەتی، کاتێک بە خزمەتی ئەگات زۆر ڕێزی لێ ئەگرێ، ئەمیش ئەچێتە ناو مەسلەک و ڕێبازی ئەو و ماوەی دوو ساڵ بەو جۆرە ئەمێنێتەوە، هەتا فێری شێوەی هەورامیش دەبێت.

سەیید ئیبراهیم لە یاداشتی خۆیدا نووسیویەتی ئەڵێ: لە سەد کەس زیاترم لە گەورە و بچووک بینیوە لە خزمەتی سەیید مستەفای عورەیزیدا بوون و لە ئاداب و سولووک و بەندەیی کردندا سوودیان لێوەرگرتووە و دەرزیان لە لا خوێندووە.

لەگەڵ ئەمەیشدا کابرایەک بووە گەورەی دنیایی شوێنەکە بووە و پێیان وتوە: «شالیارە سیاو» هێشتا هەر لەسەر یاسای کۆنی «مجوسی» ـ ئاگرپەرستەکان ـ بوو، وە ئەو خەڵکە مودارایان لەگەڵدا دەکرد.

جا پاش ماوەی ئەو دوو ساڵە سەیید ئیبراهیم ئەڵێ: بە سەیید مستەفای عورەیزیم وت: کە ڕێگەی داهاتووی من چییە؟

فەرمووی: من ئێستە لە وەزعی تۆ حاڵی بووم کە بۆ ئیرشادی موسوڵمانان ئەشێیت. جا چاک وایە بگەڕێیتەوە بۆ شارەزوور و شوێنی لەبار بۆ خۆت هەڵبژێری و خەریکی فێرکردن و ئیرشادکردنی موسوڵمانان ببی، چونکی ئێمە خزمەتی ئیسلام ئەکەین، ئەنا هەتا ماوی لە لای من بی من هەر شانازیت پێوە دەکەم.

جا سەیید ئیبراهیم نووسیویەتی ئەڵێ: لەسەر فەرمانی سەیید مستەفا گەڕامەوە بۆ شارەزوور و لە دێی «زانزان» لە تەنگەبەری چەمی «زەڵم»دا لە خواری سەرچاوەکەوە

دانیشتم و کردم بە زێد و نیشتمانی خـۆم و ئـاوی سـەرچاوەی زەڵـم زۆر بـوو بـاخ و بێستانی لەبەردا ئەکرا.

وە لە نزیکی دێی «زانزان»دا ئەشکەوتێک بـوو کـردم بـە خەڵـوەتخانەی خـۆم بـۆ بەندەیی کردن بۆ خودا.

وشەی «زانزان» وەکوو لـە دانیشـتوانی ئەوسـای زەڵـم دەبیسـترا شـوێنێکە پێـی دەڵێن: «زەڵمە کۆن» یا «زەڵزەڵە» وا لە بەرانبەری دێی زەڵمەوە.

سەیید ئیبراهیم ئەڵێ: هۆگری خەڵکی «زانزان» بـووم و لەگـەڵ خەڵـکی دێهـاتی ناوچەکەیشدا ناسراویم پەیدا کرد و، مزگەوتێکی بچووکم کردەوە و خۆیشـم هـەر لـە ئەشکەوتەکەدا بەندەیی خودام ئەکرد.

لەو ماوەدا دەنگوباسی بەندەیی کردن و پارێزگاری سەیید ئیـبراهیم بڵاوئەبێتـەوە بەو نـاوەدا و فەرمانـداری خورمـاڵ مـەلیکبـەدر ناوێـک دەبێـت، باسـی ئـەم پیـاوە دەبیسێت.

سەیید ئیبراهیم ئەڵێ: مەلیک بەدر چەن کەسی نـاردە سـەرم بـۆ ئـەوە بچـم بـۆ خورماڵ، منیش بیانووم هێنایەوە و نەچووم بۆ لای، پاش ئەوە ویستی بە زۆر بمبـا بـۆ خورماڵ، بەڵام دەستە و بەستە ژیرەکانی نەیانهێشت و بە راوێـژ وایـان لـێ کـرد ئـەو خۆی بێت بۆ لای من.

کاتێک مەلیکبەدر لەگەڵ هەندێک لە دەستە و بەستەیدا هـاتن بـۆ لام پرسـیاری لێ کردم، لە بارەی ناو و، نیشـانە و، هـۆز و بـەرە و کـار و پیشـەمەوە و وە لـە هـۆی دانیشتنم لە ئەشکەوتدا. بە قەزا و قەدەر لەو کاتەدا مەلیکبەدر هاتبوو چاوی کەوتبوو بە پڵنگێ لەو دەورەدا نووستووە. لەو بارەیشەوە پرسی: ئایا تۆ لەم جانەوەر و دڕندانـە ناترسی؟ منیش پێم وت:

من لەوانە ناترسم، چونکی ئەگەر یەکێ بە راستی لە خودا بترسـێ بێجگـە لـەو لـە کەس ناترسێ و پەنا بە خودا ئەگرێ.

جا مەلیکبەدر وتی: کە وایە تۆ هەندێ شت ئەزانی کە ئێمە نایـانزانین و ئـەتوانی کاری وا بکـەیت کـە خەڵـکی نـەتوانن بیکـەن! منـیش وتم: «و لله العـزة و لرسـوله و للمؤمنین».

جا مەلیکبەدر وتی: من تاقە کچێکم هەیە، تۆ ئەگەر پیاوێکی گەورە بی ئەزانی ناوی چییە و ناساغە و ناساغییەکەی چییە! منیش وتم: ناوی «عەنبەر»ە و نەخۆش و نارەحەتە بە دەستی وەسوەسە و خەیاڵەوە.

مەلیکبەدر وتی: ئەگەر بتوانی دۆعای بۆ بکەیت و وەک خۆی لێ بێتەوە لێت مارە دەکەم. منیش وتم: خودا، دەستی بەسەر هەموو کارێکدا دەڕوات.

جا مەلیکبەدر وتی: ئەگەر سبەینێ کچەکەم شیفای بۆ نەیەت مەعنای وەهایە کە تۆ راست ناکەیت و لە نەتەوەی ئیمام مووسا نیت.

منیش وتم: بەڵێ ئەوەی تۆ ئەتەوێ بۆ ئەو کچە خودا جێبەجێی کرد.

جا کاتێ مەلیکبەدر ئەڕواتەوە تەماشا ئەکات حاڵی کچەکەی گۆڕاوە و شوێنەواری نەخۆشی نەماوە.

سەیید ئیبراهیم ئەڵێ: دوایی ناردی بە شوێنما و عەنبەری لێ مارە کردم و بووم بە یاریدەدەر و جێگەی باوەڕی و زیاتر لە پێشوو دەمتوانی خزمەتی دینی ئیسلام بکەم و خەریکی خزمەتکردن بووم.

وە خودا لەم ژنە ـ عەنبەر ـ پێنج کوڕی پێدام: بیلال، محەمەد، حەسەن، شێردڵ، حسەین. وە مێژووی مارەکردنی ئەم ژنە ساڵی «٥٣٠»ی کۆچی بوو.

وە سەیید ئیبراهیم ـ وەک مەلا محەمەدی باوکی مەلا عەبدوڕەحمان دەڵێ ـ لە هەمان ساڵدا ـ واتە ساڵی ٥٣٠ ـ دەستی کردووە بە نووسینەوەی قورئانی پیرۆز.

و من وصایاه لاولاده باللغة العربية:

اوصيكم أبنائي بمخافة الله والمواظبة على طاعته في اوامره و اجتناب مناهيه، و ان لا تضيعوا نسبكم لا للفخر به بل للاتعاظ به. وعلموا اولادكم امور الدين والاحاديث النبوية، و كونوا على ثقة تامة بان سلسلة نسبكم انحدرت من انفَس الناس خَلقا و خلقا.

ولا تضيعوا شعاركم الذي تعرفون به انتم بني اعمامكم و هم به يعرفونكم، و هو: نحن الكاظميون ابو العباسيين. و ليس نسبكم هذا ينتمي الى ابي العباس السفاح المشهور، بل انتم منتمون الى ابي العباس الامام موسى الكاظم. و كونوا جادين في خدمة الدين لانكم انتم المكرمون بسبب الدين. و هو سبب احترامكم في الدارين. و لا تفقدوا نسبكم و دينكم حتى و لو تأتيكم المصيبة التي اتت على جدكم سيدالشهداء رضي الله عنه. والله

یرعاکم مادمتم انتم تراعون دین الله و عباده المخلصین. والله المستعان والشاهد علی ما کتبته لکم. والله یحفظکم.

و صلی الله علی سیدنا محمد و علی آله و صحبه وسلم تسلیما کثیرا. و آخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین.

حرر فی مدینة «خورماد»، و «شیرمیران» فی شهر رمضان المبارک لخمس مائة و خمسة و اربعین عاما بعد الهجرة النبویة الشریفة. علی صاحبها آلاف الصلاة والسلام. المفتقر الی الله ابراهیم ابوالعباس الحسینی.

و کتبت الوصیة خوفا من الضیاع ـ کما قلت سابقا ـ و کان ما کتبه جدی ابراهیم علی وشک التلف.

المستنسخ منصور ابن صادق البلباسی، منصور ابن صادق ابن بلال، ابن ابراهیم، کتبت فی عام سبع مائة و سبعین بعد الهجرة النبویة.

گیانی باوکت عەبدوڕەحمان! ئەمەیش چەند یادداشتێکە نەوەکانی سەیید ئیبراهیم بۆیان بەجێ‌هێشتووین لە دوالاپەڕەی ئەو قورئانەدا کە بە خەتی سەیید ئیبراهیم نووسراوەتەوە:

| | |
|---|---|
| الحمدلله علی الاتمام | ثم صلاة الله مع سلام |
| علی الذی اصطفاه فی الانام | وآله و صحبه الکرام |
| اعوذ بک من همز الوسواس | دمنی علی سنة خیرالناس |
| رضاک یطلب کاتب فقیر | منصور ابن صادق البلباسی |

منصور بلباسی

«شێوەی مۆر»

قەرارگای بەدەرەدینی باوکی عەنبەر لە زستانا «خورماد» و لە بەهارانا «شیرمیران» و لە هاوینا «شازروان» بووە کە شوێنێکە لە نزیکی «دزلی» لە هەورامانا.

وە ئەڵێن: خورماد ٥٠٠ ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح ـ د ـ دروست کراوە و ئەو کەسەی دروستی کردووە ناوی «ماد» بووە و کوڕێکی بووە ناوی «خۆر» بووە، واتە

«خورشـید» بـە فارسـی و «شمـس» بـە عـەرەبی و دوایـی بـە بـەکارهێنان بـووە بـە «خورماڵ»[١].

وە مەنسوور نووسیویەتی: لە «سادق»ی باوکی خۆمم بیستووە کە:

ئەم قورئانە پیرۆزە بە دەستی باپیرم ئیبراهیمی، کوڕی عەباسی، کوڕی عەبدوللای، کـوڕی مەنسـووری، کـوڕی عەبدولعـەزیزی، کـوڕی عەبدولـلای، کـوڕی ئیسـماعیلی «محدث»ی کوڕی ئیمام مووسای کازم نووسراوەتەوە.

وە فەرموویانە: مێژووی نووسینەوەکەی ساڵی «٥٣٠»ی کۆچی بووە و هەروا چەنـد شیعرێک دێنە یادم کە فەرموویانە، لێرەدا بۆ پیرۆزیی ئەیاننووسمەوە و لە نووسـراوی سەیید ئیبراهیمی نووسەری قورئانە پیرۆزەکەیە:

و فقنـــی الالـــه بالبـــدور
تحریـر مصـحف بشـهرزور
بـالعنبر، ثـم ابیهـا المکـرم،
ثـم بـلال نجلـی المنصـور
اشکرک یا خـالق الحـوادث
لمـا لـی مـن کـرم موفـور

هەروەها سەیید ئیبراهیم لە قەراخی قورئانە دەسنووسەکەیدا نووسیویەتی:

وە من کوڕەکانی خۆم لەم قورئانەدا فێر کرد کە بریتین لە:

«اخترالدین» و «شاوەیس» و «غەزەنفەر» و «مەسعوود» و «بـاوەیس» و «سـبحان». وە لە خودا داوا دەکەم کە ڕێگەی بـاوک و بـاپیرەی خۆیـان بگـرن و چـاو لـە «آنازیـان» نەکەن.

والله الموفق لما یحبه ویرضاه.

وە من ئەم یادگارەم نووسییەوە نەکا لە ناو بچێت.

منصور ابن صادق البلباسی الحسینی ربیع الاول سنة «٧٧٠» هـ

---

١ـ ئەم باسە وەک ئەفسانە وایە و ناوی ئەو شوێنە «هورمان» یانی خۆرهەلات بووە و «هـ» کراوە بە «خ» و «ن» کراوە بە «ل» و بووە بە «خورماڵ».

هەرەوها مەلا محەمەد نووسیویەتی:

بزانن! حەرفە ئەبجەدی‌یەکانی «منصور ابن صادق البلباسی» ئەکاتە حەوسەد و حەفتا.

بکر بن سبحان بن منصور ابن صادق البلباسی ٨٣٠ هـ.

بابا اویس، بن بکر، بن سبحان، بن منصور، بن صادق البلباسی، (الگلعنبری) الحسینی ٨٩٠ هـ.

محمد غیب، بن بابا اویس، بن بکر، بن سبحان، بن منصور ٩١۴ هـ

کوشتنی باوکم بە دەستی عوسمانی‌یەکان لە رۆژی چوارشەمەی بیست و چواری «محرم الحرام»ی ساڵی ٩٣٤ی کۆچی.

«سوار» بن «دانیال» ابن «محمد غیب» ابن «بابا ویس» ابن بکر، بن سبحان ابن منصور، ابن صادق الحسینی.

هەروەها سەیید مەنسوور نووسیویەتی ئەڵێ:

حکی لی والدی ـ ای جدی ـ قال: ان والدی حینما وصل الی «قد افلح من تزکی» فی کتابة المصحف الذی باشر بکتابته فی سنة «٥٣٠» توفی اثناء کتابة هذه الآیة. و فی هذا الخصوص قال:

فی «فی صدور الناس» الا اثنین
بوشر بالتنمیق للدارین
حین وصل عطور «من تزکی»
وافی الی اجله فاوفی

جا من کە نووسەری ئەم کتێبەم ئەڵێم: ئەمانە هەموو نووسراون لە چەن لاپەڕەیەکدا لە پاڵ قورئانە دەسخەتەکەدا. وە ئەو مێژووانە لە پاڵ ئەو ناوانەدا نووسراون هەموو مێژووی کۆچی دوایی ئەو کەسانەن.

هەروەها لە سەر ناوی خورماڵ دەنووسم: ئەوانە کە لە مێژووی کۆنی ئەو هەورامان و شارەزوورە ئاگادارن ئەزانن کە لە چەرخی کۆندا شێوە و لەهجەی هەورامی لە ناو خەڵکدا باو و بڵاو بووە و شێوەی گفتوگۆی ناوچەکە بووە، جا لێرەوە وا دەردەکەوێت

کە «خورماڵ» لە «هورمان» واتە ڕۆژهەڵات وەرگیرابێت و «هـ» و «ن»ەکە کرابن بـە «خ» و «ل» و مەبەس شار و ئاوەدانی خۆرهەڵاتی وڵاتی شارەزوورە.

وە لەسەر ناوی کوڕەکانی سەیید ئیبراهیم دەنووسم: وا دیارە کە ناوی «گردەنازێ» لە «گردی عنازی» وەرگیرابێت، چونکە لە کۆنـدا «بـنی عنـاز» فەرمانـڕەوای شـارەزوور بوون و قەرارگایان لەوشوێنەدا بووە.

وە ئاوایی «قەدەفەری» ئاوایی «غەزنەفەر»ی کوڕی سەیید ئیبراهیم و دێی شـاوەیس و باوەیسیش عائیدی ئەو دوو کـوڕەی سـەیید ئیـبراهیم بـوون کـە بـەو ناوانـەن. وە «سەراوی سوبحان ئاغا»یش بە ناوی سوبحانی کوڕی سەیید ئیبراهیمەوە بووە. هـەروا تیرەی «مەسۆدی» ـ مەسۆیی ـ لە ناو جافدا و لە قەرەداغدا سەر بە مەسعوودی کـوڕی سەیید ئیبراهیمن، کە لـەو چەرخـەدا فەرمانـڕەوا بـوون. «و تلـک الایـام نـداولها بـین الناس».

جا با بڕۆینەوە سەر گێڕانەوەکەی مەلا محەمەد:

ئەڵێ: لە پاش ئەوەی کە مەلیکبەدرەدین لە مێژووی ٥٣٥دا مـرد، هـەموو مـاڵ و زەوی و داراییەکەی گەڕایەوە بـۆ سـەر عەنبـەر خـانمی کچـی کـە خێـزانی سـەیید ئیبراهیم بووە.

وە لە ساڵی ٥٤٦دا سەیید ئیبراهیم کۆچی دوایی کـردووە، بـەڵام عەنبـەر خـانمی خێزانی هەر لە سەر فەرمانداریی وڵاتەکەی باوکی ماوەتەوە.

وە لە ساڵی ٥٥١دا بیلال، کە کوڕی گەورەی سەیید ئیـبراهیم بـووە، لـە جێگـەی دایکیدا بووە بە فەرمانداری وڵاتی شارەزوور، بەڵام لەبەر ئەوەی کە گیرۆدەی ئـەوینی «ڕەوشەن خانی» کچی «فەلامەرزی نوسەیری» ـ کە گەورەی بەرەی «ئاناز»ی «عنـاز»ی بوو ـ بوو سەیید بیلال دەستی لە گەورەیی هەڵگرت و وڵاتەکەی خۆی دایـە دەسـتی فەلامەرز لە بەرانبەری ئەوەوە کە ئەویش ڕەوشەن خانمی بـۆ مـارە بکـات و ئـەویش بۆی مارە کرد.

پاش ئەوە کە بیلال ڕەوشەنخانی مارە کرد خودا هەشت کوڕی بە بیلال و خێزانی بەخشی کە بریتین لە: سادق و ئیبراهیم و ئیسماعیل و بەکر و حەیـدەر و ئەحمـەد و نەسرەدین و زەینەدین.

وە بیلال کۆچی دوایی کرد و لەو گۆڕستانەدا کـە ئێسـتە بـە «گۆڕسـتانی بـیلال» دەناسرێت و لە نێوان زەڵم و ئەحمەدئاوادایە ... بە خاک سپێررا.

وە لە سادقی کوڕی بیلال حەوت کوڕ بەجێ‌مان: مەنسوور و محەمەد و قەڵەندەر و ئیلیاس و خوسرەو و، یوسف و سـوبحان. وە لـە سـوبحانی کـوڕی سـادق سـێ کـوڕ بەجێ‌مان: بەکر و جونەید و حەسەن، کە لەقەبی «هورمز» بوو. وە لە بەکر چـوار کـوڕ بەجێ‌مان: محەمەد و ئەحمەد و بابا ئوەیس و بازی.

جا بابا ئوەیس لە «گولعەنبەر»دا نیشتەجێ بوو، سوڵتان سولەیمان لە ساڵـی ٨٦٥دا مزگەوتێکی بۆ کردەوە و ئەویش لەوێدا دەستی کـرد بـە دەرس‌وتنـەوە و فێرکـردنی موسوڵمانان تا لە ساڵی ٩٥٠دا کـۆچی دوایـی کـرد و ئارامگـای لـە «جـەوراوا»ی لای سەرگەتدایە.

ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێ‌ما: «محمد غیب الله» و حەیدەر، محەمـەدغـەیب لـە خورماڵ لە جێگەی باوکیدا دانیشت و خەریکی دەرس‌وتنەوە بوو. وە لە پـاش کـۆچی دوایی ئەو دانیال ناوی کوڕی لە جێگەیدا دانیشت و تا کاتێـک کـە جـەنگ لـە نێـوان (مەئموون بەگ)ی گەورەی شارەزوور و دەوڵەتی عوسمانیدا رووی‌دا. ئـەو جەنگـە دە ساڵ درێژەی کێشا. جا مەئموون‌بەگ بە دیل گیرا و، دانیال شەهید کرا و، نەوەکانیان بڵاوەیان کرد بە جیهاندا هەر یەکەی بەلایەکدا. وە حەیـدەری بـرای محەمـەدغـەیب چوو بۆ هەولێر.

بۆ زانیاری: گۆڕی محەمەد غەیبوڵلا وا لە بـەر دێـی سـەرگەتا و بـە بابـا غەیبوڵـلا ناسراوە. وە گۆڕی سەید دانیال وا لە نزیکی گردی «چەقەڵاوا» ـ «تەکیە»دا لە نزیکـی دێی خورماڵدا و دارێکی بەڕووی گەورەی بە سەرەوەیە.

جا با بچینەوە سەر مەبەستی خۆمان:

نەوەکانی دانیال پاش شەهید بوونی باوکیان بڵاوەیان کرد و ناویان سوارە و مامەند و بایەزید و زوبێر بووە.

جا سوارە هەر لە شارەزووردا مایەوە و بە ناوونیشانی «بڵباسـی»یـەوە دانیشـت[١]. وە مامەند و، بایەزید و زوبێر چوون بۆ شارباژێڕ[٢]. نازانین نەتەوەیان هەیە یا نە.

---

١ـ لەوانەیە دێی «سواری» بە ناوی ئەم «سوارئاغا»یەوە بێت.

٢ـ دێیەک لە شارەزووردایە بە ناوی «گردەزبێر»ەوە رەنگە دێی زوبێر بووبێت.

وە کوڕەکانی سوارە چوار بوون: مستەفا و نەسیرەدین و مووسا و سولەیمان. ئەمانەیش هەر لە شارەزووردا مانەوە.

بەڵام سولەیمانی کوڕی سوارەئاغا کەوتە جەنگەوە لەگەڵ سوپای عوسمانیدا و توانی شارەزووریان لێ بسێنێتەوە و میرنشینێکی بڵباسی لە ساڵی ١٠٤٤ی کۆچیدا دامەزراند. بەڵام مەرگ مۆڵەتی نەدا و لە ساڵی ١٠٤٦دا کۆچی دوایی کرد.

دوای ئەو سوبحانئاغای کوڕی فەرمانداری وڵاتی گرتە دەست و لە شارەزووردا مایەوە.

وە دوای مردنی ئەمیش خوسرەوئاغای کوڕی کار و باری وڵاتی گرتە دەست و مایەوە. بەم جۆرە میرنشینی و فەرمانڕەوایی بڵباسیی تا ساڵی ١٠٦٨ لە شارەزووردا مایەوە. لەو ساڵەدا بە دەست بەیەکدانی هێزەکانی عوسمانی و ئێرانی میرنشینی بڵباسەکان لە شارەزووردا بەرباد کرا.

دوای ئەم کارەساتە بڵباسەکان و نەتەوەی خوسرەو هەر یەکەو بە لایەکدا بڵاوەیان کرد و هەندێک بۆ قزلجە و، هەندێکی دیکە لە شارەزووردا مانەوە. لەوانەی لە شارەزووردا مانەوە: ئەکرەم و ئوەیس و زولفەقار و سیامەند و سادق. وە مەسعوود و هیلال و حەسەن و عومەر و ئیبراهیم چوون بۆ قزلجە و، زوبێر و واشە و [ئێستە دێی واژە هەیە] سەیید وەسیم چوون بۆ شارباژێڕ.

وە سەیید وەسیم ژنەکەیشی ـ کە ڕۆشنی کچی سەیید مووسای بڵباسیی بوو ـ لەگەڵ خۆیدا برد و، لە دێی «قلعه چهار لا» نیشتەجێ بوو. ئەم سەیید وەسیمە تاقە کوڕێکی بوو ناوی سەیید ئیبراهیم بوو، فاتیمە ناوی کچی سەیید ئەحمەدی نەرگسەجاڕیی بۆ مارە کرد.

کوڕێکیان بوو ناویان نا عومەر، ئەم عومەرەیش گەورە بوو ژنی هێنا و خودا هەشت کوڕی پێدا. ناویان: مامەند و عەباس و بایەزید و زاهیر و جەعفەر و نوورەدین و ئیدریس و عەلی بوو. کچێکیش ناوی عایشە بوو.

ئەم خێزانە لەو وڵاتەدا گەلێ ڕێزیان هەبوو و خەڵکی بە چاوی خۆشەویستی تەماشایان دەکردن، هەتا کاتێک کە سولەیمانی کوڕی فەقێ ئەحمەدی «دارەشمانەیی» پەیدا بوو و دەستی کرد بە داگیرکردنی وڵات و دەستەو بەستەیەکی

---

٣ - سەراوی سوبحان ئاغای ئێستە بە ناوی ئەم «سوبحان ئاغا»وەیە.

بەهێزی پێکەوە نا و، دەستەڵاتی پەیداکرد. هەتا دەوڵەتی عوسمانی کەوتە تەگبیری گرتنی، کاتێک کە سولەیمان بەوەی زانی بە سەد کەسەوە چوو بۆ کەرکووک و هێرشی بردە سەر بنکە و بارەگای دەولەت و «دلاوەر» ناوی فەرمانـدەی ولاتەکەی لەگەڵ چەند کەسێک لە دەستەوبەستەیدا لە ناو برد و، تالانی کردن. ئەم هێرشە لە ساڵی ١١٠٢ی کۆچیدا رووی‌دا.

پاش ئەم رووداوە نەیتوانی لە قەزای پشدەردا دابنیشێ و دارەشمانەی بەجێ‌هێشت و لەگەڵ دەستەکەیدا هات بۆ شاربازێڕ و، «قلعە چهار لا» ـ «قەلاچوالان»ی کرد بە قەرارگا بۆ خۆی و کۆمەڵەکەی.

کاتێ هاتە قەلاچوالان داوای لە سەیید عومەر کرد کە خانوووەکای خۆی بۆ چۆڵ بکات، ئەویش بە گوێی نەکرد. سولەیمان شەو بە چەن کەسەوە دایان بە سەر ماڵی سەیید عومەردا، سێ کەسیان لە کوڕەکانی سەیید عومەر و چەن کەسێکیان لە خەڵکی دێکە کە لە لای بوو کوشت.

سەیید عەلیی کوڕە بچووکی سەیید عومەر بە ناچاری لەگەڵ فاتیمەی دایکیدا گەڕانەوە بۆ دێی «قای نەیجە»ی شارەزوور و لە ناو تیرەی بڵباسدا نیشتەجێ بوون.

وە لەولایشەوە عایشەی کچی سەیید عومەر کە ژنی حاجی ئەحمەدی قەشانی بوو بۆ تۆڵەسەندنەوەی براکانی بە گۆڕینی شێوە ئەچێتە ماڵی سولەیمان و لە پاش چەن مانگێ شەوێک هەلی بە دەست هێنا و سولەیمانی سەربڕی و دەستەی سولەیمانیش عایشەیان کوشت، بەلام سەیید عەلی لەگەڵ دایکیدا لە ناو بڵباسەکان و لە دێی «قای نەیجە»دا مانەوە.

بە رێبازی تیرەی بڵباس هاوینان ئەچوون بۆ کێوێک لە نێوان کێوی «سوورێن» و «مەریوان»دا رایان ئەبوارد، تا گەرما بەسەر ئەچوو، بەلام لەم جارەدا کە چوون بۆ کوێستان هەتا دوو ساڵ لە ترسی نەخۆشی چاوەقووڵە نەهاتنەوە بۆ شارەزوور، ساڵی سێهەم کە هاتنەوە هەر نەختینەیەکی کە کاتی خۆی شاردبوویانەوە بۆیان نەدۆزرایەوە و بە هەناسە ساردیی مانەوە، بە هەر حاڵ سەیید عەلی لەگەڵ فاتمەی دایکیدا هەرچۆن بوو ژیواریان رێ خستەوە و خۆیان گرتەوە و سەیید عەلی کاتی ژن‌هێنانی هاتبوو «سیما» ناوی کچی سەیید ئەحمەدی قای‌نەیجەیی مارەکرد و خودا سێ کوڕی پێدان: خالید و محەمەد و جەلالەدین.

جا محەمەد لە پێش ژنهێنانا بە جوانی مرد. خالیدیش چووە ناو تیرە کۆچەرەکان و نەزانرا چی بەسەردا هات و نەتەوەی هەیە یا نە.

جەلالەدین کە بە جەلالەدینی گەورە ناسراوە گەورە کچی سەیید ئوەیسی بڵباسیی مارە کرد و لە پاش ئەوە کە لە زانیاریەکاندا شارەزا بووە و دەستی باڵای پەیدا کردووە تیایاندا ئیجازەی وەرگرتووە و لە خورماڵدا بە مامۆستایی دانیشتووە و خزمەتی موسوڵمانانی کرد. خودا چوار کوڕی پێدا: مستەفا و جەلالەدینی بچووک و محەمەدئەمین و محەمەد. ئەم دووانەی دوواییان بێژنهێنان و بە گەنجی مردن. جەلالەدینی بچووک ژنی هێناوە و کوڕێکی بوو ناوی عەبدوڵلایە و تا ئێستە کە من ئەم مێژووە دەنووسم ژنی نەهێناوە.

منیش عەبدولکەریمی مودەڕس ـ نووسەری ئەم کتێبە ... دەڵێم:

عەبدوڵلا پاش ئەو مێژووە ژنی هێناوە و کوڕێکی بووە ناوی محەمەدئەمین بووە و محەمەدئەمین چەن کچی بووە.

وە مستەفای کوڕی مەلا جەلالی گەورە[1] کە بە گوڵعەنبەریی ناوبانگی دەرکردبوو «نەویس» ناوی کچی «ئەکرەم وەیسی» بڵباسیی مارەکرد و خودا سێ کوڕ و سێ کچی پێداوە، کوڕەکان: من کە ناوم محەمەدە و عەلی و کاک ئەمین و کچەکانیش فاتیمە و ئامینە و رەزیە.

جا من لە سەر وەسیەتی باوکم لەگەڵ براکانمدا خەریکی خوێندن بووم و پاش تەواوکردنی خوێندن هاتمەوە بۆ خورماڵ. کە تەماشام کرد خانەدان چۆڵ و هۆڵە و نە باوک و نە دایک نەماون و هەموو مردوون.

دراوسێکان لێم گردبوونەوە و گەلێ میهرەبانییان لەگەڵ نواندم.

خوشکەکانیشم شوویان کردبوو، یەکێ بە: شێخ محەمەد بەهادینی کوڕی عوسمان سیراجەدین و یەکێکیان بە مەولەوی و یەکێ تریشیان بە مەلا نەزیری تەوێڵەیی و عەلی و کاک ئەمینیش لە پێش ژنهێنانا مردبوون.

وە من خۆم کە مەلا محەمەدم لە سەر فەرموودەی مورشیدی گەورەم شێخ محەمەدی بەهادین لە دێی سەرگەتدا دانیشتم و خاتوون ئامینەی کچی شێخ

---

۱ـ مەلا جەلالی گەورە خەلیفەی شێخ حەسەنی گلەزەردە بووە و لە خورماڵدا دەرسی وتووەتەوە، تا لە ساڵی ۱۲۳۰دا کۆچی دوایی کردووە و مەلا مستەفای کوڕیشی خەلیفەی مەولانا خالید بووە.

عەبدولکەریمی سەرگەتیم مارە کردووە بۆ خۆم، کە دایکی تۆیە عەبدوڕەحمان! وە دایکی عەبدوڵلا و حەلیمە و توحفەیە. جا عەبدوڕەحمان گیانی باوکت! تۆ بزانە کە ئێمەو هەموو «بلّباس»ەکان و نەوەکانی شێخ عوسمانی سیراجەدین لە پاکترینی نەسل هاتووینەتە خوارەوە و ئەگەینەوە بە ئیمام مووسای کازم و ئەڕۆینەوە سەر ئەو، یانی مووسای کازم (ابوالعباس).

عەبدوڕەحمان! کوڕی خۆم! من ئەو رشتە و یادداشتەم هەر لە سەر وەسیەتی پێشینەکان بۆ نووسیت، تا پەندی لێ وەربگرن و لە سەر ڕێگەی ئەو پیاوچاکانەی پێشوو بڕۆیت، نەک بۆ شانازی پێوەکردن و خۆ بە گەورە تەماشاکردن، چونکە ڕێز لە لای خودا بە تەقوایە. وە ئێمە خزمەتکاری دینین و شانازیی بۆ خزمەتکار دەس نادا و ئێمە شوێنکەوتووی پێشینانین.

کوڕم! ئەم رشتە لە باوکمەوە گەییشت بە من و منیش بۆ تۆم بەیان کرد، تۆیش ئەبێ بیگەیەنی بەوانەی کە لە نەتەوەی ئێمە پەیدا ئەبن.

از هزار و دو صد پس او نود آور میا
این نوشتم بهر تو، یادش بگیر نور بصرا!

محمد البلباسی الحسینی
قریە (سەرگەت)
فی سنة ١٢٩٠

مەحموود! ون نەکەی ئەم یادگارە
حەرفێکی بۆتان جێگەی هەزارە

عبدالرحمن السرگتی
١٣٥٣ هـ

**بۆ زانین و ئاگاداری:** مەلا مەحموودی، کوڕی مەلا عەبدوڕەحمانی، کوڕی مەلا محەمەدی سەرگەتی، قورئانێکی دەسنووسی باپیرە گەورەیان ـ سەیید ئیبراهیم ـی بوو هێنای فرۆشتی بە «مدیریة الاثار العامة ـ قسم المخطوطات» هەندێ شت لە کۆتایی ئەو قورئانەدا نووسرابوو، ئەوە بوو ئێمەیش بۆ یادگار نووسیمانن. وە ئەم عیبارەتە فارسی‌یەیش هەر لە دوای ئەو شتانەوە نووسرا بوو:

از پدر خود بلال بمن رسیده، که این مصحف شریف بدست مرحوم جدش نوشته شده که ابراهیم، پسر عباس، پسر عبدالله، پسر منصور، پسر عبدالعزیز، پسر عبدالله، پسر اسماعیل، پسر امام موسای کاظم مکنی به «ابوالعباس»، و فرمودند که روزگار نوشتن این مصحف از سال هجری گذشته پنج صد و سی سال، یعنی به دوصد و چهل سال قبل از نوشتن من این چند کلمه. و جد بزرگ فرمودند که این بیتها یاد دارم از ابیات پدرم:

و فقنــی الالــه بالبــدور
تحریر مصـحف بشـهرزور
بعنبــر ثــم ابیهــا المکــرم
ثم بـلال نجلـی المنصـور

و من پسران خود را درین مصحف بتعلیم رسانیدم، که: اخترالدین، و شاویس، و منصور، و مسعود، و باویس، و سبحانند، و همچنان از خدا خواهم که راه اجداد خود بپیمانند، و چشم بر «آنازیان» نکنند، والله الموفق لما یحبه و یرضاه.

منصور ابن صادق البلباسی

بـرای خاطرم غم آفریدند
سر سال از محرم آفریدند

کشته شدن والدم در روز چهارشنبه بیست و چهارم محرم الحرام نوصد و سی و چهار، بدست عثمانی.

سوار ابن دانیال

محمد غیب، بن بابا اویس، بن بکر، بن سبحان البلباسی الحسینی، تسع مائة و اربعة عشر ۹۱۴ هـ

بابا اویس، بن بکر، بن سبحان، بن منصور، بن صادق، ابن بلال، ثمان مائة و تسعون ۸۹۰ هـ

بابا اویس البلباسی الحسینی

منیش کە دانەری کتێبی بنەماڵەم ئەڵێم و ئەنووسم:

بە پێی ئەم یادداشتە کە مەلا محەمەدی، کوڕی مەلا مستەفای، کوڕی مەلا جەلالی خورماڵ نووسیویەتی ڕشتەی ئەم بنەماڵە ئەڕوا تا ئەگاتە ئیمام مووسای کازم.

وە لە سەر یاسای ئیسلام ئادەمیزادی موسولمان باوەڕی پێ ئەکرێ کاتێ داوای نەسەبی بکات، مەگەر لە شوێنێکدا کە حوکمی شەرعیی بەسرابێ بە دابەزاندنی ئەو نەسەبەوە، ئەو کاتە داوای شابەتی لی دەکرێت.

کەواتە بنەماڵەی زانای گەورە مەلا جەلالی خورماڵ، ئەو زانا گەورە کە مامۆستای مامۆستایان بووە لە زانیاری‌یە ئایینی‌یەکاندا و، لە ڕێبازی تەریقەتیشدا خەلیفەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە بوە ... لە سەییدەکانن.

ئەم زاتە بە یەکێ لە سەییدەکان ئەناسرێ و داوای بەرزیی پایەی دوارۆژیشی لە خودا بۆ ئەکەین. وە هیوامان وایە بە هۆی بەرزیی و پیرۆزیی پایەی ئەو زاتە و وێنەی ئەوەوە لە پیاوە گەورەکانی جیهان ئێمەیش بەشێکمان لە پیرۆزیی دەست بکەوێت لە دنیا و قیامەتدا.

جا ڕشتەی نەسەبی ئەم بنەماڵە لە مەلا محەمەدی نووسەری ئەم یادداشتەوە بەم جۆرەیە. وە یا لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەو زاتەوە کە زۆر باش بووە و پیاوچاک بووە، ئاوایە:

عبدالرحمن بن محمد، ابن مصطفى، ابن جلال‌الدين، ابن السيد على، ابن السيد عمر، ابن السيد ابراهيم، ابن السيد وسيم، ابن امير خسرو، ابن سليمان، ابن منصور، ابن صادق، ابن بلال، ابن ابراهيم، ابن السيد عباس، ابن السيد عبدالله، ابن السيد منصور، ابن السيد عبدالعزيز، ابن السيد عبدالله، ابن السيد اسماعيل، ابن الامام موسى الكاظم ... الخ.

## لێکدانەوەی هەندێ وشە کە لە لای قورئانە دەس‌نووسەکەدا نووسرا بوون

آورمان: هەورامان.

گۆرانی: هەورامی.

جەوراوا: دێ کۆنێکە لە نێوان سەرگەت و گۆڕستانی باوەیسدا.

زەن‌زەن: دێکەی ئێمە لە بەرابەری دێی زەڵمەوە، ئێستە لە باتی ئەو ناوە لە سەر زمانی خەڵکی ئەڵێن: زەڵزەڵە.

شێردڵ: زەردەڵە، گۆڕەکەی لە پشتی دێی ئەحمەد ئاواوەیە، پێی ئەڵێن: بابا زەردەڵە.

شازەروان: هەوارێکە لە نزیکی «دالانی» بە رووی دێی دزڵیدا.

شیرمیران: یا مەبەست شەمێرانە کە لەوبەری سیروانەوەیە، یا مەبەست شیرەمەڕە، یا جێگەیەکی دیکە.

شیرمیر: شیرەمەڕ.

جان جان: لە نزیکی بەکراوادایە لە شارەزوودا.

قەڵای سەرگرد: قەڵایێکە لە پشتی دێی سەرگەتەوە لە گەڵێ لایەوە بە قەی مەترێ دیواری ماوە.

سەرگەت: یانی سەرخەت، سەرسنوور.

قەڵای سەرگرد: یانی سەرگورد، سەرکار، فەرماندەی کۆمەڵە.

باباناوز: واتە بابای نەنووستوو. ناوی پیاوێکی چاکە لە لای سەرگەتا.

دلیدەم: «تل الدم» وەختی خۆی جەنگی تێدا کراوە و خوێنی تێدا ڕژاوە.

## بنەماڵەی شێخ موئمینی سازانیی

بە بۆنەی ئەوەوە کە شێخ موئمینی سازانی دۆستی مەلا جەلالەدینی گەورەی مودەڕیسی خورماڵ بووە و هەردووکیان مەنسووبی شێخ حەسەنی گڵەزەردەی کوڕی شێخ محەمەدی نۆدێ بوون و شەجەرەی مۆرکراوی بنەماڵەی شێخ موئمینیش ئەوەی تێدایە کە ئەو بنەماڵە لە سەییدەکانی بەرزنجەن ... باسی ئەو بنەماڵە لێرەدا دوای باسی بنەماڵەی مەلا جەلال دەنووسم.

من خۆم دەقی شەجەرەی بنەماڵەی شێخ موئمینم نەدیوە، هەر چەند خۆیان دەڵێن شەجەرەیەکی بەبایەخمان هەیە کە مۆری شێخ مارفی نودێیی پێوەیە. وە دەڵێن: ئەو شەجەرە دەچێتەوە سەر شێخ زەینەدین کە برای شێخ عیسای بەرزنجە بووە.

بەڵام وەکوو زانراوە شێخ عیسای بەرزنجە ٢ برای بووە: شێخ محەمەد نووربەخش کە لە کوردستاندا نەبووە و لە دەوری خۆراسانا دانیشتووە و نەتەوەیشی لەو ناوەدا هەیە. برای دوەمی شێخ مووسایە ئەویش پێش ئەوەی مندالی ببێ لە جیهان دەرچووە.

کە وابێ ئەم شێخ زەینەدینە ئەبێ برای شێخ عیسای ئەحدەب بێ کە لە نەتەوەی شێخ عیسای گەورەی بەرزنجەیە و برای نییە.

السید علی ابن السید وسیم، ابن السید عبدالمؤمن، ابن السید حسین، ابن السید ابراهیم، ابن السید احمد، ابن السید شهابالدین، ابن السید الشیخ علی، ابن السید عوض، ابن السید محمد، ابن السید ابوالحسن، ابن السید عبدالله، ابن السید عیسی، ابن السید موسی، ابن السید فخرالدین، ابن السید عمادالدین، ابن السید عبدالرحمن، ابن السید مظهر، ابن السید زین الدین ـقدس سره العزیزـ «اخ سیادة و نجابت پناهان شیخ عیسی و شیخ موسی ـ قدس سرهما العزیز ـ و مات فی مکة المکرمة» ابن السید الشیخ علی

الهمدانی، ابن السید یوسف، ابن السید منصور، ابن السید عبدالعزیز، ابـن الســید عبـدالله، ابن السید اسماعیل، ابن السید امام موسی الکاظم[1].

به داخەوە ئێمـە تـا ئێسـتە «بحرالانسـاب»ی بەرزنجـەمان دەسـت نەکـەوتووە تـا درێژەی رشتەکانیان بزانین ئەو «بحرالانساب»ە دووانن:

یەکەم: ئەو «بحرالانساب»ەیە کە شێخ حەسەنی کوڕەزای شێخ حەسەنی گڵەزەردە داینـاوە، ئەمە نایدەن بە کەس تەماشای بکات.

دووەم: ئەو «بحرالانساب»ەی کە شێخ مـەجموودی شـۆڕیجە کـە لـە نـەوەی شـێخ محێدینی کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردەیە نووسیویە، ئەم کتێبەیشمان هەم نەدیوە. وە ئەوەی کە لای ئێمە بووە و هەندێ باسمان لە بەری نووسیوە بریتی‌یە:

لەو کتێبی نەسەبە کە لە لای سەیید ئیبراهیمی کوڕی شێخ سەعیدە.

وە ئەو کتێبەیش کە لە لای شێخ برایمـی کـوڕی شـێخ محەمـەدی کـوڕی شـێخ عەبدولکەریمی «قادر کەرەم»ە. وە ئەم کتێبانە بچووکن و بە «نهرالانساب» ئـەژمێررێن، نەک «بحرالانساب»، چونکە شێخ عیسای گەورە دوازدە کوڕی بووە و لەم دوو کتێبــەدا تەنیا نەتەوەی شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ عیسا نووسراوە و ئیتر بە هیچ جۆرێ باس لە یـازدە کوڕەکـەی دیکـەی ناکـەن. هـەروەها لـە رشـتەی نەتـەوەی سـەیید عەبدولکەریمی کوڕی شێخ عیسای گەورە هەر باسی یـەکێ لـە کوڕەکانیـان ئەکـەن، ئەوەی کە باپیرەی ئەم کۆمەڵە ناسراوەیە، ئیتر باسی نەوەکانی تریـان نـەکردووە. بـۆ نموونە:

نەتەوەی شێخ محەمەدە سوورەی ناسراو بـە «مـیری سـوور» بـە هـیچ شـێوەیەک نەنووسراوە، ئەگەرچی زاتێکی خاوەن کەرامەت بووە و ئێسـتەش کەرامەتی هەیە.

وە باسی نەتەوەی سەیید یاسینی کوڕی سەیید قەلەندەر نەنووسراوە.

هەروەها نەتەوەی بابا رەسووڵ کە حەڤدە کوڕی بووە زۆریان باسیان دیار نییە. بـە تایبەتی نەتەوەی سەیید محەمەدی مەدەنی موفتی مەدینەی مونەووەرە، کە تاقانـەی سەردەمی خۆی بووە لە زانیاریدا .... نەنووسراوە.

---

[1] ـ کاتێ ئەم کتێبە لە ژێر چاپدا بوو ئەم شەجەرەی سەرەوەیان بۆ هێنایین، کە لە ساڵـی ۱۲۲۳ کـدا بـە خەتی شێخ مارفی نۆدێیی نووسرابووەوە و ئێمەیش لێرەدا بەشی پێویستمان لێ نووسی.

وە سەیید جەعفەری کوڕی سەیید محەمەد و سەیید ئیبراهیمی کوڕی سەیید محەمەد کە بە «محدث» بەناوبانگە و، لە مەدینەوە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و لە دێی «بەردەزەرد» لە نزیکی قەزای چوارتادا نیشتەجێ بووە ... نەنووسراوە.

بە کورتی: نووسینی نەتەوەی ئەم بنەماڵە بە ڕێکی کتێبێکی گەورەی دەوێ، ئەگەر دوو سێ بەرگیان نەوێ. ئێستە سەییدەکانی «لۆن» لە «بێڵەوار»ا کە لە بڕبڕەی نەتەوەی بەرزنجەن و چەند پیاوی گەورەیان بووە باسیان نییە.

بەهەرحاڵ من باوەڕم وایە کە شێخ موئمینی سازانی لە سەییدەکانی بەرزنجەیە و لە نەوەی ئەو زەینەدینەیە، بەڵام پێویستی بە لێکۆڵینەوە و تەماشای «بحر الانساب»ە گەورەکانە تا بە تەواوی دەربکەوێت.

وە بۆ زیندووکردنەوە و رزگارکردنی لە لەناوچوون من لێرەدا بەو شێوە کە بۆم هاتووە ناوی شێخ موئمین ئەنووسم.

## شێخ موئمینی کوڕی سەیید حسەین

شێخ موئمین کوڕی سەیید حسەین نیشتەجێی سازان، لە نەتەوەی شێخ زەینەدینی بەرزنجی‌یە. ئەم زاتە پیاوێکی چاک و لەخوداترس و خاوەن پارێز بووە و خەلیفەی خوالێخۆش‌بوو شێخ حەسەنی گڵەزەردە بووە و دۆست و برادەری زانای گەورەی چەرخی خۆی مەلا جەلالی خورماڵی بووە بە تایبەتی هاومەسلەک بوون بە هۆی ئەوەوە کە مەلا جەلال خەلیفەی شێخ حەسەنی گڵەزەردە بووە، ئەم زاتە لە ساڵی ١٢١٠ی کۆچیدا لە «سازان» کۆچی دوایی کردووە.

## شێخ حەسەنی کوڕی شێخ موئمین

شێخ موئمین سێ کوڕی بووە: شێخ حەسەن و شێخ سەلام و شێخ وەسیم.

شێخ حەسەن پیاوێکی چاک و زانا و لەخوداترس بووە. لەگەڵ مەولەویدا دۆستی و برادەرییان بووە. هەردووکیان مەنسووبی شێخ محەمەد بەهائەدینی کوڕی شێخ عوسمانی سیراجەدین بوون. مەولەوی دەربارەی شێخ حەسەن ئەڵێ:

نەتیجەی پاکدین شێخ سازانی
خاس وەتەن نە تۆی دەروون سازانی

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٧٥دا کۆچی دوایی کردووە و باسی نەتەوەی نازانم.

ئەوەندە ئەزانم بە هۆی مارپێوەدانەوە مردووە و مەولەویش ئەم قەسیدەی بەو بۆنەوە نووسیوە.

## شێخ سەلامی کوڕی شێخ موئمین

شێخ سەلام لە پێش ژنهێنانیدا لە دێی بەڵخەی نزیکی تەوێڵەی هەورامانـدا کۆچی دوایی کردووە و گۆڕەکەی لە گۆڕستانی بەڵخەدایە.

## شێخ وەسیمی کوڕی شێخ موئمین

ئەم پیاوە دوو کوڕی بووە: سەیید سادق و سەیید عەلی.

سەیید سادقیش سێ کوڕی بووە: سەیید باوا و، سەیید محەمەد و سەیید تاها. لە سەیید باوا سەیید سلێمان و سەیید سەعید بووە. جا لە سەیید سلێمان سەیید عەلی و سەیید زەینەدین بووە. وە لە سەیید سەعید کاکە شێخ و حەمەڕەشید و حەمە ساڵح بووە.

وە لە سەیید محەمەدی، کوڕی سەیید وەسیمی، کوڕی شێخ موئمینی سازانی سەیید عەبدوڕەحمان و سەیید مەحموود و سەیید عەزیز و سەیید مستەفا و سەیید تاها و سەیید یەحیا بووە.

جا لە عەبدوڕەحمان سەیید مەجید و سەیید عارف بووە. سەیید مەجید نەتەوەی نییە. وە لە سەیید عارف شەش کوڕ بووە: ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، حەیدەر، عەبدوڕەحمان، مەحموود. لە عوسمانیش ڕەسووڵ و حەسەن و سادق بوون.

وە لە ڕەسوول تاها و یاسین و شاخەوان و پشتیوان و فەهمی بوون.

وە لە حەسەن ئومێد و مەجید بوون.

وە لە سادق سەلام بووە.

لە حەیدەریش فاتیح و نەسرەدین و محەمەد و ناجی بوون.

وە لە شێخ عەبدوڕەحمان فایەق و نوورەدین و فەریق و جەمال بوون.

وە لە مەحموود فاڕووق و عەواد بوون.

وە لە سەیید عەزیزی کوڕی سەیید محەمەد، محێدین بووە و لە محێدین، محەمەد و لە محەمەدیش نەسرەدین بووە.

وە لە سەیید مستەفای کوڕی سەیید محەمەد سەیید ئەحمەد و مارف و فەرەج بووە.

وە لە فەرەج، فەتاح و حسەین و ئەحمەد بوون. وە لە فەتاح نووری و رەئووف بوون.

وە لە شێخ یەحیای کوڕی، سەیید محەمەد، قادر بووە و لە قادر، سەلام و عەلی بوون و لە سەلام، مستەفا و رەشید و لە عەلی، ئەمین بووە.

وە لە شێخ تاهای کوڕی سەیید محەمەد، عەبدوڵلا و یاسین بوون.

وە لە عەبدوڵلا محەمەد بووە.

وە لە سەیید عەلی کوڕی سەیید وەسیمی کوڕی شێخ موئمینی سازانی، سەیید عەبدوڵلا بووە، لە سەیید عەبدوڵلا، حسەین بووە. وە لە شێخ حسەین، شێخ ئەمین و شێخ عەبدوڕەحمان بەجێماون.

شێخ ئەمین خوێندوویەتی و لە پایەکانی زانیاری ئایینیدا سەرکەوتووە و ئیجازەی وەرگرتووە. ئەم زاتە پیاوێکی بەڕێز و پایەبەرز بووە. برادەری مەلا قادری مەلا موئمین و مامۆستا مەلا عەبدوڵلای شێخ قادر و مەلا مەحموودی کۆکۆیی بووە. نوکتە و قسەی خۆشیان زۆر لێ ئەگێڕنەوە. لەم شوێنەدا جێگەی نووسینیان نییە.

ئەم زاتە چووە بۆ حەج و لە سەر دۆعای خۆی لە حیجازدا کۆچی دوایی کردووە و تاقە کوڕێک لە دوای بەجێماوە ناوی محەمەدە.

محەمەدی حاجی شێخ ئەمین خوێندی و بوو بە زانایەکی باش و لە رەوشت و قسەی خۆشدا وەکوو باوکی وابوو، گەلێ رەوشتی پیاوانەی تێدا بوو، بە داخەوە مەرگ مۆڵەتی نەدا و لە پێش ژنهێناندا کۆچی دوایی کرد.

کچی حاجی شێخ ئەمین شووی کرد بە شێخ ئەحمەدی موفتی، لەم کچە نەتەوەیەکی پاک کەوتووەتەوە، یەکێ لەوانە شێخ نەسرەدینی کوڕی شێخ جەلالی کوڕی شێخ ئەحمەدە، کە ئێستە لە زانکۆی شەریعەدا دەخوێنێ. خودا سەرکەوتووی بکات. وە لە شێخ عەبدوڕەحمان دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ عەبدوڕەحیم و شێخ رەزا.

جا لە شێخ عەبدوڕەحیم، ساڵح و محەمەد و عەلی بەجێماون. لە محەمەد، عەبدولباقی و لە عەلی، کەریم و محەمەد و مستەفا و ئەحمەد بەجێماون. ساڵح نەتەوەی دیار نییە.

وە لە شێخ ڕەزا، حەسەن و عەبدوڵلا و ئەحمەد و عەبدولقادر بەجێماون.

جا لە حەسەن، حسەین و لە حسەین، مەحموود و حەسەن بەجێماون. وە لە عەبدوڵلا عومەر و عوسمان و عەلی بەجێماون.

ئەحمەد نەتەوەی نەنووسراوە و دیار نییە.

وە لە عەبدولقادر، وەهاب و ناسر و مەنسوور و حەیدەر بەجێماون.

جا لە وەهاب، نەجمەدین و بەهادین و لە ناسر، تەییب و ئەییوب و

لە مەنسوور، بورهان و عیرفان و عادیل بەجێماون.

وە نەتەوەی حەیدەر نەنووسراوە.

## بنەماڵەی سەییدەکانی سەرگەت

ئەم بنەماڵە لە دەمێ چەرخەوە وان لە دێی سەرگەتا و، پیاوی گەورە و ناودار و خاوەنپایەیان لە مێژووی ١٢٥٠ی کۆچیدا بریتی بووە لە شێخ عوسمان ناوێ کە دوو کوڕی بەڕێز و پایەبەرزی بووە بە ناوی شێخ عەبدولکەریم و شێخ عەلی کوڕانی شێخ عوسمانی کوڕی شێخ خالیدی دانیشتووی دێی سەرگەتی سەر بە ناحیەی خورماڵ.

ئەم بنەماڵە ئەڵێن: لە نەوەی سەییدێکی پیاوچاک و بەڕێز و لەخوداترسن، کە ناوی سەیید ئیبراهیم و بە «بابا نەوس» ناسراوە.

بابا نەوس لە مێژووی ٥٠٠ی کۆچیدا لە ژیاندا بووە و هاوچەرخی سەیید مستەفای «عریضی»ی ناسراو بە پیرشەهریاری مورشیدی هەورامی بووە. ئەم سەیید مستەفا خەلیفەی حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بووە و شێخی گەیلانی دەربارەی فەرموویەتی: «اخی مصطفی رجل صالح». وە مەشهوورە کە نەوەد و نۆ پیری پێ گەیاندووە و هەموو بوون بە خاوەن پایە و خاوەن هێزی دڵ بۆ رووناککردنەوەی دڵی موریدان.

وە بابانەوس برادەر و دۆستی قازی بەنێ و شێخ عەلی خان بووە.

قازی بەنێ لە دێی شیویقازیی لە ناحیەی قەرەداغدا نیشتەجێ بووە و شێخ عەلیخان لەو دێدا کە بە ناوی خۆیەوە بە «شیلەخان» ـ کە سووککراوی شێخ عەلی خان ـە. لە ناحیەی سووورداشی پارێزگای سلێمانیدا بووە.

لە ساڵانی حەفتاکانی کۆچیدا یەکێ لە برادەرانی وڵاتی خۆمان کە لە «ئەڵمانیا» بوو چەند نامە و چەند غەزەلێکی نێوان بابانەوس و قازی بەنێ و شێخ عەلی خانی بۆ ناردم کە بە شێوەی هەورامی ئەو رۆژە نووسراون و بۆ مێژووی ٤٧٥ی کۆچی دەگەڕێنەوە.

ئەم شیعرانە بەڵگەی ئەوەن کە بابانەوس لەو چەرخەدا ژیاوە، بەڵام باسی رشتەی نەسەبی تێدا نەبوو.

بە هەر حاڵ موسوڵمانان ئەمینن لە سەر نەسەبی خۆیان، تا بەڵگەیەکی بێ گومان بەرپەرچی داواکەیان نەداتەوە.

هەروەها لە مانگی «ذی القعدە»ی ساڵی ١٤٠٠ی کۆچیدا لە لایەنی شێخ خالیدی کوڕی شێخ عابیدی دانیشتووی دێی «کال»ی سەر بە ناحیەی مەریوانەوە ـ کە خۆی لە سەییدەکانی سەرگەتە ـ شەجەرەی نەسەبیانم بۆ هات و تەماشام کرد و مۆری گەلێ پیاوی گەورەی لە سەیدان و زانایان و پیاوچاکان پێوە بوو. لەوانە: شێخ عوسمانی سیراجەدین و شێخ نەجمەدین و مەولانا مەلا عەبدولقادری مودەڕیسی بیارە و سەیید موحسینی کوڕی شێخ عەلی‌یە کۆسەی دۆڵپەمووی، سەیید عەبدوسەمەدی بەرزنجی و گەلێ پیاوی دیکە ... کە ئەگەر تەماشای حاڵیان بکرێ ئەزانرێ ئەمانە بە بێ بەڵگە شەجەرەی وەها مۆر ناکەن.

وە سوورەتی شەجەرەکە لە پاش «بسم الله» و ستایش و سەلام لە حەزرەت و یارانی ئەمەی تێدا نووسراوە:

السید المحقق المدقق السالک الناسک العالم بالعلوم العقلية والنقلية: السيد عثمان بن السيد خالد، ابن السيد حيدر، ابن السيد محمد الحسيني، ابن السيد علی، ابن السيد احمد، ابن السيد أباويس، ابن السيد يحيی، ابن السيد امير شيخ، ابن السيد نبی، ابن السيد اباويس، ابن السيد ابراهيم، ابن السيد عيسی، ابن السيد يوسف، ابن السيد عبدالله الملقب ببابا غيب‌الله المدفون فی قرية «سەرگەت»، ابن السيد سليمان، ابن السيد بابا، ابن السيد محمود، ابن السيد صلاح‌الدين، ابن السيد مقصود، ابن السيد ابراهيم، ابن السيد سعيد، ابن السيد داود، ابن السيد محمود، ابن السيد محمد، ابن السيد داود، ابن السيد سرهنگ، ابن السيد سعد، ابن السيد محمد، ابن الام جعفرالصادق، ابن الامام محمدالباقر، ابن الامام علی زين‌العابدين، ابن الامام حسين، ابن الامام علی ابن ابی طالب ـ رض.

بۆ زانین! ئەم شێخ عوسمان ناوە کە لە سەرەتای شەجەرەکەوەیە باوکی شێخ عەبدولکەریم و شێخ عەلی سەرگەتە وەکوو لە پێشەوە نووسیمان.

وە ئەم دوو کوڕە بەختەوەرە شێخ عەلی و شێخ عەبدولکەریم، ڕۆیشتوون بۆ خزمەتی حەزرەتی شێخ عوسمانی سیراجەدینی تەوێڵە و چوونەتە تەریقەتی نەقشبەندیی‌یەوە و گەلێ سلووکیان کردووە و حەزرەتی شێخ عوسمان خۆی تەربیەتی کردوون تا بوون بە خەلیفەی شێخ عوسمان و پایەی ویلایەتیان بووە و

گەییشتوون بە پلەی ئیرشاد و گەلێ موریدیان بـووە و کەشـف و کەرامـەتیان بـووە و پیرۆزیی کردەوە و رەفتاریان لە هەموو لایەکەوە دیار بووە.

جا حەزرەتی شێخ عوسمان دوو کچی خۆی مـارە کـردووە لـەم دوو کـوڕی شـێخ عوسمانی سەرگەتییە.

خاتوون «لاڵێ»ی داوە بە شێخ عەبدولکەریم و دوو کچی لێ بـووە، ئامینــە و تووبـا. ئامینە شووی کردووە بە مەلا محەممەدی کوڕی مەلا مسـتەفای کـوڕی مـەلا جـەلالی خورماڵی. لەم ئامینە دوو کوڕی بووە: مەلا عەبدوڕەحمان و مـەلا عەبدولـلا. وە سـێ کچیشی بووە: خەدیجە و توحفە و رەعنا.

وە خاتوو تووبای کچی شێخ عەبدولکەریم شووی کردووە بە شێخ محێدینی کـوڕی شێخ عومەری زیائەدین، وا ئەزانم چەند کوڕ و کچی لێی بووە وەکوو: شێخ محەمەد و شێخ سدیق و شێخ خالید، کە ئەهلی دین و تەسەووف بوون.

بە تایبەتی شێخ محەمەد کە لە دێی «وشـکێن» بـوو لـە مـەریوانا زاتێکـی خـاوەن کەرامەت و بارەمەند بوو، وە لە ساڵی ١٣٣٥ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

وە شێخ عوسمان سیراجەدین خەدیجەی کچی خـۆی مارەبـڕی بـۆ شـێخ عـەلیی برای شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ عوسمانی سەرگەتی. وە لـەم ژنـە سـێ کـوڕ و کچێکی بووە: شێخ عارف و شێخ حەسەن و شـێخ حسـەین و ئـەسما. ئـەم خـاتوون ئەسمایە شووی کردووە بە مەلا عەبدەی کوڕی مەلا نەزیری تەوێڵە وەکوو باسیان دێ «ان شاء الله».

وە شێخ عارفی کوڕی شێخ عەلیی سەرگەتی گوێزایەوە بۆ دێی «کال» لە مـەریوانا و پاش چەند ساڵێک گوێزایەوە بۆ گونـدی «دۆلاش» لـە مەریوانـدا و چەنـد کـوڕی لـێ بەجێماوە: کاکە عەلی و کاکە حەمە و کاک ئەحمـەد و بابـا رەسـووڵ و بابـا تـاهیر و سەیفەدین و کاکە شێخ.

کاک عەلی پیاوێکی شارەزا و زانا بوو، لە مەدرەسـەی چـۆڕدا پێگەییشـتبوو، وە لـە خزمـەتی سـەیید محەمـەدی کـوڕی حـاجی سـەیید حەسـەنی چۆڕیـدا ئیجـازەی وەرگرتبوو. کوڕەکانی دیکە خوێندەوار بوون بەڵام پایەیەکی ئەوتۆیان نەبووە.

ئەم کوڕانە ـ وەکوو بیستوومە ـ لە کاکە عەلی، شێخ عەبدوول؛ وە لە کاکـە حەمـە؛ کچێک بە ناوی تووبا بووە. وە لە کاک ئەحمەد چوار کوڕ: سەعید و حەیدەر و عادیـل

و مستەفا بووە. وە لە بابا ڕەسووڵ دوو کوڕ: جەمالـەدین و عیـزەت بـووە. وە لـە بابـا تاهیر کوڕ و کچێ: ڕەشید و خەدیجە. وە لە سەیفەدین چوار کوڕ: خالیـد و لـەتیف و محەمەد سەعید و محەمەد و کچێک بە ناوی ناهیە بەجێ‌ماوە. وە دەربـارەی نـەوەی کاکە شێخ شتێک نازانم.

وە شێخ حەسەنی کوڕی شێخ عەلی شەش کوڕی بووە: تاها، ڕەزا، عابیـد، ڕەشـاد، نەجیب، قادر. وە سێ کچ: زوبەیدە و ئافتاو و ئەمنە بووە. زوبەیدە شووی کـردووە بـە شێخ عومەری کوڕی شێخ محەمەدی قەرەداغی مودەڕیسی مزگەوتی محەمـەد پاشـا. شەش کوڕی لێی بووە:

محەمـەد، ڕەئـووف، نـووری، ئـەنوەر، ئەحمـەد، زاهیـد. شـێخ محەمـەد خـەتیبی مزگەوتی گەورەی شاری سلێمانی‌یە.

وە لە کوڕەکانی شێخ حەسەن لە شێخ تاها دوو کوڕ: جەعفەر و نـاجی و لـە شـێخ ڕەزا دوو کوڕ: عەلی و خالید، وە لە شێخ ڕەشاد کچێ شەمسە ناو، وە لە شێخ نـەجیب سێ کوڕ: محەمەد و تاجەدین و نەجمەدین بووە.

وە لە شێخ عابید سێ کوڕ: خالید و هادی و موعتەسەم. وە سێ کچ: مەحتوومـە و مەعسوومە و جەمیدە بەجێ‌ماون.

وە لـە شـێخ حسـەینی کـوڕی شـێخ عـەلیی سـەرگەتی پێـنج کـوڕ و دوو کـچ بـەجێ‌مـاون: ئیسـماعیل، نەجمـەدین، ئیـبراهیم، محەمـەد، ئەحمـەد، وە فاتیمـە و خورشیدە.

وە لە ئیسماعیل کە مەلایەکی ناوەنجی و پیاوێکی خـاوەن خـوو و ڕەوشـتی بـەرز بووە، شێخ سەدیق بەجێ‌ماوە کە زانایە و ئیمامە لە هەڵەبجەدا و، عوسمان و تـەوفیق. وە لە نەجمەدین، حەسیب و حەسەن و کچێ بـە نـاوی مەهـڕوو بـەجێ‌مـاوە. وە لـە ئیبراهیم: مـەعرووف و ئـەنوەر، وە لـە محەمـەد، ڕەئـووف و کـەریم وە لـە ئەحمـەد، مەحموود و عەبدوڵڵا بەجێ‌ماوە.

وە شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ عوسمانی سەرگەتی لە پێشدا ژنێ تری هێناوە لەو ژنە کوڕێکی بووە ناوی محێدینە. ئەم شێخ محێدینە چوار کوڕی بووە: ئەحمـەد و عەبدوڕەحمان و سادق و محەمەد.

جا سەیید ئەحمەد سێ کوڕی بووە: باوەشێخ و عوسمان و عەبدولکەریم.

وە عەبدوڕەحمانی کوڕی محێدین کوڕێکی بووە ناوی کەمالەدینە.

وە سادقی کوڕی محێدین دوو کوڕی بووە: سابیق و حەمە ساڵح.

وە محەمەدی کوڕی محێدین کوڕێکی بووە ناوی ساحیبە. وە باوەشێخ دوو کوڕی هەیە: راغیب و زاهید.

وە عوسمانی کوڕی ئەحمەدی شێخ محێدین دوو کوڕی هەیە: غەفوور و جەمالەدین.

وە عەبدولکەریمی کوڕی ئەحمەدی شێخ محێدین کچێکی بووە ناوی حەلیمە بووە.

وە کەمالی کوڕی عەبدوڕەحمانی شێخ محێدین دوو کوڕی بووە: خالید و سەعدەدین.

وە سابیقی کوڕی سادقی شێخ محێدین دوو کوڕی بووە: سەعید و عەبدوللا.

وە حەمەساڵحی کوڕی سادقی ... کوڕێکی بووە ناوی محەمەد غەریبە.

وە لە دێی سەرگەتا دوو کۆمەڵی دیکە بێجگە لەمانە هەیە: یەکەمیان نەتەوەی شێخ موئمینە کە لە سەییدەکانی بەرزنجەیە و لە نەتەوەی شێخ محەمەدی تەڕاتەوەنی کوڕی شێخ عەلی‌یە کۆسەی دۆڵپەمووە. وە من خۆم شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ موئمینم دیوە لە شەرعدا زانا بوو.

کۆمەڵی دووهەم: نەتەوەی مەلا جەلالی خورماڵن، ئەمانەیش لە سەر بەیاناتی خۆیان لە ساداتن و لە نەتەوەی ئیمام مووسای کازمن.

## بنەماڵەی شێخ عوسمانی تەوێڵە

ئەم بنەماڵە ئەگەرچی لە بەرگی دووەمی یادی مەرداندا باسیان کراوە و هەروا یەکە یەکە پیاوە گەورە پیاوەکانیشیان لە کتێبی «علماءنا فی خدمة العلم والدین»دا نووسراون ... ویستم ئەم کتێبەیش بە پیرۆزیی باسی ئەوان بگات.

ئەم بنەماڵە، وەکوو دەرکەوت، لە سەییدەکانی نەعێم و لە «جبل حمرین» بوون، بەڵام چونکی حەزرەتی شێخ عوسمان خودا کردی بە سەرچاوەی پیرۆزیی و مورشیدی تەواو بۆ هاوچەرخی خۆی بە راستی ئەو زاتە بە بنەوان و دامەزرێنەری ئەم خانەدانە گەورە دەزانرێ کە خزمەتێکی گەورەیان بۆ ئایینی ئیسلام بووە.

شێخ عوسمان کوڕی خالید ئاغای، کوڕی عەبدوڵلا ئاغای، کوڕی سەیید محەمەدی، کوڕی سەیید دەرویشی، کوڕی سەیید موشەڕەفی، کوڕی سەیید جومعەی، کوڕی سەیید زاهیرە.

وەکوو زانراوە ئەم سەیید زاهیرە لە سەییدەکانی نەعێم بووە و لە زنجیرە کێوی «جبل حمرین»دا دانیشتووە و بە خواستی خودا محەمەد دەروێش لە جەبەل حەمرینەوە چووە بۆ هەورامان و لە دێی تەوێڵەدا دانیشتووە و نەتەوەی لێ کەوتووەتەوە و نەتەوەکانی لە تەوێڵەدا بە ئاغا ناوبراون. یانی محەمەدی کوڕی سەیید دەروێش و عەبدوڵلا و خالیدی باوکی شێخ عوسمان بە لەقەبی ئاغا بەناوبانگ بوون و موختاری تەوێڵە بوون.

شێخ عوسمانی کوڕی خالید ئاغا لە مێژووی ١١٩٥ی کۆچیدا لە تەوێڵە لە دایک بووە. دایکی ناوی «حولەیمە»ی کچی فەقێ ئەبوبەکر بووە. ئەم فەقێ ئەبوبەکرە لە نەتەوەی فەقێ ئەحمەدە گردە بووە کە لە تەوێڵەدا بە فەقێ ئەحمەدی غەزائی ناوبراوە و لە کتێبی «نورالانوار»ی سەیید عەبدوسەمەدی تووداریدا بە گێڕانەوە لە شێخەکانەوە ئەڵێ: ئەم فەقێ ئەحمەدە بە راستی لە نەتەوەی شێخ نیعمەتوڵلای

وەلیی کوڕی شێخ زەکەریای کاکۆ زەکەریایی و لە نەتەوەی شێخ ئەبولحەسەنی شازلی‌یە.

وە پاش روونکردنەوەی ئەم دوو رشتە لە باوک ودایکەوە دەرکەوت کە رشتەی نەسەبی شێخ عوسمانی تەوێڵە لە باوکەوە لە نەوەی ئیمام حسەینە و لە دایکەوە لە نەوەی ئیمام حەسەنە و تان و پۆ سەییدن.

هەر چەند پیاوانی ئەم بنەماڵە لە کۆنەوە و ئێستەیش داوای سەییدایەتی ناکەن بەڵام پیاوە گەورە خاوەن زانیاری‌یەکان وەکوو محەمەد بەهائەدین و عومەر زیائەدین بە دستنووسی خۆیان نووسیویانە و ئەم رشتە زێڕەیان دەربڕیوە.

شێخ عوسمان هەر لە منداڵی‌یەوە حەزی لە خوێندن و بەندەیی کردنی خودا کردووە و زۆر منداڵ بووە کە قورئانی پیرۆزی خوێندووە و خەتمی کردووە و لە خوێندنگاکانی: تەوێڵە و بیارە و خەرپانی و خورماڵدا نەحو و سەرف و شەرعی خوێندووە و لە ئەنجامدا بە هیوای ئەوە کە بگات بە پیرۆزیی گیانی پاکان بە فەقێتی‌یەوە چووە بۆ شاری بەغدا و لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا بە ناوی داخوازی خوێندنەوە دامەزراوە و دەرزی خوێندووە و خەریکی زیکر و فیکر و حەلقەیش بووە و بەو شێوە دەمێنێتەوە هەتا لە ساڵی ١٢٢٦ی کۆچیدا مەولانا خالیدی کوردیی نەقشبەندیی خەلیفەی شێخ عەبدوڵلای دەهلەویی لە هیندوستانەوە ئەگەڕێتەوە بۆ عێراق و بە فەرمانی مورشیدەکەی دێت بۆ مزگەوتی شێخ عەبدولقادر لە بەغداد. جا شێخ عوسمان ئەچێتە خزمەتی و تەمەسوکی پێ ئەکات و ئەبێ بە موریدی و لە سەر یاسای ئەو رێبازە خەریکی زیکر و فیکر و تاعەت ئەبێ.

ئیتر ئەبێ بە موریدی دڵسۆزی مەولانا و لێی جیا نابێتەوە هەتا لە ساڵی ١٢٣١ی کۆچیدا ئیجازەی تەریقەت وەرئەگرێ و ئەبێ بە خەلیفەی حەزرەتی مەولانا خالید. وە یەکەم خەلیفەی مەولانا خالید بووە و لەو مێژووەوە هەتا ساڵی ١٢٣٨ی کۆچی کە حەزرەتی مەولانا لە بەغداوە چووە بۆ شام شێخ عوسمان هەر لە خزمەتی مەولانادا بووە، بەڵام پاش ئەوە بە فەرمانی ئەو گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و لە شاری سلێمانیدا لە خانەقای مەولانا خالیدا و لە دێی بیارەدا و لە تەوێڵەدا خەریکی ئیرشاد بووە.

وە ماوەی سێ چوار ساڵ بە تەواوی لە سلێمانیدا خەریکی ئیرشاد کردن بووە، بەڵام پاش ئەوە بە جارێ وازی لە شار هێناوە و چووە بۆ بیارە و بە ئیرشاد کردنەوە

خەریک بووە و خـودا بـە جـۆرێ یارمـەتی داوە و فـەیز و رووناکی بـە نـاو خەڵـکدا بڵاوبووەتەوە زانایـان و پیاوچاکـان لـە هـەموو لایەکـەوە لێـی گردئەبنـەوە و ئەچنـە تەریقەتەکەی و پێ‌ئەگەن.

بەم جۆرە هەتا مێژووی ١٢٧٠ی کۆچی، ئیتر بە تەواوی بیـارەیش بـەجێ دێڵـێ و ئەچێ بۆ دێی تەوێڵە و لەوێ دادەنیشێ و ئیرشاد ئەکا هەتا ساڵی ١٢٨٣ی کۆچی، لەو ساڵەدا کۆچی دوایی ئەکات و لە باخچەی زەوی خۆیدا بە خاک ئەسپێررێ. بەڵام ئەو شوێنە دوای کۆچی دوایی ئەو لە سەردەمی بەهادینی کوڕیدا کراوە بە خانەقا و جێگە بۆ ئیرشاد کردنی موسوڵمانان و خزمەتی ئایینی ئیسلام.

وە ئەم زاتە لە ماوەی ئیرشادیدا، واتە لە مێژووی ١٢٣١ی کـۆچی‌یـەوە تـا کـۆچی دوایی کردووە، یەعنی ٥٣ ساڵ گەلێ کەسی پێگەیاندووە و نـاوی هەنـدێ لـەو زاتانـە ئەنووسرێن «ان شاء الله».

## کوڕانی شێخ عوسمانی سیراجەدین

وەکوو زانیومانە ئەم زاتە بەڕێزە شەش کوڕی هەبووە:

عەبدولحەکیم و مەعرووف. عەبدولحەکیم بە منداڵی مردووە.

مەعرووفیش گەورە بووە و ژنی هێناوە، بەڵام نەچووەتە تەریقەتـەوە. وە لـە ژیـانی باوکیدا کۆچی دوایی کردووە و کوڕێکی بووە ناوی عەبدولقادر بووە ئەمیش نەچووەتـە تەریقەتەوە.

بەڵام چوار کوڕەکەی دیکەی کە ناویان: محەمەدبەهادین و عەبدوڕەحمان‌ئەبولوەفا و عومەر زیائەدین و ئەحمەدشەمسەدینە، لە خزمـەتی باوکیانـدا سـلووکیان کـردووە. وەکوو لەمەولا باسیان دەکەین.

## سەفەرەکانی شێخ عوسمان سیراجەدین

ئەم زاتە لە سەردەمی ئیرشاد کردنیدا بۆ کۆی‌سەنجەق و کەرکووک و بەغدا چووە. وە لەمەلاوە سەفەری جوانرۆ و شاری سنەی کردووە. وە هـەموو ئـەم سـەفەرانەی بـۆ جێ‌بـەجـێ‌کـردنی فـەرمانی دیـن و ئیرشـادکردن و خزمـەتی موسوڵـمانان بـووە و موسوڵمانان سوودیان لە دیدار و چاوپێکەوتنی وەرگرتووە.

**ئەدەبیاتی سیراجەدین**

ئەم زاتە ئەدیب بووە و شیعری بە گۆرانی و فارسی هەیە. گەلێ نامەی جوانیشی بۆ لای مورید و مەنسووبەکانی نووسیوە، هەروا بۆ گەلێ پیاوی گەورەی دینیی و دنیایی، بۆ بەجێهێنانی ئیش و کاری موسوڵمانان یا بۆ ڕێنومایی بۆ ڕاستی و بیر و باوەڕی پاک و کردەوەی چاک.

وە لێرەدا بۆ نموونە هەندێک لە خەلیفەکانی دەنووسم:

١ـ حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی
٢ـ سەیید عەبدوڕەحیمی مەولەوی
٣ـ سەیید محەمەدئەمینی کەلجینی
٤ـ شێخ عەلی تەوێڵەیی
٥ـ شێخ عەبدولکەریمی سەرگەتی
٦ـ شێخ ئیسماعیلی هەجیجی
٧ـ سەیید حامیدی هەورامی
٨ـ مەلا محەمەدئەمینی نۆدشەیی
٩ـ مەلا سەدرەدینی ڕووداری
١٠ـ مەلا محەمەدی هانەدنی
١١ـ مەلا مەحموودی نۆدشەیی
١٢ـ مەلا حامیدی کاتبی بێسارانی
١٣ـ مەلا قەسیمی پایگەلانی
١٤ـ شێخ محەمەد سادقی قازیبەنێ
١٥ـ سەیید قاسمی نگلی
١٦ـ مەلا عەبدوڵلای مەریوانی چۆڕیی
١٧ـ شێخ شوکروڵلای سنەیی
١٨ـ مەلا مەحموودی سنەیی
١٩ـ مەلا ئیبراهیمی جوانڕۆیی
٢٠ـ مەلا حەسەنی جوانڕۆیی
٢١ـ مەلا فەتحوڵلای جوانڕۆیی

٢٢ـ سەیید قانوونی خانەگایی
٢٣ـ سەیید عەلی خانەگایی
٢٤ـ سەیید عەبدولحەکیمی خانەگایی
٢٥ـ سەیید بایەزیدی خانەگایی
٢٦ـ سەیید حسەینی خانەگایی
٢٧ـ سەیید عەبدوڕەحمانی خانەگایی
٢٨ـ سەیید شاکەرەمی تایگۆزیی
٢٩ـ مەلا سەدرەدینی ئەوێهەنگی
٣٠ـ مەلا عەبدولکەریمی ئەوێهەنگی
٣١ـ مەلا مووسای پایگەلانی
٣٢ـ مەلا مستەفای کەلاتی
٣٣ـ شێخ حسەینی باقلاوایی
٣٤ـ شێخ محەمەد سادقی وەزیری
٣٥ـ سەیید عەبدولقادری ناسراو بە خەلیفە قادر
٣٦ـ شێخ محەمەد باقری سنەیی
٣٧ـ شێخ محەمەدی سمێرانی
٣٨ـ شێخ مستەفای سەقزیی
٣٩ـ سەیید عەبدولکەریمی دەگاشێخانی
٤٠ـ شێخ سلەیمانی چنارەیی
٤١ـ شێخ محەمەدی قەرەداغی
٤٢ـ شێخ مەلا نەبیی ماویلی
٤٣ـ مەلا مەحموودی ڕەواندزی
٤٤ـ مەلا عەلیی بێتواتی
٤٥ـ شێخ مەلا ئەبوبەکری هەولێری
٤٦ـ شێخ فەتاحی بالیکەدەریی
٤٧ـ مەلا یوسفی یالاوەیی
٤٨ـ مەلا محەمەدی هەوشاری

٤٩ـ شێخ محەمەدی شێخ وەیسی بەرزنجەیی هەنگەژاڵی
٥٠ـ شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی محەمەدی مەولان بەگ
٥١ـ شێخ محەمەدە کوردە کە لە پشتکێودا دانیشتووە
٥٢ـ سەیید شەهابەدینی تاڵشی
٥٣ـ مەلا تاهای باڵەکی
٥٤ـ مەلا محەمەدی سعردی
٥٥ـ شێخ عەبدولکەریمی قەرەداغی
٥٦ـ شێخ عەبدوڵلای کوڕی عەبدوللەتیفی قەرەداغیی «قوتب»
٥٧ـ شێخ محەمەد ئەمینی زەیدۆمەریی
٥٨ـ مەلا عوسمانی حاجی ئیسماعیلی کانیکەوەیی
٥٩ـ مەلا مستەفای شەعریی
٦٠ـ مەلا عەبدولکەریمی هەڵەبجەیی
٦١ـ شێخ ئیسماعیلی سۆڵەیی
٦٢ـ شێخ عەبدوڕەحمانی قەرەداغی «ابن الخیاط»
٦٣ـ مەلا وەیسی
٦٤ـ مەلا محەمەدی ماویلی
٦٥ـ شێخ عەلیی بالیسانی
٦٦ـ مەلا محەمەدی شێخ «چولی»
٦٧ـ مەلا محەمەدی بانەیی
٦٨ـ یەعقووببەگی شەرەفبەیانی
٦٩ـ محەمەدی مەولان بەگ
٧٠ـ سەیید حسەینی ئەستەمووڵی
٧١ـ عەلی ئەفەندیی حاکمزادەی ئەنتاکییە
٧٢ـ مەلا حومەممەدی قوڕەیشی دیاربەکری
٧٣ـ مەلا عوسمانی بالخی
٧٤ـ شێخ حەسەنی کوڕی عەبدوڕەحمان بەگی خەزنەدار
٧٥ـ شێخ محەمەدسالحی کوڕی ئیسماعیل بەگی خەزنەدار

٧٦ـ شێخ محەمەدساڵحی کوڕی شێخ حەمەعەلیی نەوتی
٧٧ـ مەلا عومەری جەلەمۆردیی
٧٨ـ شێخ حەسەنی کەرکووکی
٧٩ـ مەلا ئیبراهیمی کۆیی
٨٠ـ مەلا محەمەد ئەمینی کۆیی
٨١ـ مەلا مستەفای کۆیی
٨٢ـ مەلا مستەفای بلْباسی کە لە کێوی «قەندیل»دا[١] بووە.
٨٣ـ مەلا ئەحمەدی شاوەریی

وە گەلێ کەسی دیکەیش کە نەگەیشتوونەتە پایەی خەلافەت و بەس بە شێوەی مەنسووبێکی خاوەن روشد و دڵڕووناک ماونەتەوە.

ئەو زاتانەیش کە خەلیفە بوون هەندێکیان سەربەخۆ ئیرشادیان کردووە، وەکوو: شێخ نەبی ماویلی و شێخ ئەبوبەکری هەولێریی و هەندێکشیان لە ژێر چاودێری رۆحیی مورشیددا ئیرشاد و تەنویریان کردووە.

وە سەراسەری تەریقەتەکەی حەزرەتی شێخ عوسمان لە سەر پەیڕەویی شەریعەت بووە و بە هیچ جۆرێ نەبیسراوە کەسێ لە مورید و خەلیفەکانی کارێکی بێشەرعیی و ناڕەوایان کردبێت و لێیان وەرگیرابێ.

بە کورتی تەریقەتەکەی پەیڕەویی پێغەمەر بووە بە گوێرەی تەوانا.

## نەوەکانی حەزرەتی شێخ عوسمان

لە سەرەتاوە باسمان کرد کە شێخ عوسمان شەش کوڕی بووە، یەکێکیان بە منداڵی مردووە و یەکێکیشیان نەچووەتە تەریقەتەوە. بەڵام چواریان سلووکیان کردووە و بوون بە پیاوی خودا.

## یەکەم محەمەدبەهائەدین

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٥٢ی کۆچیدا لە هەشتی مانگی «ربیع الثانی»دا لە تەوێڵە لە دایک بووە.

وە پاش خۆناسینەوە و هۆش‌کردنەوە دەستی کـردووە بـە قورئـانی پـیرۆز لـە لای مامۆستای لەخوداترس مەلا مەحموودی دشەیی و قورئانی پـیرۆزی تـەواو کـردووە و پاش ئەوە کتێبە وردەکانی خوێندووە، جا لە خزمەتی مـەلا حامیـدی کـاتبی شـێخدا دەستی کردووە بە خوێنـدنی نـەحو و سـەرف و لـە خزمـەتی باوکیشـیدا تەریقـەتی وەرگرتووە و دەستی کردووە بە سلووک و سلووکێکی پیاوانەی کردووە. بە یارمـەتیی خودا بووە بە یەکێ لە مەردە گەورەکانی جیهـانی ئیسـلام و ئیجـازەی ئیرشـادی لـە باوکی وەرگرتووە و بووە بە جێگری ئەو شوێنە لەگەڵ شێخ عەبـدوڕەحمانی برایـدا و، دەستی کردووە بە ئیرشاد کردنی موسوڵمانان.

جا شێخ محەمەدبەهادین پاش ئەم ئیجازە نامە بووە بە خاوەنی ئـەمر و نـەهی لـە ئیش و کاری تەربییەتی موریدەکانیدا.

وە لە پاش کۆچی دوایی حەزرەتی شێخ عوسمانی سـیراجەدین ئـەم زاتـە لەگـەڵ شێخ عەبدوڕەحمانی برایدا ناوبران بۆ ئیرشاد و جێگەداریی باوکیان بەیەکـەوە، بـەڵام شێخ عەبدوڕەحمان پاش چەند مانگ لە مـردنی بـاوکی تەوێڵـەی بـەجێ‌هێشـتووە و چووە بۆ شاری بەغدا تا لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

وە شێخ محەمەدبەهادین بە تـەنیا لـە تەوێڵـەدا ماوەتـەوە و ئیرشـادی کـردووە و هەموو مورید و مەنسووب و خەلیفەکانی باوکی ملکـەچی بـوون و ئەوەنـدە کۆمـەڵ و قەرەباڵغی مەنسووبەکان لە لای پەیدا دەبێ کە باس ناکرێ!

لە پیاوی بـاوەڕپێکراوم بیسـتووە فەرموویـەتی: ڕێکـەوتووە لـە شـەوێکدا ئەڵـقەی خەتمە ئەوەندە زۆر بووە حەفتا خەلیفە هەستاون بۆ «توجهات» و بەجێ‌هێنانی ئـادابی تەریقەت.

وە گەلێ لە زانایانی کورد و عەرەب و تورک لە خانەقادا لە خزمەتیدا کۆ بوونەتەوە. بە تایبەتی حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی و سەیید عەبدوڕەحیمی مەولەوی و مـەلا حامیدی کاتبی بە زۆری لە خزمەتیدا بوون.

وە لە پاش کۆچی دوایی باوکی ئەو باخچەی مولکی خۆیانە کـە گـۆڕی حـەزرەتی شێخ عوسمانی تێدا بووە کردوویەتی بە خانەقا و چەند ژووری تێدا دروست کـردووە و گۆڕی باوکی دەکەوێتە ناو یەکێ لەو ژوورانەوە و پاش کۆچی دوایی بەهادین ئـەویش هەر لەوێدا بە خاک ئەسپێرڕێت.

شێخ محەمـەدبـەهادین لـە ساڵـی ١٢٩٠ی کۆچیـدا چـووە بـۆ حـەج و زیـارەتی پێغەمەری کردووە و لەم سەفەرەدا حاجی مـەلا ئەحمـەدی نۆدشـە و چەنـد کەسـی دیکەی لەگەڵ خۆیدا بردووە.

وە پاش بە جێهێنانی ئیش و کاری حەج و زیارەتی پێغەمەر ـ د ـ چووە بۆ میسر و زیارەتی ئەزهەری پیرۆزی کردووە و لە میسرەوە هاتووەتـەوە بـۆ شـام و لـە شـامەوە هاتووەتەوە بۆ سلێمانی بۆ جێگەی خۆی.

ئەم سەفەرە نۆ مانگی خایاندووە. مەولەوی لـە کـاتی پێشـوازییدا ئـەم شـیعرانەی گوتوە:

ئایینـــەی کـــامڵ! ئازیزەکـــەی فـــەرد!
فیـــدای ئامـــات بـــۆ، ســـەفاییت ئـــاوەرد
خەیلێن گەرد پات نـە دیـدەم دوور بی
یانـەی چـەم وێـران تـەمام خـاپوور بی
خـــاس بی تەشـــریفت بـــاز ئـــاوەردەوە
گـــەرد پـــات وەتـــەن ئـــاوا کـــەردەوە
ســـاقی! ئینـــە بـــەزم وەســـڵ یارانـــەن
چەرخیچ هەر ئەو چەرخ هەردەجارانەن
دەورێ دەر وە نـــــەرم وە پیاڵـــــەوە
ژەنـــگ دڵ وە زاخ مـــــەی بماڵـــەوە
جامێمان جە دەس تۆ هـەم سـەندە بـۆ
فرسـەتەن نەسـیو نـەک نەمەنـدە بـۆ

مەبەستی مەولەوی لە وشەی «کامڵ» عوسمان سیراجەدینە و محەمەدبەهادینی بە ئاوێنەی باوکی دانـاوە. وە مەبەسـتی لـە «یانـەی چـەم» حـوجرەی کـەناری چـەمی تەوێڵەیە لە خانەقادا، یا هەر مەبەستی کاسەی چاوی خۆیەتی.

شێخ محەمەدبەهادین نووسەر و ئەدیب بووە و گـەلێ لـە شـیعرەکانی لـە کتـێبی «یادی مەردان»دا نووسراون و پیاوێکی سالار و خاوەن پایە بووە و لە گەلێ کار و بـاری

دنیادا خاوەن بەخت و کامەران بووە، بەڵام بە داخەوە گیرۆدەی «سەرئێشە» بووە و لەو رۆژەدا گەلێ خەریکی دەرمان‌کردنی بووە بەڵام بێ سوود بووە.

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٩٨ی کۆچیدا لە دێی تەوێڵە کۆچی دوایی کردووە و لە خزمەتی باوکیدا بە خاک سپێرراوە و پێنج کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ عەلی حیسامەدین و شێخ سادق و شێخ مەزهەر و شێخ جەعفەر و شێخ محەمەدی ناسراو بە کاکە شێخ. ئەم کوڕانە هەموو نەتەوەیان لێ کەوتووەتەوە.

## حاجی شێخ عەبدوڕەحمانی ئەبولوەفا کوڕی شێخ عوسمان

ئەم زاتە لە وەرزی بەهارا لە پێنجی مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٢٥٣ی کۆچیدا لە دایک بووە. دایکی ئەم کوڕە برازای حەزرەتی مەولانا خالید بووە.

ئەم کوڕە هەڵکەوتوو و زرنگ بووە، پاش هۆش‌کردنەوە و خۆناسینەوە لە خانەدانی خۆیاندا خوێندوویەتی و لە خزمەتی مەلا مەحموودی دشەییدا قورئانی خوێندووە و لە لای مامۆستا مەلا حامیدی کاتب نەحو و سەرفی خوێندووە. هەروەها لە خزمەتی حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشە و سەیید عەبدوڕەحیمی مەولەویدا خوێندوویەتی و بووە بە زانایەکی پێگەییشتوو و گەلێ حاشیەی لە سەر عەقیدەی کوردی مەولەوی هەیە.

وە لە خزمەتی باوکیدا سلووکی کردووە تا بووە بە خەلیفە و ئیجازەی ئیرشادی پێداوە و لە ئەنجامدا ـ وەک پێشتر گوترا ـ لەگەڵ شێخ محەمەدبەهادینی براگەورەیدا بوون بە وەلیعەهدی باوکیان.

بەڵام وەک نووسیمان لەبەر ئەدەب لە کاکەی بڕاوە و لە تەوێڵەوە چووە بۆ بەغدا و لە مزگەوتی حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا دانیشتووە و خەریکی ئیرشاد بووە و لە راستیدا خزمەتێکی باشی دین و ئیرشادێکی چاکی کردووە و زۆر بەڕێز و خاوەن پایە بووە و گەلێ لە زانایان تەمەسوکیان پێ کردووە.

وە لە پاش نزیکەی ساڵێک چووە بو زیارەتی ماڵی خودا و زیارەتی فەخری عالەم و پاش ئەو سەفەرە کە هاتووەتەوە بۆ بەغدا ماوەیێ تەندروستی باش بووە، پاش ئەوە نەخۆش کەوتووە و بە داخەوە بە گەنجیی کۆچی دوایی کردووە. وە مردنەکەی رێکەوتی ساڵی ١٢٨٥ی کۆچی بوو، واتە نزیکەی ٣٠ ساڵ پاش کۆچی دوایی باوکی. وە لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا بە خاک سپێرراوە.

حاجی شێخ عەبدوڕەحمان نووسەر و ئەدیب بووە و دیوانێکی شیعری نایابی هەیە، بەشی زۆری دیوانەکەی لە «یادی مەردان» بەرگی دوەمدا چاپ کراوە.

ئەم زاتە کوڕێکی لێ بەجێماوە ناوی شێخ تاجەدین بووە و پیاوێکی چاک و لەخوداترس و وەلی بووە. وە ئەم تاجەدینەیش تاقەکوڕێکی لێ بەجێماوە لە خوشکی شێخ مستەفای هەولێری ناوی «جمال الدين».

## شێخ عومەر زیائەدین

کوڕی سێهەم لە ٤ کوڕەکەی شێخ عوسمان شێخ عومەر زیائەدین بووە.

ئەم زاتە لە پاش خۆناسینەوە دەستی کردووە بە خوێندن و قورئانی پیرۆزی لە خزمەتی مامۆستا مەلا مەحموودی دشەییدا تەواو کردووە، دوای ئەوە کتێبە وردەکانی خوێندووە و دەستی کردووە بە خوێندنی نەحو و سەرف و لە هەمان کاتدا لە خزمەتی باوکیدا تەمەسوکی کردووە و تەریقەتی وەرگرتووە و باوکی کار و باری سلووکی ئەوی داوەتە دەست شێخ محەمەدبەهادینی براگەورەیی و ئەویش تەربییەتی کردووە هەتا بە تەواوی پێگەییشتووە و ئیجازەی خەلافەتی بۆ نووسیوە و تەسلیمی کردووە و من خۆم ئەو ئیجازەنامەمە خوێندووەتەوە.

ئەم زاتە لەگەڵ ئەوەدا کە لە تەریقەتدا ئیجازەی هەبووە ... هەتا شێخ محەمەدبەهادین لە ژیاندا بووە بە یاسای موریدیی لە خزمەتیدا ڕەفتاری کردووە و پاش ئەوە بە دوو ساڵ واتە لە ساڵی ١٣٠١دا لە تەوێڵەوە گواستوویەتی‌یەوە بۆ «بیارە» و خانووی کردووەتەوە و خەریکی ئیرشادکردن بووە. دوای ئەوەی کە لە بیارەدا دانیشتووە و لە نزیکی مزگەوتی دێی بیارەدا خەریکی ئیرشاد و خزمەتی دینی ئیسلام و تەمێی موریدەکان بووە.

وە لە مێژووی ١٣٠١دا چووە بۆ گەرمیان و خانەقای قزڕەباتی کردووەتەوە و لە مێژووی ١٣٠٣دا خانەقای خانەقینی دروست کردووە و لە ساڵی ١٣٠٦دا خانەقای شاری کفریی کردووەتەوە و لە ساڵی ١٣٠٧یشا خانەقای بیارەی کردووەتەوە و قەرارگای ئیرشاد و تەربییەی موریدەکان هاتووەتەوە خانەقا و مزگەوتی بیارەی بەجێهێشتووە. وە لە ساڵی ١٣٠٣دا ناردوویەتی بە شوێن مەولانا عەبدولقادری مودەڕیسدا کە لە لای «امين السادات» بووە لە دێی «کوچک چەرموو» لە دەوروبەری

شاری سنەدا و هێناویەتی کردوویەتی بە مودەڕیس لـە بیـارەدا و ژمارەیـەکی زۆر تـا زیاتر لە سەد قوتابیی زانیاری هاتوون بۆ بیارە و بـە بـوون و نـەبوونی سـاچاندوویانە و ژیاون و دەرزیان خوێندووە و بوون بە زانا و بە مودەڕیسی و ئیمامـەتی بلاوبوونەتـەوە بە کوردستاندا و خزمەتی ئایینی ئیسلامیان کردووە.

وە گەلێ زانای گەورە لەو خوێندنگا دەرچوون وەکوو: مەلا عەبـدولقادری سـۆفی و مەلا عەبدوڕەحیمی چروستانی و مەلا عەبدوڵلای شێخ قادری ئەباعویدەیی و شێخ بابا رەسووڵی بێدەنی و شێخ مستەفای مـوفتیی هەڵـەبجەیی و شـێخ قـاسمی قەیسـیی بەغدادی و غەیری ئەمانەیش ... لە زانایانی ئەو چەرخە لەگەڵ جیاوازیی پلە و پایەی خوێندنیاندا کە مەگەر دەفتەرێکی تایبەتی‌یان بۆ دابنرێت.

بە کورتی خوێندنگای بیارە دیمەنێکی بچکۆلەی «جامع الازهـر»ی میسـر بـووە لـە کوردستاندا و شانی داوە لە شانی ئـەو لـە بلاوکردنـەوەی زانسـتی و لەخوداترسـیدا و بنکەیەکی تێکدەر و رووناککەرەوەی وڵات بووە و ئێستەیش هەر کەس لـەو وڵاتـەدا زانا بێ و خزمەتی دین بکا بێگومان پەیوەندیی ـ نزیک یـا دووری ـ بـەو خوێنـدنگاوە هەیە.

ئەم زاتە لە ماوەی ئیرشادی خۆیدا کە ١٨ ساڵ بووە، گـەلێ خەلیفـەی بـە توانـا و گەلێ مەنسووبی پاکی پێگەیاندووە. لە خەلیفەکاندا وەکوو:

دوو کوڕەکەی خۆی:

١ـ شێخ عەلادین

٢ـ شێخ نەجمەدین

٣ـ شێخ مارفی نەرگسەجاڕی

٤ـ سەیید فەتحوڵلای دۆزەخدەرەیی

٥ـ مەلا عەبدوڕەحیمی هەوشاری

٦ـ مەلا محەمەدی سونەتەیی

٧ـ مەلا عەلیی مەریوانی

٨ـ شێخ تاجەدینی برازای خۆی

٩ـ شێخ سەعیدی نەقشبەندیی بەغدادیی فەزلی

١٠ـ شێخ ئەحمەدی دێرەیی

١١ـ سەیید عەلیی سەفاخانەیی
١٢ـ شێخ سەلیمی سنەیی مەردۆخی
١٣ـ مەلا عەبدوڕەحمانی بەرگردکەیی رانیەیی
١٤ـ مەلا محەمەدی کەستانەیی
١٥ـ مەلا عەبدولقادری مودەڕیس، کە خەلیفەیش و زاوایشی بووە
١٦ـ مەلا عەبدوللای شێخ قادری عەبابەیلێیی
١٧ـ شێخ قادری عەبابەیلێیی و ... چەندینی دیکەیش کە ئێستە نانووسرێن.

شێخ عومەرزیائەدین لە مانگی شەوالی ساڵی ١٣١٨ی کۆچیدا لە بیارە کۆچی دوایی کردووە.

شێخ عومەر خەتخۆش و نووسەر و ئەدیب بووە و هۆنراوەی بە زمانەکانی: عەرەبی و فارسی و کوردی بە ٢ شێوەی گۆرانی و سۆرانی هەیە[١].

شێخ عومەر نۆ کوڕی بووە: محێدین، عەلادین، نەجمەدین، نیزامەدین، سەعدەدین، ئەنوەر، جەمیل، کامیل، تائیب. لەمەولا باسی هەندێکیان دێت.

**حاجی شێخ ئەحمەد**

کوڕی چوارەمی حەزرەتی شێخ عوسمان.

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٦٦ی کۆچیدا لە دێی بیارە لەدایک بووە.

حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی ئەفەرموێت: لەو سەردەمەدا من لە بیارە بووم لە سبەینێی ئەو شەوەدا کە شێخ ئەحمەد لە دایک بوو، شێخ عوسمان سیراجەدین هاتە ناو موریدەکان و موژدەی پێدان و فەرمووی:

ئیمشەو کوڕێکی خاوەن «قدوم» و پیرۆزمان پێ بەخشراوە.

ئەم کوڕە ناو نرا بە ئەحمەد و لەو شوێنە پیرۆزەدا ژیا و، کاتێک فامی پەیدا کرد دەستی کرد بە خوێندن و قورئانی پیرۆزی خوێند و دوای ئەوە دەستی کرد بە خوێندنی زانیاری‌یەکانی: نەحو و سەرف و شەرع بە ئەندازەی پێویست. دوای ئەوە چووە تەریقەتەوە و سلووکی کرد و بە میهرەبانی خودا وەکوو لە خوێندندا بەهرەمەند بوو لە تەسەووفیشدا بەهرەمەند و خاوەن پلە بوو، وە لە هەمان کاتدا لە خانەدانی

---

١ـ شیعرەکانی ئەم زاتە لە بەرگی دووەمی «یادی مەردان»دا بلاوکراونەتەوە.

خۆیدا کە خەریکی سلووک و تەسەووف ئـەبوو لـە خزمـەتی سـەیید عەبـدوڕەحیمی مەولەویشدا عەقائیدی ئەخوێند و کتێبی «العقیدة المرضیة»ی بە تـەواوی خوێنـدووە و گەلێ حاشیەی لە سەر نووسیوە. نوسخەی ئـەو حاشـیە لای مـەلا محەمـەد یوسـفی کوڕی حاجی مەلا سەعیدی ساداواییدا هەیە و نوسـخەیەکیش لـە لای حـاجی مـەلا خالیدی کوڕی مەلا عەبدوڵلای موفتیی شاری سنە هەیە.

حاجی شێخ ئەحمەد مورشیدێکی خاوەن تەسەڕوف بـووە و گـەلێ مەنسـووبی بـە ماریفەتی هەبووە. یەکێ لەوانە جەنابی حاجی سەیید حەسەنی چۆڕیی بـووە، کـە لـە سەفەری حەجدا تەمەسوکی پێ کردووە بە هـۆی موکاشـەفەیەکەوە کـە لـە ڕەوزەی پیرۆزدا رووی داوە.

حاجی شێخ ئەحمەد سەفەری حەجی کـردووە و چوویشـە بـۆ ئەسـتەموول و لـەو سەفەرەدا گەلێ مورید و مەنسووبی بۆ پەیدا بووە و گـەلێ سـوودیان لـێ وەرگرتـووە. یەکێ لە موریدەکانی کە بووە بە خەلیفەی ... شێخ عەبدوڕەحمانی کەرکووکی بـووە، کە پیاوێکی زانا و خاوەن‌نوور بووە.

حـاجی شـێخ ئەحمـەد پـاش کـۆچی دوایـی شـێخ بـەهادین لـە دێـی تەوێڵـەوە گواستوویەتیەوە بۆ دێی ئەحمـەدئاوای گـوێ چـەمی زەڵـم لـە ژووری خورماڵـەوە و لەوێدا دانیشتووە و خـەریکی ئیرشـاد بـووە هـەتا لـە مێـژووی ١٣٠٨ی کۆچیـدا بـە نەخۆشی ڕشانەوە کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی گوێزراوەتەوە بۆ خزمەتی بـاوکی لە خانەقای تەوێڵە و لەوێدا بە خاک سپێرراوە.

حاجی شێخ ئەحمەد چوار کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ هیدایـەت، شـێخ عەبدوڵـلا، شێخ حەبیب، شێخ حەسەن، وە لە شێخ حەسەن سێ کوڕ بەجێ‌ماوە: شێخ محەمـەد، شێخ عەتائوڵلا، شێخ سەعید. ئەم کوڕانە هەموو زانا و خوێندەوارن.

### شێخ عەلی حیسامەدین

ئەم زاتە دیاریترین نەوەی شێخ محەممەدبەهادینە. لـە ساڵـی ١٢٧٨ی کۆچیـدا لـە دێـی تەوێڵـە لـە دایـک بـووە. دایکـی ئـەم زاتـە خـاتوون تەیبـەی کچـی شـێخ عەبدوڕەحمانی «بیەلەنگە»یە کە دێیەکە لە ڕۆژئاوای قەزای هەڵەبجەدا بوو.

شێخ عەلیحیسامەدین لە پاش فامکردنەوە دەستی کردووە بە خوێندن و قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە و کتێبە وردەکانی خوێندووە و لە خانەدانی خۆیاندا ئەندازێکی عەرەبی خوێندووە. لە خەت و ئینشا و نامەنووسیندا تاقانەی سەردەمی خۆی بووە.

کاتێ باوکی لە دنیا دەرچووە ئەم لە تەمەنی گەنجیدا بووە و لە خزمەتی شێخ ئەحمەدی مامیدا سلووکی کردووە. بە هەر حاڵ شێخ عەلیحیسامەدین زاتێکی بەتوانا بووە و لە دڵی هەموو موریدەکانی باوکیدا جێگەی خۆی کردووەتەوە و ئەوانیش بە دڵ و دەروون وەریان گرتووە و گەلێ کەس لە زانیاران و خاوەن پلە و پایەکان بوون بە مورید و مەنسووبی و موریدێکی وا بوون کەم وا رێ دەکەوێت و لە ماوەی ژیانیدا ملکەچ بوون بۆی.

ئەم زاتە پیاوێکی بەڕێز و خاوەن پایە و شکۆ بووە و لە شاوە تا گەدا بە ڕێزەوە تەماشایان ئەکرد.

لە رووی کۆمەلایەتیشەوە کەموێنە بووە، زۆر قسەزان و زمان پاراو و، بە ئیدارە بووە. ئەگەر کتێبێ لە ژیانی ئەم زاتەدا بنووسرێ هێشتا کەمە.

لە عاستی ئاوەدانکردنەوە و رێکخستنی شوێن و جێگە و باخ و زەوی و زاردا گەلێ هەوڵی سەرکەوتووانەی داوە، لە دێی تەوێڵە و لە باخ و چەمی بیارەدا و، لە دێکانی گوڵپ و باخەکۆن و مەرکەزی ناحیەی خورماڵ و لە شارەزوور لە دێی «تەپەکەل» و لە هەوراماندا لە هاوینەهەواری «کراویەدۆڵ»دا لە هەموو ئەم شوێنانەدا ئاوەدانکردنەوە و ساختمان و باخاتێکی نایاب و کەموێنەی کردووەتەوە، بە تایبەتی لە تەنیشتی خورماڵەوە باخێکی گەورەی بوو، جۆرەها میوە و دار و درەختی بەرداری تێدا ناشتبوو، دەور و بەرەکەی هەموو چنار و داری بەرز و گەورە بوو، کە مرۆ تەماشای دەکردن سەرسام دەبوو. وە دارەکان بە زۆری لە کردنەوەی مزگەوت و شوێنی بەکەلکدا کار ئەکران.

وەکوو بیستوومە ئەم زاتە لەگەڵ باوکی مندا برای شیریی بوون، یانی دایکی باوکم لەبەر چاکی و موسوڵمانەتیی هەڵبژێرراوە بۆ ئەوە کە شیری پێبدات.

وە تا بە خەیاڵدا بێت لە بارەی بەرگ و پۆشاکەوە پاک و خاوێن و ناسک بووە. ئەم زاتە لە دێی «باخەکۆن»دا لە بەهاری ساڵی ١٣٥٨ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و هەر لەو شوێنەدا بە خاک سپێرراوە.

## شێخ نەجمەدینی کوڕی شێخ عومەر زیائەدین

وەکوو وتمان شێخ عومەر نۆ کوڕی بووە، لە ناو ئەمانەدا دوو کوڕی سلووکیان کردووە و بوون بە خەلیفە: شێخ نەجمەدین و شێخ عەلادین.

ئەم دوو برا لە دایکەوە جیاوازان. دایکی شێخ نەجمەدین لە هۆزی ساحیبقەرانی سلێمانی‌یە و، دایکی شێخ عەلادین ئامۆزای شێخ عومەرزیائەدین بووە.

شێخ نەجمەدین لە ساڵی ١٢٨٠ی کۆچیدا لە تەوێڵە لە دایک بووە. ئەم زاتە لە خانەدانی خۆیاندا بەرێز و کەرامەت پەروەردە بووە. پاش فامکردنەوە دەستی کردووە بە خوێندن و قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە و کتێبە وردەکانی خوێندووە و دەستی کردووە بە خوێندنی نەحو و سەرف و شەرعی مەزهەبی شافیعی و بە ئەندازەی پێویست خوێندوویەتی و لە دەوری تەمەنی ١٢ سالیدا لە خزمەتی شێخ محەمەد بەهادینی مامۆیدا چووەتە تەریقەت و سلووکی پێ کردووە، بۆ ئەوە هەر لە پێش بلووغدا دڵیان رووناک بێتەوە. وە لە پاش کۆچی دوایی بەهادینی مامی لە خزمەتی باوکیدا سلووکی کردووە، هەتا بووە بە خەلیفە و ئیجازەی ئیرشادی وەرگرتووە.

وە پاش کۆچی دوایی باوکی بووە بە جێگەنوشینی و لە خانەقای بیارەدا لە سەر شوێنی ئیرشاد دانیشتووە و سلووکی بە مورید و مەنسووبەکانی کردووە لە سەر یاسای تەریقەتی نەقشبەندی.

ئەم زاتە لە ناو موریدەکانیدا زۆر خۆشەویست بووە و موریدەکانی باوکی گەڕاونەتەوە بۆ خزمەتی و ئیتاعەیان کردووە و خۆیشی گەلێ مورید و مەنسووبی لە زانایان و گەورەکانی چەرخی خۆی گرتووە.

لە ژیانی خۆیدا زۆر لەخوداترس و دەسلەدنیا هەڵگرتوو بووە و ئارەزووی لە سەر کەنارەگیری و خەلوەتکردن بووە و کۆڕ و کۆمەڵی دانیشتنی پیرۆز و بێدەنگ بووە و هەر شوێنێ باسی دنیا و جوانی دنیای تێدا بووبێ ئەو خۆی لێ بەدوور گرتووە و مووچەی لە دەوڵەتی عوسمانی وەرنەگرتووە و بە زۆری کاتی خۆی لەگەڵ زاناکاندا رابواردووە و لە کۆڕ و کۆمەڵی دانیشتنیدا یا تەفسیر، یا «احیاء العلوم»، یا کتێبی تەسەووف خوێنراوەتەوە و کاتی خۆی بە فیڕۆ نەداوە.

وە مەنسووبەکانی بە تایبەتی زاناکان و لە ناو ئەوانیشدا ئەوانەیان پەیوەندی‌یان زیاتر بووە وەکوو: حاجی سەیید محەممەدی کوڕی حاجی سەیید حەسەنی چۆڕی و

مەولانا مەلا عەبدولقادری مودەڕیسی بیارە و شێخ بابا ڕەسوولی بێدەنی و شێخ عەبدولکەریمی ئەحمەدبرنـدە و مامۆستا مەلا عەبدولقادری سۆفی و شێخ عەبدوللەتیفی هەڵەبجە و .... کە لە بیارەدا بووبن ئەمانە لە خزمەتیدا بوون و بە خۆشی و لەتافەت رایانبواردووە.

ئەم زاتە هەمیشە خوێندنگاکەی باوکی ڕاگرتووە و خزمەتی مودەڕیسەکەی ـکە مەولانا عەبدولقادری مودەڕیس بووە- کردووە و لە سێبەری ئەودا چەن مودەڕیسی تر لە قوتابییانی خۆی دەرسیان وتووەتەوە و بەم شێوە ماوەتەوە تا ساڵی ١٣٣٧ی کۆچی، لە دەی مانگی موحەڕەمی ئەو ساڵەدا لە بیارە کۆچی دوایی کردووە و لە پشتی باوکییەوە لە ژوورەکەی ئەودا نێژراوە.

ئەم زاتە نۆ کوڕی لێ بەجێماوە. دیاریتریان شێخ نوورەدین بووە کە لە جێگەکەیدا دانیشتووە و پاش ساڵ و نیوێک کۆچی دوایی کردووە و لە هەمان ژووردا بە خاک سپێرراوە.

### شێخ عەلادینی کوڕی حەزرەتی زیائەدین

لە ڕوی ١٢٨٠ی کۆچی لە دێی تەوێڵە لە دایک بووە. پاش فامکردنەوە لەگەڵ شێخ نەجمەدیندا بەیەکەوە خوێندوویانە و قورئانی پیرۆزیان تەواو کردووە. دوای ئەوە کتێبە وردەکانی خوێندووە. جا دەستی کردووە بە زانیارییەکانی: نەحو و سەرف و شەرع. هەتا گەییشتووەتە مادەی «سیووتی». لە هەمان کاتیشدا لە ژیانی شێخ محەمەد بەهادینی مامیدا لای ئەو سلووکی کردووە، پاش ئەو لە خزمەتی باوکیدا لە بیارە سلووکی کردووە و ئیجازەی ئیرشادی پێدراوە.

وە لە ژیانی باوکیدا لە سەر فەرمانی ئەو ڕەفتاری کردووە و ڕێبازی موریدو تەریقەتی بەجێهێناوە.

وە پاش کۆچی شێخی زیائەدین لە مانگی شەوالی ساڵی ١٣١٨ی کۆچیدا بە سێ چوار مانگ لە بیارە دەرچووە و لە «دەرەشیش»ی ژووروودا خانوو و خانەقای کردووەتەوە و خەریکی ئیرشاد بووە. بەم شێوە تا ساڵی ١٣٢٠ی کۆچی لەوێ ماوەتەوە. جا لە بەهاری ئەو ساڵەدا لە دەرەشیش گوێزاویەتییەوە و چووە بۆ

هەورامانی ئەو دیو و لە «سەوڵ ئاوا» کە شوێنی کوڕانی شێخ محەمەد سادقی وەزیری و باوانی خێزانەکەی بوون ... نیشتەجێ بووە و خەریکی ئیرشاد بووە.

وە لە ساڵی ١٣٢٤دا لەو دێیەوە چووە بۆ دێی «دووڕوو» لە گوێ چەمی «ڕۆخانە» کە بەشێکە لە ئاوی سیروان و لە لایەنی بەگزادەی ڕەزاوەوە ئەو دێیەی پێدراوە.

جا لە دووڕوودا خانەقای دروست کردووە و خانووی بۆ ماڵ و خێزان و چەند هۆدەی بۆ میوان کردووەتەوە و باخ و بێستان و جۆگەی ئاش و پێویستی ژیواری دروست کردووە و مەلا محەمەدی کوڕی شێخ قادری ڕەشەدێی مەریوانی -کە یەکەم مەلای مەریوان بووە - هێناویەتی بۆ دووڕوو و خوێندنگایەکی باشی ڕێکخستووە و لە هەموو لایەکەوە قوتابی هاتوون بۆ خزمەتی. ئەمە لە ساڵی ١٣٢٦ی کۆچیدا بوو.

دوای ئەمە بە ئاسایشی خۆی ئیرشادی کردووە و مودەڕیس دەرسی وتووەتەوە و خزمەتی ئایینی ئیسلامیان کردووە. لەگەڵ ئەوەیشدا وردەوردە دە پارچە زەویی کڕیوە و کردوویە بە هۆی نان‌دان و خزمەت‌کردنی داماوان و لێقەوماوان. وە لە ساڵی ١٣٣٥دا بە بۆنەی جەنگی جیهانی یەکەمەوە قات و قڕی و نەبوونی داکەوت. لەو ساڵەدا خزمەتێکی بێوێنەی کرد بە داماو و هەژاران و بە نان و خۆراک یارمەتی زۆری خەڵکی دا و، لە هاوینی ئەو ساڵەیشدا لەگەڵ سوپای ڕووسی قەیسەریدا جەنگی کرد و چەند کەس لە پەیڕەوانی شەهیدان کران.

وە لە ساڵی ١٣٣٩دا لەبەر ئەوە کە شێخ نوورەدینی برازای لە بیارەدا کۆچی دوایی کردبوو و لە ساڵی پێشوویشدا مودەڕیسی بیارە لە دنیا دەرچووبوو و بیارە چۆڵ بووبوو ... لە دووڕووەوە گوێزایەوە بۆ بیارە بۆ سەر شوێن و خانەقای باوکی و لەوێ دامەزرا و دەستی کرد بە ئیرشادێکی مەردانە لەگەڵ خزمەت‌کردنی موسوڵمانانیدا بە هەموو جۆرێ کە بۆی کرابێ، وە موریدانی باوک و برایی و خۆیشی لە هەموو لایەکەوە لای گردبوونەوە و دەست کرا بە خزمەتی دین.

بەڵام خوێندنگاکە بە هۆی مردنی مەلا عەبدولقادری مودەڕیس و هەندێ کار و باری دیکەوە لە نێوان ئاوەدانی و چۆڵیدا مایەوە، هەتا ساڵی ١٣٤٧ی کۆچی، لەو ساڵەدا من ئیجازەم وەرگرتبوو و لە دێی نەرگسەجاڕدا مودەڕیس بووم، شێخ نامەی بۆ نووسیم و چووم بۆ بیارە و پاش چەند ڕۆژێ لە سەری ساڵدا بە مودەڕیسی بیارە دانرام و قوتابی لە هەموو لایەکەوە گردبوونەوە و سەر لە نوێ دەرس‌وتنەوە گەرم

بووەوە و سوپاس بۆ خودا دەرس‌وتنەوەیەکی ڕێک و راست دامەزرا و، گەلێ جار ژمارەی تەلەبە ئەگەییشتە هەشتا نەوەد کەس کە یەک ئەکەوتن. وە نزیکی ٥٠ کەس لە تەلەبەی تێگەییشتوو ئیجازەیان وەرگرت و بەم شێوە ئیرشاد و دەرس‌وتنەوە و خزمەتی دین چوو بەڕێوە و موسوڵمانان سوودی زۆریان وەرگرت.

لە راستیدا ئەم زاتە بە ئیرشاد و خزمەتی زانیاریی خزمەتێکی وای کرد مەگەر هەر خودا پاداشی بداتەوە.

هەروەها خۆیشی زانا بووە و دانراوێکی بە زمانی عەرەبی بە ناوی «طب القلوب»ەوە هەیە و شێخ «حسین رمضان الخالدی» شەرحی کردووە و چاپ کراوە.

وە لە بەهاری ساڵی ١٣٧٣ی کۆچیدا ئەم زاتە لە جیهان دەرچوو و لە ژووری مەرقەدا بە خاک سپێررا.

ئەم زاتە دە کوڕی لێ بەجێماوە. دیاریتریان شێخ عوسمان و مەولانان، ئەم دووانە برای باوک و دایکین و لە خوێندنگای دینیدا خوێندوویانە تا پلەی سیووتی و فەنناری و نووسەر و ئەدیبن.

## شێخ عوسمان

ئەم زاتە لە سەر وەسیەتی شێخ عەلادینی باوکی و ئیشارەی باپیری جێگەنوشینە، وە لەو ڕۆژەوە باوکی لە دنیا دەرچووە تا ئێستە خەریکی ئیرشاد و خزمەتی موسوڵمانانە و، گەلێ لە زانایان بوون بە مورید و مەنسووبی.

ئەم زاتە لە پاش کۆچی دوایی باوکی لە ساڵی ٧٣ی کۆچیدا لەسەر خانەقا دانیشت و خەریکی خزمەتی موسوڵمانان بوو، تا ساڵی ١٣٧٨ی کۆچی، لەو ساڵەدا بە هۆی هەندێ ڕووداوەوە لە بیارە دەرچوو و چوو بۆ سەر زەوی و زاری خۆیان لە هەورامانی ئەودیو، یانی خانەقای «دووڕوو» و لەوێ دانیشت و لە سەر یارمەتی خودا لە سەر ئیرادەی ئیرشاد زەویی «مەحموود ئاوا»ی سەند و لەوێدا خانەقا و مزگەوت و خوێندنگا و خانووی بۆ خۆی و پەیڕەوانی کردەوە و بە دەوری ئەو شوێنەیشدا کشتێکی گوشاد و باخێکی گەورەی وەهای دروست کرد کە بەشی گەلێ کەس بکا.

وە خوێندنگای دامەزراندەوە و مامۆستا و قوتابی دانایەوە و خەریکی خزمەتی ئایین بوون لە سەر یاسای خۆیان تا ساڵی ١٣٩٤ی کۆچی، لەو مێژووە بەدواوە کار و باری

وڵات گۆڕا و گەلێ ڕووداو و کارەساتی نابار ڕوویدا ... بە بۆنەی ئەوانەوە لە ساڵی ١٩٧٩ی زایینیدا گەڕایەوە بۆ عێراق و جارێکی دیکە لە شوێنی خۆیدا لە بیارە دانیشتەوە، بەڵام جەنگی نێوان ئێران و عێراق سنووری تێکدا و بە ناچاری کۆچی کرد بۆ بەغدا و ئێستە لە بەغدا دانیشتووە، تا بزانین ڕۆژانی داهاتوو چی تێدایە.

هەروەها شێخ مەولانایش لەم هاتوچۆ و ئەمدیو و ئەودیو کردنەدا وەکوو برای گەورەی هاوبەشی گەلێ ئەرک و ماندوێتی بووە و ئێستەیش لە شاری سلێمانیدا نیشتەجێ بووە و چاوەڕێی ڕەحمەتی خودایە.

وە لە کوڕانی شێخ عەلادین: محەمەد زاهید و موختار و محەمەدە.

محەمەد زاهید لە ساڵی ١٤٠٢دا لە کرماشان لە جیهان دەرچووە.

محەمەدیش لە سەر زەوی و زاری خۆیان ماوەتەوە.

موختاریش لەگەڵ شێخ عوسماندا هاتووەتەوە بۆ عێراق و ئێستە لە سلێمانیدایە.

وە لە کوڕەکانی شێخە: حاجی ئەمین و محەمەد سابیت و مەزهەر، ئەم زاتانە وان لە عێراقدا. ئەم سێ برایە هەرسێکیان لە یەک دایکن.

دایکیان ڕابیعە خانمی کچی شێخ ئەحمەدی عیززی یە، کە خەلیفەی حەزرەتی شێخ عومەرزیائەدین بووە و دایکیان لە گۆرستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا بە خاک سپێرراوە. ئەم سێ برا هەرسێکیان خوێندەوارن و ئەمین دانشگەی ئاداب و سابیت دانشگەی حوقووق و مەزهەر دوکتۆرای ئادابی وەرگرتووە. ئەمین بە دوو شێوەی کوردیی: سۆرانی و گۆرانی و بە زمانی فارسی شیعری وتووە و دیوانی چاپکراوی بە نازنازی «بێوەی» هەیە و لە بارەی مێژووی شارەزووریشەوە باسێکی نووسیوە و لە بەرگی دەیەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد ـدا چاپ کراوە.

سابیتیش فەرمانبەر بوو و ئێستە خانەنشینە و لە شاری سلیمانیدا نیشتەجێ بووە و «محامات» ئەکات. وە مەزهەر فەرمانبەرە و لە کار و باری ڕەسمیدایە.

## بنەماڵەی مەلا ئیبراهیمی بیارە

بە ڕووناکی نازانین ئەم بنەماڵە کێن و لە کوێوە هاتوون. ئەوەندە ئەزانین کە موتەواتەرە مزگەوتی ناو دێی بیارە دەسکردی ئەو یارانی پێغەمەرەیە کە لە ساڵی ١٨ی کۆچیدا شارەزووریان ڕزگار کردووە، لە ناو کورددا بەو جۆرە مزگەوتانە دەڵێن: عەبدوللاهی، واتە عەبدوللای کوڕی حەزرەتی عومەری خەلیفەی دوەم دروستی کردوون.

لەگەڵ ئەم قسانەیشدا لە مێژوودا نەمان دیوە کە عەبدوللای کوڕی عومەر فەرماندەی سوپا بووبێت. بەڵێ ئەڵێن: عەبدوللا لەو سوپادا بووە کە هاتن ئەربیلیان گرت و بەرەو خۆشناو و پشدەر سەرکەوتن.

وە بیستوومانە مامۆستای گەورە مەلا عەبدولقادری مودەڕیسی بیارە فەرموویەتی: بەرەی مەلا برایمی بیارە ٢٥ پشتیان لە بیارەدا مەلا بوون. جا ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەبێ نزیکەی ٨٠٠ ساڵ ئەو بنەماڵە لە بیارەدا دەوامیان کردبێ و بەو پێیە کە مەلای بیارە لە مێژووی ١٣١٠دا ئەو قسەیەی کردووە ئەبێ لە ٧٠٠ی کۆچییەوە تا ئەو چەرخە کە مەلای گەورە ئەو قسەیەی فەرمووە هۆزی مەلا برایم لە بیارەدا بووبن.

وە بۆ ئاگاداری دەنووسم: کە مزگەوتی بیارە زۆر لە زانا بەرزەکان دەرسیان تێدا گوتووەتەوە و لە ناو مزگەوتی بیارەدا پلەکانێ هەیە دانەبەزێتە خوارەوە بۆ ژێرزەمینێ کە دەڵێن سەیید محەممەد ناوێکی تێدا نێژراوە. وە لەو ژێرزەمینەدا ئەندازێکی زۆر کتێبی زانیاریی جۆراوجۆری دەسخەت هەیە، کە بۆ زۆر کۆن دەگەڕێنەوە.

وە لە مێژووی ١٣٦٠ی کۆچیدا ویستم بڕۆم ئەو ژێرزەمینە بگەڕێم و بزانم چی تێدایە. چرامان داگیرسان و چووینە خوارەوە تا گەیشتینە ژێرزەمینەکە، بینیم هۆدەیەکە نزیکی ٣ گەز پانە و ١٥ گەز درێژە و لای ڕۆژهەلاتی ئەو ژێرزەمینە پڕە لە کتێب و کەوتوون بەسەر یەکدا بە ئەندازەی باڵای زەلامێک. وە گەلێ لەو کتێبانەم

هەڵگرت و تەماشام کردن، بەڵام دوایی لە مار و دووپشک و جانەوەر ترسام و بە پلەکانەکاندا سەرکەوتمەوە تا گەییشتمەوە ناو مزگەوتەکە.

بە هەر حاڵ بگەڕێینەوە سەر مەبەستی خۆمان، مەلا برایمی بیارە کە زانایەکی ناوداره کوڕی مەلا ئیسماعیلی بیارەیە، مەلا ئیسماعیل لەو رشتەی مەلای بیستوپێنج نەفەری‌یەیە، ئەم مەلا ئیسماعیلە زۆر زانا بووه و لە مزگەوتی بیارەدا دەرسی گوتووەتەوە و لە دەوروبەری ساڵی ١٢٠٠ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و، لەو کاتەدا کە خەریکی تەجهیزی مەلا ئیسماعیل ئەبن لە ناو خۆیاندا باسی زانایەتی و رێزی مەلا ئیسماعیل و دەرس‌وتنەوە و خزمەتەکانی دەکەن ... لەو کاتەدا یەکێک لە بیارەی‌یەکان بە شێوەی گاڵتەپێ‌کردنەوە دەڵێت: جا قەی ناکا با مەلا ئیسماعیل بمرێ، سبەینێ مەلا برایم هەموو قوتابی‌یەکان سەرپەرشتی دەکات و دەرزیان پێ ئەڵێت و ماوەی ئەوە نادات کە بڵاوە بکەن بە وڵاتدا!

مەلا برایم ئەم وتە زۆر کاری تێدەکات و سێ رۆژەی پرسەی باوکی تەواو دەبێت کتێبەکانی هەڵدەگرێت و ئەڕوات بۆ سلێمانی بۆ خزمەتی سەیید عەبدولکەریمی بەرزنجی و لای ئەو دادەمەزرێت و نایەتەوە بۆ بیارە تا خوێندن تەواو دەکات و چەند موستەعیدی باش لەگەڵ خۆیدا دێنێت و دێنەوە بۆ بیارە و لە جێگەکەی باوکیدا دادەنیشێت و دەرس دەڵێتەوە.

وە لەو کاتەدا سەیید عەبدولکەریم مودەڕیسی مزگەوتی عەبدوڕەحمان پاشای بابان ئەبێت، ئەو مزگەوتە کە ئێستە پێی دەڵێن مزگەوتی شێخ بابەعەلی، وەئەبێ ئەمە لە سالانی هەزار و دووسەد و چوار و پێنجی کۆچیدا بووبێت.

کاتێ کە مەلا برایم ئەچێتەوە بۆ بیارە و دەست ئەکا بە دەرس‌وتنەوە میرەکانی بابان زۆر یارمەتیی ئەدەن و چەند پارچە باخ ئەدەن بە مەلا برایم بۆ ئەوە خەرجی خۆی و قوتابی‌یەکانی لێ بدات.

مەلا برایم زانایەکی بەرز بووە بە تایبەتی لە زانیاریی بەلاغەدا، ئەڵێن کەم مەلا بووە وەکوو ئەو مەلا ئیبراهیمە کتێبی عیسامەدینی وەزعی زانی بێ. وا باوە مەولانا خالید لە خوێندنگای مەلا برایم و شێخ عەبدوڵلای خەرپانی و مەلا جەلالی خورماڵیدا خوێندوویەتی، چونکە ئەم سێ خوێندنگا لەو سەردەمەدا لە خوێندنگا بەرزەکانی

کوردستان بوون و مەلا برایم لە خوێندنگای بیارەدا دەرسی وتووەتەوە هەتا لە مێژووی ١٢٥٠ی کۆچیدا بە رەحمەتی خودا چووە.

ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: مەلا حسەین و مەلا محەمەدتاهیر. لە مەلا محەمەدتاهیر سێ کوڕ و دوو کچ بووە: تەیب و عەبدوڵلا و مەلا مەجید. وە کافیە و سافیە. لە مەلا مەجید دوو کوڕ و کچێ بووە:

حامید و حەمید و ئەجێ. وە تەییب و عەبدوڵلا نەتەوەیان نییە.

وە لە مەلا حسەینی کوڕی مەلا برایم حامید و مەلا تەییب و مەلا مستەفا بووە.

حامید و تەییب بێنەتەوە بوون. وە لە مەلا مستەفا سێ کوڕ و دوو کچ بووە، کوڕەکان: مەلا برایم، مەلا عەزیز، عوسمان. وە کچەکانیش سەفیە و حەبیبە.

جا لە مەلا برایم کوڕێ بووە ناوی عەبدوڕەحمان بووە و لە مەلا عەزیز دوو کوڕ و کچێ بووە: محەمەد و غەفوور و رەعنا. وە لە مەلا عوسمان کچێ بووە ناوی رەعنا بووە.

بەم جۆرە ئەم بنەماڵە لە دوای ٢٥ پشت لە ئەهلی رێز و زانیاریی دوایی هاتووە.

خۆشە بیارە لە رووی هەورامان
مەنزڵگەی یارە سەر تا بە دامان
بەهەشتی عەرزە، گوڵ و گوڵزارە
بێنی دەرمانی دەرد و ئازارە
بێستان و باخە و درەختی بە بەر
شۆڕەبی و چنار بە وێنەی عەرعەر
سەروی سەرسەوز و نەمامی نەوتووڵ
بە سروەی شەماڵ دێنە جم و جووڵ
دەڵێی قەتارەی دۆست و دڵدارن
بۆ دەس لە ملان موشتاقی یارن
شنەی وەنەوشەی کە ئەدا لە دڵ
دڵ بۆن خۆش ئەبێ وێنەی پەڕەی گوڵ

کـــە دێـــن بـــە یـــەکا گوڵـــی ڕەنگامـــە
سەوز و زەرد و سـوور وێنـــەی شـــەمامە
دێتـــە بـــەرچاوت وەرەق بـــە وەرەق
بەرگی سوندوس و کاڵای ئیســـتەبـرەق
ئامـــان نشـــینگای یـــارانی ســـامی
فـــەراموش مەکـــەن ئەحواڵـــی «نـــامی»
چـــون مـــن قووتەکـــەم یـــادی یارانـــە
یـــارانی پـــاکی بـــەر کۆســـارانە
خۆشـــی ژیـــانم یـــادی یارانـــە
نەشـــەی مـــەماتم دەردی هیجرانـــە
هـــەجری بارەگـــای مـــەولانا عومـــەر
هیجـــرانی ئـــاڵای خانـــەقای ئـــەنوەر
هیجـرانی غورفـەی مەدرەسـەی عـالی
هیجـــرانی ئولفـــەی ئـــەهلی مـــەعالی
هیجـرانی حەلقـەی تەلەبـەی دڵپـاک
هیجرانی فیرقەی گیـان و دڵ ڕوونـاک
هیجـــرانی ســـەفای کـــاتی ئێـــواران
لـە نوشـینگای پـای تەختـەی چنـاران
هیجـــرانی وەفـــای دۆســـتانی ســـافی
هیجـــرانی دەوای بـــۆ دەروون کـــافی
هیجـــرانی زەوقـــی هۆشمەنـــدەکان
هیجـــرانی شـــەوقی ئەرجومەنـــدەکان

نایێتــــەوە دی حەلقـــەی مـــەلاکان
خاوەن فـام و هـۆش دڵ پــڕ جـەلاکان
کوا بابا رەسـووڵ بـە خەنـدەی لێـوان؟
پــڕ بکـا لـە زەوق بـەر چـەم و کێـوان
کـوا شـێخی بـەرزی ئەحمـەد برنـدە؟
غـەم لـە دڵ دەرکـا بـە زەردەخەنـدە
کوانــێ دائـیرەی مـەلاکان سـەرجەم؟
لـە دەوری بابـا وەک پەروانـە و شـەم
کـوا رەفیقـەکان، رەفیقـــی شـەفیق؟
وەکوو شێخ عومەر بە وێنەی سـیددیق،
بێ خەم، بێ خـەیاڵ، بـێ مـەیلی دنیـا
روو لــە خــودا کـەن بـە دڵـی وریـا
«نـامی» بــە نـامی یـارانی سـەربەرز
ئەژی و دەرئەچێ بـۆ مەنزڵـگای عـەرز

## بنەماڵەی مەلا نەزیری تەوێڵە

ئەم زاتە یەکێ بووە لـە خوێنـدەوارانی دێـی تەوێڵـە و، لـە بنەڕەتـدا لـە ناحیـەی «ئەوێهەنگ»ەوە هـاتوون و لـە تەوێڵـەدا دامـەزراون و خـۆی پیـاوێکی لـەخوداترس و دنیانەویست بووە.

بۆ بەجێهێنانی حەج گەییشتووەتە مەکە و، پاش حەج هاتووە بۆ مەدینە و، لـەوێ بە خزمەتی شێخ مەزهەری بوخارایی قادریی گەییشتووە و چووەتە تەریقەتەکەی و لە بەندەیی‌کردندا گەلێ کۆششی کردووە و لە ئەنجامدا بووە بە مرۆیەکی پیرۆز و خاوەن کەشف و کەرامەت و گەلێ مورید و مەنسووبی لێ گردبووەتەوە و بەمجـۆرە لـە دێـی تەوێڵەدا ئیرشادی کردووە.

وە شێخ عوسمانی سیراجەدین کە دیویەتی مرۆیەکی وەهـا چـاک و لەخوداترسـە عایشەی کچی خۆی بۆ مارەکردووە و مەلا نەزیر لەم عایشە نـاوە چـەن کـوڕ و کچـی بووە: کوڕەکان شەشن[1]: مەلا جەلال، مەلا عەبدولمەتین، مـەلا عەبـدولموعین، مـەلا غیاسەدین، مەلا نەزیری بچووک، کـە هاونـاوی بـاوکی بـووە. کچـەکانیش: گوڵـێ و شیرین. گوڵێ شووی کردووە بە مەلا یاسینی تەوێڵەیی کە عەللامە بووە.

وە شیرین شووی کردووە بە شێخ عەبدوڕەحمان لە شێخەکانی دێی «مازی‌بن» لـە ناحیەی ژاوەڕۆ لە هەورامانی ئەودیو. وە گەلێ لە شێخەکانی مازی‌بن لە نەتەوەی ئەم ئافرەتەن، ئێستە شێخ محەمەد لەو بنەماڵە ماوە.

جا مەلا جەلالی کوڕی مەلا نەزیر دوو کوڕی بووە: مەلا حەبیبوڵلا و، مەلا عیسامەدین.

وە مەلا عەبدولمەتین خاتوون ئەسمای کچی شێخ عەلیی سەرگەتی کە لە خاتوون خەدیجەی کچی شێخ عوسمان سیراجەدینە ... مارە کردووە.

---

١- مامۆستا لێرەش‌دا ئەڵێ شەش کوڕ بەڵام ناوی پێنج ئەنووسێ. شەشەمیان لە لاپەڕەی دوایی ئیشارەی پێ ئەکا بە ناوی: مەلا عەبدولموبین. ن.ب

لەم ژنە کوڕێکی بووە ناوی مەلا عەبدوڵڵا بوو، بە مەلا عەبدوڵڵای خاتوون ئەسما ناوبانگی دەرکردووە و مرۆیەکی چاک و ئەهلی تەریقەت بووە.

پاش ماوەیەک مەلا عەبدولمەتین کۆچی دوایی دەکات و لە پاش ئەو مەلا عەبدولموعینی کوڕی مەلا نەزیر ئەم خاتوون ئەسمای مارە کرد، مەلا ئەحمەدی لێ بوو، ئێستە مەلا ئەحمەد و مەلا عەبدوڵڵا لە دایکەوە بران و لە پشتدا ئامۆزان.

لە مەلا عەبدوڵڵا دوو کوڕ بەجێماوە: مەلا نەزیر و مەلا عەلی.

وە لە مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا عەبدولموعین چوار کوڕ بەجێماون: عەبدولکەریم و جەمال و کەمال و فەرید.

وە مەلا غیاسەدینی کوڕی مەلا نەزیر تاقە کوڕێکی بووە، ناوی مەلا سەلاحەدینە، لەم سەلاحەدینە عەبدولواحید بەجێماوە.

وە مەلا عەبدولموبینی کوڕی مەلا نەزیر نەتەوەی نەبووە.

وە مەلا نەزیری بچووک کوڕی مەلا نەزیری گەورە چوار کوڕی لێ بەجێماوە: مەلا عارف و مەلا عابید و مەلا حافیز و مەلا ساحیب.

مەلا ساحیب خوێندی و ئیجازەی وەرگرت و بوو بە خەتیب و مودەڕیس و پێشنوێژی تەوێڵە. وە خزمەتی ئایینی کرد، تا لە دوادوایی ژیانیدا کۆچی کرد بۆ شاری هەڵەبجە و لە ساڵی ١٣٩٦ی کۆچیدا لە جیهان دەرچوو.

وە مەلا حافیز چوار کوڕی لێ بەجێماوە: مەلا زوبەیر، کە ئێستە لە شارەزووردا مەلایە و، عوزەیر و لوقمان و سەلاحەدین.

وە مەلا نەزیری گەورە لە پێش کچەکەی شێخ عوسماندا ژنێکی تەوێڵەیی هێناوە و لەو ژنە کوڕێکی بووە ناوی محێدین بووە؛ حەجی کردووە. ئەم حاجی محێدینە کوڕێکی لێ بەجێماوە ناوی مەلا نەجمەدین بوو. ئەم مەلا نەجمەدینە چوار کوڕی بووە: مەلا زەینەدین، مەلا نیزامەدین، مەلا عەبدولئەحەد، مەلا باباحاجی. ئەم زاتانە هەموو نەتەوەیان هەیە و ئێستە وان لە هەڵەبجە و سلێمانیدا.

لە مەلا زەینەدین کوڕێک بەجێماوە، ناوی مەلا محەمەد بوو، زۆر زیرەک و بەڕێز بوو، دوایی تێکچوو و لە شارەزووردا کۆچی دوایی کرد.

بە رەحمەت شادە هەرچی رزگارە
تایبەتی لە دەست ئەم رۆزگارە

## بنەماڵەی مەلا یاسینی تەوێڵەیی

مەلا یاسینی، کوڕی مەلا عەبدوڕەحمانی، کوڕی مەلا حسەینی، کوڕی مەلا عەبدوڕەحمانی، کوڕی مەلا حسەینی، کوڕی مەلا سەلام.

ئەم بنەماڵەیە لە مەلا سەلامی باپیرە گەورەیانەوە تا ئەم چەرخە لە دێی تەوێڵەدا مەلایەتی و پێشنوێژی و خزمەتی دینیان کردووە. وە هەندێکیشیان مودەڕیس بوون وەکوو مەلا یاسین کە یەکەم زانا بووە لەو ناحیەدا و لە خزمەتی شێخ عەبدوڵلای خەرپانیدا ئیجازەی وەرگرتووە و زانایەکی بەرز و بەڕێز و خاوەن پایە بووە و بە گوێرەی توانا دەرسی گوتووەتەوە.

ئەم زاتە لە کاتی خوێندن و موستەعیدیدا هاوڕێی مەلا یوسفی هەورامیی تەشاری بووە و مەلا یوسف لە مەلا یاسین بەتواناتر بووە و وا باوە هەتا مەلا یوسف حازر بووبێ مەلا یاسین رووی نەبووە دەرز بە فەقێکانی خۆی بڵێ، وە هەتا مەلا یاسین حازر بووبێ مەلا محەمەدی زەهاوی، کە بوو بە موفتیی زەهاوی، نەیتوانیوە دەرز بە فەقێکانی خۆی بڵێت، وە هەتا مەلا محەمەدی زەهاوی حازر بووبێ مەلا خزری «نالی» نەیتوانیوە دەرز بە فەقێکانی بڵێت. وە ئەم چوار کەسە پێکەوە لای شێخ عەبدوڵلای خەرپانی خوێندوویانە.

بە داخەوە نەبوونی نان و خۆراک و ژیوار بە ئەندازەی پێویست بووە بە هۆی ئەوە کە نەتوانراوە قوتابی زۆر پێکەوە کۆببنەوە و سوود لە زانیاریی ئەم زاتانە وەرگرن.

وە مەلا یاسین لە دێی تەوێڵەدا مەلای ماڵ و باخی خۆی بووە و دەرزی بە نەوەکانی خۆی گوتووە.

وەکوو زانراوە مەلا یاسین خاتوون گوڵەی کچی مەلا نەزیری گەورە و کچەزای شێخ عوسمانی سیراجەدینی مارە کردووە و ٢ کوڕی بووە، مەلا عەبدولباقی و مەلا عەبدولباری، کە بە مەلا عەبدە ناسراوە.

ئەم مەلا عەبدە مەلای چاک بووە و بە تایبەتی لە شەرعدا زۆر زانا بووە.

وە ئەیانوت: کتێبی «بەهجە»ی ئیبنولوەردی لەبەر بووە کە چەند هەزار بەیتە. من خۆم مەلا عەبدەم دیوە.

ئەم مەلا عەبدە شەش کوڕی بووە: محەمەدعەلی، سابیر، مەلا تاهیر، مەلا عەبدولواحید، مەلا محەمەدحسەین، مەلا عەبدولقادر.

مەلا تاهیر لە خوێندنگای بیارەدا لە لای من موختەسەری موتەووەلی ئەخوێند و، پاش ماوەیەک لە بیارە نەما و بوو بە مەلای دەگاشێخان و کۆچی دوایی کرد.

مەلا عەبدولقادر کوڕێکی هەیە ناوی مەلا کامیلە و، لە مەعهەدی ئیسلامی دەرچوو و هاتە ئەوقاف و بوو بە پێشنوێژ و ئێستە لەم فەرمانەدا دەوام ئەکا.

هەر چەند کە ئێمە گیرۆدەی دەردین
لە هەجری یاران هەناسە سەردین
بە یادی یاران دڵمان شاد ئەبێ
لە دەردی دووریی باش ئازاد ئەبێ
دڵ وێنەی نەخوش دەرمانی ئەوێ
دەرمانی شیفای زامانی ئەوێ
شیفای زامانی یادی یارانە
تایبەتی زامی لە ئەغیارانە
«نامی» شەو و ڕۆژ بە یادی یاران
ڕێک ئەخا قووتێ بۆ ڕۆژگاران

## بنەماڵەی شێخ نوورەدینی بریفکانی

ئەم بنەماڵە خۆیان بە نەوەی ئیمام عەلیڕەزای خۆراسانیی کوڕی ئیمام مووسای کازم ئەزانن.

وە ئەو شەجەرەی نەسەبە کە لەبەر کتێبی «ارشاد السالکین» کە دانراوی یەکێک لە باپیرەکانیانە و نووسیویانەتەوە ئەمەیە:

السید عبدالحمید، ابن السید شمس‌الدین، ابن السید احمد، ابن السید شمس‌الدین، ابن السید اسلام، ابن السید شمس‌الدین، ابن السید عبدالرحمن، ابن الشیخ المرشد العارف القطب الربانی السید شمس‌الدین البریفکانی، ابن الشیخ عبدالکریم، ابن الشیخ موسی، ابن السید سلیمان، ابن السید عبدالغنی، ابن السید اسحاق، ابن السید بابا منصور، ابن السید المولی الحسیب النسیب السید حسین الاخلاطی، ابن السید الامام الشیخ المرشد شیخ الاسلام السید علی «٩١٥» ابن السید حجی نظام‌الدین، ابن السید احمد، ابن السید زین‌العابدین المشهور ب«زوردانی» الموحد علی الخراسانی.

فکتب: هذه شجرتنا التی کتبها جدنا فی تألیفه کتاب ارشاد السالکین فی طریق العارفین، تألیف السید عبدالحمید ابن السید شمس‌الدین الاتروشی مسکنا، والبریفکانی موطنا.

وا دیارە لە بەر تەواتوری رشتەی نەسەبی عەلی خۆراسانی ئیتر نەسەبەکەیان نەگەیاندووە بە ئیمام عەلیڕەزا.

ئەم شەجەرە لە سەیید عەبدولحەمیدەوە سەرکەوت. هەروا گەلێ وردە شەجەرەی لقەکانی بریفکانی‌یان ناردووە بۆ لام کە بیان‌نووسم بەم شێوە:

شجرة اولاد الشیخ شمس‌الدین المشهور بالقطب:

۱ـ السید عبدالحمید، ابن السین شمس‌الدین، ابن السید احمد،[۱] ابن السید اسلام، ابن السید شمس‌الدین، ابن السید عبدالرحمن، ابن السید شمس‌الدین المشهور بالقطب.

۲ـ السید الشیخ نورالدین، ابن السید عبدالجبار، ابن السید نورالدین، ابن السید ابی‌بکر، ابن السید زین‌العابدین، ابن الشیخ القطب السید شمس‌الدین.

۳ـ السید حماد[۲] ابن السید عبدالجلیل، ابن السید حماد، ابن السید علی، ابن السید عبدالحلیم، ابن السید محی‌الدین، ابن الشیخ القطب السید شمس‌الدین.

۴ـ السید عبدالحلیم الدرگلی، ابن السید عبدالکریم، ابن السید عبدالحلیم، ابن السید عبید، ابن السید موسی، ابن الشیخ القطب السید شمس‌الدین.

کتبه السید الشیخ عبدالحمید فی سنة الف و ثلاث مائة هجریة.

ئەم عەبدولحەمیدە برازای شێخ نوورەدینی بریفکانی‌یە.

وە ئەم وردە شەجەرانە کە نووسراون پەیوەندی‌یان لە لقەکانەوە هەیە و، مەبەستیان ئەوە بووە بگەن بە خوالێ‌خۆش‌بوو سەیید شەمسەدینی قوتب، چونکی نەسەبی ئەو لە لایان روون و زانراوە.

وە ئەمەیش باسی رشتەی تەریقەتی سەیید عەبدولحەمیدی بریفکانی‌یە لێرەدا لە پاش نووسینەوەی شەجەرەی نەسەبەکە دەینووسمەوە:

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله رب العالمین، و الصلاة والسلام علی سیدنا محمد و آله و اصحابه الطیبین الطاهرین، و علی جمیع اخوانه من الانبیاء والمرسلین.

اما بعد: فان هذه سلسلة السید عبدالحمید، ابن السید شمس‌الدین، ابن السید الشیخ احمد، ابن السید الشیخ شمس‌الدین، ابن السید الشیخ اسلام، ابن السید شمس‌الدین ...

تا دوایی وەک شەجەرەکەی پێشوو.

---

۱- بە پێی شەجەرەنامەکەی سەرەوە ابن السید احمد، کوڕی «ابن السید شمس الدین»ە. ن.ب

۲ـ بیستوومە نەوەی ئەم شێخ حەممادە خۆیان بە مەلا ناو بردووە، لەبەر ئەوە لە سەر خوێندەواری دەوام بکەن. وە مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی ئەگات بەم سەیید حەممادە. وە مەلای پێنجوینی خۆی فەرموویەتی کە لە نەتەوەی یەکێ لە سەییدەکانی بریفکانە، کە ناوی موحەممەد بووە.

و هو خلف الملا محمد الجهل تنانناني القرەخلاطي الاخلاطي. والشيخ علي الخراساني المذكور أخذ من الشيخ الامام مفيد الاسلام و بركة المسلمين الشيخ زين‌الدين الخوافي، و هو اخذ و تخلف من امام الارشاد و التحقيق الشيخ الصديق السيد عبدالرحمن القرشي البحري المصري، و هو من الشيخ الامام جمال‌الدين محمود الاصفهاني، و هو من الشيخ المرشد امام العلماء، و قدوةالعارفين ابي الحسن علي بن بزخشي الشيرازي، و هو من الشيخ الامام الشيخ عبدالصمد النظري، و هو من الشيخ الامام قطب‌العارفين الشيخ شهاب‌الدين عمر ابن محمد السهروردي، و هو من عمه الامام ابي النجيب قطب العارفين الشيخ عبدالقاهر السهروردي، و هو من شيخه الامام القاصي وجيه‌الدين السهروردي المشهور بغمويه، ابن اسود الدينوري، و هو من شيخه الامام الشيخ ممشاد الدينوري، و هو من شيخه الامام سيد الطائفتين الشيخ جنيد بن محمد البغدادي، و هو من خاله الامام قطب الزاهدين و سلطان‌المجاهدين الشيخ ضياءالدين السري السقطي. و هو من شيخه قطب‌العارفين و برهان‌المقربين اسدالدين الشيخ معروف، و هو من الشيخ داود الطائي، و هو من الشيخ حبيب العجمي، و هو من الشيخ حسن البصري، و هو من الامام علي بن ابي طالب، و هو من سيد المرسلين صلى الله عليه وسلم.

شێخ نوورەدینی بریفکانی، کوڕی شێخ عەبدولجەباری، کوڕی شێخ عەبدولقەهارە و لە نەتەوەی شێخ شەمسەدینی قوتبە، کە یەکە کەسێ بووە لە وڵاتی خەلاتی نزیکی شاری «وان»ەوە کوچی کردووە و هاتووە بۆ بریفکان و لەوێ دانیشتووە و نەتەوەی لێ کەوتووەتەوە.

شێخ نوورەدینی بریفکانی لە ساڵی ١٢٠٤ی کۆچیدا لە بریفکان لە دایک بووە و پاش فام‌کردنەوە لە خوێندنگای خۆیاندا خوێندوویەتی و قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە. دوای ئەوە بە یاسای قوتابیانی ئەو رۆژە بە خوێندنگاکانی دەوروبەردا گەڕاوە و خوێندوویە تا پێگەییشتووە.

خۆی لە گیانی خۆیدا هەمیشە دڵی لە سەر خوداپەرستی و بەندەیی کردنی خودا بووە و حەزی لە تەسەووف بووە، لە سەر ئەو حەز و ئارەزووە چووە بۆ شاری موسڵ و تەمەسوکی بە حاجی مەحموودی جەلیلی موسڵی ـ کە مورشیدی تەریقەتی قادری بووە ـ کردووە و سلووکی کردووە تا ئیجازەی وەرگرتووە.

پاش ماوەیەک شێخ نوورمحەمەدی هیندیی لە هیندستانەوە هاتووە بۆ کوردستان، جا شێخ نوورەدین لای ئەم زاتەیش کەسبی تەریقەتی نەقشبەندی کردووە و ئیجازەی ئەم تەریقەتەیشی وەرگرتووە. وەکوو خۆی دەفەرموێت:

حەقیقەت قادریمە، من لە تەنگاوا رەفاعیمە

لە زەوقا سەهرەوەردیی و غولامی نەقشبەندیمە

بە هەر حاڵ شێخ نوورەدین یەکێک لە پیاوە گەورەکانی رۆژگار و خاوەنی کوشووفات و کەرامات بووە و لە هەمان کاتدا نووسەر و تەدیب بووە و زۆر شیعری بە زمانی عەرەبی و کوردی ـ کرمانجی سەروو ـ هەیە.

وە گەلێ دانراوی لە تەسەووفدا هەیە، یەکێ لەوانە ناوی «البدور الجلیه»یە و لە دوو بەرگدایە. نوسخەیەکی ئەم کتێبە لە کتێبخانەی حاجی شێخ عەلی تالەبانیدا هەیە. وە یەکێ لە خەلیفەکانی شێخ نوورەدین کە ناوی سەیید محەمەد بووە کورد بووە و لە موسڵدا نیشتەجێ بووە، شەرحی لەم کتێبە کردووە و شوێنە نەزانراوەکانی رووناک کردووەتەوە بە جۆرێک کە هەموو زانیارێک لە مەعنای عیبارەتەکانی بگات.

شێخ نوورەدین زۆر زاهید و دەستلەدنیا شۆردووبووە و دۆستەکانی خۆی هان داوە بۆ دوور کەوتنەوە لە تەماعی دنیا و گەلێ مورید و مەنسووبی ساغ و پاکی لە: موسڵ و دهۆک و عەقرە و زاخۆ و، لە خێڵ و هۆزەکانی ئەو ناوەدا بووە. وە زۆر جێگەی ریز و بایەخی خەڵک بووە، بە تایبەتی لەو رووەوە کە بە دنیا نەخەڵەتاوە.

وە خەلیفەکانیشی بە زۆریی لە سەر شێوە و رێبازی خۆی بوون.

یەکێ لە خەلیفەکانی شێخ عوسمانی ریزوانی موسڵییە. ئەم شێخ عوسمانە زاتێکی خاوەن روحانییەت بووە. ئەم شێخ عوسمانە باوکی شێخ عەبدوڵلای ریزوانی بووە. شێخ عەبدوڵلا باوکی حاجی شیخ محەمەدی ریزوانییە کە یەکێ لە پیاوە ناودارەکانی جیهانی ئیسلام بووە و زۆر زانا بووە و بە کار و کۆششی خۆی ژیاوە و خەریکی بازرگانی بووە و لەگەڵ ئەوەیشدا دەرس وتنەوەی بە فەقێیان لەکیس نەداوە، ئامۆژگاری و رێنومایی موسوڵمانانی زۆر کردووە. زۆر بەخشندە و خاوەن چاکە بووە. زۆربەی بەخششەکانی بە شێوەی پەنامەکی بووە.

وا باوە لە گرانیی دوای شەڕی جیهانی یەکەمدا بە شەودا نان و گۆشت و رۆن و خواردەمەنی داوە بە کۆڵی حەماڵدا و خۆی لەگەڵیانا رۆییشتووە و بەشی کردووە بەسەر نەدارا و هەژاراندا.

باسی هەندێ رەوشت و کردەوەی شێخ نوورەدین لە کتێبی سەربەخۆدا نووسراوە و چاپ کراوە. ئەو کتێبە بۆ ئەوە دەشێ مرۆ تەماشای بکات و پیرۆزیی لە خوو و رەوشتی ئەو پیاوە وەربگرێت.

لە شێخ نوورەدین دەگێڕنەوە فەرموویەتی: من لە سێ شتدا لە سەر شێوەی باپیری خۆمم کە حەزرەتە:

یەکەم: ئەو گەلەی من وام لە ناویاندا لە کەللەڕەقیدا وەکوو کافرەکانی قورەیش وەهانە.

دوەم: نەوەی نێرینەم نییە وەکوو ئەو.

سێهەم: تەمەنم ئەوەندەی تەمەنی ئەو ئەبێت کە ٦٣ ساڵ بووە.

لە واقیعدا ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٦٧ی کۆچیدا لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا لە جیهان دەرچووە.

یەکێ لە موریدەکانی شێخ نوورەدین قەسیدەیەکی لە شیوەن بۆ شێخ نوورەدیندا داناوە و نیوە شیعری دوایی ئەو قەسیدەیەی کردووە بە مادەی تەئریخی لەجیهاندەرچوونی شێخ، ئەو نیوە شیعرە ئەمەیە:

تبکی السماء لفقد النور للاسف

١٢٦٧ هـ

شێخ نوورەدین چوار کچی بووە فاتمەیان نەبێ هەموویان لە پێش شووکردندا لە جیهان دەرچوون. فاتمەیش شووی کردووە بە شێخ عەبدولحەمیدی کوڕی شێخ شەمسەدینی بریفکانی لە نەتەوەی شێخ شەمسەدینی قوتب.

ئەم فاتمە لە شێخ عەبدولحەمید دوو کوڕی بووە: شێخ محەمەدعەلی و شێخ محەمەدئەنوەر. وە لە شێخ محەمەدعەلی دوو کوڕ بووە: شێخ محەمەدئەمین و شێخ عەبدوڕەحمان. وە لە شێخ عەبدوڕەحمان چەند کوڕ بەجێماوە وەکوو: شێخ عەبدولحەمیدی ئەترووشیی قازیی و شێخ بەشیر و ...

وە لــە شــێخ محەمەدئــەنوەر ســێ کــوڕ بــەجێماوە: شــێخ محەمــەد و شــێخ محەمەدسەعید و شێخ جەحفەل.

ئەم شێخ جەحفەلەیان زانایەکی گەورەیە و ئێستە لە ژیاندایە و لـە گونـدی «گـەلی رمان»ی نزیکی پارێزگەی دهۆکدا دادەنیشێ.

شێخ نوورەدین برایەکی بووە ناوی شــێخ عەبدوڵـڵا بــووە لــە بریفکــان لــە جیهــان دەرچووە و چەن نەوەی لێ کەوتووەتەوە، لەوانە: شێخ محەمەد و شێخ عەبدولجەببار، کە نەتەوەیان تا ئێستەیش لە دێی بریفکاندا هەیە. شێخ مەمدووح یەکێکە لــەو رشــتە پیرۆزە و گەلێ شوێنەواری زانیاریی لە لایە گەلێ سوودیان لێ وەردەگیرێ.

لە کاتی خۆیدا هات بۆ زیارەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و پێکــەوە دانیشــتین و بڕیاریدا لەو شوێنەوارانە بێ بەشمان نەکات، بەڵام بە داخەوە کە رۆییشــتەوە مــەرگ مۆڵەتی نەدا و کۆچی دوایی کرد.

چەند کوڕی لێ بەجێماوە گەورەکەیان شێخ محەمــەدی نــاوە لــە شــاری موسڵــدا دادەنیشێ و مامۆستای قوتابخانەیە. دەڵێن: پیاوێکی باشــە، هیــوام وایــە لای ئــەوەوە سوودمان دەست بکەوێ و هەندێک دەربارەی ئەو رشتە و بنەماڵە بزانین.

شێخ نوورەدین لە نووسینی پەخشان و شیعردا دەستی باڵای هــەبووە و ئــەدیبێکی چاک بووە. لێرەدا نموونەی پەخشان و شیعری عەرەبی و کوردیی دەنووسین.

**ئەمە نامەیێکە بە عەرەبی بۆ لای موریدێکیی نووسیوە:**

یا شیخزادە! هذه الاداب واجبة و فریضة علی کـل مریـد یریـد قـرب الله و محبتــە، و یحب ان یکون قلیل الکلام، قلیل المنام، لا یجلس مع النـاس الا بقـدر الحاجـة، و یصـبر علی الجوع والعری والالام، و یصبر علی ظلم الناس، و یعفو عمـن ظلمــە، و لا ینـتقم مـن کل من ظلمە، و یحب لکل انسان کما یحـب لنفسـە، و یکـون سـخیا بمالـە، و لا یطلـب حاجة من المخلوقات، بل یتوکل علی الله، و یفوض حوائجە الی الله.

و تعتقد انک لیس لک عمل مقبول، بل تقول کل عمـل اعمـل مغشـوش معلـول! و لا تفرح بنسبک و لا بطاعتک و لا بعملک، بل تفرح بالله و بشریعتە و برسولە.

و یا اخی! لا تترک الخلوة بقدر الاستطاعة و القدرة فـی کـل شـهر او شـهرین او ثلاثـە اشهر علی حسب التوفیق و التیسیر، تخلو فی مکان فی نحو عشرة ایام او اقل او اکثر، فان

الذکر فیه رضاء الله، و کفارة الذنوب، والتنبه من الغفلة. و اذا ترک الانسان الخلوة بقی جاهلا و لو کان عنده اوقار من الکتب! وداوم علی الوضوء، و فعل التهجد، و صلاة الضحی، و مخالفة النفس ...

ئەمەیش نموونەی شیعری عەرەبی‌یەتی:

تجلت لی صفات الله فی أسنی معانیها
فلاحت لی بها الاکوان قاصیها و دانیها
محل الفیض قلبی والمثانی کشفها عندی
و تلک الآیة الکبری لنا سبع مثانیها
بنائی بالایادی حققوه النسخة الصغری
بنی فی احسن التصویر من تصویر بانیها
شؤون الحق: تصریف، و تعریف، و تألیف،
و تأدیب، و تقریب، و ان ترقی بشانیها
**ژ معنی هیکلی انسان بحثا فی هیولائی**
**خبیرم ئەر تە پسیارە ژ استاد معانیها**

ئەمەیش نموونەی شیعری کوردی‌یەتی:

گەهی ئینسم، گەهی جینم، گەهی عاقل، گەهی شەیدا
گەهی دەر خەلوەخانەم، گەهـ لە دەیرم، گاهـ دەر بەیدا
گەهی مەوجوود، گەهـ مەعدووم، گەهی دەر بەرزەخم پەیدا
گەهی بازم لە بەتحائێ، گەهی خەرگۆش دەر بەیدا

تا دوایی ...

وە لە نەتەوەی خانەدانی شێخ نوورەدین جەنابی شێخ عەبدوڕەحمانە کە زاتێکی نەجیب و خاوەن تەقوا و کەرامەت بوو. گەلێ جار بە خزمەتی ئەم زاتە گەییشتووم

لەوانە بوو کە بڵێم تەماشاکردنی ناوچاوی ئەبوو بە هۆی دڵکردنەوە و چاوڕوون بوونەوە.

ئەم زاتە گەلێ نەوەی لێ بەجێماوە، ئەوانەیان کە من بە خزمەتیان گەیشتووم دوو کەسن:

یەکەم: شێخ عەبدولحەمید، لەگەڵ ئەوەدا کە لە خوێندنگای ئایینیدا باش خوێندبووی و موتەووەلی لە خزمەتی مەلا ئەحمەدی قوتبدا لە شاری موسڵ خوێندبوو، چووبووە خوێندنی قوتابخانە رەسمییەکان و دانشگای حوقووقی تەواو کردبوو، گەلێ وەزیفە و فەرمانی میری دیبوو. بە قازییێتی هاتە شاری هەڵەبجە و پاش ماوەیەک هاتە شاری سلێمانی و دوای ماوەیەک هات بۆ بەغدا و بوو بە قازیی یەکەمی مەحکەمەی شەرعی بەغدا، جا خانەنشین کرا.

ئەم زاتە پیاوێکی نەجیب و بەڕێز بوو، گەلێ چاکەی بە سەر منەوە هەیە.

دووهەم: شێخ بەشیر. ئەمیش یەکێکە لە فەرمانبەرە گەورەکانی میری و ئێستە «ئەمین عام»ی ئەوقافی ناوچەی حوکمی زاتییە. ئەم زاتەیش پیاوێکی بەڕەوشت و پیاوانەیە و چی پێ بکرێت لە خزمەتی خەڵکی دریغی ناکات.

## بنەماڵەی مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی

بە بۆنەی ئەوەوە کە مەلای پێنجوێنی خۆی داوای ئەوەی کردووە کە لە رشتەی سەییدەکانی بریفکانە و هەندێ بەڵگەیش هەیە لە سەر راستی ئەو داوایە ... بە دوای باسی بریفکانییەکاندا باسی ئەمانیش ئەکەم. هەر چەند پیاوی وەکوو مەلای پێنجوێن وەکوو ئەستێرەی «زوهرە» لە ئاسمانی زانیاریی و رێز و رەوشتدا ئەدرەوشێتەوە و رووناکی ئەداتەوە.

لە باسی لقەکانی سەییدەکانی بریفکاندا نووسیمان کە سەیید حەمادی کوڕی سەیید عەبدولجەلیل نەتەوەی خۆی بە ناوی مەلا ناوبردووە، بۆ ئەوە کە دڵیان لە سەر خوێندن و دەرس‌وتنەوە بێت. وە وا باوە مەلا عەبدولکەریم ناوی سەییدی بریفکانی لە ولاتی خۆیەوە هاتووە بۆ خۆشناو و لە پارێزگای هەولێردا دانیشتووە و پاش ماوەیەک یا خۆی یا مەلا عەزیزی کوڕی چووە بۆ ناوچەی شارباژێڕ و لە مەلا عەزیز، مەلا یوسف و لە مەلا یوسف، مەلا عەلی و لە مەلا عەلی، مەلا ئیبراهیم بووە.

ئەم مەلا ئیبراهیمە لە کاتی خوێندندا چووە بۆ خزمەتی مەلا خزری گەورە و لە دێی شێخەڵمارێن دامەزراوە و لە بەر ئەوەی مامۆستاکەی زانایەکی گەورە و تەوانا بووە لەوێ ماوەتەوە و لەو خوێندنگادا خوێندنی تەواو کردووە، وە مەلا خزریش ئەوەندە زانیاری و رەوشت و خووی مەلا برایمی بە لاوە پەسەند بووە کچی خۆی لێ مارە کردووە و کردوویەتی بە یارمەتیدەری خۆی لە دەرس‌وتنەوە و خزمەتکردنی موسوڵمانانا.

مەلا برایم لەو کچی مەلا خزرە کوڕێکی بووە ناوی محەمەد بووە. ئەم کوڕە دەستی کردووە بە خوێندن و ماوەیەک لە خوێندنگاکەی خۆیاندا بووە، ئەمجار بە یاسای قوتابیانی کوردستان کەوتووەتە گەڕان بە مزگەوتەکانی کوردستاندا و چووەتە جێشانە و لەوێ خوێندنی تەواو کردووە و کچی مەلا ئەحمەدی، کوڕی مەلا

محەمەدی، کوڕی حاجی حەسەنی ئالانیی ناسراو بە ئیبنولحاجی مارەکردووە و هاتووەتەوە بۆ شێخەڵمارێن و ماوەیەک لەوێ ماوەتەوە، پاش ئەوە چووە بۆ پێنجوێن و لەوێ نیشتەجێ بووە و خزمەتی ئایین و زانیاریی کردووە، بە جۆرێک دانیشتووانی پێنجوێن زۆر مەمنوونی بوون.

ئەڵێن: ئەم مەلا محەمەدە ئەوەندە پیاوچاک و لەخوداترس بووە ئەگەر یەکێک لە خەڵکی پێنجوێن بچوایە بۆ شاری سلێمانی و زیارەتی کاک ئەحمەدی شێخی بکردایە و داوای دۆعای خێری لێ بکردایە ... ئەیفەرموو: بابا لەگەڵ ئەوەدا کە مەلا محەمەد لە پێنجوێندایە حەیفە بێن بۆ لای من و داوای دۆعای خێر لە من بکەن! دۆعای مەلا محەمەدتان بەسە.

ئەم مەلا محەمەدە خزمەتی کردووە هەتا لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا لە پێنجوێندا کۆچی دوایی کردووە.

ئەم زاتە لە عایشەخانی کچی مەلا ئەحمەدی جێشانەیی ٤ کوڕی لێ بەجێ ماوە: مەلا عەبدوڕەحمان و مەلا عەبدوڕەحیم و مەلا محەمەدئەمین و مەلا عەبدوڵلا، کە لە دواییدا حەجی کردووە و بووە بە حاجی مەلا عەبدوڵلا.

دیاری و ناوداری ناو ئەم کوڕانە مەلا عەبدوڕەحمان بووە. ئەم زاتە لە سەرەتاوە لە خوێندنگای خۆیاندا لە خزمەتی باوکیدا خوێندوویەتی هەتا هەندێکیشی لە سەعدوڵلا خوێندووە. دوای ئەوە چووە بۆ سلێمانی و لە خزمەتی مەلا عەبدولقادری شێخەڵمارێنیدا ـ کە خاڵۆزای باوکی بووە ـ کتێبی شەرحی «جامی»ی خوێندووە. پاش ئەوە کە مەلا عەبدولقادر لە سلێمانییەوە چووە بۆ بەغدا مەلا عەبدوڕەحمان لای مەلا ئەحمەدی چاومار حاشیەکانی جامی وەکوو: عەبدولغەفوور و عیسامەدین و عەبدولحەکیمی سەر عەبدولغەفووری خوێندووە. هەروا لە خزمەتی مەلا ئەحمەدی چاوماردا ماوەتەوە هەتا هەندێ مەنتیقی خوێندووە. دوای ئەوە چووە بۆ شاری سنە و لەوێ لای مەلا محەمەدی فەخرولعولەما حاشیەی عەبدوڵلا یەزدی و «آداب البحث»ی خوێندووە.

دوای ئەمانە چووە بۆ لای مەلا عەلی قزلجیی لە تورجان لە موکریاندا و لەوێیش شەرحی شەمسییە و هەندێ لە شەرحی مەتالیع و هەندێکیش شەرعی لای مەلا عەلی خوێندووە. بەڵام زۆر بە وردەکارییەوە.

دوای ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ هەورامان لای مەلا ئەحمەدی نۆدشە عیلمی هەیئەت و کەلام و فیقهی خوێندووە.

پاش ئەمەیش لە هەورامانەوە گەڕاوەتەوە بۆ ڕەواندووز و کتێبی «تشریح الافلاک» و «چغمینی» لای مەلا عومەری خەیلانی خوێندووە.

دوای ئەوە جارێکی دیکە گەڕاوەتەوە بۆ تورجان و زانیاریی بەیان و بەدیع و هەندێ ریازیات و هەندێ شەرعی لە خزمەتی مەلا عەلیدا خوێندووە و هەر لەو سەردەمەدا کە مەلا سەیید حەسەنی چۆڕیی لای مەلا عەلی قزلجی موستەعید بووە حاشیەی عەبدولحەکیمی شەرحی شەمسی‌یەی لە خزمەتی سەیید حەسەندا خوێندووە. پاش ئەمانە ئیجازەی لە مەلا عەلی وەرگرتووە و هاتووەتەوە بۆ شاری پێنجوێن و لە سەر جێگە و ڕێگەی خۆی دامەزراوە و خەریکی دەرس‌وتنەوە و خزمەتی زانیاری و ئایین بووە و ژنی هێناوە و پاش چەن ساڵێک لە پێنجوێنەوە گوێزاویەتی‌یەوە بۆ شاری سلێمانی و لە مزگەوتی نەقیبدا بووە بە مودەڕیس و چەن ساڵێ لەوێدا مودەڕیس بووە.

لە هەندێ بەڵگەدا دەڵێت: مەلا عەبدوڕەحمان مودەڕیسی مزگەوتی گەورە بووە بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە مودەڕیسی مزگەوتی نەقیب بووە و دوور نیە کە بێجگە لە دەرس‌وتنەوەی مزگەوتی نەقیب چووبێ لە مزگەوتی گەورەیشدا دەرزی گوتبێتەوە.

وە پاش ماوەیەک لە سەر موناقەشەی مەسائیلی شەرعی و شتی دیکە ئەوەندە ئازار ئەگا بە دڵی تەواو وەڕەس ئەبێ و بە دزیی شێخ سەعید و سەییدەکانەوە بە شەو ماڵی لە سلێمانی بار ئەکات و ئەگەڕێتەوە بۆ شاری پێنجوێن.

وە پاش گەڕانەوەی بۆ پێنجوێن دەست ئەکاتەوە بە دەرس‌وتنەوە، بەڵام دەرس‌وتنەوەیەکی وەها کە هەر فەقێیەک زیرەک بووبێ و لە زانیاری‌یەکدا کتێبێکی لای خوێندبێ لەو زانیاری‌یەدا بووە بە زانایەکی باش و بەو جۆرە گەلێ لە زانایانی بەناوبانگ پێ‌ئەگەیەنێ و ئیجازەیان ئەداتێ. وەکوو مامۆستا مەلا حسەینی پیسکەندی و مەلا ڕەشید بەگی دارەشمانەیی و مەلا سەعیدی ئاغجەلەری و مەلا عەبدوڕەحمانی سەلەسی و مەلا عەزیزی دەرەتفێ و مەلا محەمەدی شێخ قادری ڕەشەدێ و غەیری ئەم زاتانەیش.

وە لەگەڵ ئەم خزمەت و دەرس‌وتنەوەدا حاشیە و تەعلیقاتی بەسەر گەلێ لە کتێبە زانیاری‌یەکانەوە نووسیوە. وەکوو حاشیەی لە سەر سەعدوڵلای گەورە و حیسام‌کاتی و فەنناری و عەبدوڵلا یەزدی و «تهذیب المنطق» و گەلەنبەوی شەرح و گەلەنبەوی بورهان لە عیلمی مەنتیقدا. هەروەها لە سەر شەرحی شەمسی‌یە لە مەنتیقدا. وە حاشیەی هەیە لە سەر عەقائیدی نەسەفی و شەرحی سەعد و خەیالی و «تهذیب الکلام» لە عیلمی کەلامدا، لە سەر «جمع الجوامع» و «لب الاصول» لە ئوسوولی فیقهدا، وە لە سەر «اقصی الامانی» و موختەسەر و موتەووەل لە عیلمی بەلاغەدا. وە لە سەر شەرحی مەقاسید لە کەلامدا و شەرحی مەتالیع لە مەنتیقدا و لە سەر «تشریح الافلاک» و «چغمینی» لە عیلمی هەیئەتا. جگە لەمانەیش لە زانیاری‌یەکانی دیکەدا.

هەروەها بە قەی چەند بەرگ فەتاوای شەرعیی هەیە لە وەلامی پرسیار و «مناظرات»ی نێوان خۆی و زانایانی سەردەمی خۆیدا. وە نامیلکەیەکی تایبەتی هەیە لە زانیاری ئوسوولی دیندا لە مەسئەلەی «کەلامی باری»دا.

بە راستی ئەم زاتە تاقانەی سەردەمی خۆی بووە و لەگەڵ ئەم هەموو خزمەت و دەرس‌وتنەوە و نووسینەدا ئەوەندە لە خوداترس بووە لە ئاوی شەو پارێزی کردووە.

ئەم زاتە بەم‌جۆرە تەمەنی خۆی لە رێگەی خزمەتی زانیاری و دیندا بەسەر بردووە، هەتا لە تەمەنی ٧٥ ساڵیدا لە سەعات سێی شەوی جومعەی مانگی «ذی القعدە»ی ساڵی ١٣١٩ی کۆچیدا لە پێنجوین کۆچی دوایی کردووە و لە ژوورێک لە ژوورەکانی مزگەوتدا پێش نوێژی جومعە بە خاک سپێرراوە.

ئەم زاتە گەلێ جار عەرزیان کردووە: ئێوە وەکوو خۆتان ئەڵێن لە سەییدەکانی بریفکانن بۆچی نەسەبی خۆتان گوم کردووە؟ ئەویش ئەیفەرموو: بە من ئەڵێن: مەلا عەبدوڕەحمانی، کوڕی مەلا محەمەدی، کوڕی مەلا ئیبراهیمی، کوڕی مەلا عەلی، کوڕی مەلا یوسفی، کوڕی مەلا عەزیز، کە بە مەلا ناسراوین. ئێستە ئەگەر بڵێم ئێمە سەییدین ئەڵێن: خۆتان کردووە بە سەیید. وە ئەگەر خودا میهرەبانی بکا میهرەبانی‌یەکە هەموومان ئەگرێتەوە.

وە لە راستیدا شوێنەواری سەییدیەتی مەلا عەبدوڕەحمان و شێوەی نەجابەت و لەخوداترسی و دەستلەدنیا شۆریویی ... بەڵگە بوون لە سەر شەرافەت و رێزی. بێجگە لە زانیاری‌یە بەرزەکەی.

وە ئەگەر ئەم بنەماڵە سەیید بن رشتەی نەسەبەکەیان ئاوایە: مەلا عەبدورەحمانی، کوڕی مەلا محەمەدی، کوڕی مەلا ئیبراهیمی، کوڕی مەلا عەلی، کوڕی مەلا یوسفی، کوڕی مەلا عەزیزی، کوڕی مەلا عەبدولکەریمی، کوڕی سەیید حەمادی بریفکانی، کوڕی سەیید عەبدولجەلیل ... تا دوایی رشتەی نەسەبەکەیان.

وەکوو بیستوومە رشتەی مەلاکانی شێخەڵمارێن کە خاڵۆی مەلا محەمەدی باوکی مەلا عەبدورەحمانی پێنجوێنی‌یە ئاوایە: ئەوەیان کە ئێستە لەم مێژووی ١٤٠٣ی کۆچیەدا لە ژیاندایە ناوی مەلا محەمەدە. ئەم مەلا محەمەدە لە ساڵی ١٩١٢ی زایینیی بەرانبەری ١٣٠٣ی کۆچی لەدایک بووە وە لە خزمەتی باوکیدا خوێندوویەتی. کاتێ هەندێ پایەی خوێندنی بەرزبووەتەوە چووەتە خوێندنگای شێخ عەزیزی دۆلپەموو لەوێ خوێندوویە تا ئیجازەی وەرگرتووە. وە ئێستە لە «مجمع»ی شانەدەریی شارەزووردایە.

ئەم زاتە کوڕی مەلا عەبدورەحمانە کە لە دێی شێخەڵمارێندا لە دایک بووە. لەوێ خوێندوویەتی تا بووە بە مەلا. دوایی لەوێ گوێزاویەتی‌یەوە بۆ دێی ساڵیاوا و لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

ئەم مەلا عەبدورەحمانە کوڕی مەلا عەبدوڵلای شێخەڵمارێنە کە لە دێی شێخەڵمارێن لە دایک بووە و هەر لەوێ لە جیهان دەرچووە و بە خاک سپێرراوە.

ئەم مەلا عەبدوڵلا کوڕی مەلا خدری بچووکە و، مەلا خدر کوڕی مەلا مەحموودە و مەلا مەحموود کوڕی مەلا خدری گەورەیە. ئەو مەلا خدرە کچی خۆی مارەکردووە بۆ مەلا برایمی باپیری مەلا عەبدورەحمانی پێنجوێنی. وە ئەم مەلا خدرە کوڕی مەلا رەسووڵ بووە کە لە سەر نووسینی مەلا محەمەدی شێخەڵمارێنی مەلایەکی زۆر زانا بووە و لە هەمان کاتدا پیاوچاک بووە و ئاسنی سوورەوەبووی گرتووە بە دەستی‌یەوە.

ئەو مەلا عەبدوڵلای باپیری مەلا محەمەدە کوڕێکی بووە ناوی شێخ عەبدولقادر بووە. خوێندوویەتی هەتا بووە بە مەلا و ماوەیەک لە سلێمانیدا مەلا بووە. وەکوو نووسیمان مەلا عەبدورەحمانی پێنجوێنی دەرزی جامی لە خزمەتی ئەودا خوێندووە.

پاش ماوەیەک چووە بۆ بەغدا و بووە بە پێش‌نوێژی مزگەوتی سلێمانی کە موفتی زەهاوی تێدا ژیاوە و کچێکی[1] بووە داویەتی بە سەعید ئەفەندی کوڕی موفتی

١ ـ شێخ ئەمجەد زەهاوی لەو کچی مەلا عەبدولقادرە بووە.

زەهاوی. وە هەر لەو مزگەوتەدا کۆچی دوایی کردووە و ئارامگاکەی لە پاڵ ئارامگای موفتی زەهاویدا لە ژوورێک لە ژوورەکانی ئەو مزگەوتەدایە. بەڵام ئێستە ژوورەکە رووخاوە و گۆڕەکان ون بوون.

هەروەها بیستوومە کە مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی سێ کوڕی بووە:

یەکەم: مەلا ئەسعەد کە پیاوێکی زانا و بەتوانا و لێهاتوو بووە.

وە پاش ئەوە کە مەلا رەشیدبەگی دارەشمانەیی کە لە لای ئەو فەقێ بووە لە خزمەتی مەلادا ئیجازەی وەرگرتووە و مەلایش کچی خۆی بۆ مارەکردووە و گەڕاوەتەوە بۆ شاری سلێمانی و لە مزگەوتی شێخ سەلامدا دامەزراوە ... مەلا ئەسعەد لە گەڵیانا هاتووە بۆ سلێمانی و لە خزمەتی مەلا رەشیدبەگدا خوێندوویەتی، جا ئەخۆش کەوتووە و بردوویانەتەوە بۆ پێنجوێن و لەوێ لە جیهان دەرچووە.

دووەم لە کوڕەکانی مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی جەلال بووە. ئەم زاتە خوێندەوار بووە، بەڵام مەلا نەبووە.

سێهەم: مەلا ئەحمەد بووە، ئەم یەکەیان خوێندەوار و مەلا و خاوەنپایە بووە. پاش مردنی مەلا لە شوێنەکەیدا لە سەر خوێندنگاکە دانیشتووە.

پاش ماوەیەک ئەگوێزێتەوە بۆ باشماخ کە هەندێ مولکی ئەوی تێدا بووە و پاش چەن ساڵێ هاتەوە بۆ پێنجوێن و لە ساڵی ١٣٥٤ی کۆچیدا هات بۆ بیارە لەگەڵ کۆمەڵێ لە زانایانی پێنجوێندا و، دوایی گەڕایەوە بۆ پێنجوێن و پاش ماوەیەک کۆچی دوایی کرد.

مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی سێ برای بووە: مەلا محەمەدئەمین و مەلا عەبدوڕەحیم و مەلا عەبدوڵلا. ئەم مەلا عەبدوڵلا گەڕیدە بووە و ماڵداریی نەکردووە و لە دوادوایی تەمەنیدا چووە بۆ سەفەری حەج و گەلێ بە شارەکانی عەرەبستانا گەڕاوە.

مەلا محەمەدئەمین و مەلا عەبدوڕەحیمیش خەریکی بازرگانی بوون و کاسبیییان کردووە. مەلا عەبدوڕەحیم زۆر جوان و بەشێوە و دیمەن بووە و نووسەر و شاعیریش بووە. ئەگێڕنەوە ئەڵێن: دڵی بە کچێکەوە بووە ناوی رابیعە بووە، باوکی ئەو کچە بێستانەوان بووە کاڵەک و شووتی فرۆشتووە.

ڕۆژێک مەلا عەبدوڕەحیم ئەچێ بۆ سەر بێستانەکەیان و غەزەلێک لە غەرام و پیاهەڵدانی یارەکەیدا دادەنێت. من سێ شیعرم لەو غەزەلە دەستکەوتووە بۆ یادگار لێرەدا تۆماریان دەکەم:

دڵەی کۆچکەردەم ئەمڕۆ بە جۆشە
وەتەن کەردەی سەرای کاڵەکفرۆشە
مەنی کاڵەک بە چەندە موشتەریتم
فیدای سەنگ و ترازووم ڕوو مەپۆشە

وە لە دوایی غەزەلەکەدا دەڵێت:

کەویی نابێ و بە کەس نایێتە ناو داو
عەجائیب ئاهوویەکی وەحش و تووشە!

وە مەلا عەبدوڕەحمان خوشکێکی بووە ناوی عاسیمە بووە داویەتی بە پیاوێکی کاسب ناوی عەبدولکەریم و لە هۆزی وەستا حسەین بووە.

جا عەبدولکەریم کە لە عاسیمەخانی خوشکی مەلایە دوو کوڕی بووە: مەلا محەمەد و مەلا عەبدوڕەحمان.

کاتێ مەلا محەمەد پێئەگا «ثریا»ی کچی مەلا عەبدوڕەحیمی خاڵۆی مارە ئەکا. مەلا محەمەد ئەم شیعرەی لەم بارەوە نووسیوە:

خیالم شد بکف آرم زمام چهرەی خورشید
بحمدالله که طالع شد «ثریا» رخت ما پوشید

**مەلا محەمەدی خوشکەزای مەلای پێنجوێن:**

ئەم زاتە ناوی محەمەدی کوڕی عەبدولکەریمی کوڕی ئەحمەدە، لە دانیشتووانی شاری پێنجوێن و لە تیرەی حسەینە، چونکە شاری پێنجوێن لە بناغەدا لە دوو تیرەی حسەین و بارام پێکهاتووە.

وە لە بەر ئەوە کە خوشکەزای مەلا بووە بە مەلا محەمـەدی «خـواهر زاد» ناوبـانگی دەرکردووە.

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٨٧ی کۆچیدا لە دایک بووە و مادەی «مظهر علم» بـە حسـابی ئەبجەد پیتەکانی ساڵی لەدایکبوونی ئەم زاتە دیاریی دەکەن.

ئەم زاتە پاش فامکردنەوە لە پێنجوێندا چووەتە قوتابخانـە هـەتا قورئـانی پـیرۆزی تەواوکردووە، دوایی چووە بۆ خوێندنگاکانی ناوچەکان وەکوو:

بانە و موکریان و سابلاغ ... لـە پاشـان گەڕاوەتـەوە بـۆ پێنجـوێن و لـە خزمـەتی خاڵۆیدا خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە، بەڵام لەبەر هەنـدێ ڕووداو لـە نێوانی برایەکی و هەندێ خەڵکی شارەکەدا بە ناچاریی شارەکەی بـەجێ هێشـتووە و چووە بۆ مەریوان و ماوەیەک لەوێ مەلا بووە. پاش ئەوە هاتووەتەوە بۆ نـزارە و چەنـد ساڵ لەوێ مەلا بووە.

جا عوسمان‌پاشای جاف کردوویەتی بە قازیی بۆ شاری پێنجـوێن و هاتووەتـەوە بـۆ شار و لەوێ قەزاوەتی کردووە و بە شەرافەت و سەربەرزیی ڕایبواردووە.

وە لە بەر ئەوە زانایەکی هەڵکەوتوو بووە و گەلێ موتالەعـەی کتێبـەکانی مێـژوو و ڕووداوەکانی جیهانی کردووە چاوی کراوەتـەوە و بـە شـێوەیەکی ڕێـکوپێـک کـاری قازییێتی خۆی بەڕێوە بردووە.

تەفسیرێکی بە زمانی کوردی لە قورئانی پیرۆز نووسیوە بە ناوی «تەزکاری ئیمان بۆ قەومی کوردان»، کاتی خۆی درا بە زانکۆی سلێمانی بۆ ئەوەی چاپ بکرێت، ئومێدمان وایە چاپ بکرێت و سوودی بۆ موسوڵمانان ببێت.

ئەم زاتە نەک هەر بە زەمـانی عوسمـان پاشـای جـاف بـووە بـە قـازیی، بەڵـکو لـە ئەستەمووڵەوە لە سەردەمی حوسێن عەونی بەگی موديری ناحیەی پێنجوێندا نامـەی ڕەسمی بۆ هاتووە و «٧٥» لیرەی عوسمانی بۆ بڕاوەتەوە و دیوەخان و جێگـەی خـۆی پێ ئیدارە کردووە.

وە لە پاش خۆکێشانەوەی دەوڵەتی عوسمانی لە بەر ئەوە کـە میللـەت لێـی ڕازی بووە قەزاوەتەکەی ماوەتەوە و خەڵک هەر بە چـاوی پێشـوو تەماشـایان کـردووە. وە پاش دامەزراندنی حوکوومەتی عێراقیش وەکوو پێشوو فەرمانی قەزاوەتی بۆ هـاتووە و فەرمانداری دین بووە.

بەم جۆرە مایەوە تا لە ساڵی ١٩٣٥ی زایینی و ڕێکەوتی ١٣٥٥ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی «حاجی شێخ»دا بە خاک سپێرراوە. ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێماوە هەردووکیان زانان: مەلا ئەحمەد کە بە مەلا ئەحمەدی قازیی ناسراوە و مەلا هەیبەتوڵڵا، کە ئێستە لە شاری سلێمانیدان.

## مەلا ڕەشیدبەگی دارەشمانەیی

وەکوو باسمان کرد ئەم زاتە یەکێ بووە لەوانەی کە لای مەلای پێنجوێنی ئیجازەیان وەرگرتووە و زاوایشی بووە.

ئەم زاتە لە نەسەبدا کوڕی فەتاحبەگی کوڕی عەلیبەگە و، لە بەگزادەکانی بابانە و مرۆیەکی بە توانا و زیرەک و لێهاتوو بووە و لەگەڵ مەلا حسەینی پیسکەندیدا لە خوێندندا هاوڕێ و وەک برا بوون و لە خزمەتی مەلای پێنجوێندا بەیەکەوە ئیجازەیان وەرگرتووە.

مەلا ڕەشیدبەگ زۆر خۆشەویستی مەلای گەورە بووە و کچی خۆی لێ مارە کردووە. دوای ئەوە لە مزگەوتی شێخ سەلام لە شاری سلێمانیدا دامەزراوە و مودەڕیس بووە و لە دەرسوتنەوەدا سەرکەوتوو بووە و لە ماوەی دەرسوتنەوەیدا شەرحێکی چاکی لە «فریدە»ی سیووتی کردووە و نوسخەی ئەم شەرحە بە خەتی مەلا ئەحمەدی دەروێش هەیە و وا بزانم ئێستە لای حاجی شێخ محەمەدی خاڵە و زۆر پێویستە چاپ بکرێت تا ئەم گەنجە نایابە ون نەبێ و سوودی لێ وەربگیرێ.

ئەم پیاوە زانا پاش ماوەیەک بووە بە مامۆستای «رشدیە»ی سەر بە مەعاریف لە سلێمانیدا و لە سەر ئەو کارە ماوەتەوە تا شەڕی جیهانی هەڵگیرساوە، لەو دەمەدا سلێمانی بەجێهێشتووە و چووە بۆ ئەستەمووڵ و لەوێ بەڕێزەوە لە گەلێ شوێندا فەرمانی ڕەسمیی بووە تا خانەنشین کراوە.

دوای ئەوەی خانەنشین کراوە دەسی کردووە بە خزمەتی حەدیسی پیرۆز و حەدیسەکانی موسلیم و بوخاری کۆکردووەتەوە و دووپاتەکانی لێ لابردوون و بە زمانی کوردی تەرجەمەیەکی جوانی کردووە بە ناوی «اقتران النیرین فی مجمع البحرین». وە پێشەکییەکی دەربارەی ڕێنووسی کوردی نووسیوە و ڕێنووسێکی

تایبەتی بۆ نووسینی کوردی داناوە و خۆی لە سەرانسەری کتێبەکەیدا پەیڕەویی ئەو ڕێنووسەی خۆی کردووە.

کە دەستی کردووە بە دانانی کتێبەکەی هەر فۆرمەیەکی تەواو کردووە بە پۆستەدا ناردوویەتی‌یەوە بۆ لای دۆستی خۆشەویستی مەلا حسەینی پیسکەندی لە سلێمانی، بە هیوای ئەوە کە لە پاشەڕۆژدا چاپ بکرێت.

جارێک لە خزمەتی شێخ بابا ڕەسووڵدا هاتین بۆ سلێمانی و چووینە خزمەتی مامۆستا مەلا حسەینی پیسکەندی و ئەو فۆرمانەی پیشان‌داین و هەندێکمان لێ خوێندەوە.

ئەو فۆرمانە هەروا مانەوە هەتا مامۆستا مەلا حسەین کۆچی دوایی کرد و من لە بیارە دەرچووم و گەییشتمە شاری بەغدا و بووم بە مودەڕیسی خوێندنگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی، جا هەوڵمان‌دا هەتا حاجی میرزا قادری جەببار لە گەورە پیاوانی سلێمانی ئەرکی لەچاپ‌دانی بەرگێکی ئەو کتێبەی گرتە ئەستۆی خۆی و محەمەدعەلی قەرەداغی پێشەکی بۆ نووسی و نووسییەوە بۆ چاپ و سەرپەرشتی چاپی کرد. دوای ئەوە حاجی قادر نرخێکی زۆر کەمی لە سەر دانا، بەڵام بە داخەوە خەڵک باش نەیان کڕی. جا حاجی قادر بە ئوتومبیلی خۆی و لەگەڵ حاجی عەبدوڕەحمانی کوڕیدا بردیان بۆ کوردستان لە ڕێگەی خوادا بەخشیانەوە بە سەر مەلا و مزگەوتەکاندا، بۆ سوودی موسوڵمانان.

دوای ئەوەی خەڵک بیریان کردەوە و لە نرخی کتێبەکە گەییشتن ئێستە بە پەرۆشەوە بە شوێنیدا دەرگەڕێن و دەستیان ناکەوێ[1]. ئومێدمان وایە خودا یارمەتی بدات بەشەکانی دیکەی ئەم کتێبە نایابە چاپ بکەین[2].

مەلا ڕەشیدبەگ پاش تەواوکردنی کتێبی «اقتران النیرین» بە ماوەیەکی کەم لە ساڵی ١٣٦٢ی کۆچیدا لە ئەستەمووڵ کۆچی دوایی کردووە.

---

١ ـ دوای ئەوەی کە حاجی قادر کتێبەکەی بەخشی‌یەوە بە سەر خەڵکدا بیستم زەلامی خوێندەوار هەبووە گەلێ نوسخەی لەو کتێبە دەست‌کەوتووە، جا هاتووە بە چەقۆ ناوی منی لە سەر بەرگەکان و ناوەوەی کتێبەکە کڕاندووە! «م، ع، ق».

٢ ـ لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بەرگی دووەمی ئەم کتێبەم نووسیوەتەوە و پێش هێرشی ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان ئەم بەرگە نێرراوە بۆ بەیرووت بۆ ئەوەی چاپ بکرێت، بەڵام تا ئێستە بێ‌سەر و سۆراخە «م، ع، ق».

هەواڵی نەتەوەی ئەستەموولی نازانم، بەڵام دوو کچی لە عێراقدا شوویان کردووە. یەکێکیان جاربەجار دێ بۆ زیارەتی شێخ عەبدولقادر و بەو بۆنەوە منیش وەک مامی خۆی تەماشا دەکات دێت دیدەنیم دەکات. ئافرەتێکی موسولمان و خاوێنە.

**مەلا حسەینی پیسکەندیی**

ئەم زاتە خەڵکی دێی پیسکەندی نزیکی شاری سلێمانی بووە، لە دەور و بەری ١٢٨٥ی کۆچیدا لە دایک بووە.

باوکی ناوی خەلیفە پیرۆت بووە و خەلیفەی حەزرەتی کاک ئەحمەدی شێخ بووە.

ئەم زاتە پاش فامکردنەوە دەستی کردووە بە خوێندن و هاتووەتە شاری سلێمانی و لە خوێندنگاکانی سلێمانیدا خوێندوویە، کاتێ بووە بە موستەعید و جەنابی مەلا عەبدورەحمانی پێنجوێنی هاتووەتە شاری سلێمانی مەلا حسەین لەگەڵ مەلا رەشید بەگدا لە خزمەتی مەلای پێنجوێندا ئەخوێنن و پاش گەڕانەوەی مەلای گەورە بۆ پێنجوێن لە خزمەتیدا ئەڕۆن بۆ خوێندن و لەوێ ئەمێننەوە هەتا ئیجازە وەرئەگرن، دوای ئەوە دێنەوە سلێمانی و مەلا رەشید لە مزگەوتی شێخ سەلام و مەلا حسەین لە مزگەوتی پیسکەندی ئێستە بە ئیمامەت و تەدریسەوە دادەمەزرێن.

مامۆستا مەلا حسەین کۆگایەکی رێز و زانیاریی بوو، زۆر بە وردەکاری بوو لە دەرزوتنەوەدا. هەر کەسێ لە خزمەتیدا خەریکی خوێندن بوایە، بە مەرجێ خۆی وریا و بەتوانا بوایە، ئەبوو بە زانا و جێگەی سوودگەیاندن بە خەڵک.

وە لە شەرم و حەیادا کەسم بەو شێوە نەدیوە، ئەوەندە بێدەنگ و بەئەدەب و بەویقار بوو، بەڵام ویقارێکی هێمن نەک لەگەڵ فیز و دەمارا، چونکی ئەگەر مرۆیەکی عادەتی، یا منداڵێ، یا ژنێ، یا پیرەژنێ، قسەی لەگەڵدا بکردایە ئەو وەکوو باوک لەگەڵ منداڵی خۆیدا وەڵامی ئەدایەوە و لەگەڵی ئەدوا و تێی ئەگەیاند.

وە زۆر لەخوداترس و بەپارێز بوو، لە گومان خۆی لائەدا چ جای حەرام. باوەڕێکی پاک و پوختی بوو، رێزی لە پیاوی چاک ئەگرت و هەر کەسی لە شوێنی خۆیدا دەناسی.

ئەم زاتە زمانێکی پاکی بووە نەمبیستووە غەیبەتی کەسی کردبێ و گوێی لە غەیبەتی کەس گرتبێ بە پێکەنین و پێخۆشبوون. بە کورتی نازانم چۆن تاریفی

بکەم، من لە خزمەتیدا نەمخوێندووە، مامۆستای گەورەی عەللامەم لە خزمەتیا خوێندبووی و باسی هەندێ لەم ڕەوشتانەی مامۆستا مەلا حسەینم لەوەوە وەرگرتووە. ئەم زاتە لە بەر ئەم ڕەوشتە بەرزانە لە ناو خەڵکدا بەرز بووە و هەموو کەسێ ڕێزی لێ ئەگرت. بە تایبەتی سەییدەکانی بەرزنجە زۆریان خۆش ئەویست و لە ساڵی ١٣٣٠ی کۆچی‌یەوە لە ڕێی خودادا و بێ تەمای هیچ دەرزی بە فەقێیانی مزگەوتی گەورە ئەوتەوە.

ئەم زاتە گەلێ جار تەشریفی ئەهات بۆ خانەقای حەزرەتی مەولانا خالید بۆ دیدەنی مامۆستا شێخ عومەر کە کاتی خۆی لە خزمەتیدا خوێندبووی. مامۆستام زۆر خۆشی ئەویست. چەند خۆشیی پێ‌ئەگەییشت کاتێ ئەهات بۆ خانەقا و بانگی ئەکرد: شێخ عومەر وەرە بزانین وەڵامی ئەم «استفتا»یە چییە؟! وە بەم ڕەوشتە بەرزە ئێمەی فێر ئەکرد کە زۆر جوانە مامۆستا پرس بە فەقێی خۆی بکات بە تایبەتی ئەگەر زانایەکی بەرز و باڵا بێ.

ئەم زاتە سەعات ١١ی عەرەبیی ڕۆژی هەینیی ٢٨ی «ذی القعدە»ی ساڵی ١٣٦٧ی کۆچی ڕێکەوتی ١٩٤٨ی زایینی لە جیهان دەرچوو، لە گۆڕستانی گردی سەیواندا بە خاک سپێررا.

ئەم زاتە کوڕێکی لێ بەجێ‌ماوە ناوی عەبدوسسەلامە، مەلایە و لە خوو و ڕەوشتا نموونەی مامۆستای باوکی‌یەتی. بە داخەوە لەم دوایی‌یەدا بە قەزا و قەدەر چاوی کوێر بووە، لە خودام ئەوێ کە شیفای بۆ بێت و لەم تاریکی‌یە ڕزگار ببێ.

## بنەماڵەی موفتی مەلا عەزیز

مەلا عەزیزی کوڕی حاجی مەلا ئەمینی کوڕی حاجی مەلا ئەحمەدی چاومار، کوڕی مەلا مەحموودی، کوڕی مەلا ئەحمەدی، کوڕی مەلا محەمەدی دێلێژەیی پیرحەسەنی. جا هەر لە سەرەوە باسیان ئەکەین:

### مەلا محەمەدی پیرحەسەنی

ئەم زاتە لە دێی دێلێژەدا لە دایک بووە و پاش فامکردنەوە دەستی کردووە بە خوێندن و وردەوردە سەرکەوتووە تا بووە بە موستەعیدێکی بە تەوانا. جا چووە بۆ خزمەتی مەلا محەمەدی ئیبنولحاج لە جێشانە و، لای ئەو خوێندوویەتی تا ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بۆ دێلێژە. وە بە یارمەتی شێخ رەزای کوڕی شێخ ئیسماعیلی ولیانی خوێندنگایەکی گەورەی پێکەوە نا و دەرسی گوتەوە هەتا لە ساڵی ١٢٧٣ی کۆچیدا لە دێلێژە کۆچی دوایی کرد و هەر لەوێ بە خاک سپێررا.

### مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەمەد

ئەم زاتە دوای خوێندن لە سەردەمی باوکیدا بووە بە مەلایەکی زانای تەوانا و پاش کۆچی دوایی باوکی لە جێگەکەیدا دانیشتووە و تەدریسێکی چاکی کردووە.

ئەم مەلا ئەحمەدە زانایەکی پایەبەرز بووە و شاعیرێکی وردەکار و بەتوانا بووە. ئەگێڕنەوە: خزمەتکارێکی بووە ناوی «رەشە» بووە، رۆژێک بە گاڵتەوە دەم ئەبا کچێک ماچ بکا، کچەکە تووڕە ئەبێ، مەلا ئەحمەدیش ئەیەوێ دڵخۆشیی بکا ئەم شیعرە دەڵێت:

یاقووتە لەبی لەعلت، یا قووتی رەوانی دڵ؟
رەشمارە سەری زوڵفت، یا خود «رەشە» مارێکە؟

واتە: لێوە سوورە ناسکەکەت کە وەکوو لەعل وەهایە پــێم بڵــێ: یاقووتــە یــا خــود قووتێکی سافی گەوارایە بۆ دڵی عاشقان؟ وە سەری زوڵفت رەشمــارە و خەڵــک پێــی گیرۆدە ئەبن و پێیانەوە ئەدا و ئەکەون؟ یا خود «رەشە»ی خزمەتکارم وەکوو ماری بێ حەیا وایە دەم دێنێ بە لای لێوەکانتەوە؟

وا زانراوە ئەم مەلا ئەحمــەدە لــە ساڵــی ١٢٠٦ی کۆچیــدا لــە دێلێــژە لــە جیهــان دەرچووە و مەلا مەحموودی کوڕی کە لە خزمەتی باوکیدا بووە بــە زانــا لــە جێگەیــدا دانیشتووە.

## مەلا مەحموودی کوڕی مەلا ئەحمەد

ئەم مەلا مەحموودە لە جێگەی مەلا ئەحمەدی باوکیدا لە سەر خوێندنگای دێلێژە دائەنیشێ، تا شاری سلێمانی دروست ئەکرێ لە ساڵی ١١٩٩ی کۆچیدا. دوای ئەوە لە دێلێژە ئەگوێزێتەوە بۆ سلێمانی و ئەبێ بە مودەڕیس لە مزگەوتی گەورە وەکوو چــۆن شێخ مەعرووفی نۆدێیی کراوە بە مودەڕیسی یەکەم، وە بە یەکــەوە دەرس دەڵــێنەوە، بەڵام دەرزوتنەوەیەکی وەها لە کوردستانا وێنەی نەبووە.

مەلا مەحموود بەو شێوە لە ســەر دەرزوتنــەوە دەمێنێتــەوە تــا لــە ساڵــی ١٢٣٩ی کۆچیدا بە یەکجاریی ماڵئاوایی لە جیهان ئەکات.

## مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحموود

مەلا مەحموودی دێلێژەیی پیرحەسەنی چوار کوڕی بووە: مەلا ئەحمەدی چاومــار و مەلا یەحیا و مەلا حەسەن و مەلا حسەین.

مەلا یەحیا زانایەکی بەرز و بەڕێز بووە چووە بۆ ئەستەموول و لــەوێ دامــەزراوە تــا کۆچی دوایی کردووە و شوێنەواری ون بووە.

مەلا حەسەنیش چووە بۆ ناحیەی مەرگە و لەوێ بووە بە مودەڕیس و نەتەوەی لــێ کەوتووتەوە.

وە مەلا حسەین چووە بۆ دێلێژە و لە سەر مزگەوتەکــە دانیشــتووە. جــا لــەم مــەلا حسەین ناوە مەلا محەمەد بووە و لە مەلا محەمەد مەلا ئەحمەد بووە کــە هــاتووە بــۆ

شاری سلێمانی و لە مزگەوتی خومخانـەدا بـووە بـە مـودەڕیس و حـەجی کـردووە و مەلایەکی زانا و تەوانا بووە.

کاتێک ئەم مەلا ئەحمەدە کۆچی دوایی کردووە مەلا حەمـە سـەعیدی کـوڕی لـە جێگەیدا دانیشتووە و مەلا حەمە سەعید زانایەکی باش و بەتوانا بووە، بەلام لە کۆتایی ژیانیدا نەخۆش کەوت و ئەو نەخۆشینەی لەگەڵدا مایەوە هەتا کۆچی دوایی کرد.

بەلام دیاریترین کوڕی مەلا مەحموود مەلا ئەحمەدی چاومار بووە.

کـاتی خـۆی لـە خزمـەتی باوکیـدا خوێندوویـەتی، هـەروەها لـە خزمـەتی مـەلا عەبدوڵڵای ڕەشدا و، لە خزمەتی شێخ مەعرووفی نۆدێیدا خویندوویە و، لە ئەنجامدا لای شێخ مەعرووف ئیجازەی وەرگرتووە و بووە بە مودەڕیس لـەو مزگەوتـەدا کـە بـە مزگەوتی موفتیی بەناوبانگە و لە خواری سەراوەیە.

ئەم زاتە ئەوەندە زانا و خاوەن پایە و مایە بووە لە هەموو لایەکەوە فەقێی چاکی بـە توانای لێ گردبووەتەوە، وەکوو مەلا محەمەدی زەهاوی ـ کە دوایـی بـوو بـە مـوفتیی زەهاوی ـ و مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی و سەیید ئەحمەد فـائیزی بـەرزنجی و ... و وێنەهای ئەمانە.

ئەم مەلا ئەحمەدە زۆر مووەففەق و سـەرکەوتوو بـووە، لـە نزیکـی مزگەوتەکەیـدا خانووی بۆ خۆی کردووتەوە و مەدرەسەیەکی گەورەیشی بەدەمەوە دروست کردووە.

مەلا ئەحمەد ئەمنەخانی کچی سلێمان پاشای بابان خوشکی فاتمەخان و ئەحمەد پاشای بابانی مارە کردووە و لەم ئەمنەخانە کوڕێکی بووە ناوی ئەمین بووە کە بووە بە جێگەداری.

مەلا ئەحمەد لە مێـژووی ١٢٥٥ی کۆچیـدا بـووە بـە سـەرۆکی مـەلاکانی شـاری سـلێمانی و لـە ساڵـی ١٢٨٠دا چـووە بـۆ حـەج و لـە سـەفەری حەجـدا گـیرۆدەی گەردەلوول و هەوایەکی نابار بوون و حاجی مەلا ئەحمەد ئەکەوێتـە نـاو لم و کـۆچی دوایی دەکات و شێخ ڕەزای برای حاجی شـێخ عـەلی تاڵـەبانیی بـۆ ئیشـارە بـۆ ئـەم کارەساتە بە زمانی کاکەیییەکانەوە دەڵێت:

«بحمد الله» نەما کـاک ئەحمـەدی شـێخ

«زەهاوی» مرد و گۆڕی گوم بوو «چاومـار»

ئەگەر بێ شـێخ عـەلی «دفـع الـبلا» بـێ
ئیتــر دنیــا ئەبێتــە عــەینی گوڵــزار

**حاجی مەلا ئەمینی کوڕی مەلا ئەحمەد**

ئەم مەلا ئەمینە مەلایەکی زانا و بەتوانا بووە، لە ساڵی ١٣٠٣دا بـووە بـە حـاکم لـە سلێمانیدا و لە ساڵی ١٣٠٨دا بووە بـە مـوفتیی سـلێمانی و مەدالیـەی مەجیـدی بـۆ هـاتووە و کـراوە بـە وەکیلـی دائیـرەی مەشـیەخەتی ئیسـلامی لـە سـلێمانیدا و لـە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیـددا سـەفەری ئەستەمووڵـی کـردووە و کتێبێکـی لـە عیلمی کەلامدا داناوە و ناوی نـاوە بـە «الرسـالة الحمیدیـة» و پێشکەشـی کـردووە بـە بارەگای بەرزی «شیخ الاسلام» و لێی وەرگیراوە.

نوسخەیەکی ئەم کتێبە بە خەتی خۆم لای من هەیە و حاشیەم لە سـەر نووسـیوە، هێشتا چاپ نەکراوە، پشت بە خودا چاپ دەکرێت.

حاجی مەلا ئەمین لە ساڵی ١٣١٥دا کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیواندا بـە خاک سپێرراوە. ئەم زاتە چوار کوڕ و سێ کچی بووە. کوڕەکان: مەلا ئەحمەد و مـەلا مــەحموود و مســتەفا و عەبدولعــەزیز. کچــەکانیش: عایشــەخان و ئامــەخانم و شەمسەخان. جا عایشەخان شووی کردووە بە ئەحمەدبـەگی بابـان و ٤ کـوڕی بـووە: سەعیدبەگ و ساڵحبەگ و رەمزی و نووریبەگ.

ئامەخانیش شووی کردووە بە مەلا مارفی قـازیی و دوو کـوڕ و کچێکـی لـێ بـووە: رەمزی ئەفەندی و نووری ئەفەندی، وە عەتیـەخان کـە شـووی کـردووە بـە پـوورزای خۆی.

وە شەمسەخان شووی کردووە بە سەیید هادیی کوڕی سـەیید ئیبراهیمـی کـوڕی سەیید عەبدولقادر ئەفەندی لە کەرکووک.

**مەلا عەبدولعەزیزی موفتیی**

پاش کۆچی دوایی مەلا ئەمینی موفتیی جـەنابی مـەلا عەبدولعـەزیزی کـوڕی لـە جێگەکەیدا دانیشتووە.

ئەم زاتە پیاوێکی زانا و بەتوانا بووە و کراوە بە موفتیی سلێمانی لە جێگەکەی باوکیدا، وە کراویشە بە ئەندامی کۆڕی زانیاری عوسمانی و مەدالیەی مەجیدی دراوەتێ و کراوە بە سەرۆکی ئەنجومەنی مەعاریفی سلێمانی و وەکالەتی دائیرەی مەشیەخەتی ئیسلامیی دەوڵەتی عوسمانی دراوەتێ. وە لە مێژووی ١٣١٨دا کراوە بە موفتیی بۆرسە لە تورکیا، بەڵام ئەم نەرۆییشتووە و لە ساڵی ١٣٢٠دا کردوویانە بە موفتیی شاری «ئەدرنە» بەڵام ئەمیشی وەرنەگرتووە.

وە پاش دامەزرانی حوکوومەتی عێراقیش مەلا عەزیز هەر لە سەر فەرمانی «افتا»ی خۆی ماوەتەوە.

مەلا عەبدولعەزیزی موفتیی چوار ژنی هێناوە: یەکەم دایکی حەمە کاکەیە کە لە سەییدەکانی بەرزنجەیە. دووەم: کچی سەیید ئیبراهیمە کە پوورزای خۆی بووە. سێهەم: رەحمەخانی کچی عەلیبەگی خالیدبەگی بابان، ئەم ژنە دایکی عەبدولقادر و عەبدوڕەحمان و عەبدولڵلا و منداڵەکانی دیکە بووە. چوارەم: ئەمنەخانی کچی یەحیابەگی کوڕی عەلیبەگی خالیدبەگی بابانە، دوو کچی لێی بووە شیرین و شەوبۆ.

## مەلا مەحموودی کوڕی حاجی مەلا ئەمینی موفتیی

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٩٦ی کۆچیدا هاتووەتە دنیاوە و لە خوێندنگای خۆیاندا خوێندوویەتی و خەریکی خوێندنی نەحو و سەرف و شەرع و ... بووە.

وە لە پاش مردنی حاجی مەلا ئەمینی باوکی لەگەڵ مەلا عەبدولعەزیزی برایدا چووە بۆ خوێندنگای بیارە و لە خزمەتی مەلا عەبدولقادری مودەڕیسدا خوێندوویانە و ماوەیەک لە بیارە ماونەتەوە.

دوای ئەوە رۆیشتوون بۆ پێنجوێن و لای مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی خوێندوویە هەتا مەلا عەبدولعەزیزی برای خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە و هاتووەتەوە بۆ شاری سلێمانی، مەلا مەحموودیش هەر چەند تەواوی نەکردووە لەگەڵ مەلا عەزیزی برایدا هاتووەتەوە و لەو ئەندازە زیاتری نەخوێندووە، بەڵام ژیانی خۆی لە تاعەت و تەقوادا سەرف کردووە و لە بەر ئەوە پیاوێکی کۆمەڵایەتی بووە زۆربەی کاتی لە دیدەنی دۆستان و هاوڕێیانیدا بە سەر بردووە.

مەلا مەحموود پیاوێکی ئەدیب و شاعیرێکی بەناوبانگ و هەڵکەوتوو بووە. نازناوی «بێخود» بووە و زۆربەی شیعرەکانی لە ستایشی پێغەمەردا داناوە. زیاد لەوانەیش باسی خەلیفەکانی حەزرەت و یارانی و پیاوچاکانی موسولمان دەکات. بە تایبەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و شێخە مورشیدەکەی کە شێخ نەجمەدینی کوڕی شێخ عومەر زیائەدین بووە.

وە گەلێ شیعریشی بە بۆنەی کۆچی دوایی هاوەڵان و دۆستانیەوە وتووە و کە یەکێک لەو دۆستانەی لە جیهان دەرچووە ئیتر بێخود دنیای لێ تاریک بووە و بە شیعری بەسۆز و جگەرسووتێن ئەو برادەرەی لاواندووەتەوە. لە ناو ئەوانەیشدا بە تایبەتی لە مردنی شێخ عەبدولکەریمی ئەحمەدبرندە و شێخ بابا رەسوولی بێدەنیدا هەر بەجارێ ئاگری تێچووە و ئەو زاتانەی وەها لاواندووەتەوە مرۆی بە هەست ناتوانێ گوێ لە شیعرەکانی بگرێت!

هەر کەس بیەوێ دەتوانێ دیوانی بێخود بخوێنێتەوە تا لەو دڵسۆزی و دۆستایەتیە راستەقینە بگات.

بێخود لەگەڵ ئەوەدا دەستی ئەرژیشت و دەرامەتی ژیانی هەبوو ژنی نەهێنا و نەکەوتە دنیاوە و هەر بە رەبەندی ژیا تا لە ساڵی ١٣٧٦ی کۆچیدا لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان بە خاک سپێررا.

دایکی مەلا مەحموود و مەلا ئەحمەد و مەلا عەزیزی موفتیی لە سەییدەکانی نەوەی شێخ عەبدولکەریمی خەرقەڕەشی خەڵکی گورگەدەری شارباژێر بووە.

مەلا عەزیزی موفتیی حەمە کاکە و عەبدورەحمان و عەبدولقادری[1] لێ بەجێما.

حەمەکاکە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: کەمال و جەمال. کەمال گەلێ فەرمانی میری دیوە و ئێستە سەرۆکی مەحکەمەی تەمییزی عەسکەرییە و، پیاوێکی بەرز و بەڕێز و خاوەنی رەوشت و خووی پیاوانەیە و گەلێ یارمەتی خەڵک ئەدات و خزمەتیان دەکات.

جەمالیش فەرمانبەرە لە دەزگای رۆشنبیری کوردی و خزمەت دەکات و پیاوێکی باشە.

---

١- بە پێی لاپەڕەی پێشوو عبدوللا و شیرین و شەوبۆ و منالەکانط دیکەش هەن کە ناوی ئەوان نەنووسراوە. ن.ب.

کاک عەبدوڕەحمانی موفتیش خوێندنی تەواو کرد و، چووە سیلکی عەسکەری و بە پاکی و ڕەوشتبەرزی خزمەتی کرد تا گەییشتە پلەی «لیوا» و دوای ئەوە خانەنشین کرا و، ئێستە ماڵی لە بەغدایە و چەند کوڕ و کچی خاوەنی خوو و ڕەوشت و بەدینی هەیە.

هەر چەن زەمانەی تەدریس نەماوە
زەمانەی دین و تەقدیس هەر ماوە
خیدمەتی ئیسلام ئەسنافی زۆرە
چاکە بۆ عالەم بە سەدها جۆرە
ئادەمیی وێنەی داری بە بەرە
بێجگە لە بەری خاوەن سێبەرە
ئەوەی سەمەری ببێ بۆ عالەم
سێبەری ببێ بۆ بەنی ئادەم
پێویستە دۆعای بۆ بکرێ دائیم
تا لەسەر سەمەر بمێنێ قائیم

## بنەماڵەی مەلا عوسمانی باوکی حاجی مەلا عەلی

مەلا عوسمان، کوڕی حاجی ئیسماعیلی، کوڕی مەلا ئەحمەدی، کوڕی مەلا فازیلی، کوڕی مەلا حەسەنی کوڕی مەلا میرەیە.

بنەماڵەکەیان لە دێی دەرگەزێن لەلای شاری هەمەداندا بووە و لە نەتەوەی شاعیری ناودار (باباطاهیر)ی هەمەدانین و بە قەزا و قەدەر کۆچیان کردووە بۆ عێراق و لە ناوچەی سلێمانیدا دامەزراون. وە دوای دروستکردنی سلێمانی هاتوونەتە شارەوە و مەلا عوسمان لە ساڵی ١٢٢١ی کۆچیدا لە سلێمانی لەدایک بووە.

پاش فامکردنەوە دەستی کردووە بە خوێندن و قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە و دوایی کتێبە وردەکانی خوێندووە، جا دەستی کردووە بە زانیارییەکانی نەحو و سەرف و بەلاغە و مەنتیق و شەرع و... زانیارییەکانی دیکە.

وە لە رۆژگاری خوێندنیدا بە خزمەتی حەزرەتی شێخ عوسمانی سیراجەدین گەییوە تەمەسوکی پێ کردووە و سلووکی تەریقەتی نەقشبەندیی کردووە هەتا ئیجازەی عیلم و خەلافەتی بەیەکەوە وەرگرتووە و بە پایەی بەرز گەیشتووە و لەسەر فەرمانی شێخ عوسمان هاتووە بۆ شاری سلێمانی و خەریکی ئیرشاد بووە.

بە گوێرەی ئەوەی لە باوەڕپێکراوانم بیستووە ئەم زاتە یەکێ بووە لەوانەی کە لە ناو خەلیفەکانی شێخ عوسماندا پلەی تایبەتی بووە، وەکوو شێخ عەبدوڵڵای فوتبی قەرەداغی و شێخ نەبی ماویلی و مەلا ئەبووبەکری هەولێری و شێخ محەمەدی چۆلی و... ئەم زاتە سوودێکی گیانی زۆری بۆ موسڵمانان بووە و حەزرەتی شێخ عوسمان گەلێ (توجهات) و چاودێری تایبەتی بۆی بووە.

لە باوەڕپێکراوم بیستووە: جارێک شێخ عوسمان بۆ لای مەلا عوسمان ئەنووسێ: فلانە شەوی جومعە ئاگادار بە لە فلان کاتدا (توجە)ت لێ ئەکەم. ئەویش لەو کاتەدا

دانیشتووە و چاوەڕوانی تەوەجوهی کردووە کاتێ بە خۆی ئەزانێ گڕێ ئاگر لەسەر دڵی بەرز ئەبێتەوە تا خەڵک فریای ئەکەون و ئەیکووژێننەوە!

مەلا عوسمان گەلێ خزمەتی دینی کردووە و گەلێ خزمەتی ئەهلی تەریقەتیشی کردووە و دەرسی وتووەتەوە و ئامۆژگاری خەلکی کردووە و خەتم و تەهلیلەی لەسەر یاسای نەقشبەندیی بووە لە هەمان کاتدا ئەدیب بووە و دیوانی شیعری هەیە بە نازناوی (فائیق) چاپ کراوە.

مەلا عوسمان لە ساڵی ١٣٠٧ی کۆچیدا لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە ژوورێکی تایبەتیدا بەخاک سپێرراوە.

ئەم زاتە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: مەلا عەلی و مەلا ساڵح. مەلا عەلی لە جێگەی باوکیدا دانیشتووە و ئیرشادی کردووە و موریدەکانی باوکیشی پەسەندیان کردووە.

لە دەوری ساڵی ١٣٤١ی کۆچیدا کە خۆم لە خانەقای مەولانا خالید لە خزمەتی مامۆستام شێخ عومەری قەرەداغیدا ئەمخوێند لە کاکە سوورم بیست کە پیرێک بوو لە خانەقا دادەنیشت، وتی پاش ئەوە کە مەلا عەلی لە جێگەی مەلا عوسماندا دانیشت، مەلا عەلی ناردی بە شوێن مندا، چووم بۆ لای، نامەیەکی نووسی بۆ خزمەتی حەزرەتی شێخ عومەری زیائەدین بۆ داوای تەوەججوهات و یارمەتیدانی لەبارەی ئیرشادەوە و لە پشتی زەرفی کاغەزەکەی نووسیبوو: «یا ضیاءالدین ضئنی»! منیش نامەکەم برد، لە هەڵەبجە بیستم کە شێخ وا لە خانەقای بیاوێڵەدا، چوومە خزمەتی و نامەکەم پێشکەش کرد. ئەویش وەڵامی نامەکەی بۆ نووسی‌یەوە و تکاکەی قەبووڵ کرد و دۆعای بۆ کرد و عابایەکی بە خەڵات بۆ نارد، منیش بۆم هێنا کە هاتمەوە بۆ سلێمانی و وەڵامی نامەکە و دیاری‌یەکەم دایێ گەلێ شادمان بوو، لەو رۆژە بەدواوە مەلا عەلی هەمیشە لە سەرکەوتن و بەرزەوەبووندا بوو و حەجی کرد و موریدی زۆری لێ گردبوونەوە و لەسەر ئەم شێوە مایەوە تا کۆچی دوایی کرد.

پاش کۆچی دوایی ئەم حاجی مەلا ساڵحی برای لە شوێنەکەیدا دانیشت و پاش مردنی ئەمیش، مەلا ئەحمەدی کوڕی لە جێگەیدا دانیشت. وە دوای مردنی مەلا ئەحمەد مەلا جەلالی کوڕی لە جێگەکەدا دانیشت تا کۆچی دوایی کرد. کوڕێکی لێ بەجێماوە ئێستە لە زانکۆی شەریعەی (جامع الازهر)دایە.

## بنەماڵەی مەلا عوسمانی باڵەخی

کە بە مەلا عوسمانی بچووک ناسراوە لەبەر ئەوە کە پاشمەرگە بووە و لەسەر وەسیەتی باوکی ناویان ناوە عوسمان.

ئەم مەلا عوسمانە بچووکە کوڕی مەلا عوسمانی گەورەی باڵەخی‌یە کە پاش دامەزراندنی شاری سلێمانی لە باڵەخەوە هاتووەتە سلێمانی و لە جێگەی خانەقای مەحویی ئێستەدا مزگەوتێکی بچووکی کردوەتەوە و خەریکی پێش‌نوێژی و دەرزوتنەوە بووە تا کۆچی دوایی کردووە.

ئەم مەلا عوسمانی گەورە دۆستی شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی بووە و فەقێ خالیدی میکائیلی، کە دوایی بوو بە مەولانا خالید باوکی ناسراوی شێخ عەبدولکەریم بووە. جا شێخ عەبدولکەریم لەسەر ئەم ناسراوی و دۆستایەتی‌یە مەولانا خالیدی هێناوە بۆ خزمەتی مەلا عوسمانی گەورەی باڵەخی کە لە حەفتەیەکدا دوو دەرز یا دەرزێکی پێ بڵێ. بە کورتی لە ماوەی ژیانیدا چاودێری ئەکات.

وەک وتمان دوای مردنی ئەم مەلا عوسمانە ژنەکەی کوڕێکی ئەبێ و لەسەر وەسیەتی خۆی ناوی دەنێن عوسمان و بە هەتیوی گەورە ئەبێ و ئەینێنە بەر خوێندن و لەو کاتەدا مەولانا خالید لە هیندوستانەوە بە پایەی مەشیەخەتەوە دێتەوە و خەڵک ئەچن بۆ زیارەتی. مەلا عوسمانی بچووکیش کە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا دەبێ ئەچێ بۆ زیارەتی مەولانا خالید. کاتێ ئەگاتە نزیکی مەولانا و لەو کاتەدا خەڵکێکی زۆری بە دەورەوە ئەبێ، حەزرەتی مەولانا بانگ ئەکا لە خەڵکەکە: ڕێگەی ئەو کوڕە بچکۆلە بکەن یا بێ بۆ لام. کاتێ ئەگاتە خزمەتی زۆر میهرەبانی لەگەڵدا دەنوێنێ و کڵاوەکەی سەری خۆی دائەگرێت و ئەینێتە سەر سەری عوسمانی بچووک و ئەڵێ: ڕۆڵە من قەرزاری باوکتم، ئەمەی کە کردم ئەوە قەرزەکەم دایەوە.

جا ئیتر مەلا عوسمانی بچووک لە پێشکەوتندا دەبێت و ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر تێ ئەکۆشێ و ئەبێ بە پیاوێکی سەرامەد و خوێندن تەواو ئەکات. جا تەمەسوک بە شێخ عوسمانی سیراجەدین ئەکا و سلووک تا لە تەریقەتدا پێئەگات، پاش ئەوە کە شێخ عوسمان ئەڕواتەوە بۆ هەورامان مەلا عوسمان تاقە جارێ چووە بۆ خزمەتی شێخ عوسمان، کە ئەگاتە خزمەتی شێخ ئەیکا بە خەلیفە و شاربازێڕ و دەوروبەری سلێمانی ئەداتە دەستی و ئەویش ئیرشادیان ئەکا و بە هەموو جۆرێ تەربیەتیان ئەکا. وە بەم جۆرە خەۆیکی ئیرشاد ئەبێ تا کۆچی دوایی ئەکات و لە گردی شێخ محێدیندا بەخاک ئەسپێررێ.

### مەلا محەمەدی مەحوی

کوڕی مەلا عوسمان، ئەم زاتە پیاوێکی هەڵکەوتوو بووە، دیاریترینی کوڕەکانی باوکی بووە. لە سەرەتاوە لە مزگەوتی خۆیانا خوێندوویەتی، لە پاش گەورەبوون و تێگەیشتن بە فەقێتی چووە بۆ شاری سابلاخ بۆ لای مەلا عەبدوڵلای پیرەباب و نزیکی سێ ساڵ لەلای ئەو ماوەتەوە، ئەوسا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و لە خزمەتی محەمەد فەیزی ـ موفتی زەهاوی ـدا ماوەتەوە.

مەلا محەمەدی مەحوی لە خزمەتی موفتی زەهاویدا ئیجازە وەرئەگرێ و لە ساڵی ١٨٦٢دا کراوە بە مامۆستای مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم، پاش ماوەیێ بێتاقەت ئەبێ و ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و ئەبێ بە ئەندامی مەحکەمە هەتا باوکی لە ژیاندا بووە. وە دوای ئەوە باوکی کۆچی دوایی ئەکا ئیتر ئەویش دەسبەرداری دنیا ئەبێ و دێتەوە مزگەوت و دەست ئەکا بە دەرس‌وتنەوە و ڕێنۆمایی و، گەلێ فەقێ لەملاولاوە دێن بۆ لای. وە لەبەر ئەوە کە باوکی خەلیفەی سیراجەدین بووە خۆیشی تەمەسوک بە شێخ محەمەد بەهادینی کوڕی ئەکا.

پاش ماوەیەک ئەچێ بۆ حەج و دوای ئەوە ئەچێ بۆ ئاستانە و لە ئاستانە ئەچێتە لای سوڵتان عەبدولحەمید و سوڵتان زۆر ڕێزی ئەگرێت و فەرمان دەردەکا خانەقای بۆ بکەنەوە. جا دێتەوە بۆ کوردستان و ئەم خانەقای مەحوی ئێستە لە سلێمانی ئەکاتەوە و لەو شوێنەدا لەگەڵ خزمەت‌کردنی ئیسلامدا خەریک دەبێت، تا لە ساڵی ١٩٠٤ی زاییندا لە جیهان دەرئەچێت.

ئەم زاتە مەلا عومەر و مەلا خالید و مەلا عەزیزی لێ بەجێماوە، کە سێ کوڕی پیاوانەی ڕەوشت‌بەرز بوون.

## بنەماڵەی سەیدەکانی عەبابەیلێ لە بناری شارەزوور

### شێخ حەیدەری عەبابەیلێ

شێخ حەیدەر، کوڕی شێخ ئیبراهیمی، کوڕی شـێخ محەمـەدزەکیی، کـوڕی شـێخ عەبدولکـەریمی، کـوڕی شـێخ حەیـدەری، کـوڕی شـێخ عەبدولـلای، کـوڕی شـێخ حەیدەری کوڕی شێخ بابا ڕەسووڵی گەورەی بەرزنجی‌یە.

شێخ حەیدەری سێهەم کە هاتووەتە عەبابەیلێ کوڕی شـێخ ئیبراهیمـە کـە چـوار کوڕی بووە، شێخ حەیدەر و شێخ عەبدوڕەحیم و شێخ ئەحمەد و شێخ عوسمان.

شێخ حەیدەر شەش کوڕی بووە: شێخ عەلی، شـێخ کـەریم، شـێخ سـەعید، شـێخ سلێمان، شێخ عەزیز، شێخ حەسەن.

### شێخ عەلی کوڕی شێخ حەیدەر

شێخ عەلی پیاوێکی بەدەسەڵات بووە و لە حوکوومەتی دەوڵەتی عوسمانیدا بـەڕێز بووە و فەرمانداری ناوچەی شارەزوور و قەرەداخ و شەمێران و هەورامان و پێنجـوێن و سرووچک و بەرزنجە بـووە و سـەر بـە میرەکـانی بابـان بـووە و دەوڵـەتی عوسمـانی کەوتووەتە جەنگ و هەرا لەگـەڵ لەشـکری ئێرانـدا و لەشـکری ئێـرانی شـکاندووە و ناوچەی جوانڕۆی گرتووە تا نزیکی کرماشـان. وە چـەن ساڵـێ لـە دێـی ڕەوانسـەردا ماوەتەوە و کاتی هاوینان (سەرا و لوولەپـەڕ) ئێسـتەیش شـوێنێکە بـە مەنزڵـی شـێخ عەلی عەبابەیلێ ناسراوە. هەروەها لەو وڵاتەدا جۆگەیەکی بۆ کشت‌وکـاڵ هەڵـگرتووە، ئێستە بە جۆگەی شێخ عەلی عەبابەیلێ ناسراوە.

وە شێخ عەلی لەگەڵ ئەوەدا کە پیاوی دنیا بووە لـە هـەمان کاتـدا پیـاوی دیـن و خاوەن تەقوا بووە و دۆسی مـەلا و زانایـان بـووە، بەتایبـەتی سـەیید عەبـدوڕەحیمی مەولەوی یەکە دۆستی بووە. وە پاش ئەوە کە دەستی شـێخ عـەلی لـە سەرپەرشـتی

شەمێران هەڵگیراوە و هاتووەتەوە بۆ عەبابەیلێ ئیتر مەولەویش دوای ئەو شەمێران بەجێ دێڵێ و دێتەوە بۆ دێی سەرشاتە.

شێخ عەلی پێنج کوڕ و پێنج کچی بووە. کوڕەکان سەیید ئەحمەد و شێخ محەمەد و شێخ مەحموود و شێخ محەمەدئەمین و شێخ محەمەدسەعید. کچەکانیشی: زوبەیدە و خەدیجە و پیرۆزە و کافیە و حەبیبە.

## کوڕەکانی شێخ عەلی عەبابەیلێ

یەکەم: سەیید ئەحمەدی کوڕی شێخ عەلی کە جێگەداری باوکی بووە و خاوەن دەسەڵات بووە، وە پاش ئەوە کە سەیید ئەحمەد پیر بووە ئەو دەسەڵاتە کەوتووەتە لای شێخ محەمەدی برای.

سەیید ئەحمەد دوو ژنی هێناوە، یەکەم سەلمەخانی کچی قادربەگی بابان. لەم ژنە چوار کوڕ و کچێکی بووە. کوڕەکان: شێخ حسەین و شێخ مارف و شێخ عەبدوڵلا و شێخ قادر. کچەکەیش فاتیمەیە.

جا لە شێخ حسەین شێخ محێدین بووە کە منداڵی لێ بەجێ نەماوە. وە لە شێخ مارف دوو کوڕ بەجێماون: شێخ فەرەج و شێخ سدیق.

وە شێخ عەبدوڵلا سێ ژنی هێناوە. یەکەم عەدلەی کچی شێخ محەمەد، لەم ژنە شێخ حەمەسالح و شێخ حەمەسەعید بووە. دووهەم: رەعنای کچی شێخ بابا، لەم ژنە شێخ محەمەدئەمین و شێخ غەفوور بوون. سێهەم: فاتمەی مەلا حامید، لەم ژنە شێخ غەریب و کچێ بە ناوی ئامینە بووە.

شێخ قادری کوڕی سەیید ئەحمەد پیاوێکی باش و لەخوداترس بووە و بووە بە موریدی حەزرەتی شێخ عومەری بیارە و بووە بە خەلیفەی. ئەم زاتە وەنەوشی کچی ئەڵلاوەیسی کۆکۆیی هێناوە و دوو کچی لێی بووە. یەکەم: سەلما کە شووی کردووە بە مەلا محێدینی خەرپانی و دوو کوڕی بووە: محەمەد و عەلی. کچەکەی تری حەبیبە، شووی کردووە بە مەلا مستەفای کوڕی مەلا محەمەدی رەباتی، کە موریدی حەزرەتی شێخ عومەر بووە. لەم ژنە دوو کوڕ و کچێکی بووە. کوڕەکان مەلا محەمەد زاهید و مەلا خالید.

وە فاتمەی کچی سەیید ئەحمەد شووی کردووە بە مەلا نەجمەدینی کوڕی حاجی محێدینی کوڕی مەلا نەزیری تەوێڵە. ئەم کچەی چوار کوڕی بووە: مـەلا زەینـەدینی باوکی مەلا محەمەدی تەوێڵەیی، مەلا نیزامەدین، مەلا عەبدولئەحەد، مەلا محێـدینی بە باباحاجی ناسراو. ئەمانە هەموو نەتەوەیان هەیە.

وە شێخ محەمەدئەمینی کوڕی شێخ عەبدوڵلا لە ساڵی ١٩٢٥ی زایینیدا لـە دایـک بووە و چووەتە خوێندنی رەسمی و خوێندنی تەواو کردووە و بووە بە مامۆستا و دوایی چەن فەرمانی دیکەی بینیوە. لە ئەنجامدا بووە بە «قائم مقام» و دوای ئەوە خانەنشـین کراوە و ئێستە لە ژیاندایە.

دوەم ژنی سەیید ئەحمەد، شاپەروەری کچی عەزیزبەگی وەڵەدبەگی‌یـە. لـەم ژنـە کوڕێک و چوار کچی بووە. کوڕەکەی شـێخ محەمـەدزەکـی و کچـەکانیش: رەعنـا و حەلاو و عایشە و مەنیجە.

شێخ محەمەدزەکی پێنج ژنی هێناوە. لە سێ ژنیـان منداڵـی بـووە: لـە ئاسـکەی کچی شێخ مەحموود شەمسەخانی بووە شووی کردووە بە شێخ تـائیبی کـوڕی شـێخ عومەری بیارە، کوڕێکی بووە ناوی سەلاحەدینی دەلـۆیی کـە مامۆسـتایە. وە لـە ژنی دوەم کە عەتیەی کچی سەیید حسەینی هانەسوورەیی‌یە کوڕێکی بووە محەمەدعـەلی ناوە. دوو کچیشی بووە: پیرۆزە و حەفسە.

وە لە ژنی سێهەم کچێک بە ناوی کافیە و دوو کوڕی بووە: شـێخ سـاحیب و شـێخ جەمال.

### شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەلی

شێخ محەمەد پیاوێکی بەڕێز بووە و هەر لە سەردەمی شێخ ئەحمەدی برایـدا دێـی عەبابەیلێ و چەن دێی ئەو ناوچەیەی بە دەسـتەوە بـووە و زۆر دەوڵـەمەند بـووە، زۆر ئارەزووی راو و گەڕانی کەژ و کێوی بووە.

ئەم شێخ محەمەدە پێنج ژنی هێناوە: دووانیان کچی سەعید بـەگی وەڵـەدبەیگیی بوون. یەکەمیان رابیعە، لەم ژنە سێ کوڕ و کچێکی بووە، کوڕەکان شێخ فەتاح و شێخ رەزا و شێخ رەشید. کچەکەیش خەدیجـەی نـاو بـووە و شـووی کـردووە بـە سـەیید

عەلیی، کوڕی سەیید محەمەدی، کوڕی مەولەوی و سەیید مەحموودی تـاوگۆزی لـێ بووە. جا شێخ فەتاح، شێخ جافر و شێخ جافریش تاقەکوڕێکی لێ بەجێ‌ماوە.

وە شێخ ڕەزا چوار کوڕ و دوو کچی بووە، کوڕەکان: شێخ مستەفا و شـێخ فـەرەج و شـێخ ئەحمــەد و شـێخ حامیـد. شـێخ مسـتەفا تـەنیا کـوڕێکی بـووە نـاوی شـێخ محەمەدئەمینە و شێخ فەرەج چوار کوڕی هەیە: جەمیل و حەمە ساڵـح و حسـەین و ئەنوەر.

وە شێخ حامید سەیید ئەحمەد و سەعدی ... هەیە.

وە شێخ ڕەشیدی کوڕی شێخ محەمەد شێخ ئیبراهیمی بووە کە لە عایشەی کچـی سەیید ئەحمەد تەنیا بورهانی بووە و لە حەفسەی شێخ کـەریم محەمـەد و ئـەنوەری بووە و لە سەنیەی کچی شێخ مەحموود سەلاح بووە.

دووەم ژنی شێخ محەمەد: خانمی سەعید بەگ بووە تەنیا کچێکی لێـی بـووە نـاوی عایشە بووە.

ژنی سێهەمی: رابیعەی کچی کاکە حەسەنی زەردوویی بووە. لـەم ژنـە دوو کـوڕ و کچێکی بووە، کوڕەکان: شێخ حەسەن و شێخ کەریم. کچەکەیش کافیە خان.

جا لە شێخ حەسەن، شێخ عوسمان و تووبا بوون و لە شێخ عوسمان، عومەر بـووە و لە شێخ کەریم کوڕێک بووە ناوی عەلی بووە و لە عەلی، کەریم بووە و تووبایش شووی کردووە بە قادربەگی جافرسوڵتان. وە کافیە شووی کردووە بە شێخ نەجمەدینی بیارە و کوڕێک و سێ کچی بووە، کوڕەکە ناوی کـاک ئەحمـەد بـووە و کچـەکان: فاتمـە و ئامینە و ئافتاو.

پاش کۆچی دوایی شێخ نەجمەدین شووی کردووە بە شێخ عوسمانی کوڕی شـێخ عەلادین و چوار کوڕ و دوو کچی لێ بـووە. کوڕەکـان: محەمـەد و ڕەووف و ناسـیح و مادیح. کچەکان بەدیعە و حەدیقە. محەمەد و بەدیعە مردوون و منداڵـەکانی دیکـەی ماون.

ژنی چوارەمی کاکەیی بووە. لەم ژنـە تـەنها شـێخ مەجیـدی بـووە. ژنی پێنجـەم ناجیەخان بووە، کە شێخ عەزیزی لێ بووە. لە شـێخ عـەزیز، شـێخ ڕەسـووڵ و شـێخ ئەنوەر بوون.

**شێخ مەحموودی شێخ عەلی**

ئەم شێخە پیاوێکی ئازا و سوارچاک بووە، زۆر حەزی لە راو بووە. ئەم زاتە دوو ژنی هێناوە:

یەکەم: عەنبەرخانی کچی بارامبەگی هەورامیی خوشکی جانوڵڵا بەگ. لەو ژنە شەش کوڕ و دوو کچی بووە. کوڕەکان: شێخ مستەفا و شێخ حەمەساڵح و شێخ رەشید و شێخ کەریم و شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ ئەحمەد. کچەکانیش: ئامینەخان و حەنیفەخان. ئامینەخان شووی کردووە بە عەلیمحەمەدخانی کوڕی شێخ جانوڵڵابەگ لە بارامئاوا. وە حەنیفەخان شووی کردووە بە شێخ مەزهەری کوڕی شێخ بەهادین.

جا شێخ مستەفا لە عایشەخانی کچی شێخ محەمەد، شێخ قادر و شێخ نەجمەدینی بوون. وە لە مەنیجەخانی کچی حاجی وەلی، شێخ حەسەن و نەفیەخانی بوون. وە نەفیەخان شووی کردووە بە داودبەگی کوڕی حەمەسەعیدبەگی جاف.

شێخ حەمەساڵح منداڵی نەبووە.

شێخ رەشید لە عایشەخانی کچی شێخ محەمەد سێ کوڕ و کچێکی بووە، کوڕەکان: شیخ رەووف، شێخ کەماڵ، شێخ نووری، کچەکەیش ناوی فاتمەخان بووە.

جا شیخ رەئووف لە کافیەی کچی شێخ کەریمی مامی پێنج کوڕ و دوو کچی بووە، کوڕەکان: تاهیر و کامیل و فازیل و غەریب و عەبدوڵڵا. کچەکانیش: گوڵباخ و گوڵزار.

وە شێخ کەمال سێ ژنی هێناوە یەکەم: ناهیدی کچی شێخ کەریم بووە، لەم ژنە دوو کوڕ: فەتاح و حەمە سەعید و کچێکی بە ناوی نازەنین بووە.

لە ئەختەری کچی شێخ حەمەساڵح کە ژنی دوەمی بووە چوار کوڕی هەیە: ئەمجەد و ماجید و بەختیار و بەهجەت.

لە ژنی سێهەم پیرۆزەناو دوو کوڕی هەیە: فارووق و سیروان.

شێخ نووری کوڕی شێخ رەشید چووەتە سیلکی عەسکەری و بووە بە «مقدم» و دوایی بووە بە مودیرعامی کارگەی چیمەنتۆی سلێمانی. لە پاشان بووە بە ئەمین عامی دارایی ناوچەی کوردستان. جا لە ١٩٨٠دا خانەنشین کراوە. ئەم پیاوە لە شەوبۆی کچی تاهیربەگی بابان دوو کوڕی هەیە: رێبوار و زانیار. سێ کچیشی هەیە.

### شێخ کەریمی کوڕی شێخ مەحموود

ئەم شێخە پیاوێکی بەدین و ئازا بوو، ئەمیش سێ ژنی هێناوە: یەکەم پیرۆزی کچی مەلا عەبە. دووهەم مەنیجەی کچی حاجی وەلی. سێهەم سۆیبەی کچی کاک ئەمین برازای موفتیی هەڵەبجە.

لە پیرۆزخان چوار کوڕ و دوو کچی بووە. کوڕەکان: شێخ محەمەد و شێخ سادق و شێخ حسەین و شیخ عەلی.

جا لە شێخ محەمەد: جەلال و ساحیب و جەمال و کچێ بەجێ‌ماوە.

وە لە شێخ سادق چوار کوڕ و کچێ بەجێ‌ماون، کوڕەکان: لەتیف و عەبدوللا و موحسین و تەحسین. وە لە شێخ حسەین سێ کوڕ و کچێکی هەیە، کوڕی گەورەی ناوی حەسەنە.

وە لە شێخ عەلی یەک کوڕ کە ناوی خەباتە و سێ کچی هەیە.

وە شێخ کەریم لە ژنی دووهەمی کە مەنیجەی حاجی وەلی بووە کوڕێکی بووە ناوی محەمەدئەمینە، ئەمیش کوڕێکی هەیە ناوی غەفوورە.

### شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی شێخ مەحموود

ژنێکی هێناوە زەینەبی کچی جانوللا بەگ، چوار کوڕ و کچێکی لێ بووە.

### شێخ ئەحمەدی شێخ مەحموود

خەدیجە خانمی کچی شێخ نەجمەدینی بیارەی هێناوە. لەم ژنە پێنج کوڕی بووە: عارف و فاتیح و محەمەد و عەبدوللا و ماجید.

وە ژنی دووهەمی شێخ مەحموودی شێخ عەلیی کوڕی شێخ حەیدەر کە فاتمەی کچی کەریم بووە. سێ کوڕی بووە: شێخ عومەر و شێخ فەرەج و شێخ حەیدەر.

### شێخ محەمەدئەمینی کوڕی شێخ عەلی

ئەم شێخە پیاوێکی جوان و هەڵکەوتوو بووە و هەر بە گەنجی هاتووەتە هەڵەبجە و ژنێکی لە بابانەکانی هەڵەبجە هێناوە. سێ کوڕ و سێ کچی بووە. کوڕەکان: شێخ

فەرەج و شێخ ئەحمەد و شێخ عومەر. کچەکانیش: فاتمەخان و حەنیفەخان و پیرۆزخان بوون.

جا شێخ فەرەج نەفیەخانی کچی شێخ محەمەدی هێناوە و کوڕێکی لێی بووە ناوی سەیفەدین بووە و سەیفەدین دووکوڕی بووە: زەینەدین و خەبات.

شێخ ئەحمەد منداڵی نێرینەی نەبووە.

شێخ عومەر سێ کوڕی بووە: شێخ عوسمان و شێخ محەمەد و شێخ ئەنوەر.

## شێخ محەمەد سەعیدی کوڕی شێخ عەلی

ئەم شێخە پیاوێکی ئازا و جوانمێر بووە و بەدین بووە و زۆر حەزی لە ڕاو بووە. کوڕی نەبووە و چوار کچی بووە.

## شێخ کەریمی کوڕی شێخ حەیدەر

شێخ کەریم یەک ژنی هێناوە. سێ کوڕی لێی بووە: شێخ بابا و شێخ حەمەعارف و شێخ محەمەدئەمین.

جا شێخ بابا دوو کوڕ و کچێکی بووە، کوڕەکان شێخ حەمەسەعید کە زانا بووە. وە لەم شێخ حەمەسەعیدە کوڕێک بووە ناوی شێخ محەمەد بووە. شێخ محەمەدیش دوو کوڕی بووە: خالید و عەلی.

کوڕی دووەمی شێخ بابا، شێخ حەمەساڵح بووە ئەمیش دوو کوڕی بووە: شێخ مەجید و شێخ عەمەر.

شێخ حەمەعارف نەوەی نەبووە. شێخ محەمەدئەمینیش لە دێی «تاوێرە» دانیشتووە، کوڕەزایەکی هەیە ناوی شێخ محەمەدە.

## شێخ حسەینی شێخ حەیدەر

ئەم پیاوە تاقە کوڕێکی بووە ناوی بابانەوەیس بووە، ئەم کوڕە کەسی لێ بەجێنەماوە.

### شێخ سەعیدی شێخ حەیدەر

ئەم شێخە چووەتە تاوێرە و چوار کوڕی بووە: شێخ رەشید و شێخ ئەحمەد و شێخ محەمەدئەمین و شێخ حەمەساڵح.

شێخ ئەحمەد چوار کوڕی بووە: شێخ فەرەج و شێخ حەسەن و ئەنوەر و رەئووف.

شێخ محەمەدئەمینیش سێ کوڕی بووە: سەیید قادر و شێخ فەرەج و شێخ سەعید.

شێخ حەمە ساڵح دوو کوڕی هەیە: شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ محەمەد.

### شێخ سلێمانی کوڕی شێخ حەیدەر

ئەم شێخە پیاوێکی جوانخاس بووە و زمانی فارسی و تورکی زانیوە. بە گەنجی کوژراوە. تاقە کوڕێکی لێ بەجێماوە، ناوی عەبدوڕەحمان بووە، کە نێرینەی نەبووە.

کوڕەکانی شێخ ئیبراهیم کە حەیدەر و عەبدوڕەحیم و عوسمان و ئەحمەد بوون. باسی نەتەوەی حەیدەرمان کرد.

### شێخ عەبدوڕەحیمی کوڕی شێخ ئیبراهیم

ئەم زاتە زانایەکی گەورە بووە و تاقە کوڕێکی بووە ناوی عەبدوڕەحمان بووە. ئەم عەبدوڕەحمانەیش زانایەکی گەورە بووە و شێخی تەریقەتیش بووە. تەریقەتی قادری لە شێخی بریفکان وەرگرتووە و تەریقەتی نەقشبەندیشی لە شێخ عوسمانی تەوێڵە وەرگرتووە و خەریکی دەرزوتنەوە و ئیرشاد بووە.

لە خزمانی عەبابەیلێ تۆراوە و چووەتە ناوچەی شەمێران و لە دێی کانیکەوەدا نیشتەجێ بووە تا کۆچی دوایی کردووە. دوایی شێخەکانی عەبابەیلێ تەرمەکەیان هێناوەتەوە بۆ عەبابەیلێ و لە خسنی شێخاندا بە خاکیان سپاردووە.

ئەم زاتە کوڕێکی بووە ناوی شێخ محەمەدئەمین و لە شێخ محەمەدئەمین دوو کوڕ بووە: شێخ عەبدوڵلا و شێخ عەبدوڕەحمان.

شێخ عەبدوڵلا[1] مەلایەکی تەواو بووە و لە دێی نەرگسەجاڕدا کۆچی دوایی کردووە. کچێکی لێ بووە ناوی تووبا بووە، شووی کردووە بە عوبەیدی کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلا، ئێستە لە ژیاندایە.

شێخ عەبدوڕەحمان هەر لە شەمێراندا ماوەتەوە، تا کۆچی دوایی کردووە. ئەم شێخە چوار کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ نەجیب و شێخ حەمەعارف و شێخ محەمەد، عەبدولغەفار.

وە لە شێخ نەجیب شێخ عەبدولقادر بەجێماوە.

## شێخ عوسمانی کوڕی شێخ ئیبراهیم

ئەم زاتە لە عەبابەیلێدا ماوەتەوە و سێ کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ محەمەد و شێخ ئیمام و شێخ غەفوور.

جا لە شێخ محەمەد، شێخ قەسیم و سەیید عومەر بووە. وە لە شێخ قەسیم، شێخ محەمەدسەعید و سەیید کەریم بووە. وە لە شێخ محەمەدسەعید، شێخ عومەر بەجێماوە وە لە سەیید کەریم، سەیید حەیدەر و سەیید مەحموود بەجێماوە. سەیید عومەر نەوەی نەبووە.

شێخ ئیمام لە عەبابەیلێدا بووە و دوو کوڕی لێ بەجێماوە: یەکەم: سەیید ئەبوبەکر کە چووە بۆ دەرەشیشی ژووروو و سەیید قادر و سەیید عومەری لێ بەجێماوە.

دوەم: شێخ غەفوور چووە بۆ دێی تاوێرە و خۆی و نەوەی لەوێ ژیاون و لە شێخ غەفوور، شێخ ساڵح بووە.

## شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ ئیبراهیم

شێخ ئەحمەد لە عەبابەیلێدا دانیشتووە و شێخ تاهای لێ بووە و لە شێخ تاها، شێخ عەلی و لە شێخ عەلی، سێ کوڕ بووە: شێخ جەبار و شێخ عارف و شێخ سەلام. شێخ جەبار نەوەی نەبووە.

شێخ عارف دوو کوڕی هەیە: شێخ جەمیل و شێخ کامیل.

---

١ـ ئەم پیاوە «جەفایی»یە، کە دیوانی شیعری هەیە و توانیم هەندێک لە شیعرەکانی کۆ بکەمەوە و بە ناوی «دیوانی جەفایی»یەوە چاپ کرا. «م. ع. ق» .

شێخ سەلام لە عەبابەیلێ ماوەتەوە و پیاوێکی باش بووە سێ کوڕی بووە: شێخ حەمەساڵح کە بە منداڵی مردووە. شێخ ئەحمەد، ئەمیش زوو کۆچی دوایی کردووە. شێخ محەمەد، ئەم زاتە لە عەبابەیلێ گوێزاویەتی‌یەوە بۆ سازان. ئێستە هاتووەتەوە بۆ «مجمعی زەمەقی» بە پێش‌نوێژی.

## باسی پیرخدری شاهۆ

به بڕوای زانایانی ڕشتەی نەسەب ئەم زاتە لە نەتەوەی ئیمام حسەینی کوڕی ئیمام عەلیی کوڕی ئەبوتالیبە. وە ڕشتەی نەسەبەکەی بەم جۆرەیە:

سەیید محەمەدزاهید، کوڕی سەیید مەحموودی مەدەنی، کوڕی سەیید جەعفەر، کوڕی سەیید حسەین، کوڕی سەیید محەمەدی یەنبووعی مولەققەب بە عاسیم، کوڕی سەیید ڕەحمەتوڵلای بە «العارف بالله» ناسراو، کوڕی شێخ مووسای «الداعی الی الله». کوڕی شێخ حسەینی سامیت، کوڕی سەیید هیلال، کوڕی سەیید محەمەدی خەلەف، کوڕی سەیید «منهال»، کوڕی سەیید ماجید، کوڕی سەیید عەبدوڕەحمانی، کوڕی سەیید قاسمی، کوڕی سەیید ئیدریسی، کوڕی سوڵتان جەعفەری، کوڕی ئیمام عەلی نەقی.

سەیید محەمەد لە بەر دووری لە دنیا بە زاهید ناسراوە، وە یەکەم کەسێکە لە ڕشتەدا کە هاتووە بۆ کوردستان. مێژووی هاتنەکەی بە ڕوونی دیار نییە، بەڵام بە گوێرەی هەندێ بەڵگە وەکوو ئەوە ئەڵێن: موریدی شێخ عومەری «سهروردی» - سوورەوەردی - بووە و ئەویش لە مێژووی ٦٣٢ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و هەروەها کە هاوچەرخی ئەمیر «مقرب‌الدین» بووە کە فەرمانداری بەرەی سنە و کرماشان بووە لە چەرخی سەلجووقیەکاندا .. ئەبێ مێژووی هاتنی زاهید بۆ کوردستان لە دەوروبەری ٦٠٠ی کۆچی تا ٦٤٠دا بووبێت. بە گێڕانەوە لە باوەڕپێکراوانەوە و لە سەر نووسراوەکانی وڵاتی خۆمان وەکوو «نورالانوار» ئەم زاتە هاتووەتە کوردستان لە ناحیەی «پاوە»دا نیشتەجێ بووە و لەو چەرخەدا «پاوە» ناوی «گەنجەویە» بووە.

وە فەرمانداری ناوچەی سنە و کرماشان، وەکوو وتمان، ناوی «مقربالدین» بووە و لە دێی پایگەڵاندا دانیشتووە و قازی دادگاناوی محەمەدنەجیب بووە، ئەویش لە پایگەڵاندا بووە.

جا کاتێ ئەبیسن سەیدێ لە شێوەی دەروێشدا هاتووەتە پاوە و قەرەباڵغی لێ گردبووەتەوە و هەندێ کاری نابار دەماودەم ئەبیسن .. قازیی دڵگران ئەبێ و هەواڵ ئەدا بە میر «مقربالدین» . ئەویش فەرمان ئەدا ئاگرێکی گەورە ئەکەنەوە و ئەڵێن بە سەیید محەمەدزاهید: برۆ ناو ئەو ئاگرە! ئەویش ناترسێ و ئەچێتە ناو ئاگرەکەوە و پاش ماوەیەک بە ساغی دێتە دەرەوە!

جا ئەمیر «مقربالدین» ئەڵێ: من شا نیم و تۆ شایت و باوەڕی پێ پەیدا ئەکات و بە دڵپاکی و راستییەوە ئەبێ بە مورید و خۆشەویستی و دێیەکی موڵکی خۆی ئەبێ لە ناحیەی «کورەوەز» لە «کۆماسیان»دا بە ناوی «قوتلوئاوا» وەقفی ئەکا لە سەر سەیید محەمەد و نەوەکانی و سەیید محەمەدزاهید لەو شوێنەدا دادەمەزرێت.

ئەڵێن: بۆیە ئەم سەیید محەمەدە بە «پیرخزر» ناوبانگی دەرکردووە چونکە دوای ئەوەی خراوەتە ئاگرەکەوە و لێی دەرچووە و ئاگرەکە کوژاوەتەوە لە شوێنی ئاگرەکەدا گیای سەوزیان دیوە.

ئەمەیش تەرجەمەی وەقف نامەکەیە:

بسم الله الرحمن الرحيم

من کە بەندەی دەرگای ئەحمەدم و ناوم «مقربالدینی حسینی»یە موڵکی ئاوەدانکراوەی خۆم کە ئاوایی «قوتلو ئاوا»یە وەقفم کرد لە سەر ئامۆزای خۆم شێخ محەمەد زەهیرەدین ئەبو عەبدوڵلای پیرخزری رەزەویی حوسەینی. وە دوای ئەوە لە سەر کوڕ و کوڕەزاکانی وەکوو یەک. وە حەقی سەرپەرشتیکردنی ئەو مەوقووفەمە دایە دەستی خۆی تا لە ژیانیدا، وە لە پاش مردنی ئەو بە دەستی دیندارترینی نەوەکانی بێ لەوانەی کە وان لەو شوێنەدا.

وە خزمەتی بۆ میوان و زانایان و قورئانخوێنان و هەژاران زۆرتر بێ.

من وەقفکەری گوناهکار

«احمد مقربالدين الحسيني»

وە سنووری ئەو دێیە بەم جۆرەیە: سنوورێکی کێـوی گـۆڕی فـەیرووزە، کـە وا لـە پشتی ئـاوایی «قوتلوئـاوا»وە. سـنووری دووهـەمی بـەردەچۆیین. سـنووری سـێهەمی سەردەرەبیداد. سنووری چوارەمی بازووی شورتە.

پاش وەقف‌کردنی ئەم ئاوایی‌یە حەزرەتی سـەیید محەمـەدزاهیـدی مەشـهوور بـە پیرخزر دەستی کرد بە ڕێنومـایی‌کـردنی موسوڵـمانان و خزمـەت‌کـردن بـە ئـایینی ئیسلام. وە موسوڵمانان لە هەموو لایەکەوە ئەهاتن بۆ خزمەتی و سوودیان لە پیرۆزیی ئەو وەردەگرت. وە لەو ناوچەدا ئایینی ئیسلام تازە بووەوە و بەم جۆرە مایەوە هەتا بـە ئاکامی بڕیاردراوی خودایی سەیید محەمەد زاهید لە هەمان ئاواییدا کۆچی دوایی کرد و بە خاک سپێررا.

بە داخەوە ساڵی کۆچی دوایی و ، مـاوەی ژیـان و بەسـەرهاتیمان بـە شـێوەیەکی ڕووناک بۆ ڕوون نەکرایەوە، بەڵام بڕوا ناکرێ پیاوێکی وا بێ سەر و شوێن ڕۆیشـتبێ و هیچی دەربارە نەنووسرابێ.

باوەڕی بەهێز ئەمەیە کە ژیان و مردن و بەسـەرهاتی ژیـانی بـۆ مێژوونووسـەکانی سەردەمی خۆی ڕوون و ئاشکرا بووە، بەڵام بـە هـۆی بشـێوەی ئـەو وڵاتـە و هێرشـی تاتارەوە ئەوەی کە بووە و نووسراوە لەناو چووە.

ئەوەندە بۆ ئێمە زانراوە کە گۆڕی پـیرۆزی سـەیید محەمـەدزاهیـد وا لـە دەشـتی «زێوە»ی خواری دێی «قوتلوئاوا»وە و لەو کاتەوە تا ئێستە زیارەتگای موسوڵمانانە.

هەروەها لە ژمارەی نەوەکانیدا قسەی زۆر هەیە: ئەوەندە زانـراوە ئەڵـێن لـە ڕۆژی کۆچی دوایی پیرخزری شاهۆدا خودا کوڕێکی پێدا و ناویان ناوە پیرخزر لە سەر نـاوی باوکی.

وە دێی «قوتلوئاوا» پاش ئەوە کە حەزرەتی سەیید محەمەد زاهیدی لە سەر دامەزرا ناوی گۆڕرا بە «پیرخدریان» واتە ئەم ئاوایی‌یە عائیدی ئەو کۆمەڵـە سـەییدەیە کـە لـە نەتەوەی پیرخدرن.

وە هەندێک ئەڵێن: ئەم ناوە ناوێکی تازەی هەڵبەسراوە بـە نـاوی خوالـێ‌خۆشـبوو پیرخزری گەورە، وە ئەم کوڕە بچووکەی کە ناوی نراوە بە پیرخزر لەسەر ناوی بـاوکی بووە، وە ئەم وشە «تثنیە»یە، واتە: دوو شێخە پیرخدر ناوەکان.

هەر چۆن بێ پاش کـۆچی دوایـی سـەیید محەمەدزاهیـد نـەوەکانی لـە هـەمان ئاواییدا دامەزراون و خزمەتی دینیان کردووە و پیرخـدری بچکۆلـەیش لـە خانـەدانی خۆیاندا دەستی کردووە بە خوێندن و قورئان و کتێبە وردەکانی خوێندووە و خەریکی ئەوە بووە کە لە هەموو زانیاری‌یەکدا بخوێنـێ و سـوود وەربگـرێ. وە کاتـێ تەمـەنی «٢٤» ساڵانە بووە لە پیرخدران دەرچووە و چووە بـۆ ناوچـەی «هەوشـار» و لـە ئـاوایی سەفاخانەدا دامەزراوە و لە ئەنجامـدا ئـەو دێیـەی کـڕیوە و کردوویـەتی بـە جێگـەی ئیرشادی خۆی تا کۆچی دوایی کردووە و لەو دێدا بە خاک سپێرراوە.

جا لەبەر ئەوە کە هەموو کەسێ نازانێ ئـەم کـوڕە پاشمەرگـەی باوکیـەتی و نـاوی پیرخزرە .. خەڵک وا ئەزانن ئەم زاتە و پیرخزری ناسراو و بەناوبانگ کە ناوی سـەیید محەمەدزاهیدە یەکێکن، کەچی راست ئەوەیە ئەمە کوڕی ئەوە و پاشمەرگەیەتی.

سەیید عەبدوسەمەدی دانەری «نورالانوار» ئەڵێ: نەسەبناسەکان وتوویانە: پیرخـزر لە پێنج کوڕەوە نەتەوەی لـێ کەوتووەتـەوە و لـەو کوڕانـەدا پیرخـزری پاشمەرگـەی باوکی باس کردووە و باسی کوڕی پێنجەمی نەکردووە و هەروا بە نەزانراوی ماوەتەوە.

بەڵام ئێمە لە سەر شەجەرەی راستی مۆرکراو بە مۆری پیاوانی گـەورە زانیومانـە و ناوی گەلێ کوڕی پشتیی سەیید محەمەدزاهید پیرخزرمان دیوە و بیستووە.

بۆ نموونە شەجەرەی راسـتی مـەلا ئەبوبـەکری موسـەننیفی چـۆڕیی کـە سـەیید عەبدوڕەحیمی مەولەوی و گەلێ لقی جیاوازی لێ ئەبێتەوە .. ئەڕواتەوە سـەر سـەیید بایزیدی کوڕی سەیید محەمەدی پیرخزری شاهۆ.

وە شەجەرەی سەییدەکانی باینچۆ کە بە بڕوای هەموو نەسـەبناسـەکان خـاوەنی نەسەبی راستن .. ئەڕواتە سەر سـەیید مـەحموودی سـەبزەواریی کـوڕی پیرخـزری شاهۆ.

وە شەجەرەی نەسەبی شێخەکانی عەودالانی پارێزگەی سلێمانی ئەچێتـەوە سـەر سەیید مووسای کوڕی پیرخزر.

وە لە زانای باوەڕپێکراوم بێستووە کـە لـە کتـێبی نەسـەبدا دیویـەتی کـە سـەیید محەمـەدی ناسـراو بـە «سـەیید محەمـەدی باڵاتـەران» لـە ژووری «کـانی پانکـە»ی شارەزوورەوە لە نەوەی پیرخزرە. بەڵام ئەمە بێ‌گومان نیە لەوەدا کـە کـوڕی پشـتیی

بێ، چونکە تەنیا سەیید محەمەدی پاشمەرگە، کە بە پیرخزر ناوبانگی دەرکردووە، هاوناوی باوکی بووە. جا هەڵئەگرێ لە کوڕەزا و نەوەی بن.

بەهەرحاڵ باش دەرئەکەوێ کە کوڕەکانی پیرخزری شاهۆ ژمارەیان لە دە کەس زیاترە. وە بەگزادەکانی جافی جوانرۆ و، جافی گەرمیانی عێراق داوای ئەوە ئەکەن کە لە نەوەی پیرخزری شاهۆن و ئەڕۆنەوە سەر سەیید ئەحمەدبەگی کوڕی سەیید محەمەدی پیرخزر.

کە وابێ لەم بابەتانەدا باوەڕ بە سێ شتە:

یەکەم: ئەو شۆرەت «استفاضە»ی کە لە ناو خەڵکدا ئەبێ بە بەڵگە لە سەر نەسەب و دروستە شایەتیی پێ بدرێ لە سەر نەسەب، وەکوو لە توحفەی ئیبنوحەجەردا باسی ئەمە کراوە.

دووەم: داوای نەوەکانی خانەدانەکان، چونکە بە گوێرەی شەرع مرۆ ئەمینە لە سەر نەسەبی خۆی و داوای چی بکا موعارەزەی ناکرێ مەگەر مانیعێکی شەرعیی یا عەقڵیی ڕووناک ببێ بەرهەڵستی ئەو داوایە بکا و پێچەوانەیی‌یەکەی بسەلمێنێ.

سێهەم: «بحرالانساب»ەکان کە پیاوی زانا دایان‌ناون، وەکوو «قاموس‌الانساب»ی شێخەکانی کاکۆزەکەریا، یا «بحرالانساب»ی شێخ حەسەنی، کوڕی شێخ مەعرووفی، کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردە کە بە شێخ حەسەنی دووەم ناسراوە.

بەداخەوە «قاموس الانساب»ەکە هەر ناوەکەی هەیە و ناوەرۆکیمان نەدیوە و نازانین چی بەسەرهاتووە. هەروەها «بحرالانساب»ەکەی شێخ حەسەنیش ـ وەک پێشتریش وتمان ـ دەست ناکەوێ تا سوودی لێ وەربگیرێ.

بەهەرحاڵ من تا ئێستە لە خوێندنەوەی کتێب و نوسخەی شەجەرەکان و بیستن لە پیاوی باوەڕپێکراوەوە بۆم دەرکەوتووە بێجگە لە پیرعەبدوڵلا و پیرئیلیاس و شێخ حسەینی ناسراو بە پیر ڕۆستەم و سەیید محەمەدی پاشمەرگەی و بە پیرخزر ناسراو .. چەن کوڕی تری بووە، وەکوو: سەیید بایزید و سەیید مەحموودی سەبزەواری و سەیید حەیدەر و سەیید حەمزە و سەیید مووسا.

جا سەیید عەبدوڵلا باپیرەی ئەوانەیە کە لە دێی پیرخدران خۆیدا ماونەتەوە و هەندێ سەییدی دیکەیش گۆڕیان لە پیرخدرانە. وە سەیید ئیلیاس باپیری هەندێ لە

سەییدەکانی پیرخدران و سەییدەکانی سەرشیوی مەریوان و کەلاتەرزان و هەندێکی دیکەیشی کە بڵاوەیان کردووە. وە گۆڕی لە دێی «گلە»یە لە سەرشیوی مەریوان.

وە شێخ حسەینی ناسراو بە پیر ڕۆستەم باپیرەی سەییدەکانی «چاولکان» و «کـۆڵ» و ـ دۆزەخدەرە ـ و گەلێ شوێنی دیکەیە، وەکوو باسیان دێ. وە وام بیستووە گـۆڕی ئەم زاتە لە گوندی چاولکانی عەبدوڵلادایە.

وە سـەیید محەمـەدی پاشمەرگـەی ناسـراو بـە پیرخـزر بـاپیرەی سـەییدەکانی «سەفاخانە» و «پارسانیان» و گەلێ جێگەی دیکەیە و گۆڕی لە دێی سەفاخانەدایە.

وە سەیید بایزیدی بـاپیرەی سـەییدەکانی مـەریوان و کەلاتـەرزان و تـاوەگۆزی و سەییدەکانی چـۆڕ و باوەجـانی و چنـارە و دێـی قەڵـب و بـاخ و... کـە ناسـراون بـە سەییدەکانی مەلایی و غەیری ئەمانەیشە.

وە سەیید مەحموود کە بە سـەبزەواری ناسـراوە بـاپیرەی سـەییدەکانی بـاینچۆ و دەوروبەری هەمرۆڵە و سیاسەران و ئەو دێهاتانە و سەییدەکانی گـەورەدێی پارێزگـای سلێمانی و کۆمەڵی خانعەلی ناو جەبارییە.

وە سەیید حەیدەر باپیرەی سەییدەکانی بەڵخە و نەوتیی قەرەداغە.

وە سەیید حەمزە باپیرەی رشتەی خوالێخۆشبوو مەلا مووسای تەوەکەڵـیـیـە کـە ئێستە نەتەوەکانی وان لـە دێـی «شـابەدین» و دەوروبـەری «شـابەدین»دا. وە سـەیید مووسا باپیرەی سەییدەکانی عەودالانە.

سەیید عەبدوسەمەد لە «نورالانوار»دا نووسیویە: سـەییدەکانی دێـی پیرخـدران لـە نەتەوەی پیرعەبدوڵلا و پیرئیلیاسی کوڕانی پیرخزری گەورەن و گۆڕی پیرعەبدوڵلا وا لە لای دێی پیرخزرانا. وە گۆڕی پیرئیلیاس وا لە دێی گلەی سەرشیوی مەریوانا.

وە سەییدەکانی چاولکانی سەمەدی لە نەتـەوەی سـەیید عەبدوسـەمەدی، کـوڕی سەیید عەبدولحەمیدی کوڕی شێخ حسەینی مەشهوور بە پیر ڕۆسـتەمن کـە کـوڕی پیرخزرە. هەروا سەییدەکانی «کـۆڵ» و «دۆزەخدەرە» ئـەوانیش لـە نەتـەوەی سـەیید ڕۆستەمن.

وە سەییدەکانی «کاتۆران»ی بانە لە سەیید حەسـەن نـاوێکن کـە لەگـەڵ سـەیید عەبـدوڕەحیمی برایـا لـە گۆڕسـتانی پیرتاووسـی یەمـەنی سـەر بـە دێـی چاولکـانی عەبدوڵلادایە.

وە سەییدەکانی سەفاخانە لە نەوەی پیرخزری دووەمن کە کوڕی پیرخزری گەورەیە و سەییدەکانی شمشێر و دشە کە لە نزیکی پاوەدایە لە نەتەوەی پیرئیلیاسی کوڕی پیرخزرن.

هەروا سەییدەکانی مەلا جاروڵلایی ــ کە هەندێکیشیان ئەڵێن: مەلا جانوڵلا ــ ئەوانیش لە نەوەی پیرئیلیاسی کوڕی پیرخزرن. بەڵام راستەکەی ئەوەیە کە مەلا جاروڵلایی لە نەتەوەی سەیید مستەفای ناسراو بە پیرشەهریارە و لە نەوەی عەلیی کوڕی ئیمام جەعفەری سادقن، کە بە عەلی عورەیزی بەناوبانگە و «سجاد»یشی پێ ئەڵێن.

هەروا لە «نورالانوار»دا دەڵێ: سەییدەکانی «حسن صارمی» لە هەورامانـدا ئەڕۆنەوە سەر کاتۆران و لە نەوەی پیرئیلیاسی کوڕی پیرخزرن.

وە شێخ وەلی، کە بە «شێوەلی» ناسراوە لە سەییدەکانی «قارەوائی»ن و قارەوائی لە سەییدەکانی پارسانیانین کە لە نەوەی سەیید شوکروڵلای کەوڵزەردن و لە نەتەوەی پیرخزرن، بەڵام بۆم روون نەبووەتەوە لە نەوەی کام کوڕی ئەون.

وە سەییدەکانی خەرقەڕەشی دێی گورگەدەر لە شارباژێڕا و نەتەوەی مەلا مووسای تەوەکەڵی لە شابەدین و دەوری ئەو شوێنەدا لە سەییدەکانی پیرخزرین.

هەروەها سەییدەکانی شاڵیشەلی و باینچۆیی لە سەیید مەحموودەوە ئەگەن بە پیرخزر. وە بەشێ لە سەییدەکانی جەباریی کە لە نەتەوەی «خانعەلی»ن ئەوانیش لە نەوەی سەیید مەحموودی کوڕی پیرخزرن.

وە وا باوە ئەوانی دیکە لە نەوەی ئیمام حەمزەی تەکیەی قەرەداغن، کە ئەویش کوڕی ئیمام مووسای کازمە.

وە مەلا وەیسی «کەلاتی» لە نەوەی مەلا ئیلیاسی کەلاتییە، کە بە پێی کتێبی «نورالانوار»، برای مەلا یوسفجانی باپیری مەلائەبوبەکری موسەنیفە و، پەیوەندی بە مەلا ئیلیاسی کوڕی پیرخزرەوە نیە، چونکە ئەم کۆمەڵە لە نەوەی سەیید بایزیدی کوڕی سەیید محەمەدزاهیدن.

جا ئەم مەلا ئیلیاس ناوە دێی کەلاتیی کڕیوە و وەقفی کردووە لە سەر نەوەی نێر و مێی خۆی و ئەم چوار شیعرە وەقفنامەکەیە:

اقول بعـد الحمـد و الصـلاة
علـى النبـى و آلـه الهـداة:
وقفت ملكى قرية «كلاتـى»
علـى بنـىّ و علـى بنـاتى
ثـم علـى الاولاد و الاحفـاد
علـى السـوية بـلا نكـاد
ثـم صـلاة الله مـع سـلام
على الرسول أشـرف الانـام

وە ئەم مەلا یوسف‌جانە ئەچێتەوە سەر سەیید بایزیدی کوڕی پیرخدری گەورە.

بەهـەرحاڵ سـەیید محەممەدزاهیـدی پیرخـزر کـە موریـدی شـێخ عومـەری سوورەوەردی بێ و لە دەوری مێژووی ٦٢٠ی کۆچیـدا چووبێتـە کوردسـتان تـا ئـەم مێژووە کـە ١٤٠٣ی کـۆچی‌یـە و، نزیکـی ٨٠٠ سـاڵ نەتـەوەی لـێ کەوتبێتـەوە لـە کوردستاندا. دیارە نەتەوەیەکی زۆری لێ کەوتووەتەوە و گەلێ پارچەی جیاجیای لـێ بڵاو بووەتەوە، زانینی رشتەی نەسەبی ئەمانە کارێکی ئاسان نییە.

هەر چۆن هەیە ئێمە باسـەکە حەواڵـەی داوای خانـەوادەکان و شـۆرەتی رشـتەی نەسەبیان لە ناو خەڵکدا ئەکەین. «و الله اعلم» .

وە ئەو بنەماڵە کە شەجەرەیان دەست ئێمە کەوتووە لێرەدا باسیان ئەکەین، وەکوو بنەماڵەی مەلا ئەبوبەکری موسەننیف و ئەوانەی لە بنەماڵـە پەیـدا بـوون و بنەماڵـەی باینچۆیی و عەودالانی و گەورەدێیی و هەندێکی دیکە لە سەییدەکان.

## بنەماڵەی مەلا ئەبوبەکری موسەننیف

مەلا ئەبوبەکر ناوی حەسەنە و کونیەی ئەبوبەکرە و لە ناو خەڵکیشدا لەبەر زۆریی دانراوەکانی بە «مصنف» ناوبانگی دەرکردووە. کوڕی سەیید هیدایەتی، کوڕی سەیید یوسفجانی، کوڕی مەلا یەعقووبجان لە رشتەی سەییدەکانی پیرخزرییە. یانی لە نەتەوەی سەیید محەممەدزاهیدی بە پیرخزری شاهۆ ناسراوە و لە دەوروبەری ٩٤٠ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٠١٤دا لە دێی چۆڕدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی نزیکی دێکەدا نێژراوە.

ئەم زاتە لە تەمەنی تەمییزدا لە خانەدانی خۆیاندا خوێندوویە و قورئانی پیرۆز و کتێبە وردەکانی خوێندووە. جا دەستی کردووە بە خوێندنی زانیارییەکانی دیکە و بە خوێندنگاکانی مەریوان و شوێنەکانی دیکەی کوردستاندا گەڕاوە تا سەرامەد بووە. جا چووە بۆ شاری دیمەشقی شام و لەوێ حەدیسی پیرۆزی خوێندووە و لە خزمەتی مورشیدی ئەو سەردەمەیشدا تەسەووفی وەرگرتووە. دوای ماوەیەک چووە بۆ میسر و لە خوێندنی ئەزهەریش سوودی وەرگرتووە. جا لەوێوە چووە بۆ حیجاز و حەجی ماڵی خودا و زیارەتی پێغەمەری کردووە و ماوەیێ لە شاری مەدینەی مونەووەرەدا ماوەتەوە.

جا لە دەوروبەری ساڵی ٩٧٠ی کۆچیدا گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و لە مەریواندا بووە بە مودەڕیس لە لای هەڵۆخان بەگی ئەردەڵانی کە لەو رۆژەدا فەرمانڕەوای ئەو ناوچە بووە.

ئەگێڕنەوە: کاتی خۆی ئەمیر حەمزەی بابان لە دەوروبەری ٨٧٠ی کۆچیدا لەشکر و سوپای خۆی هێناوە بۆ کێوی بەرقەڵای مەریوان و لە لای ئاوای کانیبادا سوپاکەی دامەزراوە و شوورایەکی قایمی بە دەوری سوپاگاکەدا دروست کردووە و لە نزیکی شوورای ئەو قەرارگادا مزگەوتێکی گەورەی دروست کردووە و ناوی ناوە «مزگەوتی

سوور». زانای پایەبەرز سەیید ئیبراهیمی، کوڕی سەیید مەحموودی، کوڕی سەیید عەبدولکەریمی، کوڕی سەیید عیسای بەرزنجیی کردووە بە مودەڕیسی ئەو مزگەوتە. ئەویش لەوێدا تەدریسێکی وای کردووە جێگەی شانازی بێ.

لە پاش کۆچی دوایی سەیید ئیبراهیمی بەرزنجی «کابل»، بە ماوەی ١١٤ ساڵ کە دەوری بابان لەو ولاتەدا نەماوە هەڵۆخانی ئەردەلانی لەو ناوچەدا فەرمانڕەوا بووە و مەلا ئەبوبەکری موسەننیف لە مەدینەوە هاتووەتەوە بۆ مەریوان و هەڵۆخان بەگ لە کێوی بەرقەلادا ئەو مزگەوتەی بۆ تەعمیر کردووەتەوە و مەلا ئەبوبەکری کردووە بە مودەڕیسی.

لە هەندێ ساداتی چۆڕیم بیستووە کاتێ هەڵۆخان بەگ ئەو مزگەوت و مەدرەسەی کردووەتەوە لە سەر تەختە بەردێکی مەڕمەڕ ئەم شیعرەی نووسیوە و ئەڵێ:

مسجد عالی هەلوخانی
حیفش اینست میشود فانی

وە ئەو تەختەبەردە لە میحرابی مزگەوتەکەدا دامەزراوە بۆ نیشانە و مێژووی دروستکردنی مزگەوتەکە.

بەهەرحاڵ مەلا ئەبوبەکر لەو مەدرەسەدا تەدریسێکی باشی کردووە و گەلێ کتێبی داناوە. جا هەڵۆخان بەگ دێی «وشکێن»ی ئێستە کە لەو کاتە ناوی «موشەڵە» بووە .. ئەدا بە جەنابی مەلا ئەبوبەکر، ئەویش ئەڕوا بۆ ئەو دێ و پاش ماوەیەک ئەم دێی وشکێنە ئەگۆڕێتەوە بە دێی «چۆڕ» کە ئاوێکی کەمی لێ دەرچووە. وە بۆ یەکجاریی لە وشکێنەوە ئەگوێزێتەوە بۆ دێی چۆڕ و لەوێدا مزگەوت و خوێندنگا ئەکاتەوە و ئەو پارچە زەوی‌یە ئاوەدان ئەکاتەوە و بەم شێوەی خوارەوە وەقفی ئەکا.

بسم الله الرحمن الرحيم

بسم الله الذى له الملک اولا و ابدا، والحمد لله حمد من يحمده سرمدا، والصلاة و السلام على حبيبه الذى لا نبى بعده، و على آله و صحبه و جنده.

اما بعد: فيقول ابوبكر الحسن، ابن هداية‌الله البيرخضرى: وقفت قرية جور على اولادى، فأولاد اولادى، و اولادهم و احفادهم ليصرفوا منافعها على انفسهم، و على من عليهم نفقته، و على ورادهم و طلابهم و فقراء المسلمين و العلماء و الصلحاء. ربنا تقبل منا آمين!

ئەم وەقفنامەیە بە خەتی مەلا ئەبوبەکر خۆی لـە دوای کتـێبی «ریـاض‌الخلـود»ەوە نووسراوە.

مەلا ئەبووبەکر گەلێ سوودی بە موسوڵـمانان گەیانـدووە و لـە وڵاتی خۆیـدا وەک تازەکەرەوەی ئایین و زانیاریی وا بووە. خوا بۆ زانیاری و تەسەووف، یـا بـۆ رەوشـت و عەقڵ، ئەو چینەی گۆڕیوە و بەرەو بەختیاریی و پیرۆزیی بردوون.

مەلا ئەبوبەکر دەرزی زۆر گوتووەتەوە و گەلێ زانای پێ‌گەیاندووە و هەروەها گـەلێ دانراویشی هەیە: وەکوو:

١ ـ «سراج‌الطالبین» کە لە تەسەووفدایە.

٢ ـ «ریاض‌الخلود» کە ئامۆژگاری و حیکمەتە.

٣ ـ کتێبی «وضوح» لە شەرحی «محرر»ی رافیعیدا بە چوار بەرگ.

لەم کتێبەدا گەلێ شتی بە کەڵکی نووسیوە بـە تایبـەتی لـە بابـەتی موعامـەلات و ئیجارات و جەعالە و ... لە سەر یاسای وڵات. وە ئـەحکامی شـەرعیی ئەوانـەی روون کردووتەوە.

کتێبی «وضوح» دوا کتێب و دانراوی مەلا ئەبوبەکرەو، لەم کتێبەدا باسـی سـنووری «سواد عراق»ی کردووە کە کاتی خۆی پاش رزگارکردنی ئەو ناوچـە حـەزرەتی عومـەر وەقفی کردووە بە وەقفی عام بۆ موسوڵمانان، بە «ئیجارەی موئەببەدە» داویەتـەوە بـەو خەڵکە کە وان لەو وڵاتانەدا، بۆ ئەوە لە بەرانبەری کـرێـیـەکی موناسـبەوە بەرهـەمی بهێنن و خۆیانی پێ بژیێنن و «بیت‌المال»ی موسوڵمانیش سوودی لێ وەربگرێ.

وە ئەو سنوورەی بەم شێوە داناوە: کە لە کوردستاندا «زەهاو» و «قـەڵای جوانـڕۆ» و «دەوان» و «سازان» و «تەشار» و «نەوسوود» و رووی کێـوی «سـوورێن» بـە لای شـارە-زووردا و، «ئاڵان» و «سوەیل» و دێی «بێژوە» ئەمانە هەموو لە سنووری «سوادی عـراق»دا ئەبن و حوکمی سەوادی عێراقیان بە سەردا تەتبیق ئەکرێ.

دێی چۆڕ زۆر جوان هەڵکەوتووە و پاڵی داوە بە کێـوێکی بـەرزی هەواخۆشـەوە،کە ناوی «قەلەبەرد»ە و بەهاران لەو کێوەدا گیای خواردەمەنیی وەکوو: شنگ و پیشۆک و هەڵـەکۆک و پیچـک و کاشمـە و مـەنێ و رێـواس و گونـۆر و کنیـواڵ...ی هەیـە و بەردەمی چۆڕیش دەشت و دەر و جێگەی کشت‌وکاڵە و بەشی خۆی ئاوی هەیە و لـە نزیکەوە داری سوتەمەنی دەست ئەکەوێ.

بە کورتی ئەو دێ گەلێ رووی باشی بۆ ژیوار تێدایە.

ئەم زانا گەورە گەلێ خزمەتی بە ئایین و گەل و وڵات کردووە، بە داخەوە هێرشی سوپای «صفوی» بەسەر وڵاتەکەدا ناچاری کردووە کە شوێنی خۆی بەجێ بێلێ و کەنار بگرێ. بۆیە هاتووەتە خاکی عێراق و چووەتە ناوچەی قەرەداغ و ماوەیەک لای شێخەکانی سۆڵەی قەرەداغ ماوەتەوە، بەڵام نازانم لە سەردەمی کام شێخیاندا بووە، هەرچەند وا دیارە کە لە سەردەمی شێخ رەسووڵی گەورەدا بوبێت.

وە بۆ نوکتە لە زمانی مەلا ئەبوبەکرەوە دەگێڕنەوە کە حەزی لە کەلانەی پیچک کردووە، پیچک لە سۆڵەدا نەبووە و کەلانەیان بە پیاز کردووە، ئەویش بە یادی «چۆڕ»ەوە گوتوویە:

پیچک تەڕچک جنیاگ دۆڵە
خاسترە لە پیاز سۆڵیای سۆڵە

جا پاش ماوەیەک ئەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی بۆ دێی چۆڕ، بەڵام هەر ژیانی بە دڵ نەبووە، گەلێ جار دەردی دەروونی خۆی لە عاستی ناباریی و ناهەمواریی دەوروبەری خۆیدا دەربڕیوە. بە تایبەتی جافی کۆچەریی، کە هاوینان چوون بۆ کوێستان و بەسەر مەریواندا رۆییشتوون و کشت و کاڵیانیان خواردووە و بە زایەیان داوە.

خوالێخۆشبوو مەلا ئەبوبەکر یاسای ئەوەی دامەزراندووە کە کوڕەکانی بە مەلا ناو ببرێن بۆ زیادە هاندان و هەڵنانیان بۆ خوێندن و فێربوونی زانیاری. وە نەیویستووە بە شێخ یا سەیید ناو ببرێن و زۆر وەسیەتی کردووە بۆ نەوەکانی کە هەمیشە هەوڵ بۆ خوێندن بدەن و لایەنی خوێندن بەر نەدەن.

ئەم زاتە لە مێژووی ١٠١٤ی کۆچیدا لە دێی چۆڕ کۆچی دوایی کردووە، ئارامگای لە نزیکی چۆڕ دایە.

ئەم زاتە چوار کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: مەلا عەبدولکەریم و مەلا محەمەد و مەلا یوسفجان و مەحموودجان.

وا باوە مەحموودجان بەر لەوەی ژن بێنێ بە منداڵی مردووە. سێ کوڕەکەی دیکەی نەتەوەیان لێ بووەتەوە. مەلا یوسفجان لە چۆڕ دەرچووە و بەرەو جوانڕۆ رۆیشتووە، لە دێی تاوگۆزی دانیشتووە و هەر لەوێیش کۆچی دوایی کردووە و سەییدەکانی تاوگۆزی و هەندێ سەییدی دیکەش ئەچنەوە سەر ئەو.

وە سەییدەکانی چنارەی شارەزوورو هەندێ سەییدی دەوری سلێمانی ئەچنەوە سەر مەلا محەمەد.

وە مەلا عەبدولکەریم لە بەر بشێوەی ناوچەی مەریوان و ستەمی سوپای قزلباش ماوەیەک دێی چۆڕی بەجێ هێشتووە و چووە بۆ سابلاخ و لەوێوە چووە بۆ شاری وان و باشقەلا و چەن ساڵێک لەو ناوەدا بووە، جا گەڕاوەتەوە بۆ مەریوان و لە چۆڕدا دانیشتووە تا کۆچی دوایی کردووە، گەلێ نەتەوەی لێ کەوتووەتەوە.

مەلا جامی چۆڕیی کە چووە بۆ سابلاخ و میربوداق مزگەوتی سووری بۆ کردووەتەوە ماوەیەک لە شاری قەلاچوالان بووە کە پایتەختی بابان بووە، گەلێ لە نەوەکانی شێخ محەمەدی نۆدێ لە لای خوێندوویانە و سوودیان لێ وەرگرتووە. ئیتر نازانم ئەم هاتنەی بۆ قەلاچوالان لە پێش رۆییشتنیدا بووە بۆ سابلاخ، یاخود مزگەوت و مەدرەسەی سابلاخی بۆ بەجێ هێشتووە گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی بابان؟

ئەم مەلا جامی چۆڕیيە زانایەکی زۆر گەورە بووە، گەلێ نەتەوەی لێ کەوتووەتەوە و هەندێکیان لەمەولا باسیان دێ.

یەکێکی دیکە لە نەوەکانی مەلا عەبدولکەریمی کوڕی جەنابی مەلا ئەبوبەکری موسەننیف، سەیید ئیبراهیم بووە، کە باپیرە گەورەی حاجی سەیید حەسەنی عەللامەی چۆڕی بووە و لێرە بەدواوە باسی ئەکەین.

## سەیید حەسەنی چۆڕی

کوڕی سەیید ئیبراهیمی، کوڕی سەیید عەبدورەحمانی، کوڕی سەیید ئیبراهیم ـ کە لە سەرەتاوە بە میرزا ئیبراهیم ناسراوە و پاش ماوەیەک بە مەلا میرزا - کوڕی سەیید عەبدولغەفاری، کوڕی سەیید ئیبراهیمی، کوڕی مەلا عەبدولکەریمی، کوڕی مەلا ئەبوبەکری موسەننیف.

سەیید حەسەن لە دەوروبەری ساڵی ١٢٥٥دا لە دێی چۆڕا لە دایک بووە و پاش فامکردنەوە لە خانەدانی خۆیاندا دەستی کردووە بە خوێندن و قورئانی پیرۆزی خوێندووە و دوای ئەوە هەندێ کتێبە وردەی خوێندووە و دوای ئەوە دەستی کردووە بە خوێندنی نەحو و سەرف و وردەوردە سەرکەوتووە و خودا یارمەتی داوە و لە وەرگرتنی زانیاریدا پێشکەوتووە و سەرکەوتوو بووە، لە شاری سنە و شار و ناوچەکانی

دیکەی کوردستاندا خوێندوویەتی و لە نزیکی تەواوکردنی خوێندندا چووە بۆ تورجان لە وڵاتی موکریاندا، لە خزمەتی زانای گەورە مەلا عەلیی قزلجیدا خوێندوویە و دەستی کردووە بە حاشیەی عەبدولحەکیمی شەرحی شەمسی‌یە و لە ماوەی چوار ساڵدا تەواوی کردووە.

بیستوومە هەر رۆژێ کە دەرزی خوێندووە لە بەیانی‌یەوە هەتا بانگی نیوەڕۆ خەریکی ئەو دەرزە بووە جارجار تەواو نەبووە، پاش وچاندانی نیوەڕۆ هاتوونەتەوە و دەرزەکەی تەواو کردووە.

بیستوومە کاتێ کە عەبدولحەکیمی تەواو کردووە ئیتر مەولانا عەلیی قزلجی فەرموویەتی: رازی نیم لەمە زیاتر دەرزی هیچ کتێبێ بخوێنی، چونکە ئەوەی مەسئەلەی گران و بەبایەخی زانیاری‌یەکانی دیکە بێت لە وتنەوەی حاشیەی عەبدولحەکیمدا باس کراوە و تۆ تێی گەیشتووی.

ئیتر ئیجازە وەرئەگرێ و ئەگەڕێتەوە بۆ چۆڕ بۆ سەر مزگەوت و خوێندنگا و شوێنی خۆیان و لە هەموو لایەکەوە فەقێ لێی گرد ئەبنەوە و بە هەموو جۆرێ بە زانیاری رەوان و بەکەڵک و رەوشت و خووی جوان و بەرز سوودیان پێ ئەبەخشێ و دەرزێکی باش دەڵێتەوە. وە کاتێ کە دەرسی بە کوڕەکانی خۆی گوتووە فەرموویەتی: کێ ئارەزووی هەیە با بێت دابنیشێ و گوێ بگرێ، بۆ ئەوە دەرزەکە تایبەتی منداڵەکانی خۆی نەبێ و سوودی گشتی ببەخشێ.

ئەم زاتە گەلێ زانای بەرزی پێ‌گەیاندووە، وەکوو: سەیید هیدایەتوڵڵای هۆیەیی کە پاش خوێندنی زانیاریی مەنتیق کتێبێکی گەلەنبەوی داناوە کە تا ئێستە بە دەسخەتیی ماوە و چاپ نەکراوە. وە سەیید محەممەدی کوڕی خۆی کە بە ئاغە محەممەد بەناوبانگ بووە. ئەم زاتەیش لە باوکی کەمتر نەبووە.

حاجی سەیید حەسەنی چۆڕیی گەلێ دانراوی بەنرخی هەیە، وەکوو حاشیەی مودەووەنەی لە سەر تەسریفی مەلا عەلی و لە سەر فەریدەی جەلالەدینی سیووتی و لەسەر «تهذیب‌المنطق» و عەبدوللا یەزدی و گەلەنبەوی بورهان و لەسەر عەبدولحەکیمی شەرحی شەمسی‌یە و لە سەر ریازیات و فەلەکییات و حیساب و گەلێ فتوای بەنرخی دەرکردووە بۆ وەلامدانەوەی ئەوانەی کە داوای فتوایان کردووە. وە نامیلکەیەکی هەیە لەباسی سیفەتی کەلامی زاتی خوادا، چ نەفسی و چ لەفزی.

وە بە موناسەبەوە باسی هەندێ شتی دیکەیشی لە عیلمی کەلامدا کردووە. وا باوە ئەم کتێبەی بە بیست و چوار ساڵ تەواو کردووە.

ئەم زاتە لەگەڵ ئەم کۆششە زۆرەیدا لە دەرزوتنەوە و کتێبداناندا لە مەریواندا ... فەرمانی موفتێتیشی بەجێهێناوە، چونکی شێخولئیسلام بووە و میوانیشی زۆر بووە و گەلێ هاتوچۆ و ئەمسەرەوسەریشی کردووە بۆ لابردنی ناکۆکیی نێوان خۆی و خزمەکانی چۆڕیی کە لەسەر ئەو زەوی‌یە وەقف کراوە ئازاری دڵیان داوە و شکاتیان لێ کردووە.

بە هەر حاڵ ئەم زاتە ژیانی خۆی لە خزمەتی دین و زانیاریدا بەسەر بردووە، هەتا لە ساڵی ١٣٢١ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

حاجی سەیید حەسەن چوار کوڕی لێ بەجێماوە یەکەم: سەیید عەبدولقادری شێخولئیسلام. دوەم: ئاغا حسەین. سێهەم: سەیید محەمەد. چوارەم مەلا عەبدولکەریم.

جا ئاغا سەیید محەمەد برنجی مەلا بووە. سەیید عەبدولقادریش مەلا بووە، بەلام لە پایەی ئاغا سەیید محەمەد کەمتر بووە. هەروەها ئاغا حسەین و ئاغا مەلا عەبدولکەریمیش تا پلەی مەلای یاسایی بەرز بوونەتەوە.

حاجی سەیید حەسەنی چۆڕیی لەگەڵ حەزرەتی شێخ عومەری زیائەدیندا میانەیان باش بووە و زۆر دۆستی و خۆشەویستی‌یان لە نێواندا بووە و سەیید حەسەن خانەقای بیارەی بە «سەفینەی نووح» ناو بردووە و ئاموشۆیان بۆ لای یەکدی گەرم بووە و گەلێ جار شێخ عومەر چووە بۆ چۆڕ.

لە مامۆستا مەلا عەبدورەحیمی خاڵۆی کوڕەکانی سەیید حەسەنم بیست فەرمووی: جارێک شێخ عومەر لە چۆڕدا میوان بوو و منیش بە فەرمانی سەیید حەسەن خزمەتی شێخم ئەکرد. فەرمووی: پاش نوێژی بەیانی لە حوجرەی میواندا خەریک بووم چاییم لێ ئەنا و شێخ عومەر لەسەر بەرماڵەکەی خۆی رووەو قیبلە دانیشتبوو و قاپووتێکی لەبەردا بوو و کاتێ لام کردەوە دەبینم قاپووتەکە ماوە و شێخ دیاری نییە. منیش سەرم سوڕما کە چۆن ئەو زاتە چووەتە دەرەوە و من نەمزانیوە! هەرچەند تەماشای رێگە و دالانم کرد کەسم نەدی و زۆر سەرسام بووم. لەو کاتەدا لام کردەوە بە لای جێگەکەیدا تەماشام کرد وەکوو پێشوو وا لە جێگەکەی خۆیدا.

ئەوەندەی پێ نەچوو حاجی سەیید حەسەن هات بۆ حوجرە و بەرقلیان ئامادە کرا، لەو کاتەدا شێخ عومەر فەرمووی: حاجی سەیید حەسەن ئەمڕۆ من چووم بۆ زیارەتی مەولانا مەلا ئەبوبەکری موسەننیف، لە نزیکی ئارامگای ئەودا سەییدێکم چاوپێکەوت هات بۆ لام و زۆر تکای لێ کردم کە دۆعای خێری بۆ بکەم. وە پەنجەیەکی دەستی قرتاوە. جا سەیید حەسەن ئەفەرموێت: ئەو سەییدە باپیرەی من بووە. لە کاتی درەوکردندا مار داویە بەو پەنجەیەوە و بڕیاریان داوە پەنجەی ببڕن بۆ ئەوە ژارەکەی بلاو نەبێتەوە و کار لە لەشیدا نەکات، بە راستی «موکاشەفە»کەت راست و رەوانە.

حاجی سەیید حەسەن کاتێ چووە بۆ حەج هاتووەتە بیارە بۆ ئەوە لەگەڵ حاجی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عوسمانی سیراجەدیندا بڕۆن بۆ حیجاز. جەنابی شێخ عومەر فەرموویەتی: سەیید حەسەن! ئاگات لە خۆت بێ لەم سەفەرەدا، ئەحمەدی برام تەفرەت نەدا بە هاوڕێتی.

یانی ئاگات لە خۆت بێ بە هاوڕێتی ئەم سەفەرە نەتکا بە موریدی خۆی!

کاتێ ئەڕۆن مەناسیکی حەج بەجێ دێنن و لەوێوە ئەچن بۆ مەدینەی مونەووەرە و ماوەیەک لەوێ دەمێننەوە، ڕۆژێک حاجی سەیید حەسەن بە حاجی شێخ ئەحمەد ئەفەرموێت: ئەی شێخ وا زانراوە ئێوە ئەهلی کوشووفاتن و منیش هەندێک مەبەستم لە دڵدایە بە زمان دەریان نابڕم، ئەگەر بە خزمەت حەزرەت گەییشتین و مەبەستەکانمت پێگەیاند و وەلامەکانیان هەرچۆن بوو پێت وتمەوە من دڵم دائەمەزرێ و باوەڕ ئەکەم.

پاش چەند ڕۆژێک حاجی شێخ ئەحمەد ئەفەرموێت: سەیید حەسەن! سوپاس بۆ خودا بە خزمەتی حەزرەت گەییشتم و مەبەستەکەم عەرز کرد کە ئەوە بوو: ئایا سەیید حەسەن سەییدە یا سەیید نییە و تۆ لێی رازیت یا نە؟ ئەویش فەرمووی: موژدەی بدەرێ کە نەوەی منە و ئێمەیش لێی رازین.

## دەقی شەجەرەی حاجی سەیید حەسەن

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله على ان منّ علينا حيث جعلنا بمحض فضله الجميل و كرمه الجزيل خير آل انتسب للاولياء والانبياء، وجعل حسبنا بحسن لطفه الكامل، و بتوفيقه الشامل اتباع سنة افضل اجدادنا اعز خلق الله الى الله تعالى محمد المصطفى ـ ص ـ

فانا الفقير حسن الجورى، ابن المرحوم السيد عبدالقادر، ابن السيد ابراهيم، ابن السيد عبدالرحمن، ابن ابراهيم المعروف اولا بميرزا ابراهيم، و ثانيا بملا ميرزا، ابن السيد عبدالغفار، ابن السيد ابراهيم، ابن السيد عبدالكريم مؤلف «الواضح» فى التفسير، و انذار القران فى الموعظة، و غير ذلك، ابن السيد حسن المشهور بالمصنف، المكنى بابى‌بكر، ابن السيد هداية الله، ابن السيد يوسف جان، ابن السيد يعقوب جان، ابن السيد هداية الله، ابن السيد محمد جان، ابن السيد هداية الله، ابن السيد حسن، ابن السيد شاه حسين، ابن السيد حسن[١]، ابن السيد محمود، ابن السيد حسن، ابن السيد جعفر، ابن السيد بايزيد، ابن السيد محمد[٢] المشهور ببير خضر، ابن السيد حسن، ابن السيد محمود، ابن السيد موسى، ابن السيد حسين، ابن السيد هدل، ابن السيد خليفة[٣]، ابن السيد منهال، ابن ماجدالدين، ابن قاسم، ابن ادريس، ابن جعفر الامام الحسن العسكرى، ابن الامام على النقى، ابن الامام محمد التقى، ابن الامام على الرضا، ابن الامام موسى الكاظم... الخ.

## شەجەرەی سەیید عارفی چۆڕیی

السيد عارف، ابن السيد ابوبكر، ابن السيد طاها، ابن السيد عبدالرحمن، ابن السيد طاها، ابن السيد باوه شيخ، ابن السيد عبدالقادر، ابن السيد محمود، ابن السيد عبدالغفور، ابن السيد مصطفى، ابن السيد حسن، ابن السيد جامى، ابن السيد عبدالكريم، ابن السيد حسن المكنى بابى‌بكر المشهور بالمصنف الجورى ... الخ.

---

١ - نسخة اخرى ‹حسن على محمود›

٢ - نسخة اخرى ‹محمد حسن موسى›

٣ - نسخة اخرى ‹خلف›

**شەجەرەی نەسەبیی مەولانا مەلا عەبدولقادری مودەڕیسی بیارە**

بەر لە نووسینی شەجەرەکە پێویستە کەمێ تەرجەمەی حاڵی ئەم خاوەن شەجەرە بنووسین.

ئەم زاتە ناوی عەبدولقادری، کوڕی سەیید عەبدوڕەحمانی، کوڕی سەیید یوسفە و، لە دێی کانی‌کەوەی بازیانا لە دەوروبەری ساڵی ١٢٧٥ کۆچیدا لە دایک بووە و پاش فام‌کردەنەوە دەستی کردووە بە خوێندن و قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە، کتێبە وردەکانی خوێندووە، دوای ئەوە دەستی کردووە بە زانیاری‌یەکانی نەحو و سەرف و لە خوێندندا سەرکەوتووە و چووە بۆ شاری سلێمانی و لە خزمەتی گەلێ زانای ئەوێدا خوێندوویەتی. کاتێ گەیشتووەتە پایەی دوایی چووە بۆ هەورامان بە خزمەتی شێخ محەمەدبەهادینی کوڕی حەزرەتی شێخ عوسمانی سیراجەدین گەییشتووە، تەمەسوکی پێ‌کردووە و ئەندازێک تەربیەتی کردووە. وە لە تەوێڵەوە چووە بۆ خزمەتی حاجی مەلا ئەحمەدی نودشی و کتێبی گەلەنبەوی بورهانی لە مەنتیقدا و جەمعولجەوامیعی لە ئوسوولدا و ... هەندێ کتێبی دیکەیشی خوێندووە، جا ئیجازەی وەرگرتووە و چووە لە دێی «کوچک چەرموو» دانیشتووە دەرزی گوتووەتەوە، بە یارمەتی و خزمەتی «امین‌السادات» کە جەنابی سەیید سەعدەدین بوو. وە لە راستیدا «امین‌السادات» مەدرەسەیەکی بۆ رازاندەوە و لە هەموو لایەکەوە فەقێ و قوتابی خوێندن روویان تێ‌کرد و مەلا عەبدولقادریش بە شێوەیەکی شیاو دەرزی ئەگوتەوە، تا لە ساڵی ١٣٠٣ی کۆچیدا شێخ عومەر زیائەدین لە تەوێڵەوە ئەچێ بۆ بیارە و خانوو ئەکاتەوە و مەدرەسەیەکی باش پێکەوە دەنێ.

لەو مێژووەدا شێخ عومەر نامەیەک ئەنووسێ بۆ مەلا عەبدولقادر، مەلا عومەری سەردەشتی و مەلا عەبدوڵلای پەسوەیی نارد بە شوێن مەلا عەبدولقادردا و هێنای بۆ بیارە و کردی بە مودەڕیس و پشتگیری‌یەکی وەهای کرد کە قوتابی لە هەموو لایەکەوە روویان کردە بیارە و لێی گرد بوونەوە و بۆ زیادە ڕێز گرتن لە مەلای مودەڕیس فاتیمەی کچی خۆی بۆ مارە کرد و بە هۆی ئەم خزمایەتییە تازەیشەوە گەلێ پایەی لای مورید و مەنسووبەکانی خانەدانەکەدا بەرزتر بووەوە و فەقێ زیاتر لە بیارەدا کۆ بوونەوە. بە جۆرێ کە لە ماوەی ژیانی حەزرەتی شێخ عومەردا لە ساڵی ١٣٠٣وە تا ١٣١٨، کە ئەکاتە پازدە ساڵ، دەیان فەقێی باشی پێگەیاند و ئیجازەیان

وەرگرت و بە ناوچەکانی کوردستاندا بڵاو بوونـەوە بـۆ دەرزوتنـەوە و خزمـەتکـردنی ئایینی ئیسلام.

وە لە پاش کۆچی دوایی شێخ عومەر و هاتنی دەوری شێخ نەجمەدین کە تا ساڵی ١٣٣٧ی کۆچی ـ ساڵی کۆچی دوایی شێخ نەجمـەدین ـ ئـەکات مـەلای بیـارە لـەم نۆزدە ساڵەیشدا ژمارەیەکی دیکە مـەلای باشـی پێگەیانـد و بـە شـێوەی پێشـوو بـە کوردستاندا بڵاو بوونەوە.

وە پاش کۆچی دوایی شێخ نەجمەدین بـە ساڵـێک مـەلای بیـارەیش لـە بیـارەدا کۆچی دوایی کرد و لای ئارامگای شێخ عومەردا بە خاک سپێررا.

جا ئەم زاتە لە رشتەی نەتەوەی مەولانا مەلا ئەبوبەکری موسـەننیفە و شـەجەرەی نەسەبەکەی ـ دوای لابردنی پێشەکییەکەی ـ لەگەڵ خستنەسەری ناوی کوڕەکانیـدا بەم جۆرەیە:

السيد محمد طيب الملقب بحسن، والسيد محمـد حبيـب الملقـب بحسـين، والسـيد احمد الملقب بعبدالخالق .. ابناء الفاضـل المـدرس ببيـاره السـيد عبـدالقادر، ابـن السـيد عبدالرحمن، ابن السيد يوسف، ابن السيد موسى، ابن السيد احمد، ابن مراد[١]، ابـن السـيد سيف الدين، ابن السيد حسين، ابن السيد علي، ابن السيد رستم، ابن السيد شهابالـدين، ابن السيد زبير، ابن السيد جامي، ابن السيد محمود جان، ابن السيد حسن الملقب بمولانا ابیبکر المصنف، ابن السيد هداية الله، ابن السيد يوسف جان .. الخ.

لە کۆتایی ئەم شەجەرەوە نووسراوە:

كتبت هذه الشجرة المباركة سنة الف و ثلاث مائة واربع وعشرين كتبه حيدر.

ئەم حەیدەر ناوە، شێخ حەیدەری کوڕی شێخ عەلی تەوێڵەیی خەلیفەی حەزرەتی شێخ عوسمان سیراجەدینە.

نوسخەی ئەسڵی ئەم شەجەرەم لای محەمەد ئەفەندیی کوڕی خوالێخۆشبوو مەلا حسەینی کوڕی مەولانا عەبدولقادری مودەڕیسەوە بە دەست گەییشت و تەماشام کرد و نووسەرەکەی یەکێکە لە راستترینی پیاوانی چەرخی خۆی.

---

١ ـ ئەم زاتە مەلا موڕادی بازیانییە کە ئارامگای لە دێی «رەشەکان» لە ناحیەی ئالان لە قەزای چوارتـای پارێزگای سلێمانیدایە.

هەروەها ئەو شەجەرە مۆر کراوە بە مۆری گەلێ لە بەرزە پیاوانی ئەو چەرخە، وەکوو شێخ عوسمانی سیراجەدین و پیاوانی دیکە.

بەڵام بەداخەوە ئەوەیان بەسەردا تێپەڕیوە کە مەلا جامی کوڕی سەیید مەحموود جان نەبووە و کوڕی مەلا عەبدولکەریم بووە، سەیید مەحموود جان بە گەنجی مردووە و کەسی پاش بەجێ نەماوە.

## شەجەرەی بنەماڵەی شێخ ئەحمەدی ناو جاف

بسم الله الرحمن الرحيم

السيد حيدر والسيد بكر ابنا السيد جعفر، ابن السيد احمد المشهور بشيخ «احمدى ناو جاف»، ابن السيد عبدالعزيز، ابن السيد مصطفى المشهور بملا مصطفى، ابن السيد على المشهور بالملا على كوسه، ابن السيد خضر الجوارتايى المشهور بالملا خضر، ابن السيد الملا عبدالكريم، ابن السيد حسن الجورى المشهور بمولانا ابى‌بكر المصنف، ابن السيد هداية الله، ابن السيد يوسف جان ... الخ.

## بنەماڵەی سەیید عەبدوڕەحیمی مەولەوی

ئەم زاتە ناوی عەبدوڕەحیم و نازناوی «مەعدوومی»یە و لە کوردستاندا بە «مەولەوی» ناوبانگی دەرکردووە. بە روونی مێژووی لە دایک بوونی نەزانراوە. بەڵام بە گوێرەی هەندێ بەڵگە و بەراوردا دەبێ لە دەوروبەری ١٢٢٥ی کۆچیدا لە دایک بووبێ. ئەم زاتە کوڕی مەلا سەعیدی کوڕی مەلا شەریفە و لە نەتەوەی مەلا یوسف جانی کوڕی مەلا ئەبوبەکری موسەننیفی چۆڕی‌یە.

لای باوکی خۆی قورئان و کتێبە وردەکانی خوێندووە و دوایی زانیاری‌یەکانی نەحو و سەرفی لە خوێندنگاکانی ئەو ناوەدا خوێندووە. لە سەرەتای خوێندنیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە، ئەمیش لە بەر بەڕێوەبردنی ژیوار و ئیش و کاری ماڵەوەیان ماوەیەک دەسبەرداری خوێندن بووە، دوایی بە یارمەتی خودا دووبارە گەڕاوەتەوە سەر خوێندن و چووە بۆ خانەگا و پاوە و ماوەیەک لەو ناوچەدا خوێندوویە، جا چووە بۆ مەریوان و دوایی بۆ شاری سنە و لەوێیشەوە چووە بۆ بانە و لە بانە گەڕاوەتەوە بۆ شاری هەڵەبجە و سلێمانی و لە ئەنجامدا لە خزمەتی زانای گەورە مەلا عەبدوڕەحمانی نۆدشیدا ـ کە مودەڕیسی مزگەوتی مەلا ئەمینی مام رۆستەم بووە و لە هەمان کاتدا موفتیی رەسمیش بووە ـ ئیجازەی وەرگرتووە.

جا گەڕاوەتەوە بۆ ناوچەی هەڵەبجە و لە چەن دێی نزیکی هەڵەبجەدا وەکوو: چروستانە و پریس و کانی‌کەوەی شەمێران و گوندە و ... بە مەلایەتی و دەرزوتنەوە خەریک بووە و بە دەم ئەویشەوە خەریکی کتێبدانان بووە و زۆربەی دانراوەکانی لە زانیاری کەلامدایە وەکوو:

١ - الفضیلە بە زمانی عەرەبی، کە ٢٠٣٢ شیعرە لە عیلمی ئوسوولی دیندا.

٢ ـ العقیدة المرضیة. بە کوردی، ٢٠٠٠ شیعر زیاترە.[١]

مەولەوی لە بەر ئەوە کە زانا و ئەدیب و پیاوێکی کۆمەڵایەتی بووە سەفەری شارەکانی سنە و سابلاخ و سلێمانی و کەرکووک و بەغدا و کرماشان و دەشتی گەرمیان و کۆساری جوانڕۆ و خێڵەکانی باوەجانی و قوبادیشی بووە.

وە لە سەرەتای ژیانیەوە پەیوەندی تەسەووفی نەبووە، بەڵام پاش ماوەیەک لە لایەنی شێخ عوسمانی سیراجەدینەوە جازیبەی ڕۆحیی بووە و شێخ بە توندیی دڵی بۆ لای خۆی ڕاکیشاوە و مەولەوی چووەتە تەریقەتی نەقشبەندییەوە و ئەوەند سلووکی کردووە پایەی خەلافەتی دەست کەوتووە و بووە بە یەکێ لە پیاوە بەنرخەکانی بارەگای شێخ عوسمان و چرای کۆڕ و کۆمەڵی زانا و خەلیفە و مورید و مەنسووبەکان بووە.

ئەمەیش بە هۆی ئەوەوە بووە کاتی خۆی مەولەوی پەیوەندیی گیانی نەبووە و لە عاستی خۆیەوە هەندێک دوودڵ بووە و ئەو وانەی خەڵکە کە دراوە بە گوێچکەیدا لە بارەی ئەوەوە کە خۆی و خانەوادەی لە سەییدەکانن .. بە لایەوە ڕاست نەبووە. هەتا جارێک نامەیەک بۆ مەلا حامیدی کاتبی شێخ دەنووسێت و بۆ مەلا حامید دەنووسێت کە عەرزی شێخ بکات: ئێمە وا باوە کە سەییدین، ئایا ئەم قسە باوە ڕاستە یا نە؟ مەلا حامیدیش ئەو مەبەستەی بە شێخ ڕاگەیاندووە، هەتا شێخ ئەم نامەی بۆ مەولەوی نووسیوە و تێیگەیاندووە کە خانەوادەی ئەوان و خانەوادەی «مەللایی» ـ کە شێخەکانی دێی «قلبە»ن ـ ئەوانیش هەموو سەییدن و ڕشتەی نەسەبیان ڕاستە.

جا مەولەوی هاتووە تەمەسوکی بە شێخ کردووە و کەوتووەتە سلووکەوە و بەو بەش و بارە گەییشتووە کە پێگەییشتووە.

ئەمەیش دەقی نامەکەی شێخە:

جناب مرکز دائرەی اعتقاد و ادب، سید سند صحیح النسب، زیور طغرای علم و حسب، مولوی ملا عبدالرحیم را دعا و سلام میفرستیم.

و بعد: صحة نسبة شجرۀ طیبۀ شما بروضۀ مطهرۀ خاندان نبوت نزد حقیر کشفا و وجدانا به درجۀ وضوح رسیده است.

---

[١]ـ بۆ زیاتر ئاگاداری لە: ژیان و بەسەرهات و هاوڕێیی و دانراو و ..ی مەولەوی تەماشای بەرگی دووهەمی یادی مەردان بکە. لێرەدا زیاتر بایەخ بە لایەنی بنەچە و بنەماڵەی مەولەوی دراوە.

و کذلک نسبة طاهرهٔ لؤالی ظاهرهٔ خانەوادەی جلیلهٔ «ملائی» به آن درهٔ فاخره ثابت و صحیح گردیده است. به حدی که «کالشمس فی وضح النهار» واضح و آشکار است، و مستغنی از بیان و اظهار امثال این فقیر خاکسار. تکرار سؤال اگرچه «والمسک ماکررته ینضوع» دلالت بر تشکیک می‌کند.

کاشکی آن ذات شریف در این خانواده علّیه نقشبندیه که سلوکشان عین اتباع سنن سنیهٔ حضرت مصطفویه است علیه و علی آله و اصحابه الصلاة و السلام و التحیة .. جهدی می‌کردی،؟ و در صحبت خاک آستان ایشان صیقلی سر آیینة دل عرفان منزل می‌زدید، تا مستغنی از گواهی گواهان خارج می‌شدید.

آفتاب آید دلیل آفتاب
گر دلیلت باید از وی رخ متاب

ما را بحمدالله بر آیینەی دل از این جهت غباری نمانده است، در ثبوت این نسبت مذکوره وسوسه و خارخاری نیست.

چون گواهی داد حق چه بود ملک
تا بود اندر گواهی مشترک
زانکه شعشاع حضور آفتاب
بر نتابد چشم دلهای خراب

و صلی الله علی خاتم شجرة الرسالة، و خاتمة صحیفة الجلالة، محمد و آله و صحبه المتأدبین بآدابه. و السلام علی من اتبع الهدی.

عثمان
المجددی الخالدی

**ئەمەیش دەقی وەڵامەکەی مەلا حامیدی کاتبە:**

جناب صاحب والا مناقب خود را، بعد از دست‌بوسی معروض می‌دارد: که صحیفەی شریفه و عبارات لطیفهٔ ایشان را در خدمت «قطب الزمان علیه الرحمة و الرضوان» معروض داشتیم.

فرمودند: که مرا در صحت و ثبوت نسب شریف مولوی و طائفهٔ «ملائـی» هـیچ شـبه و تشکیک نمانده. شبه و گمان مشکک مصادم بداهت ما نمی‌شود.

نفرت خفاش بی بصر کلف رخسار محبوب مهر انور نمی‌شود. بلکه فی الحقیقـه دلیـل وجود خورشید است.

نفـرت خفاشان باشد دلیل
بر وجود آفتاب بس جمیل

و صلی الله علی سیدنا محمد و آله و صحبه و سلم، و بارک و کرم.

خادم العلماء و الفقراء

حامد

مەولەوی پاش ئەوە کە ئیجازەی وەرگرتووە چووە بـۆ دێـی چروسـتانە و بـووە بـە پێشەوای ئایینی و مودەڕیسی شوێنەکە. پاش ماوەیەک لەوێوە گوێزاویـەتی بـۆ دێـی پریس و دای ئەوەیش کە ماوەیەک مەلای پریس بووە چووە بـۆ دێـی گونـدە لـە نـاو نەوڕۆڵی پارچەدا، ماوەیەکیش لەوێ بووە جـا چـووە بـۆ کـانی‌کـەوەی شـەمێران بـە خۆشی ئەوەوە کە شێخ عەلی عەبابەیلێیی لەو ناوچـەدا بـووە و فەرمانبـەری میریـی بووە.

پاش ماوەیەک مەحموودپاشای جاف ناوچەی شـەمێران بـە تـاپۆ لـە حوکوومـەتی عوسمانی وەرئەگرێ و ئەیداتە دەست «عوسمـانی خاڵـە» و شـێخ عـەلی دەسـتەڵاتی بەسەر ناوچەکەدا نامێنێ. جا مەولەوی ئەچێتەوە بۆ مەڵبەندی ئەسڵی خۆی کە دێـی سەرشاتەی نزیکی چەمی سیروان بوو، ئەو دێ یەکێک بوو لە چوار دێی تاوگۆزی کـە مەڵبەندی سەییدەکانی تاوگۆزی بوون.

وە لە کۆتایی ژیانیدا لەو شوێنەدا دەمێنێتەوە و دوا دوایـی تەمـەنی خـۆی لەوێـدا بەسەر دەبات، لەگەڵ ئەوەیشدا کە گەلێ تەلاش کراوە بۆ ئەوە کوردستان بەجێ بێڵێ و بەرەو عەجەم بڕوا.

مەولەوی لە دە ساڵەی دوایی ژیانیدا تووشی سێ کۆسپی گەورە بووە:

١ ـ کۆچی دوایی عەنبـەر خـاتوونی خێـزانی، کـە ئـەم کـارە بـە تـەنها قیامـەتی مەولەویی پێ هەڵساوە و ئەو دڵە ناسکەی شکاوە و، ڕووی ڕۆشنـی دنیـای لەبـەرچاودا لێڵ بووە.

٢ ـ دوای کۆچی دوایی عەنبەر خاتوون کوێریش بووە، کە ئیتر بە یەکجاریی دنیای لـێ تاریک بووە و دیمەنی جوانی ڕەنگاوڕەنگی وەرزەکانی کوردسـتان، کـە هـەوێنی دەیان پارچە شیعری شاکاری بوون، بە پەردەیەکی ڕەش داپۆشراوە و هەر ئـەوەی بـۆ ماوەتەوە بە بەختی ڕەشی خۆیدا هەڵبدات.

٣ ـ کۆچی دوایی خۆی کە بە کارەساتێکی دڵتەزێن و نابار بووە.

دەگێڕنەوە: کاتێ ئەچێ بۆ پرسەی دۆستێکی لە دێی پریس بە سواری وڵاخێکـەوە دەبێت و لە لای دێی هانەسوورەدا دار توویەک بووە لقێکی لێ لار بووەتـەوە بـۆ سـەر ڕێگەکە و مەولەوی خۆی ئەوەی زانیوە، بە هاوڕێکەی گوتووە: کە گەیشتینە لای ئەو دار تووە پێم بڵێ با سەر دانەوێنم و ئەو لقە دارە لێم نەدا. بەڵام بە داخەوە کـابرا ئـەو قسەی مەولەوییەی بیر دەچێـت و کاتـێ مەولـەوی بـە خـۆی زانیـوە ئـەو دارە لارە داویەتی لە سنگی و پشتی بردووە بە دوادا و پشتی شـکاندووە و بـەو ئـازارە سـەختە گیانی پاکی بە پەروەردگاری خۆی سپاردووە.

مەلا حامیدی کاتبی شێخ بەم جۆرە مەولەویی لاواندووەتەوە:

آسمان گر خـون ببـارد بـر وفـات مولـوی
زیبد ار بـرگ سـیه پوشـند اهـل دنیـوی
مجمع علم و عبادت، مخزن صـدق و صـفا
مظهر عقل و درایـت، میـر ملـک معنـوی
پیروی شرعی محمد، شیخ اولادی حسین
سـالک راه طریقــت در طریــق اخــروی
فارس نظـم قصـاید در حقیقـت در مجـاز
ریزەخوار خوان جودش صد أمیـر دهلـوی
بهـر تـأریخ وفـاتش آنقـدر کـردیم فکـر
کاسـمان «غـش» کـرد بـر مـرگ مولـوی

١٣٠٠ هـ

باوکی مەولەوی کە مـەلا حەمەسـەعید بـووە سـێ کـوڕی لـێبـەجێمـاوە: مـەلا سەعدوڵلا و مەلا عەبدوڕەحیم ـ مەولەوی ـ مەلا یوسف.

لە مەلا سەعدوڵلا دوو کوڕ بەجێماوە: عەبدولکەریم و محەمەد.

لە عەبدولکەریم سۆفی فەتاح بەجێماوە. وە لە محەمەد، سەیید عەبدوڕەحیم بـوو. وە لە عەبدوڕەحیم چوار کوڕ بەجێماوە.

دەربارەی نەوەی مەلا یوسف هیچم دەست نەکەوتووە.

مەولەوی چوار کوڕی بووە: شێخ محەمەدی گەورە و شـێخ محەمـەدی بچـووک و سـەیید عەبدوڵـلا و سـەیید هیدایـەت. جـا لـە شـێخ محەمـەدی گـەورە، شـێخ محەمەدسەعید بووە لە هادی شێخ محەمەد بووە.

لە شێخ محەمەدی بچووک، سەیید عەلی بووە و لە سەیید عەلی، سەیید مەحموود و سەیید جەمیل و سەیید نووری بووە.

جا لە سەیید مـەحموود، سـەیید عەبـدوڕەحمان و سـەیید عەبـدولقادر و سـەیید لەتیف و سەیید ڕەئووف بووە.

وە لە سەیید جەمیل، ئەحمەد و عەبدوڵلا و سەدیق و عەبدولقادر بووە.

وە سەیید نووری منداڵی نەبووە.

وە لە سەیید عەبدوڵلا، سەیید محەمەد و سەیید کاک ئەحمەد و سـەیید فـەتاح و سەیید حەسەن و سەیید مستەفا و سەیید عەبدوڕەحیم بووە.

جا لە سەیید محەمەد، جەلال و موحسـین بـووە. وە لـە سـەیید کـاک ئەحمـەد، سەیید محەمەد و لە سەیید فەتاح، عەزیز و محەمەد و ئەنوەر بوون.

وە سەیید هیدایەتی کوڕی مەولەوی منداڵی نەبووە.

ئەمە دەقی شەجەرەی مەولەوییە:

بسم الله الرحمن الرحیم

حمدا لمن تنزه فی کنه ذاته عن ان ینتمی الیه العقل بالطلب، و شکرا لمن تقدس عن ان ینتمی الی نسب او ینتمی الیه نسب.

و اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شریک له الخالق بالقضاء و القدر، و ان سـیدنا محمـدا عبده و رسوله النسیب الاذکی الاطهر.

صلی الله علیه و علی اصحابه المتعززین بانتسابهم الیه، المتذللین کلتراب تحت قدمیه.

و بعد: فان شجرة ثمرتها حصول المعرفة للجنان، و دوحة غصنها الوصول الى غرفة الجنان، ثناء السلسلة العنية النبوية، و مدح السلالة الجليلة العلوية. و لكن لما ماجت بحور الايات و الاخبار، و امتلأت انهار السنن و الاثار بجوار مناقبهم العلية، و لآلى معاليهم المتلألئة المتوالية. .. صار مديح امثالنا من القاصرين فى حقهم قصورا، و ثناء اشباهنا من الصاغرين لهم جهلا و غرورا. كيف و من وجوه شرف المنسوب اليه؟ و اداؤه مما لا تسلط للعقل عليه!

ارى كل مدح فى النبى مقصرا
و ان بالغ المثنى عليه و اكثرا
اذ الله أثنى بالذى هو اهله
عليه، فما مقدار ما يمدح الورى؟

فلنصرف عنان البيان الى المقصود، ولنتخذه وسيلة الى شفاعة صاحب المقام المحمود. و نقول:

طالما كانت شجرة نسب السادات التاى جوزية يابسة مختفية فى زاوية الكتمان، كانما نسجت عليها عناكب النسيان. فاتخذها الايام ظهريا، و جعلها نسيا منسيا، و اخفاها الانام فى مجهول الزوايا فكأنما استغنوا عنها بما فيهم من الكمال و المزايا. بينما كانت كذلك اذ اورقت اغصانها، و نمت و برزت افنانها، فوجدت من طرف السادة الجورية و الجوار تائية اولاد قطب عصره عند المنصف و المتعسف، المولى المعروف بملا ابى‌بكر المصنف قدس الله تعالى سره! و افاض علينا بره. و زيادة على اشتهار الانتساب عند اولى الالباب صحت شجرة السادات التاى جوزية بشهادة ذوى الاقدار العلية، و الشرف و السيادة الجلية، السادات اولى السعادت الجورية، حيث قالوا فى شهادتهم واصح روايتهم: ان جناب جدنا الامجد الأعلم الارشد: قدوة علماء الدين، صاحب وراثة سيد المرسلين ـ ص ـ العالم الربانى والعارف الصمدانى، صاحب التأليفات الفائقة و التصنيفات الرائقة، مقبول المعاند و المنصف: السيد حسن المعروف بملا ابى‌بكر المصنف ـ قدس سره! قد تزوج درة درج العصمة و الخدارة، و درية برج العفة و الطهارة، بنت جناب القطب الربانى و الغوث الصمدانى الشيخ ميكائيل الدودانى ـ قدس سره! ـ التى ماسمح بمثلها الزمان المسماة ب«خاتون جهان»، فتولد منها الجامعان للكمال البعيدان عن النقصان: الملا عبدالكريم، و

الملا یوسف جان. و السادة الساوجبلاغیة و الجوار تائیة، من نسل المورد للرحم العمیم المولی عبدلکریم. و هو قدمات بجور، و دفن فی جوار والده الماجد فیها، و قبره معروف یزار و یتبرک به.

و لکن المولی یوسف جان لما غلب بالفتوة و الشباب و الحدثان علی نفسه داعیة الرکوب و الاصطیاد، و کان ذلک خلاف رأی والده الماجد النقاد .. انتقل الی جده الامجد الشیخ میکائیل بهذا القال و القیل، ثم بعد ذلک انتقل الی ارض الروم فی جوار خاله الشیخ سعد التای جوزی تارک العادة و الرسوم، و حصل له فیها اقطاعات و وظائف، وصلات و عوارف. و السادة التای جوزیة من نسل ملا یوسف جان ـ رحمه الملک المنان! ـ

و هو قدمات بتای‌جوز و دفن فی جوار خاله الشیخ سعد غفر الله لهما. انتهی مضمون شهادتهم. و اعلم انه لما نطقت صحاح الاخبار، و وردت اخبار الاحبار بوجوب محبة اهل البیت النبوی، و تحریم بغضهم بالتحریم القوی، و نص علیه فی ماحکی عن الشافعی ـ رض ـ من قوله:

یا اهل بیت رسول الله حبکم

فرض من الله فی القرآن انزله

فلا جرم کان حفظ نسبهم الشریف، و کتابة انتسابهم اللطیف، مما فیه مصالح عامة المسلمین کیلا یضیعوا حقوقهم، حتی یکرموا من حیث البغضة عدولهم و فسوقهم. فلذا جری علی هذا السنن السلف، و اقتدی بهم الخلف. اللهم اجعلنا من جملة خادمی اهل البیت النبوی، و من زمرة منتسبی مخلصی المنسبین الی النسب العلی العلوی. و من علینا بالفناء فی محبة الساقطین فی دیارهم بفناء دارهم الفائزین بکمال قرب جوارهم، و طرف جدارهم آمین یا مجیب السائلین!

فنقول ـ وبالله التوفیق ـ : و ممن فاز بسعادة نسبة السیادة، الاعز الارشد، و الاعلم الاحکم الامجد، صاحب الشمائل الحمیدة، و الفضائل الکثیرة العدیدة، مدرک المنطوق و المفهوم، جامع المنثور و المنظوم: السید عبدالرحیم المعروف بالمولوی المتخلص بالمعدوم، عفا عنه القیوم. ولد ذی الرأی السدید و العقل الاکید: السید سعید. غفره مالک یوم الوعید. ولد المرحوم المنیف: السید شریف. غفره الملک اللطیف، ولد المرحوم المسعود: اسید محمود. رحمه الملک المعبود. ولد المغفور الکامل الایمان: السید یوسف جان. غفر له المنان. ولد واصل درجة الیقین: السید جمال‌الدین. عفا عنه القوی المتین.

ولد البازل جهده فی متابعة سید المرسلین ـ ص ـ : السید کمال‌الدین، حفه بمغفرته غافر المستغفرین! ولد منبع العلم و الایمان: السید ملا یوسف جان، رحمه الملک المنان! ولد صاحب العلوم الباطنة و الظاهرة، معدن الکشوفات و الکرامات الباهرة. ذی التصانیف الدقیقة، و التألیف الحقة الحقیقة، الحبر الوفی و العالم العامل الولی، المحقق المدقق بالاتفاق، السید حسن المعروف بملا ابی‌بکر المصنف فی الآفاق قدس سره العلیم الخلاق! ولد صلب المنور قلبه بنور الله: السید هدایة الله، حفه بمغفرته الله، خلف منبع التقی و الزهد و الایمان، السید یوسف جان، من الله تعالی علیه بالرضوان. فی غرف الجنان، ولد کامل الایقان: السید یعقوب جان. غفره المنان. ولد مشرق نور الله: السید هدایة الله، اعانه بعفوه الله. خلف مرکز العرفان السید محمد جان، حفه الله تعالی بالاحسان. ولد مطلع شمس محبة الله: السید هدایة الله. ولد المرحوم المؤتمن السید حسن، رحمه ذو المنن لؤلؤ صدف الشرف فی العلم و العین، شاه حسین، خلف الارشد المؤتمن: السید حسن، من علیه ذوالمنن، خلف المرحوم المطهر السید جعفر غفره الله الاکبر، خلف جامع نعوت المزیة و المزید، السید ابی یزید. عفا عنه یوم الوعید. خلف شیخ مشایخ الزمان قطب دائرة الدوران، غوث الامن و الامان، الولی الکامل المکمل الواصل المجاهد السید محمد زاهد، قطب الارشاد المعنوی، المعروف ببیر خضر الشاهوئی، قدس سره و افیض بره!

و وجه تسمیته علی ما قاله العالم الربانی و الاعلم الصمدانی، مقبول المتسعف و المنصف، المولی ابی‌بکر المصنف هو: ان الامیر مقرب‌الدین کان امیر زمانه، فأوقد نارا عظیمة لتجربتة و امتحانه، فأمر بایقادها بحیث تحرق کل من یدانیها، و القاء السید محمد زاهد فیها، فلما کملت حیثیة وراثته الجلیلة کمالا تماما، صارت النار فی حقه بردا و سلاما. فتحیرت ارکان دولته، و قالوا له بالفارسیة:

«شاها دیدی چگونه شخصی است بزرگ؟!» فقال بها:

«شاه من نیستم شاه اوست» فمن ذلک الوقت لقب بـ«پیر خضر شاهو».

و ایضا الجبل الموسوم بـ«شاهو» کان اسمه فی الاصل «گنجویة» فلما اتخذه السید المذکور محلا لنفسه، و سکنا لیومه و غده و امسه، سمی بـ«شاهو» تسمیة للمحل باسم الحال، کما هو دأب اهل اللسان و الکمال.

و جناب بیر خضر خلف الرحوم المسعود: السید محمود، صانه عن الحساب الملک المعبود. ولد المطهر المظفر السید جعفر، غفره الله العلی الاکبر. ولد من ارتفع عنه حجاب

البین: السید حسین، عفا عنه رب العالمین. ولد المرحوم المسعود السید محمود،حفظه یوم الجزاء الملک المعبود! خلف مشمول نعمت الله: السید رحمة الله، رحمه الله! ولد المتصف بالمصابرة علی موجب الاسی؛ السید موسی، حفظه یوم الجزاء عما اساخلف رافع حجاب البین: السید حسین. عفا عنه بعز جده منور المشرقین. ولد الخلی عن العلل السید بدل. المتصف بالعز المتمادی، المشهور بالعادل الهادی. عفا عنه الهادی.

خلف المرحوم ذی النطیفة، المشهور بالخلیفة: السید خلف، حشره فی زمرة السلف، ولد مطلع الافضال، السید منذر المعروف بالمنهال، عفا عنه ذو الجلال و الجمال ولد شمس فلک الیقین السید ماجدالدین، رحمه رب العالمین. ولد سالک مسالک الدین القویم. السید عبدالرحیم، رحمه رب العظیم. خلف ذی المجد و المراسم السید قاسم، شفع فیه جده ابوالقاسم. خلف مدرس مدرسة التقدیس: السید ادریس، حفظه رب المرؤوس و الرئیس. ولد المزکی المطهر السید جعفر، رحمة الله علیه، و أثابه مما لدیه. ولد من هو علی مدارج حق الیقین مرتقی، الامام الهمام الامام علی النقی. خلف الامام التام الوفی الوقی، الامام محمد التقی. خلف المتصف بمقام الرضا و الارتضاء، الامام علی موسی الرضاء.

ولد من عجز عن مناقبه الناثر و الناظم الامام موسی الکاظم. خلف من هو بالحق ناطق، الامام جعفر الصادق. خلف ذی العرفان الوافر و المجد المتکاثر، الامام محمد الباقر. ولد من هو ملجأ الاسلام و الدین، و منبع العرفان و الیقین، الامام الهمام زین العابدین. ولد فلذة کبد نور المشرقین و المغربین، و قرة عین سید الثقلین، کاشف الغطاء بنور القلب عن البین، السبط النجیب الحسیب السعید، الخائف عن یوم الوعید، مع ماحواه من النور المزید، الامام حسین الشهید. من صلب امیر المؤمنین و امام المتقین. اسد الله الغالب علی ابن ابی‌طالب ، و ترائب سیدة نساء العالمین، حائزة اعلی درجات القبول، «فاطمة الزهراء البتول». ابنة من بظهوره ظهر البهاء والصفاء، و منه کشف عن الاعیان غطاء الخفاء، روح الوجود، حبیب المعبود، صاحب المقام المحمود، سیدنا و سندنا، ملاذنا و معاذنا فی معاشنا و معاذنا: حضرة محمد المصطفی سید الانبیاء. علی جماله و کماله و علی اصحابه بعد آله ازکی صلاة و سلام و ثناء. و اذ قد وصل القلم الی حقیقته، و العقل الی ماهیته، تحیر من مهابته، فلم یعدل عن هذا مخافة الندم، ولو انتهی الی حضرة خلیفة الله ابی البشر سیدنا آدم. علیه السلام مع سید الانام. اللهم صل و سلم و بارک علی سیدنا محمد

و علی آله، و عترته و اصحابه و تبعته اجمعین. و اغفر بحرمته لامته قاطبة، لا سیما لا فقر اهل العصیان احمد بن عبدالرحمن[١].

شەجەرەی هەندێ لە تاوگۆزی‌یەکان لە نەوەی مەلا یوسف جان:

السید الملا عزیز، ابن السید احمد، ابن السید یوسف، ابن السید شریف، ابن السید ابراهیم، ابن السید مرید، ابن السید یار احمد، ابن السید محمد، ابن السید محمد حسن، ابن السید کمال‌الدین، ابن السید جمال‌الدین، ابن السید کمال‌الدین، ابن السید جمال الدین ، ابن السید کمال‌الدین، ابن السید الملا یوسف جان، ابن السید حسن المعروف بملا ابی‌بکر المصنف، ابن السید هدایة الله .... الخ.

## شەجەرەی سەییدەکانی مەڵلایی بە خەتی مەولەوی، نووسراوی ساڵی ١٢٦٩ ک

بسم الله خیر الأسماء

و الحمد لله ملأ الارض و السماء، و الصلاة و السلام علی سید السادات و افضل الانبیاء. محمد و آله و صحبه البررة الاتقیاء.

و بعد: فقد صرح الشیخ ابن حجر ـ رحمه الله تعالی ـ فی مواضع فی تصانیفه بما حاصله، و فی مواضع بما لفظه: «من ادعی نسبا و لم یشتهر بغیره .. سمع دعواه».

فهؤلاء الذین تاتی کتابة نسبهم قد بلغ انتسابهم الی السید خضر المشتهر بملا خضر الجوارتانی حد الاستفاضة و التواتر من الرجال العدول و الرواة الثقاة، و ما کانوا مشتهرین بغیره.

و انتساب السید خضر الی حضرة الامام حسین ـ رض ـ ثابت فیما رأینا فی شجرات متعددات مکتوبات ممهورات بخطوط و مهور السادات و العلماء و الفضلا، و منقول فیما سمعنا من العلماء العالمین و الفضلاء الکاملین «و ما شهدنا الا بما علمنا، و ما کنا للغیب حافظین».

علی ان حفظ النسب لتعلق بعض الاحکام الفقهیة به کالکفاءة فی النکاح و غیر ذلک، کما لا یخفی علی اهله امر مهم، و ان خدمة ذوی القربی و اهل البیت النبوی حکم محبوب مستحب، بل فرض کما یستفاد مما یأتی؛ فلذلک سمعنا فضائلهم، و اطعنا امرهم،

---

١ ـ ئەم ئەحمەدە عەڵلامە ئەحمەدی نۆدشی‌یە.

و کتبنا سلسلة نسبهم الشريف ببناننا، و اعتقدناه بجناننا، فقلت بلساننا: من طائفة «ملائی» السيد مصطفى، ابن السيد حسن، ابن السيد صالح، ابن السيد محمد، ابن السيد مصطفى التايجوزی، ابن السيد محمد الناراوی، ابن السيد خضر الجوارتائی المشتهر بملا خضر، ابن السيد عبدالكريم، ابن السيد حسن المشتهر بمولانا ابی‌بکر المصنف، ابن السيد هداية الله، ابن السيد يوسف جان، ابن السيد يعقوب جان، ابن السيد هداية الله، ابن السيد محمد جان، ابن السيد هداية الله، ابن السيد حسن، ابن السيد شاه حسين، ابن السيد حسن، ابن السيد محمود، ابن السيد حسن، ابن السيد جعفر، ابن السيد ابی يزيد، ابن السيد محمد المشهور ببير خضر[1] .... الخ

### الطائفة الملائية

ان الطائفة الملائية[2] من نسل السيد الملا مصطفى، ابن السيد الملا حسن، ابن السيد صالح، ابن السيد محمد، ابن السيد الملا مصطفى التای‌جوزی، ابن السيد الملا محمد الناراوی، ابن السيد الملا خضر الجوارتائی، ابن السيد الملا عبدالكريم الجوری، ابن السيد حسن المكنی بابی‌بکر المشهور بملا ابی‌بکر المصنف.

### السيد الملا مصطفى

المشهور بملا مصطفى الشميرانی ـ و هی قرية شهرزور ـ[3] و للسيد الملا مصطفى هذا اولاد و هم: السيد عبدالرحمن، و السيد علی، و السيد احمد، و السيد محمد. و بنت واحدة

---

١ـ مەولەوی لە سەر ناوی پیر خزر نووسیویە: شجرۀ نسب پیر خضر در نسخۀ دیگر که صحیح و بی‌ترک است و تغییری در سید بدل و سید خلیفه و سید حسن و تقدیم و تأخیری در سید محمود و سید حسن دارد، تا به سید منهال می‌رسد این است: پیر خضر، ابن السید محمود، ابن السید جعفر، ابن السید حسین، ابن السید محمود، ابن السید رحمة الله، ابن السید موسی، ابن السید حسین، ابن السید عادل، ابن السید خلف، ابن السید منهال.

٢ـ ئەم بەشی بنەماڵەی «مەلائی»یە بە خەتی مەولەوی بوو، ئێمەیش وەک خۆیمان نووسی و وەرمان نەگێڕا سەر زمانی کوردی.

٣ـ ئەمە لەو سەردەمەدا وا گوتراوە، بەڵام ئەم دێ دوایی ـ لە ناو چەند دێیەکی سەر بە شەمێراندا ـ بە دێی «ئەحمەدبەگ» ناسرا.

اسمها «عائشة». كما ان للسيد محمد ابن الملا مصطفى ولدان: هما السيد محمود و السيد يوسف.

و الملا مصطفى هذا ابن السيد حسن المشهور بملا حسن و هو ابن السيد صالح المشهور بملا صالح. و له اولاد، وهم: السيد الملا حسن، و السيد حسين، و السيد الياس، و السيد محمد، كما يظهر لک من اجداد الاحفاد.

و السيد سليم ابن السيد عبدلقادر، ابن السيد حسين، ابن السيد صالح.

و السيد عبدالقادر ابن السيد محمد سعيد، ابن السيد الياس، ابن السيد صالح.

و السيد محمد ابن السيد مؤمن، ابن السيد عثمان، ابن السيد محمد، ابن السيد صالح. «اولئک اولاد السيد صالح».

و اما الاحفاد: فالسيد محمد، و السيد احمد ابنان للسيد سليم و السيد حمزة، ابن صالح، و صالح و عبدالكريم ابنان للسيد حسين ابن السيد صالح.

و السيد على ابن السيد مصطفى، ابن السيد حسين، ابن السيد صالح.

و السيد عبدالفتاح، و السيد معروف، والسيد عباس، ابناء للسيد محمد سعيد ابن السيد الياس ابن السيد صالح.

كما ان السيد عبدالصمد و السيد عبدالله و السيد فرج اولاد السيد عبدالفتاح.

و السيد صالح ابن السيد عبدالصمد.

و السيد محمد ابن السيد عبدالله.

و السيد محمد امين ابن السيد عثمان ابن السيد الياس.

و السيد محمد صالح و السيد احمد هما ولدا السيد محمد أمين و السيد محمود و السيد صالح و السيد احمد ابناء السيد محمد .

و السيد عبدالعزيز، و السيد على ابنا السيد صالح، ابن السيد عثمان.

و السيد صالح ابن السيد محمد.

و للسيد محمد اولاد، وهم: السيد مصطفى، و السيد حسين، والسيد يوسف، ولهم سلالة كما يلى:

السيد محمد ابن عبدالرحمن، ابن السيد يعقوب، ابن السيد مصطفى، ابن السيد محمد.

و السيد معروف، و السيد عباس، و السيد عبدالقادر، ابناء السيد سليم ابن السيد عباس، ابن السيد مصطفى، ابن السيد محمد.

و السيد عبدالله ابن السيد حيدر، ابن السيد عبدالله، ابن السيد مصطفى، ابن السيد محمد.

و السيد عبدالعزيز، و السيد خضر، ابنا السيد مصطفى ابن السيد خضر، ابن السيد مصطفى، ابن السيد محمد.

و السيد احمد، ابن السيد محمد، ابن السبد احمد، ابن السيد مصطفى، ابن السيد محمد.

و السيد على، و السيد عبدالرحيم، و السيد محمود ابناء السيد رسول، ابن السيد محمود، ابن السيد مصطفى، ابن السيد محمد. و السيد محمد ابن السيد سليمان، ابن السيد امام، ابن السيد محمود، و السيد عارف ولدا السيد سليمان، و السيد محمود ولد السيد عارف، و السيد عبدالله ولد السيد سليمان.

و السيد رسول ابن السيد حسين، ابن السيد يعقوب، ابن السيد حسين، ابن السيد محمد.

و السيد عبدالقادر، ابن السيد اسماعيل، ابن السيد محمود، ابن السيد مصطفى المشهور بملاله، ابن السيد يوسف، ابن السيد محمد.

و للسيد اسماعيل اخ و هو السيد شريف، و للسيد شريف ابن هو عبدالكريم.

و للسيد سليم اخ و هو السيد على، و للسيد على ابن هو السيد محمد، و له ابن و هو محمد صالح، و له اولاد و هم: السيد فتاح، و السيد عارف، و السيد رشيد.

### السيد مصطفى التاى‌جوزى

المشهور بملا مصطفى و كان ـ قدس سره! ـ صاحب كرامات، و خوارق عادات، و «تاى جوز» قرية من قرى «جوان رود» و دفن ـ رحمه الله تعالى! ـ فيها.

و كان له ولدان: السيد محمد، و قد كتبنا نسله. و السيد «يار احمد» و نسله كما يلى:

السيد على محمد، و السيد محمد، و السيد يار محمد، و السيد يار احمد، و السيد حيدر، و الخمسة اولاد لمحمد ابن السيد حيدر، ابن السيد يعقوب آقا، ابن السيد يار احمد، ابن السيد مصطفى التاى‌جوزى.

و السید بهرام ابن السید ملا مصطفی ابن احمد ابن السید یار احمد ابن السید مصطفی التای‌جوزی.

و السید محمد امین، و السید محمد سعید، و السید سلیمان ابناء السید قیتولی، ابن السید حیدر، ابن السید یعقوب، ابن السید یار احمد، ابن السید مصطفی التای‌جوزی.

و السید یعقوب، و السید محمد خان، و السید محمد، و السید معروف، و هم ابناء السید عبدالمحمد، ابن السید حیدر، ابن السید یعقوب، ابن السید یار احمد، ابن السید مصطفی التای‌جوزی.

## السید محمد النااروی

المشهور بملا محمد الکوسج، و کان ـ قدس سره! ـ صاحب کرامات، و کان له اولاد منهم: السید مصطفی، و قد ذکرناه و نسله. و منهم: السید احمد الجنی، و السبد الیاس و نسلهما کما یلی:

السید حسن و السید حسین، و السید عبدالعزیز، و السید محمد سعید، و السید کاکا علی، و السید محمد. و اولائک الستة ابناء السید مصطفی، ابن السید علی، ابن السید محمد، ابن السید احمد الجنی، ابن السید الملا محمد النااروی.

و السید محمد، ابن السید محمود، ابن السید اسماعیل، ابن السید احمد، ابن السید محمد، ابن السید احمد، ابن السید محمود، ابن السید الیاس، ابن السید الملا محمود النااروی.

و السید حسین، و السید محمد، ابنا السید عمر، ابن السبد عثمان، ابن السید ابی‌بکر، ابن السید احمد، ابن السید محمود، ابن السید الیاس، ابن السید الملا محمود النااروی.

و السید محمد و السید مصطفی ابنا السید علی، ابن السید الیاس، ابن السید علی، ابن السید اسماعیل، ابن السید محمود، ابن السید الیاس، ابن السید الملا محمود النااروی.

و السید عبدالقادر، و عبدالعزیز، و نادی، ابناء السید محمد، ابن السید احمد، ابن السید ابی‌بکر، ابن السید احمد، ابن السید محمود، ابن السید الیاس، ابن السید الملا محمود النااروی.

و السید عثمان و السید کاکه خان ابنا السید علی، ابن السید عثمان ابن السید ابی‌بکر، ابن السید احمد، ابن السید محمود، ابن السید الیاس، ابن السید الملا محمود النااروی.

و السيد عبدالله ابن السيد عثمان، ابن السيد ابی‌بكر، ابن السيد احمد، ابن السيد محمود، ابن السيد الياس، ابن السيد الملا محمود النارِاوی.

و السيد عبدالقادر ابن السيد عبدالله، و اخوه السيد محمد ابنا السيد مصطفی، ابن السيد عمر، ابن السيد احمد، ابن السيد محمود، ابن السيد الياس، ابن السيد الملا محمود النارِاوی.

و للسيد محمد ابنان: السيد احمد، و السيد محمود.

و السيد عبدالقادر، و ابراهيم، و مصطفی ابناء درويش محمد و هو و اخوه السيد يوسف ابنا السيد علی، ابن السيد عمر، ابن السيد احمد، ابن السيد محمود، ابن السيد الياس، ابن السيد الملا محمود النارِاوی.

و السيد احمد، ابن السيد شريف، ابن السيد بيره، ابن السيد محمود، ابن السيد الياس، ابن السيد الملا محمود النارِاوی.

و كانت شجرة الطائفة الملائية ممهورة بمهرجم غفير من فضلاء العصر فی وقته مثل: المرحوم كاک احمد الشيخ، و المولوی، و علماء العصر فی السليمانية و شهرزور و غيرهما. و لا داعی الی تعدادهم هنا. اكتفاء بما فی شجرتهم.

## شەجەرەی ساداتی چنارە لە قەزای دەربەندیخاندا:

ئەم بنەماڵە لقێکن لە بنەماڵەی مەلا ئەبوبەکری موسەننیفی چۆڕیی مەریوانی و لە سەر بناغەی دەقی شەجەرەکەیان لە نەوەی مەلا محەمەدی کوڕی مەلا ئەبوبەکری موسەننیفن و یەکەم کەسێ لەم بنەماڵە کە هاتووە بۆ دێی چنارە سەیید نیزامەدین بووە کە مرۆیەکی باش و زانا و بەڕێز بووە. وە هەرچەند بە وردیی مێژووی هاتنی بۆ دێی چنارە نەزانراوە، بەڵام لە سەر تەماشای هەندێ بەڵگە وا دەردەکەوێ کە لە دەوروبەری ١٢٠٠ی کۆچیدا بووبێ، وە ئەم بنەماڵە لەو کاتەوە دامەزراون لە چنارەدا هەمیشە خوێندەواریان لێ نەبڕاوە، بەڵام لە بەر ئەوە کە خەڵکی ئەو دێیە خەریکی ئیش‌وکار و کشت‌وکاڵ بوون ئەگەر خوێندەواری باشیان تیدا هەڵکەوتبێ لە چنارەدا نیشتەجێ نەبووە و چووە بۆ دەرەوەی ئەو ناوە.

ئەمەیش شەجەرەکەیانە:

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، و الصلاة على سيدنا محمد و آله و صحبه اجمعين.

و بعد: ان الله تعالى جعل المرشد العالم الفاضل الكامل المحقق المدقق الشيخ سيد نظام الدين من جلابيب كرمه، و شآبيب نعمه منخرطا فى سلك بيت الذين اذهب الله عنهم الرجس و طهرهم تطهيرا.

فنشهد امتثالا لاية: «و لا تكتموا الشهادة» انه ابن السيد مولانا، ابن السيد يوسف، ابن السيد سليمان، ابن السيد بابا شيخ، ابن السيد على، ابن السيد محمود الملقب بمولانا، ابن السيد محمد، ابن السيد حسن المسمى بملا ابى‌بكر المصنف، ابن هداية الله ....

## سەییدەکانی کەس‌نەزانی لای سەقز

بۆ ئاگاداری بزانن کە شێخەکانی کەس‌نەزانی سەر بە قەزای سەقز کە یەکێ لەوان شێخ نەجمەدینی کوڕی شێخ شەمسەدینە ئەوانەیش لە نەوەی مەلا محەمەدی کوڕی مەلا ئەبوبەکری موسەننیفن و لەگەڵ شێخەکانی چنارەی شارەزووردا لە شێخ مەحموودی ناسراو بە «مەولانا»دا یەک ئەگرنەوە، چونکە شێخەکانی دێی چنارە ئەچنەوە سەر سەیید عەلیی کوڕی سەیید مەحموودی بە مەولانا بەناوبانگ، وە شێخەکانی کەس‌نەزانیش ئەچنەوە سەر شێخ شەمسەدینی کوڕی سەیید مەحموودی ناسراو بە مەولانا، بەم شێوە ئەڵێن:

شێخ نەجمەدینی، کوڕی شێخ شەمسەدینی، کوڕی حاج شێخ فەزلوڵلای، کوڕی شێخ شەریفی، کوڕی حاجی شێخ ئەسعەدی، کوڕی حاجی شێخ عەبدوڵلای، کوڕی حاجی شێخ شەمسەدینی دوەم، کوڕی حاجی شێخ عومەری، کوڕی حاجی شێخ شەمسەدینی یەکەم، کوڕی حاجی شێخ مەحموودی مەشهوور بە مەولانا، کوڕی سەیید مەلا محەمەد، کوڕی سەیید حەسەن ـ مەلا ئەبوبەکری موسەننیف ـ .

هەروەها شەجەرەی حاجی شێخ ئەمینی خالیش ئەگات بە شێخ شەمسەدینی، کوڕی مەلا مەحموودی، کوڕی مەلا محەمەدی کوڕی سەیید حەسەنی ناسراو بە مەلا ئەبوبەکری موسەننیف بەم شێوە:

حاجی شێخ ئەمینی خاڵ، کوڕی شێخ محەمەدی خاڵ، کوڕی شێخ ئیسماعیلی، کوڕی شێخ عوسمانی، کوڕی شێخ عەلی، کوڕی شێخ شەمسەدین، کوڕی شێخ مەحموودی ناسراو بە مەولانا، کوڕی سەیید حەسەن ـ مەلا ئەبوبەکری موسەننیف ـ .

## شەجەرەی شێخەکانی قەرەداغی دانیشتووی دێکانی «نەوتی» و «بەڵخە»:

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، و الصلاة على سيدنا محمد و آله و صحبه اجمعين.

اما بعد: فهذا نسب السيد سعيد، ابن السيد محمد، ابن السيد عبدالكريم، ابن السيد عبدالرحمن، ابن السيد محمد، ابن السيد خضر، ابن السيد ميكائيل، ابن السيد سليمان، ابن السيد كولنان = «کولەنان»، ابن السيد ابراهيم، ابن السيداسماعيل، ابن السيد دانيال، ابن السيد محمود، ابن السيد عبدال، ابن السيد حسن، ابن السيد عبدال بير ولى، ابن السيد شهاب‌الدين، ابن السيد ارين، ابن السيد بلال، ابن السيد مؤمن، ابن السيد شهاب الدين، ابن السيد عيسى، ابن السيد موسى، ابن السيد احمد، ابن السيد محمد، ابن السيد على، ابن السيد حسين، ابن السيد يوسف، ابن السيد حيدر، ابن السيد محمد[١]، ابن السيد ضارى، ابن السيد يعقوب، ابن السيد محمد، ابن السيد ابراهيم سمين، ابن الامام موسى الكاظم، ابن الامام جعفر الصادق، ابن الامام محمد الباقر، ابن الامام على زين العابدين، ابن الامام الحسين السبط، ابن الامام على ابن ابى‌طالب و فاطمه الزهراء وردة الرسول - ص -.

---

١ - لە نوسخەی شەجەرەکەدا لە سەر ئەم موحەممەدە نووسراوە: المشهور «بپير خضر الشاهو» بەلام ئەوە هەڵەیە، چونکی پیرخزر کوڕی سەیید مەحموودی مەدەنییە و کوڕی سەیید ضاری نییە. وە پیر خزر لە نەوەی عەلیڕەزای خۆراسانەوە لە نەوەی ئیبراهیم سەمین نییە.

## بنەماڵەی سەیید ئەحمەدی بایەنچۆ

وەکوو باوە سەیید ئەحمەدی بایەنچۆ کوڕی سەیید محەمـەدی سـەبزەواری‌یـە، لـە نەتەوەی سەیید محەمەدی زاهیدی بە پیرخدری شاهۆ ناسـراوە و ئـەم قسـە لـە نـاو شارەزایانی نەسەب لە کوردستاندا روون و ئاشکرایە.

سەیید ئەحمەد پیاوێکی چاک و خوداناس و لەخوداترس بـووە و گـەلێ کەرامـەتی لێ دەگێڕنەوە لەوانە:

دەڵێن: کە گەیشتووەتە ئەو شوێنە کە ئێستە پێی دەڵێن بایەنچۆ لەبەر بـێ ئـاویی شوێنەکە خەڵک داوایان لێ کردووە کە دۆعا بکا بەڵکوو خودا لە لایەکەوە ئاوێکیان بۆ دەربخات. ئەویش عاساکەی کوتاوە بە زەویدا، خودا لە شـوێنی عاسـاکەیەوە ئـاوێکی زۆری بۆ دەر کردوون کە خەڵکی سوودی لێ وەربگرن.

دوای ئەوە خەڵکی ئەو ناوە زۆر ڕێزیان لێ گرتووە و بـە سـەربەرزیی لـەو شـوێنەدا دامەزراوە.

جا سەرگوزەشتەی ئەم خێزانە کات و شوێنێکی زۆری دەوێ.

ئێمە لێرەدا لە سەر نووسینی سەیید حەسـەن ـ کـە یەکێکـە لـەو خانەدانـە ـ بـە کورتی هەندێ شت دەنووسین بەڵکوو لە هەلی تردا شتی دیکـەمان دەسـت‌کـەوێ و بینووسین.

سەیید حەسەن ئەڵێ: نەتەوەی سەیید ئەحمەدی بایەنچۆیی لە سـەر چـوار کـەس هاتووەتە خوارەوە: سـەیید رەحمـەت و سـەیید مـیرزا و سـەیید سـەعدی و سـەیید شاوەیس.

چینی دوەم و سێهەم لە پلە و پایەی دنیادا لە چینی یەکەم و دوەم کەمتر بـوون و لە ژێر سێبەری ئەواندا ژیاون. لە گەڵ ئەوەدا هەموویان بەدین و لەخوداترس بوون.

چینی دوەم کە چینی سەیید میرزایی بوون پیاوی دیاری و بەرزیان زۆر بووە، یەکێ لەوانە جەنابی سەیید عبدولحەکیم بووە کە لە دێی «گەوونتوو»دا دانیشتووە. ئەم زاتە زانا و ئەدیب بووە، هەستی شیعری بووە و نامیلکەیەکی جوانی لە باسی سیفاتی بەرز و رەوشتی جواندا بە شیعر داناوە. ئەو هۆنراوە لە کتێبخانەی سەییدەکانی باینچۆدا هەیە کە بەداخەوە تا ئێستا چاپ نەکراوە.

سەیید عبدولحەکیم خاوەن تەکیە و شوێن بووە و نان و خوانی بووە و لەگەڵ شێوەی ناندان و خانەدانیشدا ئیرشادی کردووە، هەتا لە دنیا دەرچووە و چەند کوڕی لێ بەجێماوە. گەورەتریان سەیید نەجمەدین بووە، کە لە جێگەکەی باوکیدا دانیشتووە بەلام پاش ماوەیەک گوێزاویەتییەوە بۆ دێی «هەمرۆڵە» لە ناحیەی لەیلاخ کە شوێنەواری خێڵەکانی «زەند» و «مەنمی»یە و بە سیفەتی خانەدانی تەکیەداری و ئیرشاد دامەزراوە. بە تایبەتی دوای ئەوە کە سەیید نەجمەدین بووە بە مەنسووبی حەزرەتی شێخ عوسمانی سیراجەدین و چووەتە تەریقەتی نەقشبەندی و بووە بە خەلیفە و شێخ عوسمان کچی خۆی بۆ مارە کردووە و بەمە زیاتر پلەی سەیید نەجمەدین بەرز بووەتەوە.

سەیید نەجمەدین لەو کچی شێخ عوسمانە دوو کوڕی بووە: سەیید جەلال و سەیید شەهاب. ئەم دوو کوڕە هەردووکیان ئینسانی باش و بەتوانا و خوێندەوار بوون.

سەیید جەلال لە مێژووی ١٣٨٠ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و چوار کوڕی لێ بەجێماوە: عابید و خالید و زەینەدین و عارف.

وە سەیید شەهاب لە مێژووی ١٣٩٠ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و دوو کوڕی لێ بەجێماوە: ئەمانە ئێستە لە مێژووی ١٤٠٣ی کۆچیدا لە ژیاندان.

وە لە نەوەی سەیید میرزایی دوو پیاوی بەرێز هەڵکەوتوون، یەکەم ناوی سەیید ئەحمەدە کە لە دێی «زەڵکە»دا بە خاک سپێرراوە. دوەم سەیید ئاغاجان کە لە گوندی «هانەگلان»دا نێژراوە. ئەم دوو دێ سەر بە باینچۆن.

سەیید ئەحمەد زۆر لەخواترس و خواپەرەست بووە، زەوقی شیعری و ئەدەبیشی بووە. نزیکەی پێنجسەد شیعری لە خودابەیەکناسی و پاڕانەوەدا هەیە، ئەو شیعرانە وان لای سەیید حەسەن کە یەکێک لە نەوەکانیەتی.

سەیید ئاغاجانیش پیاوێکی لەخوداترس بووە، چەن کوڕی لێ بەجێ‌ماوە. یەکێ لەوانە ناوی شێخ ڕەزا بووە، جەزەبە و حاڵی نەفسی بووە و لە سەر تەریقەتی قادری بووە.

وە چینی یەکەم کە سەییدەکانی نەتەوەی سەیید ئەحمەدی باینچۆن کە بە سەییدڕەحمەتی بەناوبانگن .. باپیرەیان ناوی سەیید ڕەحمەت بووە. ئەم پیاوە یا کوڕی سەیید شەمامەی کوڕی سەیید ئەحمەدە یا کوڕەزایەتی.

سەیید ڕەحمەت چەند کوڕێکی بوود گەورەکەیان ناوی سەیید مەهدی بووە. سەیید مەهدی دوازدە کوڕی بووە دیاریتریان ناوی محەمەدسەعید بووە، زانایەکی بەڕێز و ئەدیب و شاعیر بووە، یوسف و زلێخای دانراوی مەولانا جامیی لە فارسی‌یەوە وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی کوردیی شێوەی هەورامی و هۆنراوەیەکی زۆر شیرین و پاراوە. ئەم کتێبە هێشتا چاپ نەکراوە و نوسخەیەکی لە کتێبخانەی خێزانی «امین السادات»دا هەیە.

ئەم محەمەدسەعیدە هەرچەند لە باینچۆ لە دایک بووە زۆر دڵی پێوە بووە تیادا دابنیشێ، بەڵام هەر گوێزاوەیەتی‌یەوە بۆ دێی کوچکچەرموو لە باکووری باینچۆوە و لەوێدا نیشتەجێ بووە و ژیانی خۆی بردووەتە سەر.

وە بە فەرمانی دەسەڵاتداری ئەو ڕۆژە بووە بە فەرمانڕەوای ناحیەی «لەیلاخ» و «خوڕخوڕە» و کەلاتەرزان و مەردانە ئیش و کاری ئەو سێ ناحیەی بەڕێوە بردووە.

سەیید محەمەد سەعید لەگەڵ ئەو پایە و پلەدا هەم خەریکی خزمەتی ئایین و زانست بووە و لە ماوەی ژیانیدا خوێندنگای بەرزی پڕ لە فەقێی بووە و بڕیاری داوە هەمیشە شەست نەفەر فەقێ لە خوێندنگاکەیدا بێ. وە ئەگەر وا ڕێکەوتبێ یەکێک یان دووان لەو فەقێیانە ڕۆیشتبن گورج ناردوویە فەقێیی دیکەی هێناوە و جێگەکەی پڕ کردوونەتەوە.

وە لە دوادوایی ژیانیدا مودەڕیسی ئەو خوێندنگا بەرزە مەلا فەتحوڵڵا ناوێ بووە لە نەتەوەی زاناکانی فەرهادئاوای ناوچەی «ساراڵ»ی سەر بە شاری سنە.

ئەم مەلا فەتحوڵڵا زانایەکی نایاب و لەخوداترسێکی دڵڕووناک بووە. خەڵکی شتی لە یاسا بەدەریان لێ گێڕاوەتەوە.

دەگێڕنەوە کە سەیید محەمەد سەعید قوشخانەیەکی بووە باز و هەڵۆ و جۆرەها پەلەوەری تێدا بووە کە بۆ ڕاو و شکار دەست بدەن. ڕۆژێک لە پێش هەتاوکەوتندا سەیید محەمەد سەعید ئەڕوا لە قوشخانەکەدا بازێک دەر ئەکا و ئەیخاتە سەر دەستی، چاوەڕێی ئەوە ئەکا کاتی ڕاو بێت و بازەکەی بەرەڵا بکات. لەو کاتەدا جەنابی مەلا فەتحوڵڵای مودەڕیس لە مزگەوت دێتە دەرەوە، کە سەیید محەمەدسەعید ئەبینێ وا بازێکی بەسەر دەستەوەیە بە شێوەی گۆرانی پێی دەڵێت: «بدیە! بدیە! سەیید و ئەولاد و پێغەمەری ـ د ـ نمازو سوبحیش نەوەندەن، کەچی قوشش نان سەرو دەستشەوە».

واتە تەماشا بکە! تەماشا بکە! ئەم زاتە سەییدە و نەتەوەی پێغەمەرە ـ د ـ نوێژی سبەینێی نەکردووە، کەچی بازی ناوە بە سەر دەستی‌یەوە؟

کاتێ مەلا فەتحوڵڵا ئەو قسە ئەکا سەیید محەمەدسەعید لە شەرمەزاریدا بازەکەی دەکوتێ بە زەویدا و باڵێکی ئەشکێنێ و خۆیشی بە شەرمەوە ئەڵێ: مامۆستا پەیمان بێ هەتا ماوم لە دنیادا نوێژی بەیانی نەفەوتێنم. جا مەلا فەتحوڵڵا ئەڵێ: کە تۆ ئاوا قسەکەی منت وەرگرت لە خودا داوا ئەکەم سەربەرزی هەر دوو دونیا بی.

وە لەو کاتەدا کە بازەکەی سەیید محەمەدسەعید بە باڵشکاویی تەپەتەپ ئەکا و ناتوانێ بفڕێ، جەنابی مەلا فەتحوڵڵا بازەکە هەڵئەگرێ و دەست دێنێ بە باڵیا و ئەیداتەوە دەستی سەیید محەمەدسەعید، کاتێ سەیید محەمەدسەعید وەری ئەگرێ تەماشا ئەکێ باڵی ساغە و بازەکە وەکوو جاری جارانی پێشووی وەهایە!

پاش ئەم کەرامەتە سەیید محەمەدسەعید کوڕەکانی کۆئەکاتەوە و وەسیەتیان بۆ ئەکات: هەرگیز لە هاتوچۆدا پێش زانای دین نەکەون و بە ڕێزەوە تەماشایان بکەن.

ئەگێڕنەوە: لە سەردەمی سەییدمحەمەد سەعیدا یەکێ لە سەییدەکانی سەفاخانە کە ناوی سەیید محەمەدسادق بووە دڵدارێکی بووە ناوی «صراحی» بووە، لە پێش گوێزانەوەیدا دڵدارە دیاریکراوەکەی دەمرێ. ئەویش لە داخی ئەم کارەساتە سەری خۆی هەڵدەگرێ و بڕیار ئەدا هەتا ماوە سەر بە ئاوایی سەفاخانەدا نەکاتەوە و ئەچێت بۆ دێی کوچکچەرموو بۆ لای مەلا فەتحوڵڵا و ئەم سەیید محەمەدسادقەیش ئەوەندە جوانخاس بووە کەموێنە بووە، وە ئەوەندەیش دەنگی خۆش بووە کاتێ شیعرێکی خوێندووەتەوە هەرکەسێ بیستوویەتی لە شوێنی خۆیدا وەستاوە.

وە سەیید محەمەدسەعید خۆشەویستیی ئەم سەیید محەمەدسادقە ئەچێتە دڵیەوە و زۆر پەسەندی ئەکات و کچێکی بووە ناوی جیهان‌ئارا بووە بڕیار ئەدا بیدا بە سەیید محەمەدسادق. بە قەزای خودا ئەم جیهان‌ئارایەش نەخۆش ئەکەوێت و ئەمرێ! ئەمجار سەیید حەمەسادق بە تەواویی شێت و شەیدا ئەبێت و لە حاڵی ئێرەتی دەرئەچێت. بەم بۆنەوە چەند شیعرێک لە لاواندنەوەی دوو دەستگیرانەکەی و پەرێشانیی خۆیدا دەڵێت و لە ناو شیعرەکاندا باسی ئەوە ئەکا کە شوێنە خۆشەکانی دێی کوچکچەرموو کە ناویان: «سەرسێوک» و «باخان» و «بێلۆ» و «شاجۆ»یە خەمبارن و بێ نازن بە هۆی جیا بوونەوە و مردنی ئێوەوە. لە شیعرەکەدا دەڵێ:

«سەرسێوک»[1] بێ ناز «باخان» بێ‌ڕەنگەن
«بێلۆ»[2] خاتر زیز، «شاجۆ»[3] دڵ‌تەنگەن
ئەعزا شکستەی بێ جەراحە خۆم
بێ «جیهان ئارا» و بێ «سوراحە» خۆم

سەیید محەمەدسەعید لە کوچکچەرمودا کۆچی دوایی کردووە، چوار کوڕی لێ بەجێ‌ماوە:

یەکەم: محەمەدڕەشید، ئەم زاتەیش کوڕێکی بووە ناوی سەیید فەتحوڵڵا بووە، بە بێ نەوە سەری ناوەتەوە.

دووەم: سەیید محەمەد ئەمین، ئەم زاتە سێ کوڕی بووە:

١ ـ سەیید ئەسعەدی قازیی کە نەوەد ساڵی تەمەن بە سەر بردووە لە خانەدانێکی پڕ رێز و کەرامەتدا. ئەم زاتەیش پاش فامکردنەوە دەستی کردووە بە خوێندن و لە پاش خوێندن تەواوکردن خەریکی دەرزوتنەوە بووە و سوودی بە موسوڵمانان گەیاندووە و خەریکی قازییتی و تەتبیقی یاسای ئایین بووە و بەو جۆرە ئەو تەمەنە

---

١ ـ سێوک: ناوی باخێ بووە لە کوچکچەرموودا، سەرسێوک: ناوی کێوێکە لە پشتی ئەو باخەوە.

٢ ـ بێلۆ: ناوی سەرچاوەی ئاوێکە لە هەمان شوێندا.

٣ـ شاجۆ: ناوی جۆگەیەکی گەورە بووە لەو دێدا.

درێژەی بە سەر بردووە و نەچووەتە ناو دنیا و بە بێ ژن و پەیوەندی و پاشماوە سەری ناوەتەوە.

٢ ـ سەیید جەعفەر، کە دوو کوڕی بووە، یەکەم سەیید محەمەد کە بە بێ نەوە مردووە. دوەم سەیید ئەحمەد کە نەتەوەی بووە.

٣ ـ لە کوڕەکانی سەیید محەمەد ئەمین .. سەیید عەبدوڵلایە کە لە تەمەنی بیست و یەک ساڵیدا حەجی کردووە و لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا بە بێ منداڵ و خێزان سەری ناوەتەوە.

سێهەم لە کوڕەکانی سەیید محەمەدسەعید سەیید عەلی‌یە، کە لە گەنجیدا بە بێ نەوە سەری ناوەتەوە، لە کوچکچەرموو بە خاک سپێرراوە.

چوارەم لە کوڕەکانی سەیید محەمەدسەعید .. سەیید سەعدەدین بووە، کە بە «امين السادات» ناسراوە، خاوەنی پایە و مایە و مزگەوت و خوێندنگا و دیوەخان بووە و هەمیشە خوێندنگاکەی ئاوان بووە.

ئەم زاتە لە پاش کۆچی دوایی مەلا فەتحوڵلای مودەڕیس جەنابی مەلا عەبدولقادری بازیانی کانی‌کەوەیی «موجاز»ی حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشی هێناوە بۆ کوچکچەرموو، کردوویەتی بە مودەڕیس وگەلێ فەقێی زانا و هۆشیار، وەکوو مەلا محەمەدحەسەنی کوڕی مەلا عەلیی قزلجیی و وێنەی ئەو لە لای خوێندوویانە.

بەڵام شێخ عومەری زیائەدین ناردوویەتی بە شوێن مەلا قادردا هێناویە بۆ بیارە و لەوێ دەرزی گوتووەتەوە.

سەیید محەمەدسەعید زۆر لە ڕۆییشتنی مەلا قادر دلگران بووە و ماوەیەک پاش ئەوە مەلا عەزیزی ڕوحزادی بووە بە مودەڕیسی کوچکچەرموو، ئەویش دوازدە ساڵ لەو شوێنەدا دەرزی گوتووەتەوە، جا باوکی مەلا عەزیز هاتووە بە شوێنیدا و بردوویەتی‌یەوە بۆ شارەزوور و لەوێ بووە بە مەلای دێی عەبابەیلێ و پاش ماوەیەک مار پێوەی داوە و کۆچی دوایی کردووە.

لە پاش گەڕانەوەی مەلا عەزیز بۆ شارەزوور مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا فەتحوڵلای مودەڕیسی پێشووی کوچکچەرموو هاتووەتەوە بۆ جێگەکەی باوکی و بووە بە مودەڕیس و نزیکی چل ساڵ لەو شوێنەدا دەرزی گوتووەتەوە.

سەیید سەعدەدین تەمەنی خۆی لە خزمەتکردنی ئایین و زانست و ناندان بە موسوڵماناندا بە سەر بردووە و بەم شێوە ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کردووە. پێنج کوڕی لێ بەجێماوە:

یەکەم: سەیید عەلیی ناسراو بە «امین السادات» کە لە ڕێز و بەلاغەت و قسەڕەوانی و مەجلیسئاراییدا کەم وێنە بووە. زۆربەی شیعرەکانی مەولەوی لەبەر بوو، وتاری زۆر بە تەئسیر بوو.

بەڵام لە دوایی ژیانیدا بە هۆی پەژارە و خەمی مردنی دوو کوڕی جوانەمەرگییەوە وازی لە دنیا و سەرگەورەیی خێزانەکە هێناوە و کەنارنشین بووە.

دوەم لە کوڕەکانی سەیید سەعدەدین: سەیید محەمەدی بە «فخرالاشراف» ناسراو بووە. ئەم زاتە دوو کوڕی هەیە: سەیید جەمیل و سەیید حەسەن.

سێهەم لە کوڕەکانی سەیید سەعدەدین، سەیید ئەحمەدی ستوودەیە، ئەم سەیید ئەحمەدە دوو کوڕی هەیە: سەیید ئیبراهیم و سەیید مەحموود. هەردووکیان لە ژیاندان.

چوارەم: سەیید ئەباعوبەیدە. ئەم زاتە دوو کوڕی هەیە: حیسامەدین و عەلادین، هەردووکیان لە ژیاندان.

پێنجەم: سەیید ئەبوو سەعید، ئەم زاتە سێ کوڕی هەیە: سەیید محەمەدڕەشید و سەیید محەمەدسادق و سەیید محەمەدباقر. هەرسێکیان لە ژیاندان.

وەک گوتمان ئەم کورتە زانیارییە لە دەستنووسی سەیید حەسەنی ئەشرەفی وەرگیراوە و بەڵکوو لە داهاتوودا زیاترمان دەست بکەوێ.

## وێنەی شەجەرەی هەندێ لە بنەماڵەی زانای گەورە مەلا مووسای «توکلی» کە لە دێی «شابەدین»ا دانیشتووە.

مەلا مووسای تەوەکەڵی یەکێ بووە لە زانا بەرزەکانی چەرخی دە و یازدەی کۆچی و هیوامان وایە بەسەرهاتی ژیانی بنووسین بۆ ئەوەی برادەران سوودی لێ وەرگرن، وە ئەمەی خوارەوە شەجەرەی سەید ئەحمەد ناوێکە کە یەکێکە لە نەوەکانی:

السيد احمد، ابن السيد عمر، ابن السيد عبدالله، ابن السيد احمد، ابن السيد علی، ابن السيد يوسف، ابن السيد موسی المشهور بملا موسی، ابن السيد بايزيد، ابن السيد علی، ابن السيد علی، ابن السيد خسرو، ابن السيد حمزه، ابن السيد علاءالدين، ابن السيد عبدالمطلب، ابن السيد احمد، ابن السيد حسين، ابن اسيد طاهر، ابن السيد حسين، ابن السيد علی، ابن السيد محمد، ابن السيد موسی، ابن السيد جعفر، ابن السيد محمد، ابن السيد اسماعيل، ابن السيد احمد، ابن السيد محمد، ابن السيد احمد، ابن السيد محمد، ابن السيد قاسم، ابن السيد حمزه، ابن السيد محمد المشهور ببير خضر الشاهويی ... الخ.

### مەلا مووسای تەوەکەڵی

مەلا مووسا قورئانێکی بە خەتی خۆی نووسیوە و ئەو قورئانە ئێستە ماوە و سەرچاوەیەکی راست و باشە ـ هەرچەند کورت بێ ـ بۆ ژیانی مەلا مووسا[١].

مەلا مووسا دەربارەی لەدایکبوونی خۆی دەڵێت: لە دەوروبەری ساڵی «٩٥٠»ی کۆچیدا لە دایک بووم و لە ساڵی ٩٨١دا فاتیمەی کچی شێخ عیسام مارە کرد و، لەم فاتیمە سێ کوڕ و سێ کچم بووە. دوای ئەوەیش باسی مردنی خێزانەکەی دەکات کە لە ساڵی ١٠٠٥دا بووە.

---

١- ئەم زانیاری‌یانەم بە دەسخەتی کاک مەحموود ئەحمەدی ئەمینی مەکتەبەی ئەوقافی سلێمانی دەستکەوت. «م، ع، ق».

هەروەها لـە رووی قورئانەکـەوە باسـی هەنـدێ وەقـف و نـەزری کتێـب و خـانوو دەبینرێت.

لە دوا لاپـەڕی قورئانەکەیشـەوە مێـژووی کـۆچی دوایـی مـەلا مووسـا بـە ساڵـی «١٠٢٧»ی کۆچی دیاری کراوە.

مەلا مووسا خۆی رشتەی نەسەبی خۆی بەمجۆرە نووسیوە:

موسی بن بایزید، بن علی، بن خسرو، بن حمزە، بن علاء الدین، بـن عبـدالمطلب، بـن محمد[١]، بن احمد، بن حسین، بن طاهر، بن حسین، بن علی، بن محمد، بن موسـی، بـن جعفر، بن محمد، بن اسماعیل، بن احمد، بن محمد، بن احمد، بن محمد، بن قاسـم، بـن حمزە ....

١- لە شەجەرەکەی سەرەوە ئەم ناوە نەنووسراوە. ئێمـەیش بـە بـێ دەسـکاری وەک ئەسڵـی کتێبەکـە نووسیمانەوە. ن.ب.

## بنەماڵەی شێخ ئیسماعیلی عەودالان

ئەم زاتە لە نەتەوەی پیرخزری شاهۆیە و لە سەردەمی شێخ محەمەدی نۆدێی کوڕی شێخ عەلیی کوڕی بابا رەسووڵدا بووە و ئەم دوو پیاوە زۆر دۆستی یەک بوون و میانەیان زۆر خۆش بووە و هاتوچۆی گەرمی یەکیان کردووە.

ئەم شێخ ئیسماعیلە یەکێ بووە لە پیاوە گەورەکانی چەرخی خۆی و خاوەن کەرامەت بووە. وە لە نەتەوەکەیدا پیاوی خاوەن تەقوا و زانا زۆر بووە. لەوانە شێخ ئەحمەدی ناسراو بە «بێنخۆش» کە کوڕی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ ئیسماعیل بووە کە تاقانەی خانەدان بووە و گەلێ کەرامەتی بووە.

مەلا عومەری «رەنجووری»[1] کە یەکە شاعیری زەنگنە بووە موریدی گیانیی ئەم شێخ ئەحمەدە بووە و گەلێ شیعری پێدا وتووە. لەو ساڵەدا کە شێخ ئەحمەدی بێنخۆش کۆچی دوایی کردووە، شێخ ئەحمەدی تیمار لە عێراقدا و شێخ ئەحمەدی تەنگیسەری لە ئێراندا کۆچیان کردووە، جا مەلا عومەر بە سۆزەوە هەرسێکیانی لاواندووەتەوە، شیوەنی بۆ نووسین و داخی دەروونی خۆی هەڵڕشتووە و باسی ئەوەی کردووە کە سێ شێخ ئەحمەدی وەلی بە جارێ مردوون.

شێخ ئەحمەدی بێنخۆش دوازدە کوڕی بووە، ئەو کوڕانە لە دێی «بانیمۆرد»ی سەر بە ناحیەی سەنگاودا نیشتەجێ بوون و ئێستە نەتەوەیان لەو ناوچەدایە. وە شێخ عەبدولکەریم شەجەرەیەکی بۆ ناردووم کە ئەمە دەقەکەیەتی:

السید عبدالکریم، ابن السید عصام‌الدین، ابن السید قادر، ابن السید حسین، ابن الحاج السید عطار، ابن السید قادر، ابن السید احمد الملقب بـ«بین خوش»، ابن السید عبدالله، ابن القندیل النورانی السید اسماعیل القطب العبدالانی، ابن السید محمد، ابن السید موسی، ابن السید ابراهیم ابوالبهاء، ابن السید خضر المبرور، ابن السید منصور، ابن السید

---

١ـ خودا یارمەتی دام دیوانی رەنجووریم بە لێکۆڵینەوەوە بلاو کردەوە. م، ع، ق .

حمزه، ابن السيد حسين، ابن السيد يوسف، ابن السيد حيدر، ابن السيد موسى، ابن السيد محمد زاهد المشهور ببير خضر الشاهوئى .. الى آخر شجرتهم.

شێخ عیسامەدینی باوکی حاجی شێخ عەبدولکەریم ئەدیب بووە و ئەم غەزەلە نموونەی شیعری یەتی:

له فیکری مەعسییەت دەرماندە وو مەبهووت و حەیرانم
غەریقی بەحری عیسیان و زەلیلی نەفس و شەیتانم
خمیده قامتم خم شد میان از بار عصیانها
من از بار گنه هر دم پریشان و پریشانم
شدم غافل ز یاد حق تهی کشکول زاب زاد
برای منزل آخر فقیر و پیر و عطشانم
رفیقان دسته دسته سالما طی سفر کردند
من بی پا و پژمرده در اهوال بیابانم
اسف زان روز در قبرم که منکر می‌شود سائل
خجالت‌مند محجوب معذب کور و نادانم
که تا کی من نباشم معتبر از هجرت یاران
درین دیر کهن هر دم ز جهدی ثروت و نانم
طمع هر دم ز تحریکم تغافل می نخواهد کرد
همیشه در پی ملکی همه ایران و تورانم
ز حرص و طول آمالم ندارم یک نفس راحت
اجل یادم نمی‌آید که تا گیرد گریبانم
«عصام الدین» بگو هر دم ز روی معذرت‌خواهی
ندانستم نفهمیدم غلط کردم پشیمانم

ئەم پارچەی دواییش شیعری ئەوە:

تەمامــە بــێم بــە «بســم الله» لــە «الــرحمن» داوا کــەم
رەحیم ئەمڕۆ لە بۆ سوبحەی لـە جەننەتـدا تەمـەننا کـەم
لــە ســەر ئــەم بخشــش و رەحمــە خــودا «الحمــدلله»
کە «رب العـالمین» رێـی داوە ئـەم سـوورەتە مـەعنا کـەم
بــە «الــرحمن»ە ئومێــدم هــەتا هــەم مــن لــە دنیــادا
کە مردیشم «رحیم» بێ بۆم بە شەرتێ روو لە مـەولا کـەم
ئەڵێم: «یا رب» ئەتۆی «مالک یومالدین» وەکـوو فـەرمووت
«اصــح» «ایــاک نعبــد» ئیتاعــەی غــەیری تــۆ ناکــەم
«و ایــاک» بــە نــووری «نســتعین» دێــین لــە بــۆ تاعـەت
بــە لــەفزی «اهـدنا» رێـی «الصـراط المسـتقیم» چـا کـەم
«صــــراط الـــــذین» وا کــــە «انعمــــت علـــیهم» بـــوون
بە غەیری کۆمەڵی گومڕا لە «مغضوب» خۆم تـەوەللا کـەم
خودا! نەمکەی بە مەرجـەع بـۆ «علـیهم» دوای «مغضـوب»
بە شەدد و مـەددی تەجویـدی «و لا الضـالین» گۆیـا کـەم
لــە پــاش ئایــاتی ســەبعەی فاتیحــە لازم بــە «ئـامین»ە
تەرەحوم بـە «عصـام الـدین» بکـە بـۆ هـەردوو دنیاکـەم

**شەجەرەی سەییدەکانی «گەورەدێ» لە ناحیەی «ئاغجەلەر» دوای «بسم الله» و حەمد و سەلات و سەلام و دەرخستنی شەرەفی ئالی پێغەمەر دەڵێ:**

السیدان یعقوب و یوسف ابنا السید اسحاق، ابن السید اسماعیل، ابن السید محمد، ابن السید عبدالله، ابن السید عبدالکریم، ابن السید عبـدالرحیم، ابـن السـید عبدالواحـد، ابـن السید هاشم، ابن السید قاسم، ابن السید عبدالله، ابـن السـید شـمسالـدین، ابـن السـید

محمود، ابن السید رحمةالله، ابن السید موسی، ابن السید محمد زاهد المشهور کالنار علی علم، بل و کالنجم فی العلم الذی کان علی قدم سیدنا ابراهیم، و جرب کما جربه المردود نمرود اللئیم بالنار العظیم فصارت النار له بیمن جده بردا و سلاما و صار المجرب لعتبته خادما و غلاما، و هو کما ثبت فی سلسلة الذین نسبوا انفسهم الیه، و شهدت الاستفاضة لحصول الظن الراجع لدیه، ابن السید جعفر، ابن السید حسین ... الخ

وە لەملاولای ئەم شەجەرەوە مۆری گەلێ لە زانایان دانراوە و ئیمزا و قسەی گەلێکی دیکەیشی پێوەیە لەوانە:

قد شهد السید النجیب الشیخ طاها البرزنجی فی حضور الوالی الحاکم بمملکة بابان «خالد باشا» و سماعه من ابن عمهم السید بکر افندی الساکن فی قسطنطنیة.

سمعت من جمع کثیر صدق مضمون الشجرة بلا ریب، انا الحقیر السید عبدالصمد القاضی بسلیمانیة.

سمعت ممن لا مجازفة فی اقوالهم صحة مضمون الشجرة. المدرس بقصبة السلیمانیة!

بسمالله و الحمد لله و بعد: فقد اطلعت علی تحقیق و تصحیح هذه الشجرة الشریفة من ... و هو من ابیه الشیخ اسماعیل الصالح، و وثقت بهم، و لم یوجد القادح فختمته، و انا ابن محمود البرزنجی الحسینی النقیب علی الاشراف. احمد.

وە لە حاشیەی شەجەرەکەدا ناوی نەتەوەی سەیید یەعقووب و سەیید یوسف نووسرابووەوە هەتا بۆ سبەینێ بە کاریان بێ و دەربکەوێ کە ئەوانە لە نەتەوەی سەییدەکانی «گەورەدێ»ن.

## شەجەرەی مەلا مارفی قازیی لەگەڵ خستنەسەری ناوی رەمزی و نووری بە رشتەکەوە:

السید الحاج رمزی افندی، و السید نوری افندی ابنا السید الملا معروف وهبی افندی القاضی بالسلیمانیة، ابن السید رسول المشهور بالملا، ابن السید محمود المشهور بالملا، ابن السید حسین المشهور بالملا، ابن السید ابراهیم المشهور بالملا، ابن السید الحاج الملا حمزه، ابن السید علی، ابن السید داود، ابن السید سیفالدین، ابن السید حسین، ابن السید سیفالدین، ابن السید علی، ابن السید رستم، ابن السید شهابالدین، ابن السید زبیر، ابن السید محمد، ابن السید مند، ابن السید الحاج، ابن السید یوسف، ابن

السيد محمود، ابن السيد محمد المشهور ببير خضر الشاهوئى، ابن السيد حسن، ابن السيد محمود، ابن السيد موسى، ابن السيد حسين ... الخ

## شەجەرەی بنەماڵەی مەلا سەدیقی دانیشتووی دێی گەرمکی گەرمیان

لە ناو عەشیرەتی «داودە»دا کە خۆی بە یەکێ لە سەییدەکانی بانیمۆردی ناحیەی سەنگاو ئەزانێ و داوای سەییدایەتی دەکا سەیید مەحموودی کوڕی سەیید محەمەدی مەشهوور بە پیرخزری شاهۆیە.

انا الفقير المدعو السيد صديق ابن السيد لطف‌الله، ابن السيد جاسم، ابن السيد اسماعيل، ابن السيد الشيخ قولى، ابن السيد شعبان، ابن السيد ولى، ابن السيد شعبان، ابن السيد اسماعيل، ابن السيد احمد، ابن السيد اسحاق، ابن السيد محمد، ابن السيد اسحاق، ابن السيد نظر، ابن السيد مراد، ابن السيد محمد، ابن السيد الحاج جوشن، ابن السيد بير محمود، ابن السيد بير خضر محمد ظهيرالدين، ابن السيد محمود المدنى، ابن السيد جعفر، ابن السيد الشيخ حسين، ابن السيد محمود الينبوعى ... الخ.

و قد ادرج فى كتاب السيد صديق ستة اشخاص و هم: السيد بير محمود، و السيد بير الياس، و السيد بير روستم، و السيد محمد بيرخضر المولود بعد وفاة والده السيد محمد بيرخضر، و الذى سكن اخيرا فى قرية «صفاخانه» من مضافات بلدة «سقز» و يشتبه فى هذا السيد كثير من الناس، و يعتقدون انه هو المولى السيد محمد زاهد البيرخضر الاول، و ليس كذلك، بل هو ولده المولود فى يوم وفاته.

## بنەماڵەی شێخ زەکەریای موهاجیر لە ناحیەی خوڕخوڕەدا

شێخ زەکەریا لە مێژووی ٨٠٠ی کۆچیدا هاتووەتە کوردستان و لە وڵاتی ئەردەڵان لە ناحیەی خوڕخوڕەدا نیشتەجێ بووە. وە لەو سەردەمەدا زیارەتی شێخ نیعمەتوڵڵای وەلیی کوڕی شێخ زەکەریای حەسەنیی شازلیی کاکۆزەکەریایی کردووە و تەمەسوکی پێ کردووە و خەریکی بەجێهێنانی ڕێبازی تەریقەت بووە هەتا ئیجازەی خەلافەتی وەرگرتووە.

وە شێخ نیعمەتوڵڵا کە خاوەن دەستەڵات و قسەڕەوا بووە ئاوایی «بست»ی بە پارە کڕیوە و بەخشیویەتی بە شێخ زەکەریای موهاجیر و ئەویش بە ئاسوودەییەوە گەڕاوەتەوە بۆ سەر جێگە و ڕێگەکەی خۆی و خەریکی ئێش و کار و هۆی ژیوار بووە و لە هەمان کاتدا ڕێنومایی موسوڵمانانیشی کردووە و نەتەوەیەکی خوداناس و تێگەییشتووی لێ کەوتووەتەوە و لە دێی «بست» و دەوروبەریدا بڵاو بوونەتەوە و خەریکی ژیواری خۆیان بوون.

وە لە دەوروبەری مێژووی ١٠٥٠ی کۆچیدا شێخ ئیبراهیمی کوڕی شێخ میکائیل کە یەکێ بووە لە نەتەوەی شێخ زەکەریا بە میهرەبانی خودا سەرکەوتوو ئەبێ لە ڕێگەی دین و خزمەتی ئیسلامدا و ئەچێ لە خزمەتی شێخ شەهابەدینی کوڕی شێخ ڕەزییەدیندا کە لە نەوەی شێخانی کاکۆزەکەریا بووە تەریقەت وەرئەگرێ و دێتەوە لە دێی «بست»دا خەریکی ڕینومایی ئەبێ و لە واقیعدا پیاوێکی هەڵکەوتوو و خاوەن کەرامەت بووە.

دەگێڕنەوە کە: کۆڵەکەیێ لە مزگەوتی «بست»دا بووە کاتی خۆی شێخ ئیبراهیم پاڵی پێوە داوە هەر ناساغێ پاڵی پێوە دابێ ئاسایشی بۆ هاتووە و باری ئازاری سووک بووە.

ئەم زاتە لە دەوروبەری ساڵی ١١٢٠ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و دوو کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ عەبدولقادر و شێخ حەسەن. شێخ عەبدولقادر لە دێی بستدا ماوەتەوە، بەڵام شێخ حەسەن چووە بۆ خوێندن و لای زانایانی کوردستان خوێندوویەتی، پاش ئەوە چووە بۆ میسر و لە ئەزهەردا خوێندوویە هەتا زانیاری‌یەکانی تەواو کردووە، دوای ئەوە ئیجازەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بۆ عێراق.

پاش گەڕانەوەی بۆ عێراق لە خزمەتی شێخ محەمەدی نۆدێیی کوڕی شێخ عەلیی، کوڕی شێخ بابا رەسوولی بەرزنجیدا تەریقەتی وەرگرتووە و سلووکی کردووە، هەتا بووە بە خەلیفە، جا چووەتەوە بۆ ناحیەی خورخورە و لە دێی مەولاناوادا نیشتەجێ بووە و خەریکی دەرزوتنەوە و رێنومایی موسوڵمانان بووە و بە خەتی خۆی قورئانی پیرۆزی نووسیوەتەوە و لە مزگەوتی مەولاناوادا دایناوە و دۆعای لەو کەسە کردووە کە کەم و زیاد لەو قورئانەدا بکات!

بەو شێوە تەمەنی خۆی لە رێگەی خزمەت‌کردنی ئایینی ئیسلامدا بەسەر بردووە هەتا لە ساڵی ١١٣٥دا کۆچی دوایی کردووە. ئەم مێژووە لە پیتەکانی «شێخ حسن حق» دەردێت.

لە پیاوە پێشینەکانی ئەو خانەوادە بیستراوە کە شێخ عەبدولقادری برای شێخ حەسەن هەر لە دێی بستدا ماوەتەوە و کوڕێکی بووە ناوی شێخ حەیدەر بووە. ئەم شێخ حەیدەرە بە شێخ حەیدەری گەورە ناوبانگی دەرکردووە.

ئەم شێخ حەیدەرە چوار کوڕی بووە: شەمسەدین و شوجاعەدین و زیائەدین و مەزهەرەدین. شەمسەدین هەر لە دێی بستدا ماوەتەوە. شێخ شوجاعەدین چووە بۆ دێی «سوورەمۆزە» و شێخ زیائەدین چووە بۆ دێی «جانەوەرە» و شێخ مەزهەرەدین چووە بۆ مەولاناوا، ئەم چوار کوڕە هەموو نەتەوەی زۆریان لێ کەوتووەتەوە.

وە شێخ حەسەنیش لە مەولاناوادا بووە و نەتەوەی زۆری لێ کەوتووەتەوە.

ئەم خانەدانە بە ئاسایش و کەرامەت لەو ناحیەدا ژیاون و خەریکی ماڵ و کشت و کاڵی خۆیان بوون و توانیویانە شوێن و پایەی خۆیان رابگرن و نانداری‌یان بۆ موسوڵمانان بووە. هەتا دەوروبەری ساڵی ١٣٣٠ کۆچی. وە لەو مێژووە بەدواوە لە ژێر پێی جافی گەرمیانی عێراق و ستەمی خێڵە کوردەکانی ئێران و ستەمی ستەمکارانی

دیکەدا وڵاتەکەیان وێران بووە و خۆیان بڵاوەیان کردووە بۆ وڵاتی عێراق و شوێنەکانی دیکە کەمێکیان نەبێ کە لەوێ ماونەتەوە.

وە شێخ عەزیزی جانەوەرەیی و شێخ عەبدوڕەحمانی برای، کە هەردووکیان ئەدیب و خۆشنووس و بەڕێز بوون لە نەوەی شێخ زیائەدینی جانەوەرەن.

شێخ عەزیز لە کاتی خوێندنـدا هـاوڕێی سـەیید عەبـدوڕەحیمی مەولـەوی بـووە و یەکتریان زۆر خۆش ویستووە و مەولەوی بە وشەی «ئازیز» ناوی شێخ عەزیزی بـردووە و ئەمانەیش لە ڕۆژی خۆیاندا دەوریان بووە.

لە رشتەی خانەدانی شێخ زەکەریای موهاجیردا قسـە زۆرە. هەنـدێک ئەڵـێن: لـە نەوەی تەلحەی کوڕی عەبدوڵلان، کە لە نەوەی ئیمام حسەین ئەژمێررێن.

وە یەکێ لەم شێخانی نەتەوەی شێخ زەکەریای موهاجیرە لـە سـەفەری حیجـازدا شەجەرەیەکی دەست کەوتووە کە پاڵپشتی ئەوە ئەکات لـە نـەوەی تەلحـەی کـوڕی عەبدوڵلان و ئەچنەوە سەر ئیمام حسەین.

وە سەیید عەبدوسەمەدی تووداریی دانەری «نور الانـوار» ئەڵـێ: شـێخ شـەهابەدین کاکۆزەکـەریایی مورشـیدم ئـەو شـەجەرەیە لـە «قـاموس الانسـاب»ی دانـراوی شـێخ محەمەد سـادقی شـازلیدا لـە پلـەی چواردەهەمـدا نووسـیوە و لـە دوایـی‌یەکەیـەوە نووسیویە: «و الله اعلم» .

وە خەلیفە رۆستەمی حەوتاشی لەگەڵ شێخ ئیبراهیمی بسـتیدا لـە خەلیفـەکانی شێخ شەهابەدین کاکۆزەکەریان و شەجەرەی نەسەبیان هەیە و کاک ئەحمەدی شێخ بە ناوی سەییدەکانی نەوەی ئیمام حسەینەوە بۆی مۆر کردوون و بە راستی داناوە.

شێخ حەسەنی مەولاناوا هەرچەن خەلیفەی شێخ محەمەدی نۆدێ بووە، تەریقەتی لە شێخ ئیسماعیلی ولیانیی کوڕی شێخ محەمەدی نۆدێیش وەرگرتووە بەم شێوە:

اخذ الطريقة الشيخ حسن مولانا آبادی عن السيد اسماعيل الوليانی، عن الشـيخ احمـد الاحسائی، عن الشيخ حسين البصری، عن الشيخ صادق، عن الشيخ قاسم، عن الشيخ ابـی الفتاح، عن الشيخ غريب‌الله، عن الشيخ عبدالرزاق، عن القطب الربـانی ابـی‌محمـد محـی-الدين الشيخ عبدالقادر الكيلانی، عن الشيخ ابی‌سعيد المخرمی[١] و المخزومی، عـن الشـيخ

١ـ المخرمی : نسبة الی مخرمة، وهی محلة من بغداد جانب الرصافة قرب دجلة، وتسمی اليوم بالعيواضية. والمخزومی نسبة الی بنی‌مخزوم قبيلة من العرب. والشيخ ابو سعيد كان مخرميا و مخزوميا.

ابی‌الحسن الهکاری، عن الشیخ ابی الحسین الطرطوسی، عن الشیخ ابی الفرج، عن الشـیخ ابی‌الفضل التمیمی، عن الشیخ ابی‌بکر الشبلی، عن الشـیخ جنیـد البغـدادی، عـن الشـیخ سری السقطی، عن الشیخ معروف الکرخی، عن الشـیخ داود الطـائی، عـن الشـیخ حبیـب العجمی، عن الشیخ حسن البصری، عن الشیخ الامام الهمام المرتضی علی ابن ابـی‌طالـب الکرار، عن حضرة المصطفی المختار سیدنا محمد ـ ص ـ.

## بنەماڵەی مەلایانی جەلیزادە لە شاری کۆیەدا

تەرجەمەی ژیانی ئەم خێزانە بە دەفتەرێکی زۆر گەورە ئەوسا دەنووسرێتەوە، یەکێکی زۆر شارەزا و ئاگاداری بەسەر ئەو بنەماڵەدا دەوێ و لەوانە نییە من بتوانم ئەم کارە ئەنجام بدەم، بەڵام وەک دەڵێن: «ما لا یدرک کله لا یترک جله» ، وە بە یارمەتی برام مەسعوود کە ئێستە تاقانەی ئەو بنەماڵە بەڕێزەیە شتێکی کەم ئەنووسم:

جا ئەڵێم لەم رشتە وێنەفریشتەدا لە دوا کەسی بەرزی بەڕێزیانەوە کە ناوی مەلا محەمەد بە جەنابی مەلا ئەفەندی ناسراوە دەستپێدەکەم تا ئەچمە سەرەوە بەم ریزە: مەلا محەمەد کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلای، کوڕی حاجی مەلا ئەسعەدی، کوڕی مەلا عەبدوڵلای، کوڕی حاجی مەلا عەبدورەحمانی جەلی، کوڕی مەلا عەبدوڵلای جەلی، کوڕی مەلا محەمەدی ناسراو بە مەلازادە، کوڕی مەلا ئیبراهیم، کوڕی مەلا حەسەن، کوڕی مەلا ئیبراهیم، کوڕی مەلا حەسەن، کوڕی مەلا ئەبوبەکر.

مەلا ئەبوبەکر و مەلا حەسەن و مەلا ئیبراهیم و مەلا حەسەن و مەلا ئیبراهیم.

کاک مەسعوود ئەڵێ: ئەوەندە لە هەواڵی مەلا ئەبوبەکر ئەزانین کە لە دێی «بێگەڵاس»دا کە سەر بە قەزای پشدەرە لە پارێزگای سلێمانیدا مەلا بووە و خزمەتی دین و زانیاریی کردووە. هەروەها مەلا حەسەنی کوڕی مەلا ئەبوبەکر و مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا حەسەن، ئەم زاتانەیش هەر لە دێی «بێگەڵاس»دابوون و خزمەتی دینیان کردووە تا لە جیهان دەرچوون.

### مەلا محەمەد کوڕی مەلا ئیبراهیم

ئەم زاتە کە بە مەلازادە ناسراوە لە دێی «شیوئاشان»دا دانیشتووە و خزمەتی دینی کردووە و هەر لەو دێدا کۆچی دوایی کردووە.

شیوئاشان گوندێکی خۆش و سازگارە کەوتووەتە شیمالی چیای «کۆسرەت»ەوە لە قەزای رانیەدا.

### کاک مەلا عەبدوڕەحمانی جەلی

ئەم زاتە زانایەکی بەرز و بەڕێز و خاوەن پایە و مایە و لەخوداترس بووە. لە کاتی خوێندندا زۆر بە وردی خوێندوویەتی، دوای ئیجازە وەرگرتن تەدریسێکی زۆر چاکی کردووە، لە هەر کتێبێکدا دەرسی گوتبێتەوە ئەو کتێبەی بە حاشیە و تەعلیقات و «تضمیر» و «تضبیب» رازاندووەتەوە.

گەلێ حاشیەی لە سەر کتێبە عادەتییەکان هەیە، حاشیەی لە سەر جامیی شەرحی «کافیە» و کەمالی شەرحی شافی‌یە لە سەرفدا و لە سەر عەبدوڵلا یەزدی و جەلالی مەنتیق هەیە. هەروەها لەسەر شەرحی عەقائیدی نەسەفی لە عەقائیدا و لە سەر موختەسەری موتەووەل لە عیلمی بەلاغەدا هەیە. هەروەها حاشیەی لە سەر شەرحی جمع الجوامع لە ئوسوولی فیقهدا و لە سەر شەرحی موختەسەری مونتەها و شەرحی مینهاجی بەیزاوی لە ئوسوولی فیقهدا و لە سەر شەرحی ئیبنوحەجەر بۆ «اربعین» کە ئیمامی نەوەوی دایناوە و لە سەر «المنح المکیة فی شرح القصیدة الهمزیة» هەیە.

ئەم کتێبە بە خەتی خوالێخۆشبوو مەلا سەعدی کۆیی نووسراوەتەوە کە یەکەم خۆشنووسی چەرخی خۆی بووە و خادیمی سوججادەی پیرۆزی پێغەمەر بووە. وە حاشیەی لە سەر «اشکال التأسیس» لە عیلمی هەندەسە و لە سەر شەرحی چەغمینی لە عیلمی هەیئەتدا هەیە. «خلاصة الحساب»ی بەهادینی عامیلی شەرح کردووە. ئەم شەرحە زۆر بەکەڵکە و لە ناو زانایانی کوردستاندا زۆر باو بووە. وە حاشیەی لە سەر تەفسیری بەیزاوی و توحفەی ئیبنوحەجەر هەیە. ئەم حاشیە نزیکەی سێ بەرگ ئەبێ و تا ئێستە چاپ نەکراوە. بەڵکوو لە داهاتوودا چاپ بکرێت.

خوالێخۆشبوو کاک مەلا عەبدوڕەحمانی جەلی هەر لە دێی جەلیدا بووە کە دێیەکی ئاو و هەوا خۆش و سازگارە لە رووی شیمالی کێوی ئاواگردەوە، هەتا کاتێ کە عەبدوڕەحمان پاشای بابان بووە بە فەرمانداری قەزای کۆیە. ئیتر لەو رۆژەوە کاک مەلا عەبدوڕەحمان گوێزاویەتی‌یەوە بۆ شاری کۆیە و عەبدوڕەحمان پاشا مزگەوت و

خوێندنگای بۆ کردووەتەوە و خەریکی دەرزوتنەوە و خزمەتی دین بووە و ژیانی خۆی لەم کارە پیرۆزەدا بەسەر بردووە. وە لە هەمان کاتدا کار و باری «افتا» و رێنومایی و رێکخستنەوەی نێوانی کۆمەڵەی موسوڵمانانی شارەکەیشی گرتووەتە ئەستۆی خۆی و بەم شێوە ژیاوە هەتا لە ساڵی ١٢١٧ی کۆچیدا لە شاری کۆیە جیهانی بەجێهێشتووە و گیانی بە پەروەردگار سپاردووە.

### حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی

پاش کۆچی دوایی کاک مەلا عەبدوڕەحمانی جەلی مەلا عەبدوڵلای کوڕی لە جێگەکەیدا دانیشتووە، ئەم زاتە پیاوێکی زانا و بەڕێز و لەخوداترس و دنیانەویست بووە. وە لە کاتی پێگەییشتنیدا رێکەوتی چەرخی ئیرشادی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی کردووە ئەمیش بە ئیخلاسەوە چووە تەمەسوکی پێ کردووە و سلووکی کردووە هەتا پێگەییشتووە و ئیجازەی خەلافەتی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بۆ شاری کۆیە و لەگەڵ دەرزوتنەدا ئیرشادیشی کردووە.

لە هەمان کاتدا ئافرەتێکی برازای حەزرەتی شێخ مەولانایشی مارە کردووە و پەیوەندی و خزمایەتیشی لە ژن و ژنخوازییەوە لەگەڵ شێخەکەیدا پتەو بووە. بەو شێوە دامەزراوە لە سەر دەرزوتنەوە و ئیرشاد و فتوادان و ئامۆژگاری و خزمەتی موسوڵمانان و گەلێ خزمەتی دینی کردووە.

وە هۆنراوەیەکی بە ناونیشانی «وسیلة الوصول لساحة عناية الرسول» داناوە. وە حاشیەی لە سەر گەلێ کتێب نووسیوە، وەکوو «جامع الاصول»ی دانراوی «ابن الاثیر» و «انسان العیون» لە سەر شەرحی بوخاری دانراوی قەستەلانی. وە کتێبێکی هەیە لە سەر وێنەی «اتقان»ی «سیوطی». مێژووی لە دایکبوونی ئەم زاتە دیار نییە، بەڵام لە مێژووی ١٢٤٦ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

### حاجی مەلا ئەسعەدی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای جەلی

ئەم کوڕە بەڕێزە لە ساڵی ١٢٢٦ی کۆچیدا لە شاری کۆیە لەدایک بووە، لەو خێزانە بەرزەدا گەورە بووە، پێگەییشتووە و خوێندنی تەواو کردووە. خۆی نووسیویەتی ئەڵێ: باوکم لە ساڵی ١٢٤٦ی کۆچیدا بە نەخۆشی رشانەوە کۆچی دوایی کردووە. وە ئەڵێ:

لەو چەرخەدا محەمەدپاشای فەرمانداری رەواندز و کۆیە و ئەو ناوە گەلێ چاودێری کردین و زۆر رێزی لێ گرتین و لە سەر خوێندنگاکەی باوکم داینام، بەڵام من خوێندنم تەواو نەکردبوو و تا عیسامەدینی «وضع»م خوێندبوو.

وە کاتێ تەمەنم گەییشتە بیست و سێ ساڵ کچی محەمەد ئاغای کوڕی حەوێز ئاغام مارە کرد و، لەو کاتەدا شەرحی شەمسی‌یەم ئەخوێند، وە لە مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٢٥٠دا ژنەکەم گوێزایەوە و لە بیست و دووی مانگی شەووالی ئەم ساڵەدا عەبدوڵلا جەمالەدینی کوڕم لە دایک بوو. وە لەگەڵ ئەوەدا کە بووم بە خاوەنی ژن و منداڵ لە خزمەتی زانای بەرزی بەڕێز مەلا محەمەدی قازیی کوڕی مەلا ئیسماعیلدا خوێندنم تەواو کرد.

جا پاش ئەمانە جەنابی باپیری حاجی مەلا ئەسعەد تەشریفی بردەوە بۆ شام و ئیجازەی شەرع و حەدیس و تەفسیری لە زانای بەرزی ئەو وڵاتە شێخ عەبدوڕەحمانی کەزبەری وەرگرتووە، ئەمە لە مێژووی ١٢٦٠ی کۆچیدا بووە. وە لە شامەوە چووە بۆ حەجی ماڵی خودا و زیارەتی پێغەمەر و دوای تەواوکردنی ئەوانە گەڕاوەتەوە بۆ شاری کۆیە و خەریکی کار و باری خۆی بووە.

وە پاش ماوەیەکی کەم چووە بۆ شاری بەغدا و لە خزمەتی زانای پایە بەرز مەلا عەبدوڕەحمانی رۆژبەیانیدا ئیجازەی وتنەوەی هەموو عیلمەکانی وەرگرتووە، دوای ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ شاری کۆیە و خەریکی دەرزوتنەوە و سوودگەیاندن بە موسوڵمانان بووە و گەلێ فەتوای لە ئەحکامی شەرعدا هەیە هەندێکیان لەناوچوون و هەندێکیان ماون، وە گەلێ حاشیەی لە سەر کتێبەکان هەیە بە تایبەتی لە تەفسیر و حەدیس و شەرعدا.

وە لە ساڵی ١٢٨٠دا بۆ جاری دوەم چووە بۆ حەج و مەلا عەبدوڵلای کوڕی خۆی لەگەڵ خۆیدا بردووە و ئیش و کارەکانی حەجی تەواو کردووە، دوای ئەوە نەخۆش کەوتووە و پاش ماوەیەک کۆچی کردووە بۆ ماڵی یەکجاری خۆی و لەو شوێنە پیرۆزەدا گیانی بە پەروەردگاری خۆی سپاردووە و لە «جنة المعلی»دا بە خاک سپێرراوە. ئەم رووداوە لە مانگی «ربیع‌الثانی»ی ساڵی ١٢٨٩ی کۆچیدا بووە.

خواڵێخۆشبوو مەلا عەبدوڵلا لە یادداشتەکانی خۆیدا نووسیویەتی:

«توفى والدى يوم الجمعة، اخر شهر ربيع الثانى من سنة الف و مائتين و تسع و ثمانين، فى مكة المكرمة عصر يوم الجمعة، و صلى عليه ضحوة يوم السبت بالملتزم الشريف، و دفن فى جنة المعلى، فى شعبة النور، قرب قبر الشيخ ابن حجر. رحمهما الله تعالى.»

## حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی

ئەم زاتە وە کوو باسمان کرد، لە ساڵی ١٢٥٠ی کۆچیدا لە شاری کۆیە لە دایک بووە و پاش فام کردنەوە لە خانەدانی خۆیاندا خوێندوویەتی و جەنابی مەلا ئەسعەدی باوکی بایەخێکی زۆری پێداوە و کوششی زۆری کردووە لە ڕێگەی پێگەیاندنیدا بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، ئەویش ئەو ڕەنجەی بە زایە نەداوە و کوڕێکی بەویقار و خاوەن‌توانای لێ دەرچووە و لە خوێندندا زۆر سەربەرز و سەرکەوتوو بووە.

وە بێجگە لە خوێندنی لە خوێندنگای خۆیاندا چوویشە بۆ ناوچەی باڵەک و لە خزمەتی مەلا محەممەدی کوڕی کاک عەبدوڵڵای شێخ وەتماندا خوێندوویەتی، هەروەها لە خزمەتی جەنابی شێخ تاهای «سورسور» و زانای بەرز و بەناوبانگ مەلا محەممەدی خەتێدا زۆری خوێندووە و گەلێ پێش‌کەوتووە و لە ناو زاناکانی شاری کۆیەدا ناوبانگی بە زانایی و بەڕێزی دەرکردووە.

کاتێ لەو سەفەری حەجە گەڕاوەتەوە و هەواڵ دراوە کە حاجی مەلا ئەسعەد کۆچی دوایی کردووە بە بێدامان و تێرامان حاجی مەلا عەبدوڵڵا لە جێگەکەی باوکیدا لە سەر خوێندنگاکەی باوکی دانیشتووە و لە هەموو لایەکەوە فەقێی لێ گرد بووەتەوە و خەریکی دەرزوتنەوەیەکی چاک بووە بە شێوەیەکی وەها لە وڵاتەکەدا دەنگی داوەتەوە.

وە لە ساڵی ١٢٩٢دا سەفەری بەغدای کردووە بۆ ئەوە کە هەندێ لە گەورەپیاوانی بەغدا ببینێ و بار و دۆخی ناهەمواری وڵاتەکەیان بۆ بگێڕێتەوە و بە گوێرەی دڵی خۆی لەگەڵیان دواوە و ئەو پیاوانە زۆر ڕێزیان لێ گرتووە، بە تایبەتی نەقیبی سەییدەکانی گەیلانی سەیید سەلمان و زانای گەورە موفتی زەهاوی و دەروێش حەیدەری، ئەمانە زۆر ڕێزی حاجی مەلا عەبدوڵڵا ئەگرن و بە هەموویانەوە هەوڵ ئەدەن بۆ ئەوە کە ئیش و کاری بۆ تەواو بکرێ.

وە خۆشبەختانە هەر لەم رۆژانەدا کە جەنابی مەلا عەبدوڵلا لە بەغدادا بـووە کـاک ئەحمەدی شێخیش لە سلیمانی‌یەوە هاتووە بۆ بەغدا و لەو هەلەدا گەلێ جار چاویـان بە یەک کەوتووە و ئەو میانەی پێشوویانە کە بە هۆی نامەوە بووە لـەم سـەفەرەدا بـە دانیشتن و گفتوگۆ و چاوپێکەوتنەوە پتەوتر دەبێ.

جا پاش چەن رۆژێک جەنابی حاجی مـەلا عەبدوڵـلا ئەگەڕێتـەوە بـۆ کۆیـە و بـە یاسای خۆی و زیاتر لە جاران خەریکی دەرزوتنەوە ئەبێ و لەوسا زیاتر لە کاری خۆیدا سەرگەرم ئەبێ.

وە کاتێ لە ساڵی ١٢٩٢دا جەنگی نێـوان دەوڵـەتی عوسمـانی و رووسـیا روودەدات جەنابی حاجی مەلا عەبدوڵلا لەگەڵ کۆمەڵـێکی بـەهێز و توانـای وەکـوو هۆزەکـانی وڵاتی کۆیەدا ئەچێ بۆ جیهاد لە دژی سوپای رووس و لە سەر جیهاد کردن بـەردەوام ئەبێ و ناگەڕێتەوە تا ئەو جەنگە تەواو ئەبێ.

وە بە هۆی ئەم یارمەتیدانەی سـوپای عوسمـانی‌یـەوە نێـوانی حـاجی عەبدوڵـلا و ئیسماعیل پاشای فەرماندەی سوپای عوسمانی گـەلێ پتـەو دەبـێ و دۆسـتایەتی‌یـان خۆش دەبێ.

وە پاش ئەوەی ئیسماعیل پاشا ئەگاتەوە بەغدا کۆشش ئەکا تا لە باتی ئـەو دێهاتـە کە کاتێ خۆی بە دەست ماڵی مەلاوە بـووە و دوایـی حوکوومـەتی عوسمـانی خـۆی وەری گرتووەتەوە .. هەموو مانگێ هەزار قورووش مانگانە بـۆ حـاجی مـەلا عەبدوڵـلا ئەبرێتەوە.

وە ئەوەندەی پێ ناچێ نێوانی حوکوومەتی عوسمانی و ئێران ئاڵۆز ئەبێ و نـاکۆکی ئەکەوێتە نێوانیانەوە. جا حوکوومـەتی عوسمـانی بـە پەلـە حـاجی مـەلا عەبدوڵـلا و عەبدوڵلا پاشای رەواندز ئەنێرێ بۆ ئێران بۆ چارەسەری ئەو ناکۆکی‌یـە. ئـەوانیش لـە مێژووی ١٣٠٩ی کۆچیدا ئەڕۆن و ئەچنە سابلاخ و بە یارمەتی خـودا نـاکۆکی‌یەکـە لا دەبەن و نێوانیان رێک ئەخەنەوە.

جا پاش ئەم خزمەتە مەدالی مەجیدیی لـە پلـەی سـێهەم بـە خـەڵات دەدرێ بـە حاجی مەلا عەبدوڵلا و لە لایانی ناسرەدین شایشـەوە ئەموسـتیلەیەکی ئەڵماسـی بـۆ دەنێررێت.

حاجی مەلا عەبدوڵڵا لەگەڵ ئەوەدا کە ئەکەوێتە ناو ئەم کارە دەوڵەتی‌یە گەورانەوە هەر کاتێک ئەگاتەوە ماڵی خۆی وەکوو جاران دەچێتەوە سەر دەرس‌وتنەوە و ڕێنومایی موسوڵمانان و خزمەتە ئایینی‌یەکانی خۆی.

بەڵام لەبەر ئەوە کە بێ‌تاقەت ئەبێ کاری پێش‌نوێژی و خوتبەخوێندنەوە ئەدات بە مەلا محەمەدی کوڕی خۆی و ئەویش ئەو کارانە بەڕێوە ئەبات و حاجی مەلا عەبدوڵڵایش خەریکی دەرس‌وتنەوە و ڕێنومایی موسوڵمانان ئەبێ. بەم شێوە دەمێنێتەوە تا لە ساڵی ١٣٢٦ی کۆچیدا لە جیهان دەردەچێ.

گەلێ لە شاعیرانی ئەو ڕۆژە لاواندوویانەتەوە بە تایبەتی دوکتۆر حسەین باباجان، بە زمانی فارسی سوکوارێکی زۆر بەرزی بۆ داناوە و وشەی «مغفور»ی کردووە بە مادەی «ابجد» بۆ ساڵی کۆچی دواییەکەی کە ١٣٢٦ بووە.

## جەنابی مەلا محەمەدی کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵا

مەلا محەمەد بە گوێرەی نووسینی باوکی لە کۆتایی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٢٩٢ی کۆچیدا لە دایک بووە. وە لە پاش فام‌کردنەوە لە خانەدانی خۆیاندا خەریکی خوێندن ئەبێ و دەوام ئەکا تا پێ‌ئەگات و ئیجازە وەرئەگرێ و لە پێشەوە ـ وەک وتمان ـ لە سەردەمی باوکیدا خەریکی پێش‌نوێژی و خوتبە خوێندنەوە دەبێ، دوای کۆچی دوایی باوکی فرمانی دەرزوتنەوەیش ئەگرێتە دەست. لە ڕاستیدا مەردانە و پاڵەوانانە شان ئەکا بە خزمەت‌کردندا و ئەو ئەرکە گەورانە بەڕێوە دەبات و زیاد لەوانەیش هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ تێگەیاندنی کۆمەڵ و ڕووکردنیان بۆ ئایینی ڕاستی و تێگەیاندنیان کە بەرزی و ڕەوشتی جوان و پێشکەوتن لە یاسای ئیسلامدایە. وە هەر ناکۆکی و تەنگ‌وچەڵەمەیەک لە شاری کۆیەدا رووی بدایەت کۆششی ئەکرد بۆ چارەسەرکردنی و بە زۆریی سەربەرزانە چاری دەکردن و ئاگربەستی ئاژاوەی دەکرد.

مەلا محەمەد بەم شێوە لە سەر ئەم کارانە ئەمێنێتەوە و، گەلێ قوتابی زیرەک و زانا و خاوەن پایە و مایە لە خوێندنگاکەیدا دەخوێنن و خوێندن تەواو ئەکەن و لە شار و دێهاتەکاندا دادەمەزرێن و ئەبن بە مەلا و پێش‌نوێژ و خوتبەخوێنی ئەو دێهاتانە و بەم شێوە بزوتنەوەیەکی زانیاریی لە وڵاتدا پەیدا کرد.

وە پاش ماوەیەک خۆی تەرخان ئەکا بۆ دەرزوتنەوە و خوتبەخوێندنەوەی مزگەوتەکەیان ئەدا بە شێخ نووری کە برای دایکیی [لەدایکەوە برای] بووە.

پاش ئەمە دەست ئەکا بە کتێبدانان و:

١ ـ لە عەقائیدا کتێبێ بە ناوی «القائد»ەوە دەنووسێ.

٢ ـ «المصقول فی علم الاصول» لە ئوسوولی فیقهدا دادەنێ.

٣ ـ الکلام الجدید لە عیلمی کەلامدا دادەنێ.

٤ ـ نامیلکەیەک لە باسی سیفەتی کەلامدا.

٥ ـ نامیلکەیەک لە مەعنای ئیماندا.

٦ ـ زیاد لەمانە نووسیویەتی: و شرعت فی تحریر کتاب علی طراز المقاصد و المواقف، و سمیتە «المشاهد» . اسأل الله اتمامه.

٧ ـ تەفسیری قورئانی پیرۆز بە زمانی کوردی. تا ئێستە دوو بەرگی لێ چاپ کراوە. پشت بە خودا ئەوانی دیکەیشی چاپ دەکرێ.

لە کۆتایی ئەم تەفسیرەوە بە خەتی خۆی نووسیویەتی:

«و اما مشربی و میلی فلیس الا الی الاتحاد، و نبذ الخلاف ما امکن، و اکرر علی الدوام قوله ـ تعالی ـ: «تلک امة قد خلت لها ما کسبت و ما کسبتم، و لا تسألون عما کانوا یعملون» .

و قوله ـ تعالی ـ: «ان الله لا یغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بانفسهم» . انتهی فی یوم الاربعاء سلخ ربیع الثانی سنة الف و ثلاث مائة و سبع و خمسین. الحقیر جلی زاده محمد.»

خوالێخۆشبوو تەفسیرەکەی لە سێ بەرگدا لە ساڵی ١٩٤٣دا بە چەند مانگێک پێش کۆچی دوایی تەواو کردووە. چونکە لە دوازدەی تەشرینی یەکەمی ١٩٤٣دا کۆچی دوایی کردووە.

## شێخ نووریی حاجی مەلا عەبدوڵلا

لە پاش کۆچی دوایی مەلا محەمەد، شێخ نووری برای وەکوو جاران کارەکانی مزگەوتەکەیانی بەڕێوە برد و لە سەر پێشنوێژی و خوتبەخوێندنەوە و دەرزوتنەوە رۆیشت تا لە بیستی مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٢ی زایینیدا کۆچی دوایی کرد و لە

گۆڕستانی گشتیی شاری کۆیە لە نزیکی گۆڕی مەلا محەمەدی برایی و حاجی مەلا عەبدوڵڵای باوکیدا بە خاک سپێررا.

سەد داخم بە دڵ لە بەرزەداخان
لە کووژانەوەی چرای ئۆجاخان

مردن پێویستە لە بۆ گیانلەبەر
گەدا و دەوڵەمەند یا پاشای سەروەر

نەزان یا زانای دڵپڕ لە حیکمەت
یا پیری ئیرشاد وەسیلەی رەحمەت

کەس رزگار نابێ لە داوی مردن
بە خۆ ونکردن یا بە راکردن

ئەسەف لەوەیە چەرخێکی وا هات
زانیاریی دینی کەوتە سەر نەهات

ئەو خانەدانەی پڕ بوو لە عولووم
لە کەشفی سیرڕی مەنتووق و مەفهووم

ئەو خانەدانەی پڕ بوون لە ئیرشاد
چرای دەروون بوون بۆ زومرەی عیباد

تۆماری تەی بوو بە چەن پێچ و لوول
بردی بۆ سەما گێژی گەردەلوول

ئاساری نەما لە رووی جیهانا
مەگەر لای مەردی حیکایەتخوانا

سا مەگەر خودا بە فەیزی ئیحسان ـ
لا بکاتەوە لە عالەم دیسان

کە هێزی قودرەت دەربخاتەوە
مردووی عیلمی دین زیندوو کاتەوە

«نامی» نەماوە تەمای بە دنیا
هەر هیوای ماوە بە خودای تەنیا

## بنەماڵەی شێخەکانی تاڵەبانی

ڕشتەی ئیرشادی بنەماڵەی تاڵەبانی بریتی‌یە لە: شێخ عەلیی کوڕی حاجی شێخ جەمیلی، کوڕی شێخ محەمەدعەلی، کوڕی حاجی شێخ عەلی ئەفەندی، کوڕی شێخ عەبدوڕەحمان خالیس، کوڕی شێخ ئەحمەدی، کوڕی شێخ مەحموود. وە چەن ڕشتەی دیکەیش کە سەر بە کوڕەکانی شێخ ئەحمەد و کوڕەزاکانین.

### شێخ مەحموودی تاڵەبانی

ئەم پیاوە کوڕی یوسف‌ئاغا ناوێ بووە. ئەم یوسف‌ئاغا مەئموور مەفرەزەی عوسمانی بووە، پاش ماوەیەک دەستی لە کارەکەی هەڵگرتووە و چووەتە ناو عەشیرەتی زەنگنە و ئافرەتێکی زەنگنەی مارە کردووە و کوڕێکی بووە ناویان ناوە مەحموود.

ئەم کوڕە بەختەوەرە پاش فام‌کردنەوە دەستی کردووە بە خوێندن و قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە و دەستی کردووە بە خوێندنەکانی عەرەبی لە: نەحو و سەرف و ... بۆ خوێندن چووە بۆ دەرەوەی شوێنەکەی خۆی و لە شار و لادێکانی کوردستان دەخوێنێ و دەچێ بۆ ناوچەی بادینان و لە دێیەک لە دێکانی ئەو ناوچەدا دەخوێنێ و بۆ مەتالا و کۆشش گەلێ جار دەچێتە سەر کانی‌یەکی گوندەکە، دیارە ئەوەندە لە سەر کانی‌یەکە ئەمێنێتەوە تا ناویان ناوە بە «کانی مەلا مەحموود» و ئیستەیش بەو ناوەوەیە.

بەهەرحاڵ لە سەر خوێندن ئەڕوا تا هەموو زانیاری‌یەکان تەواو دەکات و دوایی دێتەوە بۆ ناوچەکەی خۆی و لە «قرخ» و «تاڵەبان»ی قەزای چەمچەماڵ دادەنیشێ و خزمەتی دین و زانیاری دەکات. لە هەمان کاتدا خەریکی کشتوکاڵیش دەبێ و بە ڕەنجەشانی خۆی دەژی و بێستانی هاوینەیشی بووە بۆ میوە و سەوزەی خۆی و، بەم شێوە بە ڕێزەوە کاتی خۆی ڕابواردووە.

ڕۆژێ لە ڕۆژان لە هاویندا کاتێ لە سەر بێستانەکەی ئەبێ تەماشا دەکا وا سێ دەروێش هاتن و لە ڕێگەکە لایان دا و ڕوویان کردە مەلا مەحموود، ئەمیش ئەچێ بە پیریانەوە و بەخێرهاتنیان ئەکا و ئاوی سارد و میوەیان بۆ دادەنێ، تا وچانێک ئەدەن. تمەز یەکێک لەم سیانە شێخ ئەحمەدی لاهووری‌یە و بە هیوای چوون بۆ بەغدا و زیارەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی ئەم ڕێگەیان گرتووەتە بەر و ئەو دوانەکەیش دەروێش و مەنسووبی تەریقەتن و وان لە خزمەتیدا. مەگیرە شێخ ئەحمەد بە تایبەتی بۆ ئەوە لای داوە ڕێبازی تەریقەت نیشانی شێخ مەحموود بدات و شێخ مەحموود بگاتە ئەو پلە و پایە خودا بۆی بڕیار داوە.

جا شێخ مەحموودیش بە سینەگوشادی و شادمانی‌یەوە وەلامی شێخ ئەحمەد ئەداتەوە و ڕێبازی تەریقەتی قادری لێ وەردەگرێت و ئەبێ بە مەنسووبێکی ساغ و دەروێشێکی بەدەماغ و لەو ڕۆژەوە دەست ئەکا بە سلووک کردن و ئادابی تەریقەت بەجێ دێنێ و ڕۆژ بە ڕۆژ دڵی بەهێزتر دەبێ.

وە شێخ ئەحمەدیش پاش حەسانەوە لای شێخ مەحموود دەکەونەوە ڕێ و خوداحافیزی لە شێخ مەحموود دەکەن و بەرەو بەغدا بەڕێ دەکەون بۆ زیارەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی. شێخ ڕەزای تاڵەبانی لەم ڕووەوە بە شیعر دەڵێت:

خودا وەختێ کە حەز کا بەندەیێکی خۆی بکا خۆشنوود
لە ڕێگەی دوورەوە بۆی دێ بە پێی خۆی شاهیدی مەقسوود
لە هیندستانەوە شەش مانگەڕێ تا خاکی کوردستان
خوا شێخ ئەحمەدی هیندیی ڕەوان کرد بۆ مەلا مەحموود
مەلا مەحموودی زەنگنە، یەعنی قوتبی دائیرەی ئیرشاد
لە دەوری مەرقەدی هەر دەنگی «یا هو» دێت و «یا معبود»
لە پاش ئەو ئەرشەدی ئەولادی شێخ ئەحمەد لە جێی دانیشت
بە عەینی وەک سولەیمان جێ‌نوشینی حەزرەتی داوود
بەڵێ بابی وەها ئەڵبەت دەبێ فەرزەندی وا بێنێ
ئیلاهی! سەد هەزار ڕەحمەت لە قەبری والید و مەولوود

به رەحمەت چوون ئەوان با بێینــەوە ســەر بــابی ئـەوڕەحمان
فیدات بم ئــەی نەتیجــەی دوودمــانی ئەحمــەد و مــەحموود!
نەتیجـــەم مەقســـەدە «تـــالی» و «مقــدم» شـــەرتی تەحســـیلە
ئەوانــەی بۆیــە ئیجــاد کــرد خــودا تــا ئــەم ببــێ مــەوجوود
ئەمێستاش شێخ عەلیی نەجلی کـە پـیری سـاحیب ئیرشـادە
ئــەمیش وەک بــاب و بــاپیری لــە زومــرەی ئــەولیا مەعــدوود
(رەزا)ش لەو نەسلەیە ببەخشە یـاڕەب! چونکـە قـەت نابـێ:
گولــی بــێ خــار و بــەحری بــێ بوخــار و ئــاگری بــێ دوود

لە کاتی ڕۆشتنی شێخ ئەحمەدەوە بۆ بەغدا تـا کـاتی هاتنـەوەی بـۆ کوردسـتان و چاوپێکەوتنی مەلا مەحموود کە شەش مانگێک بووە .. شـێخ مـەحموود بـە جـۆرێ سەرکەوتوو ئەبێ و کەرامەتی لێ دەرئەکەوێ، کاتێ کە جەنابی شێخ ئەحمەد دێتـەوە زۆر سوپاسی خودا ئەکا لە سەر ئەو بەش و بارەیە کە دەستی کەوتووە و بە دڵخۆشـی ئەڕواتەوە بۆ سووررداش کە جێگەی یەکەمجاری بووە، بەڵام دوو دەروێشەکەی هاوڕێی ئاگری حەسادەت بەرئەبێتـە گیانیـان و شـەوێ لـە شـەوان بـڕیاری کوشـتنی شـێخ ئەحمەد ئەدەن و ئەیکوژن و لە ناو دڕک و داڵدا دەیشارنەوە.

لەو شەوەدا شێخ ئەحمەد دێتە خەوی مەلا مەحموود و ئەفـەرموێ: فریـام کـەوە! فڵان و فلان سەریان بڕیوم! جا شێخ مەحموود لە خەو هەڵساوە و لەگـەڵ کۆمەڵـێک لە موریدەکانیدا چووە بۆ سووررداش و تەرمەکەی شـێخ ئەحمـەدی دۆزیوەتـەوە و بـە ڕێزەویە بە خاکیان سپاردووە و ئێستە ئارامگاکەی لە سووررداشدا زیارەتگایە.

پاش کۆچی دوایی شێخ ئەحمەدی لاهووری مەلا مەحموود دەبێ بە مورشـیدێکی سەربەخۆ و لە بەر ئەوە دارای عیلمی زاهیر و باتین بووە گەلێ خزمەتی بەسوودی بـە جیهانی موسوڵمانان کردووە.

لە حاجی شێخ عەلیی کوڕی حاج شێخ جەمیلم بیستووە کە: مەلا مەحموود چووە بۆ شاری کەرکووک و لە ناو ئـەو تەکیـەدا کـە ئێسـتە هەیـە تەکیەیـەکی بچکۆلـەی کردووەتەوە و هەندێ دەروێـش لـە تەکیـەدا گـرد بوونەتـەوە و زیکـر و تەهلیلـەیان کردووە. مەلا مەحموودیش جارجار چووە بـۆ کـەرکووک و سـەری لـە دەروێشـەکان

داوە، لە دوا سەفەریدا کە ئەچێ بۆ کەرکووک لەوێ نەخۆش ئەکەوێت و کۆچی دوایی دەکات. جا شێخ ئەحمەدی کوڕی ئەچێ بۆ کەرکووک و لەو شوێنەدا کە ئێستە هەیە بە خاک دەسپێررێت. مەلا مەحموود هەشتاوپێنج ساڵ تەمەنی بەسەربردووە و دوای کۆچی دوایی گەلێ لە شاعیرە: کورد و تورک و عەرەبەکان لاواندوویانەتەوە و شیوەنیان بۆ نووسیوە . لەوانە مەلا سیبغەتوڵڵای هەورامیی رووداری بەم چەن شیعرە لاواندوویەتیەوە کە دەڵێ:

مشـــرع کـــرم، مـــروج راه هـــدی
غـوث الضـعفا کـه بـود محمـود مقـام
در عـالم صـورت سـوی معنـی بشـتاف
کانجاسـت مقـام وصـل ارواح عظـام
بـر تربـت او بـاد ز الطـاف خـدائی
بـس نـوع تحیـات بـس گونـه سـلام
«نوری» ز خرد بخواست تأریخش گفـت:
محمـود جـوار احمـدش هسـت محـام

١٢١٥هـ

## شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی

مەلا مەحموود کە کۆچی دوایی کردووە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: محەمەد و ئەحمەد. محەمەد بە گەنجی لە جیهان دەرچووە و کەسی لێ بەجێ نەماوە.

شێخ ئەحمەد ماوەتەوە، ئەم پیاوە بە یارمەتی خودا لە خانەدانی باوکیدا دەستی کردووە بە خوێندن و لەگەڵ خوێندنەکەیشیدا خەریکی تەسەووف بووە و لە خزمەتی باوکیدا تەریقەتی وەرگرتووە و ئادابی بەجێ هێناوە و سلووکی کردووە و گەیوەتە پایەی خەلافەت. وە لە ژیانی باوکیدا لە سێبەری ئەودا ئیرشادی کردووە، بەڵام پاش کۆچی دوایی ئەو سەربەخۆ ئیرشادێکی باش و راستی کردووە.

ماوەیەک دوای کۆچی دوایی باوکی هاتووەتەوە شاری کەرکووک و لە نزیکی جێگە تەکیەکەی باوکیدا لە نزیکی گۆڕستانی گەڕەکی بلاغـدا جێگـەی گرتـووە و دوو سـێ ژووری لە خۆرهەڵاتی تەکیەکەوە بۆ خۆی و میوان کردووەتەوە.

وە لە لای شیمالیشەوە چوار هۆدەی بۆ موریـدەکانی کردووەتـەوە و لـە بـەردەمی ئەم هۆدانەدا مزگەوتێکی ژێرزەمینیی کردووەتەوە تا ئەم نزیکانە مابوو، بەڵام ئیستە پڕ کراوەتەوە و لە نێوانی ئەو هۆدانە و مزگەوتی ئێسـتەدا دوو ژووری دروسـت کـردووە، گەورە و بچووک، گەورەکەیان حاجی شـێخ عـەلی ئەفەنـدی و شـێخ محەمەدعـەلی کـوڕی تێـدا بـە خـاک سـپێراوە و لـە بچووکەکەیشـیاندا حـاجی شـێخ جـەمیل و عەبدوڕەحمانی کوڕی نێژراوە.

شێخ ئەحمەد زۆر سـەرکەوتوو بـووە و ئیرشـادێکی باشـی کـردووە و خـودا پلـە و پایەیەکی بەرزی داوەتـێ و لـە عێـراق و سـووریا و تورکیـا و ئێرانـدا گـەلێ موریـد و مەنسووبی گرتووە، بە تایبەتی لە هەوراماندا، وە گەلێ ژنی هێنـاوە و خـودا دە کـوڕی باشی پێ بەخشیوە و هەموویان دارای زانست و خاوەنی ڕێبازی تەسەووف بـوون، ئـەو کوڕانەیش ئەمانـەن: شـێخ عەبـدوڕەحمانی خـالیس و شـێخ عەبدولغـەفوور و شـێخ عەبدولفەتاح و شێخ عەبدولکەریم و شێخ محێدین. ئەم کوڕانە هەموو لە کچی کـوڕی میرئەسماعیلی زەنگنە بوون.

وە شێخ عەبدولعەزیز و شـێخ محەمەدسالـح و شـێخ حسـەین. دایکـی ئـەمانیش خاتوون شانازە، کە لە ئاغاکانی هۆزی داوودەیە. وە شێخ محەمەدعارف لـە ژنێکـە لـە ئاغاکانی زەهاو، وە شێخ عەبدولقادر کە بـە گـەنجی مـردووە و لـە لای قـەبری شـێخ مەحمووددا بە خاک سپێرراوە.

وە چەن کچیشی بـووە لەمـەولا بـە درێـژی باسـیان دەکـەین. شـێخ ئەحمـەدی تاڵەبانی لە ساڵی ١١٩٤دا لە دایک بـووە و لـە ساڵـی ١٢٥٧دا لـە کـەرکووک کـۆچی دوایی کردووە و لە پاڵ مەرقـەدی باوکیـدا بـە خـاک سـپێرراوە. گـەلێ لـە شـاعیر و ئەدیبەکان ئەم شێخ ئەحمەدەیان لاواندووەتەوە، لەوانە مەلا سیبغەتوڵڵای هـەورامیی رووداری کە بە زمانی فارسی دەڵێ:

قطـب عرفـان معـین دیـن خـدا

کـه ازو نجـم شـرع مسـعود اسـت

هِشت دنیـا و رفـت سـوی بهشـت
کـه در آنجـا لقـای معبـود اسـت
رفـت و از رفتـنش ز چشـم جهـان
خون از آن چشم دهر مرمود اسـت
عقـل تـاریخ او ز رضـوان خداسـت
که کسی لب باین نه بگشـود اسـت
تاج حشمت فگنـده از سـر گفـت :
دسـت احمـد مقـام محمـود اسـت

۱۲۵۷ هـ

**شێخ عەبدوڕەحمان ناسراو بە «خالص»**

شێخ عەبدوڕەحمان لە ناو دە کوڕەکەی شێخ ئەحمەددا جیاواز و دیـاری بـووە بـە گەورەیی لە تەمەن و زانست و کردەوەدا و لـە تەسەووفیشـدا شـارەزا و بـەتوانا بـووە، یانی دیاریترینی نـەوەی شـێخ ئەحمـەد بـووە، لـە بـەر ئەمانـە بـە بـڕیاری موریـد و مەنسووب و کوڕەکانی شێخ ئەحمەد و لە سەر ئەو بناغە کە دیاریترینی نـەوەی شـێخ ئەحمەد بووە لە جێگەکەی باوکیدا دانراوە و جێگەداری باوکی بـووە و بـە مورشـیدی هەمووان ناسراوە و هەموو موریدی و مەنسووبەکانی، مـل کـەچی بـوون و گـوێڕایەڵـی قسەکانی بوون.

وە لە بەر ئەوە هەموو کوڕەکانی بەیەکەوە نەدەژیان و گەلێ موریـد و مەنسـووبیان لە وڵاتاندا بووە بە خواستی خۆیان بڵاوەیـان کـردووە و هەریـەکێکیان لـە شـوێنێکدا بوون و خەریکی ئیرشاد و خزمەتی دین بوون.

شێخ عەبدولغەفوور چـووە بـۆ ئێـران و لـە سەردەشـتدا تەکیەیـەکی کردۆتـەوە و خەریکی ئیرشاد بووە، بەڵام پـاش مـاوەی دوو سـاڵ براکـانی تاقـەتی دووریـی شـێخ عەبدولغەفووریان نەبوو و چوون ماڵەکەیان هێنایـەوە بـۆ عێـراق و لـە شـاری کۆیـەدا دایانمەزراند. شێخ عەبدولغەفوور لـە کۆیـەدا تەکیـە و خانـەدانێکی بـەرپا کـردووە و دەستی کرد بە ئیرشاد و خزمەتی موسوڵمانان.

ئەم زاتە سێ کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ رەشید و شێخ ئەدیب و شێخ نووری. رەشید و ئەدیب بێ نەوە سەریان ناوەتەوە. شێخ نووری چوار کوڕی لێ بەجێماوە: عیززوڵلا و نووروڵلا و بورهان و ئەفزەل. دایکی ئەمانە کچی شێخ عەبدولقادر فائیزی کوڕی شێخ عەبدورەحمان خالسە. شێخ ئەفزەل سێ کوڕی لێ بەجێماوە: حیسامەدین و نەسرەدین و شەرەفەدین.

عیززوڵلایش دوو کوڕی لێ بەجێماوە: کاکە سوور و شێخ رەشید. وە لە بورهانیش دوو کوڕ بەجێماوە: محەمەدسالح و جەنگی. وە لە حیسامەدین، جەلال بەجێماوە.

وە شێخ عەبدولفەتاحی کوڕی شێخ ئەحمەد چووە بۆ ئاوایی «خەربەگ» لە ناحیەی «قەرەحەسەن».

وە شێخ عەبدولکەریم لە ئاوایی باداوا دانیشتووە و شێخ محێدینیش چووە بۆ دێی «حاجیلەر» لە نزیکی «قۆرەتوو»دا.

وە شێخ عەبدولعەزیز چووە بۆ ئاوباریک و لە ناحیەی «گل» نیشتەجێ بووە و، چوار کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ عەبدوسەمەد و شێخ مەعرووف ـ کە زانایەکی بەرز بووە ـ و شێخ رەزا و شێخ حەمید کە بە شێخ حەمیدی گل ناسراوە.

لە شێخ عەبدولکەریم: شێخ عەبدوڵلا و شێخ غەنی و شێخ محەمەدئەمین بەجێماون.

وە لە شێخ محێدین شێخ محەمەدی نانگەورە و شێخ نەسرەدین و شێخ لەتیف و شێخ جەلال بەجێماون. وە لە شێخ عەبدولفەتاح، شێخ مەعرووف و شێخ لوتفوڵلا و شێخ سەلام و شێخ سەمەد و شێخ تاها بەجێماون.

وە لە شێخ محەمەدسالح شێخ مەحموود و شێخ قادر و شێخ سەعید بەجێماون.

وە لە شێخ حسەین: شێخ هادی و شێخ جەمیل بەجێماون.

وە لە شێخ محەمەدعارف: شێخ سەعید و شێخ حەکیم و شێخ شوکور بەجێماون.

ئەم شێخ محەمەدعارفە لە دێی سەوزبلاغ دانیشتووە و چوار مەلای مودەڕیس و چل تەلەبەی دینیی داناوە و ژیوار و پێویستیانی بەڕێوە بردووە تا پێبگەن و ئەوانیش بە دەوری خۆیان خزمەتی ئایین و زانیاریی بکەن.

وە لە شێخ مەعرووفی کوڕی شێخ عەبدولعەزیز: شەمسەدین و تاهیر و سابیر و سەدیق و عوسمان بەجێماون.

وە لە شێخ حەمیدی گل: شێخ جەلال و شێخ وەهاب و شێخ تالیب و شێخ غالیب و شێخ رەشید و شێخ مستەفا بەجێماون.

جا با بڕۆینە سەر باسی شێخ عەبدوڕەحمانی خالیس. ئەم کوڕە کە دوڕڕێکی کەموێنە بووە لە ساڵی ۱۲۱۲ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە خوێندنگا بەرزەکەی خۆیانا خوێندوویەتی. قورئانی پیرۆز و کتێبە وردەکانی خوێندووە و زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی ـ جگە لە زمانی زگماکی خۆی ـ فێر بووە و لە زانیارییە ئایینییەکاندا سەرامەد بووە. تەمەسوکیشی بە باوکی خۆی کردووە و سلووک و ریازەی خۆی بە تەواوی بەجێهێناوە. پاش تەواوکردنی ئادابی عادەتیی تەریقەت کراوە بە خەلیفە و ئیجازەی لە باوکی خۆی وەرگرتووە.

بەلام ئەم زاتە سەروێ بووە لە چەمەنی شاهانەی ئەولیادا و ئەدیب و نووسەرێکی تاقانە بووە لە باخی ئەسفیادا و مامۆستایەکی زانا و توانا بووە لە ناو مامۆستایاندا و مورشیدێکی هەلکەوتوو بووە لە ناو کۆڕی مورشیدەکانا. نازناوی شیعریی خالیس بووە، دیوانێکی ئەدەبی هەیە مرۆی زیرەک و وریا لە عاستی نوکتەی ورد و هەستی ناسکی ئەم شاعیرەدا سەرسام دەبێ. خاوەن تەوەججوهاتێ بووە هەمیشە وەکوو مۆمی عالەمئارا گراوە و موریدان وەکوو پەروانە بە دەوریدا سووتاون.

شێخ عەبدوڕەحمان ئەوەندە خاوەن جیلوەی خودایی بووە تەکیەکەی بووە بە بنکە بۆ دائیرەی تەکیەی دەروێشان، خوێندنگاکەی دەرمانخانەی دڵڕێشان بووە و هۆدەکانی تەکیە مەڵبەندی پیاوان و ناوداران بوون و هەموو جۆرە خوێندەوار و زمانزانێ تیایاندا دانیشتوون و وچانیان داوە.

باس و تاریفی شێخ عەبدوڕەحمان تەواو نابێ و بە مەعنای کەلیمە مەردی مەیدان و شێری ناو مەردان بووە و تاجی سەری ئەولیاکان بووە و لە ناو پیاوە هەڵکەوتووەکانی جیهاندا لە ریزی سەرەوە ناوی نووسراوە.

تەکیەکەی شیاوی شاهیی جیهان بووە، هەرگیز جیاوازی لە نێوان پیاوی گەورە و بچووک و قورس و سووک نەخراوە تیایا، هەروەکوو جیاوازی لە نێوان عەرەب و کورد و تورک و ... نەبووە تیایا.

هەرچی دەستکەوتووە بە گوێرەی توانا سەرف کراوە. لێی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: عومری ئەو کەسە نەمێنێ ئەوەندەی پارە ببێ کە حەجی لە سەر واجب ببێ.

یەکە پیاوی پیاوانە و خێرخوای ناو کۆمەڵ بووە و میانەی لەگەڵ شێخان و پیاوانی سەردەمی خۆیدا زۆر باش بووە، بە تایبەتی لەگەڵ شێخ عوسمانی سیراجەدیندا. وە هەر لە بەر ئەو پەیوەندی‌یە بووە کە شێخ عوسمانی سیراجەدین شێخ عومەری کوڕی خۆی ناردووە بۆ کەرکووک بۆ ئەوە ماوەیەک لەو تەکیەدا بمێنێتەوە و سوود لە خوو و رەوەشتی دەرویشان وەربگرێ، بەڵام کاتێ شێخ عوسمان بیستوویەتی بەیانی و ئێوارە سینی بۆ شێخ عومەر دێت .. ناردوویەتی بە شوێنیا تا بێتەوە بۆ بیارە بۆ ناو ژیانە زبر و هەژارانە و دەروێشانەکەی خۆیان لە هەوراماندا.

شێخ عەبدوڕەحمان وەکوو لە خزمەتی شێخ ئەحمەدی باوکیدا سلووکی کردووە هەروا لە خزمەتی شێخ مارفە کوسەی شێخ ئیسماعیلی ولیانیدا سلووکی کردووە.

ئەگێڕنەوە رۆژیک شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی بە دیدەنیی ئەچێ بۆ خزمەتی شێخ مارف و شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی لەگەڵدا دەبێ، جا شێخ مارف نەفەرموێت: کاک ئەحمەد تۆ شوکور کوڕت زۆرە و من کوڕم نییە، یەکێ لە کوڕەکانت بدە بە من. ئەویش ئەفەرموێت: کوڕەکانم هەموو خزمەتکاری تۆن، هەرکامیان ئەفەرموویت لە خزمەتتانایە. ئەویش ئەفەرموێ: دەی عەبدوڕەحمانم بۆ بەجێ بێڵە. ئەویش عەبدوڕەحمان بەجێ دێڵێ. شێخ مارف هەر مەبەستیشی ئەوە ئەبێت کە شێخ عەبدوڕەحمان تەمێ بکات و بیکات بە کوڕی خۆی لە بارەی زانست و رێبازی تەسەووفەوە. وە پاش ئەوە کە ماوەیەک لە خزمەتیا سلووکی کردووە لە سەر رای شێخ مارف ئەگەڕێتەوە بۆ خزمەتی باوکی.

سەردەمی شێخ عەبدوڕەحمان سەردەمی زێڕینی هەموو بنەماڵەی تاڵەبانی بووە و چەرخێکی باش بووە بۆ چاودێری دۆستایەتی و خۆشەویستی نیوان شێخەکانی کوردستان و هەموو مەبەستیان خزمەتی ئایینی ئیسلام بووە.

کاتێ کە سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی شێخ عەبدوڕەحمان ئەناسێ و شارەزای رەوشتی دەبێ فەرمان دەرئەکا بە کردنەوەی مزگەوتێکی چاک و گەورە و،

لە ساڵی ١٢٦١دا مزگەوتەکە ئەکرێتەوە بە شێوەیەکی وا مزگەوتێکی تاقانە دەبێ لە شێوە و قەوارەدا و لە رەسمی‌یاتدا بە ناوی مزگەوتی «مجیدیە» ناسراوە.

لەو سەرمەدەدا ئەو مزگەوتە دروست کراوە خواڵێخۆش‌بوو سەیید عەبدورەحیمی مەولەوی دیدەنی ئەو شوێنەی کردووە و ئەم شیعرانەی نووسیوە:

عقل گفتا چون تفکر کرد و ایست:
دانی این بانی و مبنی چیست و کیست؟
در تنزل کرد جلوه بی چنین
حق در آن و عرش اعظم آن درین
هر که داند سرّ این راز نهفت
خوش «علی العرش استوی الرحمن» گفت
مبتدا و منتهای هر شیی است
«مظهر حق باد» تأریخ وی است

۱۲۶۱

وە شێخ عەبدورەحمان ئەدیب و شاعیرێکی تەک و کەموێنە بووە و دیوانێکی شیعری ناسک و جوانی هەیە چاپ کراوە. ئەم دوو شیعرە نموونەی ئەو شیعرانەن:

طواف کعبۀ دل کن اگر دلی داری
دل است کعبۀ معنی تو دل چه پنداری
هزار حج پیاده کنی به آن نرسد
که: یک نفس دل بیچاره‌ای بدست آری!

وە لەو دیمەنە جوانانە کە دیومە مەنارەی تەکیەکەیە کە لە هۆی ئەوەوە لە ساڵی ١٣٣٦ی کۆچیدا سوپای عوسمانی‌یەکان تەقەمەنی و barووتیان ئاگر دا و تەقینەوەیەکی گەورە لە نزیکی تەکیەکەدا رووی دا و، منارەکەیش لار بووەتەوە بە جۆرێ کە مرۆ سەرسام دەبێت ئەم منارە گرانە بەم شێوە لارە چۆن راوەستاوە!

لەگەڵ ئەوەدا ماوەی ٥٦ ساڵ بەو جۆرە بە لاریی مایەوە هەتا منارەکەیان دەرهێنا و منارەیەکی تازەیان لە جێگەیدا دروست کردووەتەوە. ئەم تەعمیرە لە سەردەمی حاجی شێخ عەلیی کوڕی شێخ جەمیلدا بوو، ئەم پیاوە کۆششی کرد بۆ ئاوەدان‌کردنەوەی ئەو شوێنە و من کە لە ساڵی ١٣٧٤ی کۆچیدا بە مودەڕیسی لەو شوێنەدا دانرابووم ئەم چامەم نووسی کە ئیشارەم تێدا کردووە بە ئەو ڕووداوەی بە سەر ئەو منارەدا هاتووە:

بسم المهيمن مَن له الآلاء — من فاض من احسانه النعماء
حمد و شكر شامل، و ثناء — منا لمولى جاء منه ضياء
و صلاة اخلاص كغيث و ابل — هطلت على من طاوعته سماء
بكريم خلق احمد و محمد — طاها النبي و آله النجباء
طوبى لكم يا اهل ذوق مدامة — في كأسها سكر، و فيه نماء
بشرى لكم اذ قد بدى قبس الهدى — و منارها، اى طورها السيناء
طور تقدس عن غبار غباوة — و به الغناء، و به الهناء، و شفاء
فاخلع به ادبا نعال علاقة — و تجردن عما علاه عناء
كملت لديك و سائل المتواجد — هذا المدام و هذه الصهباء
نم و استرح، قم عش لكل مسرة — و افرح بقلبك اذ أتاه صفاء
هي بقعة للعاشقين اولى الوفا — و بذوقهم طاب الهوى و هواء
لما بنوها مخلصين لوجهه — عم الفناء عناية و بقاء
هي طور موسى للغريب بنورها — علم الرشاد منارة بيضاء
تعلو الثريا من علو مقامها — بالرغم من ان الرغام هباء
بالاستقامة في الهدى قامت بها — مر السنين «منارة حدباء»
مالت الى البيت المتيق كراكع — يخشى الاله و هاله الآلاء
تحكي مقالة حالها بفصاحة — عن مدح قوم كلهم عظماء
عن معشر طاب الزمان بطيبهم — و بنورهم عم الانام ضياء
الطالبانيين من طلبوا الهدى — من ربهم فاتتهم النعماء

السادة الاشراف من محمودهم ... عم الزمان أمانة و سخاء
و الشيخ احمد نجله السامی الذی ... بلغ العلا ما سابقته سماء
و له اساس عمارة المجد الذی ... ینمو بها الانوار و الاضواء
ثم المحب الخالص المجذوب من ... جذبات حق ما لهن فناء
شیخ بجذبة عشقه انجذب الوری ... و بجذوة نوره انجلت ظلماء
و بنوره قد استنار العالم ... و بدا الصباح و زالت الظلماء
العبد للرحمن حق عبادة ... قد زانها التسلیم، ثم رضاء
ثم العلی المقتدی و امام من ... فی جامع الاحسان قام وراء
احسن به من مرشد متواضع ... فی سیره ما شانه الخیلاء
من حف محفله الفضیلة و التقی ... و سمت لدیه السنة الغراء
و التف حوله کل ذی فضل سنی ... و اصطف عنده سادة علماء
فکأن منزله ینابیع حکمة ... فیها الفنون ینالها العرفاء
ثم الشریف محمد من علوه ... وصف العلا قد خصه و نماء
اعنی محمد العلی بوصفه ... و قد استفاد بفضله العلماء
ثم الجمیل بزینة الاحسان من ... قد استراح بفضله الفضلاء
بکماله قد زاد نور جمالهم ... و بماله استغنوا و زال عناء
ومتی ننقب عن وجوه فخارهم ... فهم الوجوه، و کلهم وجهاء
و لهم مآثر کل طائفة، و من ... ینبوع آداب لهم ادباء
جاء النداء بدعوة الباری لهم ... شاء العلی لهم الأله فشاؤا
یارب اعل مقامهم بکرامة ... یوما تجلی من لقاک ضیاء
و صن المقام عن الملام، و زد بها ... شرفا و ایمانا یلیه حیاء
بعلا علی تحتویه کرامة ... و بعبد رحمن اتاه ثناء
و اجعل لهم عرفان حق لازما ... مادامت الانوار و الظلماء
یا اهل کرامة و شرافة ... و سخاوة و سماحة و وفاء
قد تاه فی بیداء حب جمالکم ... عبدالکریم، و قد علاه عناء

لا تهملـوا شـأن المحـب المغـرم | ان المحـب حياتـه البلـواء
لا تهملـوا ذكـراه بعـد فـراقكم | لقلوبنـا بالـذكريات شـفاء
لا تهملوا عطف القلوب الى الـذى | عطـف الحبيـب لـه شـفا و دواء
و ادعـوا دعـاء خالصـا لنجاحـه | فلعـل يكشـف بالـدعاء بـلاء
مـا اطيـب السـاعات عنـد لقـائكم | لو لم يكـن لـى مـن نـواى شـقاء
الـف مضـى و ثـلاث مئـين وراءه | سـبعون اربعـة لهـا رقبـاء
و قد استرحت مـن العنـا بلقـائكم | و الـدهر بعـد القهـر فيـه صـفاء
لابد مـن نفـس و لـو طـال الاسـى | يـأتى علـى عقـب الظـلام ضـياء
يـارب صـل علـى النبـى و آلـه | مـا لاح مـن افـق السـناء سـناء
مـا فـاح مـن ذكـراه روح محبـة | او لاح نـور و اسـتبان صـفاء
مـا حـن مغتـرب الـى اوطانـه | مـا جـن ليـل قـد تـلاه ضـياء
ما قد نما الـ «نـامى» بدوحـة عـزة | و اتـاه مـن كـرم الالـه بهـاء

دەگێڕنەوە: کاتێ کە شێخ عەبدوڕەحمان نەخۆش دەکەوێت ـ بەو نەخۆشی‌یە کـە پێی دەمرێت ـ شێخ عەلی ئەفەندی کوڕە گەورەی خۆی بانگ دەکات و پێی دەڵـێت: عەلی کوڕی خۆم! ئێمە بە میهرەبانی خودا، زیکر و تەهلیلە و بەندەیی‌کردن بۆ خـودا بووە بە ڕێگەمان و بە راستی لـە سـەر «لا الـه الا الله» دەوامـمـان کـردووە و خـودایش ناویەتی‌یە دڵی سوڵتان عەبدولمەجیدەوە ئەم مزگەوتە گەورەیەی بۆ کردووینەتـەوە و ئێمەیش بەندەیی خودامان تێدا کردووە. لەمەولا ئیتـر زەمـان زەمـانی تۆیـە، ئەگـەر تۆیش بە راستی لە سەر ئەم ڕێبازە بڕۆیت خـودا ئـەم شـان و پایـەت بـۆ دێڵـێتەوە و وێرانی ناکات.

وە ئەگەر تۆ هەر لـە سـەر ئـەم ڕێبـازە رۆییشـتی و خـودا ویسـتی مزگەوتەکـەت بڕووخێنێ و هەندێکی لێ ڕووخاند تۆیش گورج لاکەی تری بڕووخێنە. واتە کە خـودا خواستی هاتە سەر ئەوە کە شوێنەکەت نەمێنێ ئیتر بە تۆ چار ناکرێ. انا لله و انـا الیـه راجعون.

شێخ عەبدوڕەحمانی خالیس چوار[1] کوڕی بووە: شـێخ عـەلی و شـێخ ڕەزا و شـێخ عەبدولواحید. شێخ عەلی گەورەیان بووە.

شێخ عەبدوڕەحمان لە ساڵی ۱۲۱۲دا لە دایک بووە و لە ساڵی ۱۲۷۵ی کۆچیدا لـە کەرکووک کۆچی دوایی کردووە و لە ژوورێکی تەکیەکەدا بە خاک سپێرراوە.

گەلێ لە شاعیر و ئەدیبەکان ئەم زاتەیان لاواندووەتەوە و سووکواریان بۆ نووسـیوە. لەوانە مەولەوی ئەم شیعرانەی بە فارسی بۆ گوتووە:

ضیائی کان برحمـانی دریـن کـون
میـــان ســـایها ممتـــاز گردیـــد
به فیضش هر یک از اجـزای عـالم
علـــی اســـتعداده همـــراز گردیـــد
مثالش چون ز رحمت مشتق آمـد
پـــی مصـــدر روان پـــرواز گردیـــد
بتأریخش قلـم زان سـان رقـم زد:
برحمـت جـان پـاکش بـاز گردیـد

۱۲۷۵

### حاجی شێخ عەلی ئەفەندی

لە پاش کۆچی دوایی حاجی شێخ عەبدوڕەحمان دیـاریترین کوڕەکـانی کـە شـێخ عەلی بوو لە جێگەکەیدا دانیشت.

ئەم پیاوە لە ساڵی ١٢٤٨ی کۆچیدا لە دایک بووە و پاش فامکردنەوە لەو خانەدانـە پڕ لە زانستەدا دەسـتی کـردووە بـە خوێنـدن و قورئـانی پـیرۆز و کتێبـە وردەکـانی خوێندووە. پاش ئەمانە دەستی کردووە بە خوێندنی زانیارییە باوەکان و ماوەیەک لە خزمەتی سەیید محەمەدی ئیمامی مزگەوتی بلاغدا ـ کە یەکێک لە پیاوچاکان بووە ـ

---

۱- مامۆستا لێرەشدا ئەڵێ چوار کوڕ، بەڵام ناوی سیان ئەنووسێ بەڵام بـەپێی ناوبردنـەکانی لاپـەڕەکانی دوایی لە گەورەوە ئەمانەن: شێخ عەلی، شێخ عەبدولواحید، شێخ ڕەزا. ن.ب

خوێندوویەتی، لەم مزگەوتەدا ماوەیەک لەگەڵ شێخ عومەری کوڕی شێخ عوسمانی سیراجەدیندا بەیەکەوە بوون.

تەنها بەمەیشەوە نەوەستاوە و بە یاسای خوێندنی کوردستان گەلێ جێگە بۆ خوێندن گەڕاوە و چووەتە خزمەتی حاجی مەلا ئەسعەد ئەفەندیی جەلی و لەگەڵ مەلا عەبدوڵلای کوڕیدا بەیەکەوە خوێندوویانە.

بیستوومە لە سەرەتاوە جەنابی مەلا ئەسعەد زۆر گوێی بە عەلی ئەفەندی نەداوە، بەڵام پاش چەند رۆژێک کە شارەزای بووە و توانایی بۆ دەرکەوتووە زۆر بایەخی پێداوە و دەرسی باشی پێ‌گوتووە هەتا خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە. و گەڕاوەتەوە بۆ کەرکووک.

وە لەم‌لایشەوە لە لای باوکی خاوەن‌پایەی خۆی سلووکی کردووە هەتا گەییوەتە پلەی خەلافەت و دارای هەردوو عیلمەکە: زاهیر و باتین بووە و بە هەردوو لایان خزمەتی موسوڵمانانی کردووە. بە کورتی شێخ عەلی ئەفەندی لە کاتی کۆچی دوایی باوکیدا زانایەکی شارەزا و مورشیدێکی بەتەوانا بووە، بۆیە دوای مردنی باوکی بە رەزامەندی موسوڵمانان لە جێگەکەیدا دانیشتووە.

لە راستیدا شێخ عەلی باشترین جێ‌گرێک بووە بۆ باوکی و لە زانیاریدا بەرز و باڵا بووە بە تایبەتی لە شەرع و حەدیس و ئوسوولی فیقهـ و ئوسوولی حەدیسدا. وە قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە، هەروەها وا باو بووە کە سەحیحی بوخاریی کردووەتە بەر و لە تەفسیری قورئاندا دەستێکی باڵای هەبووە. وە زۆر دامەزراو بووە لە سەر پەیڕەویی سوننەتی پێغەمەر و ئیرشادێکی رێک و پێک و بەسوودی کردووە، چەند پیاوی گەورەی پێگەیاندووە، کاتی خۆی بەفیڕۆ نەداوە، هەمیشە دەمی بە ویرد و ئامۆژگاری‌یەوە بووە و دەستی لە بەخشش وناندان بە موسوڵماناندا بووە، دیارە کەسێ ئەمە دەست و دەمی بێت دڵیشی وا بووە.

وە هەمیشە کوڕە پیرۆزەکەی بە زانایانی رۆژگار رازاوەتەوە و جێگەی چارەسەرکردنی تەنگ‌وچەڵەمەی موسوڵمانان بووە و هەر کاتێ رووداوێکی گەورە رووی دابێ زاناکانی کەرکووک چوون بۆ تەکیەکەیی و لە خزمەتیدا چارەسەری کارەکەیان کردووە.

بە ڕاستی ئەوەی ئێمە لە پیاوانی باوەڕپێکراومان بیستووە دەربارەی مەناقیبی ئەم پیاوە ئەگەر بنووسرێ دەفتەرێکی گەورەی دەوێت. ئەوەی کە من تێگەیشتووم ئەوەیە کە ئەو بنەماڵە سێبەری ڕەحمەتی خودا بوون لە سەر زەویدا.

لە بارەی ئیرشادی دەرمانی دەردی دڵنەخۆش و پیاوی سەرخۆش بوون، وە لە بارەی زانیاری‌یەوە بارەگاکەی جێگەی مامۆستایانی خاوەن‌پایە بووە، وە لە بارەی ناندان بە موسوڵمانانەوە بیستوومە هەر ساڵێ حەوسەد تەغار گەنم و جۆ و زەڕات و برنج و نیسک و ماش و فاسۆلیای کردووەتە عەمارەوە، لەگەڵ ئەویشدا لە ناوەڕاستی بەهاردا لێیان بڕاوە و پێویستیان بەوە بووە قەرز لەم و لەو بکەن، یا بە کڕین نان دەست بخەن تا نوخشە پێدەگات.

شێخ عەلی ئەچێ بۆ سەفەری حەج، لە مەکەدا هەندێ خوێندەواری «وەهابی» لێی ئەپرسن: چۆن دروستە بانگ‌کردن لە ئەرواحی ئەوانە کە مردوون؟ یەکێک کە مرد پەیوەندی بە دنیاوە نامێنێ. ئەویش لە وەڵامیاندا ئەفەرموێت: یەکەم: ئەو کەسە کە ئەچێ بۆ حەج نابێ خەریکی جیدال و هاورد و بردی قسە و کار و باری دنیا بێت. دووەم: ئەگەر ویژدان بێ ئەبینین هەموو موسوڵمانێ لە کاتی نوێژ کردندا لە تەحییاتدا قسە لەگەڵ حەزرەتدا دەکات و ئەڵێت: «اسلام علیک ایها النبی و رحمة الله و برکاته» ئەگەر قسە لەگەڵ ئەرواحدا ڕەوا نەبوایە ئەم عیبادەتە وەها دانەدەمەزرا. ئەوانیش بێ‌دەنگ دەبن.

ڕۆژێک لە بەر منارەی تەکیەدا دادەنیشێ و بەکوڵ دەگری، لەو کاتەدا دۆستێکی دێ بەسەریا و پێی ئەڵێ: یا شێخ تۆ ئەو چاکە و، ئەو چاکە و، ئەو خزمەتە و، ئەو خزمەتەت کردووە! ئەمیش ئەڵێ: جا تۆ ئەزانی کە خودا ئەوانەی لێ‌وەرنەگرتووم؟! ئەڵێ: نەوەڵڵا، ئەڵێ: دەی من بۆ ئەوە دەگریم.

ڕۆژێک لە تەکیەوە دەچێتەوە بۆ ماڵی خۆیان، لە بەر دەرگای ماڵەکەدا سەگێکی گەڕۆڵ دەبینێ، ئەویش ڕوو ئەکاتە ئەو سەگە و ئەڵێ: بە خودا ئەگەر خودا نەمان-بەخشێ تۆ لە ئێمە باشتری، تۆ هەر ئازاری دنیات هەیە ئێمە ئازاری دنیا و پاشەڕۆژ.

بیستوومە لە کاتی سەرەمەرگیدا دەست دەکا بە گریان، دۆستێکی پێی دەڵێت: یا شێخ پیاوی وەکوو تۆ کە خەڵک بانگ ئەکەی بۆ لای خودا چۆن ئەبێ کە خۆت بەم جۆرە لە مردن بگریت؟ ئەویش ئەفەرموێت: تۆ وا ئەزانی من لە مردن بێزارم؟ حاشا!

بە خودا بۆ ئەوە ناگریم! بەڵکو بۆ ئەوە ئەگریم کە تەماشای ئەو کتێبخانە گەورە ئەکەم کە پڕن لە کتێبی بەنرخ و، کەسێکم نییە تەماشایان بکات و سوودیان لێ وەربگرێت.

حاجی شێخ عەلی گەلێ ڕێزی زانایان و ئەهلی دینی گرتووە، بە تایبەتی ئەوانە کە مافی دۆستایەتی و هاوڕێتیی لەگەڵیاندا بووە. وەکوو حاجی مەلا عەبدوللای جەلی کە بەیەکەوە لە خزمەتی حاجی مەلا ئەسعەدی باوکیدا خوێندوویانە ـ وەکوو باسمان کرد ـ. حاجی مەلا عەبدوللایش زۆر ئەم خۆشەویستی‌یەی دەربڕیوە، وەکوو لە نامەیەکدا بۆ شێخ عومەری زیائەدینی نووسیوە دەڵێ:

لە پاشی تۆ ـ خودا بۆ خۆی عەلیمە ـ

لە کەرکووکێ دۆعاگۆی شێخ عەلیمە

بیستوومە کاتێک حاجی کاک ئەحمەدی شێخ ئەڕوا بۆ حەج لە کەرکووک میوانی حاجی شێخ عەلی ئەبێ، لەو کاتەدا زاناکان دەربارەی حوکمی جگەرەکێشان پرسیاری لێ ئەکەن، ئەویش ئەفەرموێت: مادام حەزرەتی کاک ئەحمەد دانیشتووە من مافی قسە کردنم نییە. ئەوانیش ڕوو ئەکەنە جەنابی کاک ئەحمەد، ئەویش ئەفەرموێت: ئەم مەسەلە نەسێکی قورئان و حەدیسی تێدا نییە و لە سەردەمی تەشریعاتدا جگەرە باو نەبووە و ئێمەیش موجتەهید نین هەتا حوکمێکی بۆ بدۆزینەوە، بەڵام بە گوێرەی حەدیسی «من حسن اسلام المرء ترکه ما لا یعنیه» ئەم گڕ و پفە و ئەم ئاگر بەماڵەوە نانە و، ئەم کات بەفیڕۆدانە نەبوونی باشترە لە بوونی[1].

---

١ـ هەزار ڕەحمەت لە گیانی کاک ئەحمەد بۆ ئەم وەڵامە جوانەی، چەند ڕێک و جوانە و ڕێکی بەختەوەریی ئینسانە! بەڵام لەو کاتەدا ئەو ئەم وەڵامە جوانەی داوەتەوە کەرەسەی لێکدانەوە و «تەحلیل» نەبووە و تووتن تەحلیل نەکراوە هەتا تێبگەن چەن مادەی ژاری تێدایە. لە ١٩٣١ی زایینی‌یەوە کەرەسەی ئەمانە زۆر بوو و دەرکەوت کە چەندێ ژاریی نیکۆتین لە ناو ئەندازێکی کەم تووتندایە و کە ئەم نیکۆتینەیش چەندەی زیان بۆ قوڕگ و سنگ و سیی ئادەمیزاد هەیە.

بۆیە لەو کاتەدا لە «جەمعیەی ڕابتەی علما»دا لە بەغدا بڕیار درا: هەرکەسێ تا ئێستە فێری جگەرەخواردن نەبووبێ حەرامە خۆی فێر بکات. وە هەر کەسیش فێر بووبێت دەبێ وردەوردە هەوڵ بدا و ژمارەی جگەرە کەم بکاتەوە و کەم جگەرە بخوات تا بە یەکجاریی وازی لێ دێنێ.

وە نەوەک ئەوانەی لە زووەوە جگەرە ئەکێشن تووشی دەردێ ببن نەمانتوانی بڵێین: واجبە یەکسەر دەسبەرداری جگەرە ببن و وازی لێ بێنن.

حاجی شێخ لە عەلی ئیرشاددا گەلێ سەرکەوتوو بووە و ماوەی ئەوەی نەداوە کە خەلیفە و مەنسووبەکانی بە ناو موریدەکاندا بگەڕێن و پارە و شتومەک بە ناوی شێخ و تەکیەوە کۆبکەنەوە، بەڵکو ئەو بە گوێرەی توانا شتی داوە بە خەلیفە و مەنسووب و دەروێشەکان.

لە سەر ئەم بناغەیە بووە کە حاجی مەلا عەبدوڵلای کۆیی فەرموویەتی: مـن دەف لێدانی تەکیەی تاڵەبانیم پێ خۆشە، چونکە غەیری ئەوان دەف لـێدەدەن و دەڵـێن: شتمان بۆ بێنن.

حاجی شێخ عەلی ئەدیبێکی بەرز و شاعیرێکی باڵا بووە، بـەڵام لـە بـەر ئـەوە کـە خەریکی ئیرشادی موسوڵمانان بووە ماوەی ئەوەی نەبووە خوو بداتە شیعر و ئەدەب.

وە لەم شیعرانەی خوارەوەدا کە لە لاواندنەوەی شـێخ سـەعیدی حەفیـدا وتـوونی، کاتێ کە شێخ سەعید لە موسڵ شەهید کراوە .. دەردەکەوێ کە حاجی شـێخ عـەلی چۆن شاعیرێک بووە:

نـه در خورشـید تـاب مهـر و نـه در مـه ضـیا باشـد
نـه در روی فلـک شـرم و نـه در دوران حیـا باشـد
گهـی بـا ابـن ملجـم شـیر یـزدان را زنـد نـاوک
گهـی بـا شـمر آن در قتـل شـاه کـربلا باشـد
سـر آن نوجـوان را از چـه ببریـد آن کـافر
کـه میدانسـت رویـش بوسـه‌گـاه مصـطفی باشـد؟
سـری کـز عـرش برتـر، بسـترش آغـوش پیغمبـر
بخـاک انـداختن پیشـش برنـد آن کـی روا باشـد؟
گذشـتیم ار چـه شـایان گذشـتن نیسـت کـردارش
پـس از آن مـاجرا آخـر چـرا ایـن مـاجرا باشـد؟
حفیـد حضـرت کـاک احمـد آن شـیخ سـعید آثـار
ز تـابوتش بیـرون کـردن بریـده سـر چـرا باشـد؟
چـرا آتـش زدی ای بـی‌مـروت در دل زهـرا؟
تـرا اندیشـهء از بـرق تیـغ مرتضـی باشـد؟

تو گر گوئی که هم کهوارهء بوجهل ملعون است
که دائم در خیال کشتن آل عبا باشد
خراب آباد کن یا رب سلیمانی موصل را
که دنیا پاک گردد ورنه آن ناپاکها باشد
الا سنگین‌دلان ای اهل موصل این چه آشوب است
کسی برپا کند این را که دشمن با خدا باشد؟!
بریزان از دو دیده اشک حسرت «خالص»ا هردم
که آل فخر عالم بستهء دام بلا باشد
بخون دیده جوهردار کردم حرف تأریخش
پدر در کربلا و خود شهید «نەی‌نەوا» باشد

١٣٢٦ هـ

حاجی شێخ عەلی ئەفەندی پێنج کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ محەمەدعەلی و شێخ محەمەدڕەئووف. دایکی ئەم دووانە لە بەگزادەی زەهاوە. شێخ حەبیب و شێخ حەسیب و شێخ نەجیب، دایکی ئەمانەیش خەڵکی کەرکووکە.

شێخ محەمەدعەلی لە پاش کۆچی دوایی شێخ عەلیی باوکی لە جێگەکەیدا دانیشتووە. ئەم شێخ محەمەدعەلی‌یە لە ساڵی ١٢٧٣ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٣٥٢ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە پاڵ باوکیدا لە هۆدەکەی ئەودا بە خاک سپێرراوە.

شێخ حەمەعەلی پیاوێکی باش و بە غیرەت بووە و لە ژیانی خۆیدا بە هەموو توانای تەکیەکەی ڕاگرتووە و مورید و مەنسووب و خزم و خوێشان خۆشیان ویستووە.

شێخ حەمەعەلی دوو کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: جەمیل و جەمال، شێخ جەمال خەریکی کار و باری دنیا بووە و شێخ جەمیلیش خەریکی ئیش و کاری تەکیە و بەندەیی‌کردن و دەروێشی بووە.

## شێخ جەمیل

ئەم زاتە پیاوێکی باش و خوداپەرەست بووە و پاش کۆچی دوایی باوکی لە سەر تەکیە و ڕێبازی خۆیان دەوامی کردووە. شێخ جەمیل لە ساڵی ١٣١٠ی کۆچیدا لە

دایک بووە و لە خانەدانی خۆیاندا خوێندوویەتی و قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە و چەند کتێبە وردەی خوێندووە. دوای ئەوە دەستی کردووە بە خوێندنی: نەحو و سەرف و شەرع و، ئەندازەیەکی خوێندووە. دوای ئەوە خەریکی ئیش و کاری تەکیە و ماڵی خۆیان بووە و لە سەر یاسای خانەدانەکەیان زیکر و تەهلیلەی کردووە هەتا باوکی لە جیهان دەرچووە، دوای ئەوە واتە لە ساڵی ١٣٥٢ی کۆچییەوە کار و باری ئیرشاد و چاودێری موریدانیشی گرتووەتە ئەستۆی خۆی.

شێخ جەمیل دەست ئەکا بە تازە کردنەوەی یاسا و ئوسوولی تەکیە و ئیرشاد و، بە هەموو جۆرێ خەریک ئەبێ، بە شێوەیەک کە هەر موریدێ لە هەر شوێنێ بووە دێتەوە بۆ تەکیە و، شێخ جەمیل خۆی بانگی بەیانییەکان و تەمجید و تەسبیح ئەگرێتە گەردنی خۆی، پاش ئەمانە بایەخی زۆر ئەدا بە خوێندنی شێخ عەلی و شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی لە خوێندنگاکەی خۆیاندا و مەلایان بۆ دادەنێ هەتا هەموو زانیارییەکان تەواو ئەکەن. وە فەرمانیان پێ ئەدا کە خەریکی زیکر و تەهلیلە و یاسای خانەدان بن، هەتا لە ساڵی ١٣٨١ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە.

مردنەکەیشی وا بوو: ئازاری ناساغی و نەخۆشیی پەرەی سەند و هێنایانە «مستشفی جمهوری» بەغدا و چەند رۆژێک مایەوە، تا لە بەرەبەیانی رۆژی سێشەمەی نۆزدەی مانگی سەفەری ساڵی ١٣٨١ی کۆچیدا لە هەمان نەخۆشخانەدا گیانی بە پەروەردگاری جیهان سپارد، دوایی هێنایان بۆ مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و لێرە شۆردیان و نوێژمان لە سەر کرد و بردیانەوە بۆ کەرکووک و لە هۆدەی حاجی شێخ عەلیدا بە خاک سپێررا.

حاجی شێخ جەمیل پێنج کوڕی لێ بەجێماوە: شێخ عەلی و شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ عیرفان و شێخ نووری و شێخ محەممەد زیاد. دیاریتری کوڕەکان حاجی شێخ عەلی بوو کە لە جێگەکەیدا دانیشت.

### حاجی شێخ عەلیی کوڕی حاجی شێخ جەمیل

ئەم پیاوە پاش فامکردنەوە لە خوێندنگاکەی خۆیاندا خوێندوویەتی و زانیارییە باوەکانی تەواو کردووە و پاش کۆچی دوایی حاجی شێخ جەمیل لە جێگەکەیدا دانیشتووە و بە راستی خەریکی خزمەتی تەکیەکە و راگرتنی نوێژی جومعە و

جەماعەتەکان و زیکر و تەهلیلە و نان‌دان بە موسوڵمانان بووە و هەموو موریدەکانی باوک و باپیری لێ گرد بوونەوە و هەموو تەکیەکەی بە منارە و گومەز و هۆدەکانەوە چاک کردووە، بە جۆرێ گەلێ لە جاران خۆشتر و جوانترن و تا ئێستەیش لە سەر ئەو پلە و شێوە بەردەوامە.

شێخ عەبدوڕەحمان کۆچی دوایی کردووە و شێخ عیرفان و شێخ نووری و شێخ محەمەد زیاد لە ژیاندان.

لە شێخ محەمەد ڕەئووفی کوڕی حاجی شێخ عەلی ئەفەندی، شێخ فاتیح و شێخ فائیق و شێخ فازیل بەجێ‌ماون. وە لە شێخ فاتیح، شێخ عارف و لە شێخ فازیل، خوسرەو و پیرۆت بەجێ‌ماون. شێخ فائیق نەوەی نێرینەی نیە.

وە لە شێخ حەسیبی کوڕی حاجی شێخ عەلی، شێخ عەبدولمەجید و ئەدیب و نازم و چالاک و شێرزاد و قابیل و کامیل و عەلی بەجێ‌ماون.

وە لە شێخ حەبیبی کوڕی حاجی شێخ عەلی: شێخ سوعاد و شێخ تەحسین بەجێ‌ماون.

وە لە شێخ نەجیبی کوڕی حاجی شێخ عەلی: شامیل و عادیل بەجێ‌ماون.

وە لە حاجی شێخ عەلیی کوڕی شێخ جەمیل: یوسف و ئیسماعیل و جەمیل بووە.

وە لە شێخ عەبدوڕەحمان: ئاشنا و ئامانج و لوقمان بەجێ‌ماون.

### شێخ عەبدولقادر فائیز

دووهەم لە کوڕەکانی شێخ عەبدوڕەحمان خالیس شێخ عەبدولقادر فائیز بووە. ئەم زاتە پیاوێکی خوێندەوار و زانا و بە دین بووە و لە خوداپەرەستی و بەندەیی‌کردندا کەم‌وێنە بووە. وە لە عیزەتی نەفس و قنیاتدا تاقانەی چەرخی خۆی بووە و شاعیرێکی پایەبەرز بووە و بە زمانی کوردی و فارسی و تورکی شیعری هەیە. بەڵام زۆربەی شیعرەکانی بە کوردین.

ئەم زاتە چەن کوڕی لێ بەجێ‌ماوە: شێخ فەیزوڵڵا و شێخ عیززەدین و شێخ نووری. ئەمانەیش هەموو نەوەیان هەیە و لێرەدا ماوەی باس‌کردنیان نیە.

## شێخ عەبدولواحید

سێهەم لە کوڕەکانی شێخ عەبدوڕەحمان خالیس شێخ عەبدولواحید بووە. ئەم زاتـە پیاوێکی باش و لەخوداترس بووە، لەمیش شێخ ئەسعەد بەجێماوە.

حاجی شێخ عەلی ئەفەندی فاتیمەی کچی خۆی لێ مارە بڕیوە. ئەم ژنە یەکێ لـە ئافرەتە چاکەکانی چەرخی خۆی بووە و تا کۆچی دوایی کردووە سەرحەلقەی خەتم و تەهلیلەی ناو ژنانی تەکیەی تاڵەبانی بووە. شێخ ئەسعەد لەم ژنـە باشـە بـەڕێزە سـێ کوڕی بووە: عەبدولکەریم و محەمەد و عوسمان.

## شێخ ڕەزای تاڵەبانی

کوڕی چوارەم لە کوڕەکانی شێخ عەبدوڕەحمان خالیس شێخ ڕەزا بووە. ئـەم زاتـە لە ساڵی ۱۲۵۳ی کۆچیدا لە دێی «قرخ»ی سەر بە قەزای چەمچەماڵ لە دایک بووە.

پاش فامکردنەوە دەستی کردووە بە خوێندن و قورئانی پـیرۆز و کتێبـە وردەکـانی خوێندووە. دوای ئەوە دەستی کردووە بە زانیاری‌یەکانی: نەحو و سـەرف و وردەوردە بەرز بووەتەوە. وە ماوەیەکی زۆر لە خوێندنگاکانی کەرکووکدا خوێندوویە، پاش ئـەوە چووە بۆ شاری کۆیە و بە بۆنەی شێخ غەفووری مامیەوە لەوێ ماوەتەوە تـا خوێنـدنی تەواو کـردووە. دوای ئـەوە هـاتووە بـۆ شـاری کـەرکووک و لـە تەکیەکـەی خۆیانـدا ماوەتەوە.

ئەم زاتە هەرچەن پیاوێکی زانا بووە و لە زانیاری‌یەکاندا دەستی باڵای بـووە، بـەڵام لە بەر ئەوە کە زەوقی شیعر و ئەدەبی زاڵ بووە لە جیهاندا بە شاعیر و ئەدیب ناوبانگی دەرکردووە. ئەگەرنا لە هەموو زانیاری‌یەکاندا سەرامەد بووە، بـە تایبـەتی لـە شـەرع و تەفسیر و حەدیسدا.

ئەگێڕنەوە: جارێک حاجی شێخ عەلی ئەفەندی ئەچێ بۆ بەغدا بـۆ زیـارەتی شـێخ عەبدولقادری گەیلانی، شێخ ڕەزایشی لەگەڵدا دەبێ، جا ڕۆژێک لە ماڵی نەقیبدا ئەبن حاجی شێخ عەلی بە بۆنەی باسـێکەوە حەدیسـی «دع مـا یریبـک الـی مـا لا یریبـک» ئەخوێنێتەوە، بەڵام بە بۆری «ی»ی لە سـەر ئاساسـی ئـەوە کـە ئـەو فیعلـە لـە بـابی «افعال»ە، وە هەندێ مەلا دەڵێن: ئەبێ بە فەتحە ـ سەرـی «ی»کـە بـێ. قسـەکەیان درێژە دەکێشێ. جا شێخ ڕەزا ئەفەرموێت: کاکە «لا تتکلم معهم انهـم لفـی شـک منـە

مریب» کە «مریب» ئیسمی فاعیلی بابی ئیفعالە و بە بۆری میمە، جا مەلاکان بێدەنگ دەبن.

پاش وردبوونەوە لە شیعری شاعیرەکانی کوردستان دەردەکەوێ کە: مەولەوی و نالی و مەحوی و شێخ رەزا هەریەکەیان لە بابەتی خۆیدا تاقانە بوون. مەولەوی لە تەئسیری شیعر و جۆش و خورۆشی دەروونیدا و نالی و مەحوی لە وردیی ناوەرۆک و چاودێریی نوکتەی بەلاغەدا و شێخ رەزایش لە رەوانی و بێ‌گرێیی شیعرەکانی لە هەموو بابەتێکدا.

وە بزانە چۆن لە خودا دەپاڕێتەوە:

ای ریزخوری خوان نوالت مە ماهی
جودت چو وجودت ابد نامتناهی
برنامەی اعمال سیاهم قلم عفو
برکش کە بدل شد بە سفیدیم سیاهی
بودم من اگر بندۀ از خواجە گریزان
باز آمدم ای بندەگیت عزت شاهی
بر عفو عقوبت نبود سود و زیانت
این هر دو بە پیش تو موساویست الهی
بیرون شدن از ساحت ملک تو محال است
عبد توأم و ملک توأم خواهی نخواهی
این دیدۀ گریانم و این سینۀ بریان
برصدق سخن میدهم هر دو گواهی
صد بار امید است «رضا» را بە تو هرچند
سر تا قدمش غرق گناه است و مناهی

وە تەماشای ئەم تەرجیع بەندەی بکەن لە ستایشی پێغەمەردا ـ د ـ وتوویەتی:

ای جهان آفرین ثناگویت
وی دو عالم معطر از بویت

ســـــاکنان ســـــرادق ملکـــــوت
همـــه قربـــان یـــک ســـر مویـــت
گـــل ز خـــونین‌دلان رخســـارت
لالــــه از هنــــدوان گیســــویت
لالـــه در بـــاغ داغـــدار رخـــت
ســـرو مائـــل بـــه قـــد دل‌جویـــت
ســـرمه مفتـــون چشـــم مازاغـــت
نافـــه دل‌ریـــش خـــال هنـــدویت
عارضت «والضحی» ، خطت «واللیل»
«قـــل هـــو الله» حـــرّ ز بازویـــت
«قـــاب قوســـین» را نمـــی‌دانـــم
جـــز کمانهـــای هـــر دو ابرویـــت
نسخه‌ی کائنـات هرچـه در اوسـت
شـــرح رمـــزی ز مصـــحف رویـــت
بـــاز گـــویم غـــم اســـارت خـــویش
بزبـــــان فصـــــیح لاهویـــــت
عـــرش کمتـــر بهـــای مشـــت گلـــی
کـــه بـــرو آره‌میـــده پهلویـــت
روز شـــب جبرئیـــل در پـــرواز
بـــی ســـر و پـــا همـــی دوَد ســـویت
روضـــه‌خـــوانی کنـــد بـــنظم حجـــاز
همچـــو درویـــش بـــر ســـر کویَـــت
**کـــز ســـراپرده‌ی مقـــدس ذات**
**بـــر ســـراپای انـــورت صـــلوات**
ای منـــادی بکـــاف هـــا یـــا عـــین
وی منادی «انـا النبـی» بـه«حنـین»
جبرئیـــل امـــین بـــامر خـــدای

امـــرت آورد ای شـــه کـــونین
خیـز بـر نـه قـدم بـه کـوی قـدم
خیــز بــرکش علــم ز علــم بعــین
بمقـــامی درآمـــدی کـــه درو
نه «متـی» را مجـال بـود نـه «ایـن»
«قــاب قوســـین کــان او ادنـــی»
«بـین مـولی الـوری و بینـک بـین»
قَسَـمت مـی‌دهـم بجـان «حسـن»
به سر «مرتضـی»، بخـون «حسـین»
روز «وا أمتـــی» کـــه پـــیش روی
بـــه امیـــد شـــفاعت ثقلـــین
بنـــواز و مـــرانم از لـــب جـــوی
تـــرکن از آب کـــوثرم «شـــفتین»
ای بـــه کویَـــت ســـعادت ابـــدی
وی ز رویـــت شـــرافت حـــرمین
مـــا ز امـــر تـــو غافـــل تـــو بمـــا
مشـــفق مهربـــان‌تـــر از ابـــوین
در مـــزار ایـــن درود مـــی‌خـــوانم
بـــاز پرســـند از تـــوام ملکـــین
**کـــز ســـراپرده‌ی مقـــدس ذات**
**بـــر ســـراپای انـــورت صـــلوات**
خواجـــهٔ انبیـــا و خـــتم رســـل
هـــادی خلـــق، پیشـــوای ســـبل
ای همه ممکنـات جسـم تـو جـان
وی همـه ممکنـات خـار تـو گـل
محـــرم کردگـــار مهـــبط وحـــی

مهتـــر اصـــفیا و مظهـــر کـــل
«لــم تلــد مثلــک النســاء فتــی
لـم یجـد شـبهک الزمـان رجـل»
صـــفت شـــانئەت «هـــو الابتـــر»
صـــفت باغضـــت «زنـــیم، عتـــل»
در قیامـــت چـــو ذوالجـــلال تـــرا
مـــی‌دهـــد رخصـــت شـــفاعت کـــل
آیـــد از بارگـــاه مقـــدس خـــدا
«لـــک ماشـــئت یـــانبی فقـــل»
فکر مـن کـن کـه کـردەام تسـبیح
در خرابـــات رهـــن شـــاهد مـــل
تا مرا چون تویی شـفیع چـه بـاک
ز آتـــش دوزخ سلاســـل و غـــل؟
بـــه هـــوای تـــو مســـت بـــی‌پـــروا
نعـــت گویـــان خـــرامم از ســـر پـــل
**کـــز ســـراپردەی مقـــدس ذات**
**بـــر ســـراپای انـــورت صـــلوات**

تەماشا بکەن لە باسی شکافی تاقی کیسرا لە «مدائن»دا ئەڵێ:

شکـافی کە بینی تو در طاق کسری
دهانی است گوید: بقا نیست کس را!

ئەم دوو بەیتەیشی لە ستایشی خودای تەعالادا فەرمووە:

هشت بهشت و شش جهت، هفت زمین، نو فلـک
جملـه تـو آفریـدەای «وحـدک لا شـریک لـک»
مـن چـیم ـ ای فـدای تـو ـ دم زنـم از ثنـای تـو
ایـن همـه ماسـوای تـو، در کـف قـدرت تـو یـک

شێخ رەزا چامەی درێژ و تەرجیعبەند و گەلێ بابەتی شیعری لە ستایش و هەجودا وتووە و هەروەها تاکە شیعری جوانیشی هەیە هەر تاکێکیان دایکی ئەدەبن، تەماشابکە لەم تاکەدا دەڵێ:

نیک و بد چون به حکم تقدیر است
ترک تدبیر عین تدبیر است

لەگەڵ ئەوەدا باوک و باپیری شێخ رەزا داوای ئەوەیان نەکردووە کە سەیید بن و خۆیان بە عەشرەتی زەنگنە داناوە .. شێخ رەزای تاڵەبانی لە چەند شیعرێکدا ئەوەی دەربڕیوە کە لە بنەماڵەی سەیید ئەحمەدی، کوڕی سەیید حەسەنی، کوڕی سەیید بابا رەسووڵی گەورەی بەرزنجین و فەرموویەتی:

مشهور جهان به غوث ثانی
عبدالرحمن تالەبانی
محمودش جد و احمدش باب
هر سه ولی‌اند و قطب اقطاب
محمود مرید پیر لاهور
هرچند به زنگنە است مشهور
در اصل نسب گلی است سوری
از گلبن باغ «کاکە سوری»

دەگێڕنەوە : ئەم سەییدە بەرزنجی‌یە کاکە سووری‌یانە هەندێکیان کۆچیان کردووە بۆ دەوروبەری سەقز و بانە لە ئێراندا و لەوێدا نیشتەجێ بوون و هەندێکیان لە دێی سیتەکی ژووروو و هەندێکی دیکەیان لە هەزارمێرددا دانیشتوون. جا شێخ رەزا دەڵێ: ئێمە لە نەوەی کاکە سوورین کە لەقەبی سەیید حەسەنی کوڕی بابا ڕەسووڵە.

شێخ رەزا لە سەردەمی حاجی شێخ عەلی ئەفەندی براگەورەیدا لەگەڵ ماڵی شێخ عەبدوڵلای کوڕیدا کە زاوای حاجی شێخ عەلی ئەفەندی بووە کۆچی کردووە بۆ بەغدا و لە بەرانبەری «دفاع»ی ئەمڕۆدا تەکیە و خانووی کردووەتەوە و لەوێدا نیشتەجێ بووە هەتا لە ساڵی ١٣٢٧ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی مزگەوتی شێخ

عەبدولقادری گەیلانیدا بە خاک سپێرراوە و ئەم شـیعرانە لـە سـەر کێلـی گۆڕەکـەی نووسراوە:

یا رسول الله چه باشد چون سگ اصحاب کهف
داخل جنت شوم در زمرەی احباب تو؟
او رود در جنت و من در جهنم کی رواست؟
او سگ اصحاب کهف و من سگ اصحاب تو

شێخ ڕەزا کە کۆچی دوایی کردووە شێخ عەبدوڵلا و شێخ محەمەدی شاعیری لێ بەجێماوە. لە شێخ عەبدوڵلایش، شێخ ڕەحمەتوڵلا و شێخ حەسەن و شێخ عەلی بەجێماون. کە ئەم زاتانە کەسیان لە پاش بەجێنەماوە.

وە لە شێخ محەمەد، شێخ سەعید بەجێماوە و لە شێخ سەعیدیش نەتەوە کەوتووەتەوە.

## بنەماڵەی «خاتم السجادە»

ئەم خانەدانە ـ وەک باوە ـ لە نەتەوەی حەزرەتی عوسمانی خەلیفەی سێهەمن.

وەک لە لای زانایانی سیرەتی پێغەمبەر ـ د ـ و حەدیسی پیرۆز زانراوە بناغەی ئەم سوجادەی پیرۆزە وا بووە کە حەزرەتی عوسمان لەگەڵ کۆمەڵێ لە یاراندا بە فەرمانی حەزرەت ـ د ـ لە مەکەوە کۆچیان کرد بۆ حەبەشستان لە سەر ئەوە کە کافرەکانی شاری مەکە گەلێ ئازاری موسوڵمانەکانیان دەدا.

وە پاش ئەوەی کە ماوەیەک لە حەبەشستاندا مانەوە هاتنەوە بۆ مەکە، دووبارە کافرەکان دەستیان کردەوە بە ئازاردانیان، جا حەزرەت بۆ جاری دووەم فەرمانیدا بە عوسمان و یارانی کە بچنەوە بۆ حەبەشستان و لەوێ مانەوە هەتا حەزرەت ـ د ـ لە مەدینەدا دامەزرا، ئیتر یاران لە هەموو لایەکەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، لە ناو ئەوانەدا موهاجیرەکانی وڵاتی حەبەشەیش هاتنەوە بۆ مەدینە. کاتێ کە حەزرەتی عوسمان خۆی و خێزانەکەی ـ کە کچی حەزرەت بوو ـ گەییشتنە مەدینە و حەزرەت بەمەی زانی زۆر شادمان بوو:

یەکەم: لەبەر ئەوە کە عوسمان خاوەنڕێز و بەتوانا بوو لە باوەڕ و وەفاکاری و خزمەتگوزاریدا.

دوەم: پیاوێکی ئازا و دڵ بەهێز بوو، خاوەن بیر و راوێژ بوو.

سێهەم: زاوای حەزرەت بوو، کچی حەزرەتی لەلا بوو.

چوارەم: بە هۆی هاتنەوەی عوسمانەوە هیوای ئەوەی بوو کە گەلێ لە خزم و خوێشان بێن موسوڵمان ببن و ... لە بەر چەن شتی تریش.

جا کاتێ عوسمان گەییشتە بەرەوە و هات بۆ خزمەتی، حەزرەت ـ د ـ فەرمووی بە ئەنەس: بڕۆ ئەو سوجادە کە نوێژی جومعەی لە سەر ئەکەم بۆم بێنە. ئەویش چوو هێنای، حەزرەت ـ د ـ سوجادەکەی بە خەڵاتدا بە عوسمان و فەرمووی: هەر

پێغەمەرێک هاوڕێیەکی هەیە، هاوڕێی من لە بەهەشتدا عوسمانە .. ئەم فەرموودەیشە بوو بە خەڵاتێکی گەورەتر لە خەڵاتە پێشووەکە.

جا حەزرەتی عوسمان سوجادە ـ بەرماڵەکە ـی وەرگـرت و نایـە سـەر چاوەکـانی بۆنی ئەکرد وەکوو چۆن یەکێ بۆنی گوڵباخی بەهار بکات. وە بەرماڵەکەی لای خـۆی دانا. وە کاتێ نوێژی ئەکرد بەرماڵـەکەی دائەخسـت و بەرماڵـێکی دیکـەی بەسـەردا دائەخست بۆ ئەوە پێ نەنێتە سەر ئەو بەرماڵـە کـە حـەزرەت پێـی موبـارەکی ناوەتـە سەری.

وە تا عوسمان لە ژیاندا بوو ئەو بەرماڵە لە لای مایەوە. وە پاش کۆچی دوایی خۆی کەوتە دەستی «ابان»ی کوڕی کە پیاوێکی گەورە بوو و یەکێ لە زانایانی ئەو سەردەمە و زانایـانی مەدینـەی مونـەوەرە بـوو. «ابـان» نـوێژی لـە سـەر نـەدەکرد و لـە سـەر کورسی‌یەک دایننابوو و ڕێزی لێ دەگرت.

دوای کۆچی دوایی «ابان» کەوتە دەستی نەتەوەکەی بەم ڕیزەی خـوارەوە: کەوتـە دەستی «ابو عبدالله الخفیـف»، دوای ئەو کەوتە دەست حەمدوون، دوای ئەو لای تاهیر، جا داود، جا کەوتە لای «آخ بابا»، جا حەمید، جا «علاءالدولـة»، جـا «شـجاعالـدین»، جـا «حبیب‌الله»، جا «افضل»، جا محەمەد، جا «اویس»، جا «عبدالقاسم»، جا «عبـدالباقی»، جـا «عبدالقاسم». ئەمە کە نووسیم لە سەرەتاوە تا ئێرە تەرجومەی ئەو کتێبەیـە کـە مـەلا ئەبوبەکری موسەننیفی چۆڕی نووسیویەتی و لە کۆتایی‌یەکەیدا نووسیویە:

«فقد تمت الصحیفة بعون‌الله، فاعتمد علی ما فیها، فانه قد صح عندی، و ثبـت لـدی، و انا الفقیر ابوبکر بن هدایةالله الحسینی، عفا الله عنه و عن جمیع المسلمین آمین. و الحمد لله رب العالمین» .

نەقشی مۆرەکەی

دارد شرف سلسله از شاه ولایت

الواثق بالله ابوبکر هدایت

وە ئەم تەئیدە بۆ دەرخستنی ڕاستیی نیسبەتی سوجادەی شەریف دەست‌بەدەست تا حەزرەتی عوسمان و تا پێغەمەر ـ د ـ لە سەر ئەخباری موتەواتەر و لە سەر تەماشـا کردنی سەنەدەکانی دەستاودەستی ئەم بەرماڵە پیرۆزە بـووە لـە حەزرەتـەوە بـۆ لای عوسمان ـ خ ـ تا گەییشتووە بە عەبدولقاسمی دووهەم نەک لـە سـەر هاوچـەرخێتی

مەلا ئەبوبەکری موسەننیف بۆ عەبدولقاسم، چونکە مەلا ئەبوبەکر ـ خ ـ لە سەدەی دەی کۆچی و لە سەرەتای سەدەی یازدەدا لە دێی چۆڕ کۆچی دوایی کردووە.

وە مەلا ئەبوبەکر هاوچەرخی پیرمیکائیل بووە کە یەکێکە لە گەورەکانی نەتەوەی حەزرەتی عوسمان ـ د ـ وە خاتوون جیهانی کچی پیرمیکائیلی مارە کردووە و مەلا عەبدولکەریم و مەلا یوسفجان و مەحموود جانی کوڕی مەلا ئەبوبەکر لەو ژنەن.

وە باپیرانی پیرمیکائیلی عوسمانی لە مێژووی ٦١٧ی کۆچیدا هاتوون بۆ ناحیەی جوانرۆ و لە دێی دەوداندا دامەزراون بەڵگەی ئەمانیش کە نووسیمن ئەو نامە و قەبالانەن کە لە خانەدانی عەلی رەفیق ئەفەندی «خادم السجادە»دا لە کەرکووک خۆم دیومن و لە سەر هەندێکیان نووسراوە کە ئەمیر شەمسەدین بیلالی مەشهوور بە مەرزبانماڵی بە دەرامەت و باشی وەقف کردووە لە سەر ئەو کەسانە کە خزمەتی سوجادەی شەریفە ئەکەن، وە ئەوانەیش کە دێن بۆ دیدەنی، وە مێژووی نووسینی ئەو وەقفنامەیە ساڵی ٧٣٨ی کۆچی بووە کە لەو کاتەدا ئەمیر شەمسەدین فەرمانداری جوانرۆ بووە.

جا ئەو بەرماڵە لە عەبدولقاسمەوە گەییشتووە بە عەبدوڕەحمان، جا بە محەمەد، جا بە ئیسماعیل، جا بە عەلی، جا بە پیرمیکائیل، جا بە ئیبراهیم، جا بە ئەبوبەکر، جا سەعدەدین، جا مەنسوور، جا ئیبراهیم، جا محەمەد، جا بە ئیسماعیل، جا بە حەسەن، جا بە ئاسەف، جا بە خزر، جا بە سەعدی کە بریتییە لە مەلا سەعدی زانای بەرزی شاری کۆیسەنجەق لە دەوری مێژووی ١١٦٠ ەوە تا ١٢٦٠ .

یانی نەتەوەی پیرمیکائیل هەر لە دێی «دەودان» بوون تا سەد ساڵێک دوای مردنی پیرمیکائیل. دوای ئەوە بە بۆنەی هەندێک رووداوی جیهانییەوە لە جوانرۆ دەردەچن و دەچنە کۆیسەنجەق و لەوێ نیشتەجێ دەبن، هەروەها کۆمەڵێکی دیکە لە نەتەوەی پیرمیکائیل هاتوون بۆ عێراق و بە هۆزی پیرمیکائیلی ناوبانگیان دەرکردووە و ماوەیەک وەکوو جافی کۆچەریی گەرمیان و کوێستانیان کردووە، دوای ئەوە لە قەرەداغ و سەنگاودا نیشتەجێ بوون و مەولانا خالیدی نەقشبەندی یەکێکە لەم بنەماڵەی پیرمیکائیلییە.

وە بە گوێرەی هەندێ نامە و دەسنووسی مێژوویی کە دیومن و خوێندوومنەوە نووسراوە: کە مەلا یوسفجان لە چۆڕەوە چووە بۆ لای شێخ سەعدەدینی خاڵۆی و

لەگەڵ خالیدا بەیەکەوە چوون بۆ تورکیا و پاش ماوەیەک گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان کە ناحیەی تاوگۆزییە و لەوێدا کۆچی دواییان کردووە وگۆڕی هەردووکیان لای یەکدایە. وە بەو بەڵگە و نووسراوانەدا دەردەکەوێ کە: ئیبراهیم و ئەبوبەکر و سەعدەدین برا بوون و کوڕی پیرمیکائیل بوون و ئیبراهیم براگەورە بووە و هەرکەسێکیان دەست بە دەست خزمەتی بەرماڵی پیرۆزی پێغەمەریان کردووە.

وە دەرئەکەوێ لە سەردەمی حەزرەتی عوسمانەوە ئەو کەسانە کە خزمەتی ئەو بەرماڵەیان کردووە زانا و خوێندەوار و پیاوچاک و لەخوداترس بوون. وە وا باوە کە پیرمیکائیل خۆی مورشیدێکی بەرز و پیرۆز بووە. بۆیە مەلا ئەبوبەکری موسەننیف لە مەریوانەوە ناردوویەتی بۆ لای و داوای کچی لێ کردووە تا بە ژن و ژنخوازی خزمایەتییان ببێ.

وە مەلا سەعدی کۆیی لە نەوەی ئەو بنەماڵەیە و، چۆن بە بەڵگەوە سەرپەرشتی خزمەتی بەرماڵی پیرۆزی بە دەستەوە بووە وەهایش مودەڕیس و زانا و پیاوێکی بەرزی خاوەن دانراوی بەنرخ بووە.

ئەم پیاوە لە ساڵی ١٣٥٠ی کۆچیدا لە شاری کۆیە لە دایک بووە و خوێندنی تەواو کردووە و بووە بە برنجی مەلا و زانا و، ئەوەندە کتێبی داناوە دانراوەکانی خۆی لە سەر یەک هەڵچنیوە و لە پاڵیاندا وەستاوە دانراوەکانی بەقەدەر باڵای خۆی بەرز بوونەتەوە!

یەکێک لە دانراوەکانی کتێبێکە بە ناونیشانی «الدرر اللامعه فی بیان اشکال بعض الایات الساطعة». لە ساڵی ١٢٥٤ی کۆچیدا ئەبوسەنای ئالووسی و گەلێکی دیکە لە زانایانی بەرزی وڵات تەقریزیان کردووە.

ئەبوسەنا لە تەقریزەکەیدا نووسیویەتی:

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لولیه، و الصلاة علی نبیه، و علی آله الاقطاب و اصحابه الانجاب.

اما بعد: فقد سرحت طرف الطرف فی معانی هذا الکتاب الجامع من فرائد الفوائد ما یبهر الاذهان، و یحیر ذوی الالباب، فعلمت ان جامعه فرید فی عصره، واحد الاحدین فی مصره. وفقه الله ـ سبحانه و تعالی ـ للتهذیب و التحریر، و جعله نافعا بما یبدیه من التقریر کل تحریر.

کتبه افقر العباد الیه ـ عز شأنه ـ ابو الثناء شهاب‌الدین السید محمـود المفتـی ببغـداد المحمیة عفی عنه.

ختم

خوالێخۆش‌بوو مەلا سەعدی لـە مێـژووی ١٢٦٠ی کۆچیـدا لـە شـاری کۆیـە بـۆ یەکجاریی ماڵئاوایی لە جیهان کردووە. واتە ١١٠ ساڵی تەمەن بە سەر بردووە.

ئەو بەرماڵە پیرۆزە لە ماوەی ژیانی مەلا سەعدیدا لای مـەلا سـەعدی بـووە، دوای ئەوە کەوتووەتە دەستی حاجی محەمەد ئەفەندی کـوڕی کـە دیـاریترینی کوڕەکـانی بووە.

حاجی محەمەد پاش کۆچی دوایی باوکی ماڵـی گوێزاوەتـەوە بـۆ کـەرکووک و لـە گەڕەکی بڵاغدا خانووی کردووەتـەوە بـۆ بەرماڵـە پیرۆزەکـە و لـە لایـەنی دەوڵـەتی عوسمانی‌یەوە مووچە و بەرات و دەرامەتیان بۆ نانداان بۆ بڕیار دراوە و ئـەو خێزانـە لـە کەرکووکدا بەڕێزەوە دامەزراون و حاجی محەمەد ئەفەنـدی لـە دەوروبـەری مێـژووی ١٢٣٤ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە مێژووی ١٣٠٤ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانی حەوشەی تەکیەی تاڵەبانیدا لە نزیکی ئارامگای شێخ مەحموودی زەنگنەوە بە خاک سپێرراوە.

وە لە پاش کۆچی دوایی حـاجی محەمـەد ئەفەنـدی ئـەو بەرماڵـە دەکەوێتـە لای حاجی ئەمین ئەفەندیی کوڕی کە پیاوێکی لێهاتوو و بەڕێز بووە و زاوای جەنابی شـێخ عەبدوڕەحمانی خالیس بووە. ئەو خانەدانە لەو مێـژووەوە زۆرتـر لـە جـاران جێگـە و شوێنیان دەرکەوتووە.

وە ئەم بنەماڵە بێجگە لەوە لە نەوەی حەزرەتی عوسمانن بە زۆری رشـتەکەیان لـە پیاوچاک و زانای بەرز و بەڕێز خاڵی نەبووە. ئەوەندە بۆ ڕێزی ئەم بنەماڵـە بەسـە کـە مەولانا خالیدی نەقشبەندی و مەلا سەعدی «خادم السجادە» لەم رشتە پیرۆزەن.

حاجی ئەمین ئەفەندی لە مێژووی ١٢٦٢ی کۆچیدا لـە دایـک بـووە و لـە ١٣٣٢دا کۆچی دوایی کردووە.

پاش کۆچی دوایی حـاجی ئـەمین ئەفەنـدی بەرماڵـەکە کەوتووەتـە لای جـەنابی ڕەفیق ئەفەندی کوڕی کە پیاوێکی هۆشیار و زانا و خاوەن دیـن بـووە. ئـەم زاتـە بـە یاسای ئەدەب تەمەنی خۆی بە سەر بردووە، ماوەیەک لە «مجلسی نـواب»دا مەنـدووب

بووە. لە ساڵی ١٢٩٠دا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٣٥٥ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە و بەرماڵەکە کەوتووەتە دەستی عەلی ئەفەندی کوڕی.

عەلی ئەفەندی و ڕەئفەت ئەفەندی و ئەمجەد، سێ کوڕی زانا و هۆشیار و بەڕێز بوون و شوێن و جێگەی کۆمەڵایەتی و دیوەخانی باشیان بوو و شوێنەکە ئامادە بوو بۆ ئەوە کە هەرکەس بچێ دیدەنی و زیارەتی ئەو بەرماڵە پیرۆزە بکات، من خۆم چەند جار چووم زیارەتم کردووە.

من هەرچەند بیر دەکەمەوە نازانم پیاوەتی و ناسکیی ڕەئفەت ئەفەندی و هۆشیاریی و زانایی عەلی ئەفەندی چۆن بەیان بکەم. ئەم دوو کوڕە دوو پیاوی وەها بوون ئەگەر چەرخ و ڕۆژگار یارمەتی بدایەن لە پێشینانەکانیان کەمتر نەدەبوون. لە سەردەمی خۆیشیاندا لە هاوڕێ و هاودەمی خۆیان لە پێشتر بوون. هەروەها ناتوانم مافی برایەتی و دۆستایەتی ڕاستی ئەمانە بەجێ بهێنم.

وە ئەم خانەدانە وەک لەگەڵ خانەدانی تاڵەبانیدا خزمایەتی و ژن و ژنخوازییان هەیە لەگەڵ خانەوادەی مەلا محەمەدی قوتبیشدا خزمایەتی و ژنخوازییان هەبووە.

مەلا محەمەدی قوتب لە بنەڕەتدا لە هۆزی شوانە و لە سەردەمی خوێندندا ئەم لەقەبە جوانەی لە زمانی تەفەئولی هاوڕێکانییەوە وەرگرتووە کە پێیان وتووە مەلا محەمەدی قوتب، وە ئەم نازناوە وەک میرات پشتاوپشت هاتووە و بووە بە ناونیشانی ئەو بنەماڵە.

مەلا محەمەدی قوتب، مەلا مەردان و مەلا ئەحمەدی قوتبی لێ بەجێماوە. مەلا ئەحمەدی قوتب زانایەکی بەرز و بەڕێز بووە و لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بووە بە حاکم. ئەم پیاوە بەهادینی قوتب و عەبدولخالیقی قوتبی لێ بەجێماوە. کە هەردووکیان خاوەن وەزیفەی گەورە بوون لە حکوومەتی عێراقدا. مەلا مەردان، مەلا عەبدولمەجیدی قوتب و مەلا حەمیدی لێ بەجێماوە.

مەلا عەبدولمەجیدی قوتب پیاوی زانا و شارەزای کار و باری کۆمەڵایەتییە و هەروەها خۆشنووس و ئەدیبە. لەگەڵ ئەمانەیشدا بە دەستەڵات و دەستڕۆییشتووە لای کاربەدەستانی وڵات.

وە لە مێژووی نووسینی ئەم کتێبەدا کە ساڵی ١٤٠٣ی کۆچییە گەلێ پیاوی زانا و ئەهلی زانیاری لە کەرکووکدا هەن، دیاریتریان: مەلا عەبدولمەجیدی قوتب و مەلا

عەلی فەتحوڵڵایە کە لە هۆزی زەنگنەیە و لـە مزگـەوتی عـەلی‌بەگـدا خوتبـەخوێن و پێش‌نوێژە و خزمەتی ئایین و موسوڵمانان دەکات.

ژن و ژن‌خوازیی خێزانی مەلا محەمەدی قوتب لەگەڵ «خادم السجادە»دا ئەمەیە کە کچی مەلا محەمەدی «خادم‌السجادە» کە رەحمای ناو بووە شووی کردووە بە جـەنابی مەلا مەردان و مەلا عەبدولمەجیدی قوتبی لێ بووە. وە کچی دووەمی مەلا محەمەدی «خادم‌السجادە» شووی کردووە بە مەلا ئەحمەدی قوتب و، بـەهادین و عەبـدولخالیق و محەمەدی لێ بووە و ئەم کچە ناوی عیسمەت بووە.

